## بیرەوەرییەکانی

# تەیموری لەنگ

لەفارسییەوە: حەمەی حەمە سەعید



مارسل بریون

# بیرەوەرییەکانی

# تەیموری لەنگ

وەرگێڕانی لەفارسییەوە
حەمەی حەمەسەعید

پێداچوونەوە
عوسمان محەممەد هەورامی

سلێمانی ..................................... ٢٠١١

لەبلاوکراوەکانی خانەی چاپ و پەخشی رێنما

زنجیرە ١٣١



ناسنامەی کتێب

بیرەوەرییەکانی تەیموری لەنگ

- نوسینی: مارسل بریون.
- وەرگێرانی: ئەمەی ئەمەسەعید
- بابەت: بیرەوەری
- تیراژ: ١٠٠٠
- نۆبەت و ساڵی چاپ: پێنجەم ، ٢٠١١
- شوێنی چاپ: چاپخانەی گەنج

ژمارەی سپاردن: (٢٩٠)ی ساڵی ١٩٩٩ای پێدراوە

ناونیشان
سلێمانی ـــ بازاڕی سلێمانی ـــ بەرامبەر بازاڕی خەفاف.
ژمارەی مۆبایل: (٠٧٧٠١٥٧٤٢٩٣) (٠٧٥٠١١٩١٨٤٧)

# پێشەکی وەرگێڕی فارسی

(مارسل بریون)ی فەرەنسی دانەرو کۆکەرەوەی ئەم کتێبە لە ئێراندا ناسراو نی‌یە. من دوانزە ساڵ لەمەبەر بەسەرهاتێکی تری مێژوویم بە ناونیشانی (سەلاحەددین وارنعود) کە بە قەڵەمی ئەم نووسەرە نووسرا بوو وەرگێڕاوو لە یەکێك لە ڕۆژنامەکانی ڕۆژانەی تاراندا بلاّومکردەوە، بەلاّم بە وێنەی وەرگێڕاوەکانی ترم بە شێوەی کتێب چاپ نەکرا.

بە رای من کتێبی " منم تەیمووری جیهانگیر" کە ئێستا دەخرێتە بەر دەستی خوێنەران، لە لایەن نوسەرەوە بەم زووانە کۆکراوەتەوەو نووسراوەتەوەو یەکێکە لە کتێبە هەرە باشەکانی ئەورووپای ڕۆژئاوایی کەلەم ساڵانەی دواییدا چاپ کراوە.

مارسل بریون بۆ نووسینەوەی ئەم کتێبە چیی لە مێژووی کۆندا سەبارەت بە تەیموور نووسراوە خوێندوویەتیەوە، لەبەر ئەوەی زمانی عەرەبی زانیوە چیی کتێبی عەرەبی لەسەر تەیموور نووسراوە خوێندوویەتیەوە، ئەو مێژووانەش کە فارسی بوون کاتێ وەرگێردراونەتە سەر زمانەکانی ئینگلیزی، فەرەنسی، ئەڵمانی سوودی لێ بینیوون، ئینجا دەستی بە نووسینەوەی ئەم کتێبە کردووە.

بابەتەکانی ئەم کتێبە؛ ئەو بابەتانەن کە نووسەر لەناو هەموو ئەو کتێبانەدا کە لە کتێبخانەکانی ئەمەریکاو ئەورووپادا چاوی پێکەوتن‌و سەبارەت بە تەیمووری لەنگ نووسراون، کۆیکردوونەتەوە.

مارسل بریون بە سەرهاتی هەر یەك لە نووسەری ئەو کتێبانەی نووسیوە، بەندە تا ئەمڕۆ نەمدیوە هیچ نووسەرێك بۆ نیشاندانی سەرچاوەکانی خۆی ئەوەندە ورد بێت. بۆ نمونە یەکێك لەو سەرچاوانە کتێبی (ظفرنامە)یە، کە نووسەرەکەی (شرف الدین عەلی یەزدی)یە، من دڵنیام جگەلە مامۆستایانی مێژوو کە ئیشیان ووتنەوەی مێژووە وە ناچارن لەبەر کارەکەی خۆیان مێژوو بخوێننەوە هیچ خوێنەرێکی ئێمە (ئێران) نازانێ شرف الدین عەلی یەزدی لە چ دەورەیەکدا ژیاوە! وە چۆن کتێبی (ظفر نامە)ی نووسیوە. بەلاّم مارسل بریون

دەڵێ: شرف الدین عەلی یەزدی کاتبی میرزا ئیبراهیم سوڵتان بووە، کە دووەمین کوڕی (شارۆخ)ە، وە نووسینەوەی کتێبەکەشی دەگەڕێتەوە بۆ ساڵانی (١٤٢٤-١٤٢٥زاینی) لە (یەزد)داڕژیاوەو هەر لەوێش کۆچی دوایی کردووەو ئەم کتێبەش (ظفر نامە) ساڵی ١٦٥٣ی زاینی بە زمانی فەرەنسی لە لایەن (پیتی لاکروا)وە نووسراوەو لە ساڵی ١٧٢٣ی زاینیدا لە لایەن (دەربایی) کراوە بە ئینگلیزی.

نوسەری هەریەك لەو کتێبانەی کە مارسل کەڵکی لێوەرگرتوون چ بە زمانی عەرەبی یاخود تورکی یان زمانەکانی ئەوروپایی بووبێ بە جوانی بە خوێنەری ناسیون.

ئەم کتێبە (بیرەوەرییەکانی تەیموری لەنگ بە قەڵەمی خۆی) تەنها یەك کتێب بووە بە دەسنووس‌و بە زمانی فارسی نووسراوەتەوە لەلای (جەعفەر پاشای سوڵتانی یەمەن)- ئەو کات یەمەن لەقەڵەم ڕەوی عوسمانیدا بووە - دانراوە، پاش مردنی جەعفەر پاشا نوسخەی ناوبراو لای جێماوانی جەعفەر پاشادا پارێزراو دەبێت. تا کاتێك (کاتبێك) نوسخەی لەبەر نوسیوەتەوەو بردوویەتی بۆ هندستان.

لە کۆندا لەبەر ئەوەی کتێب بە دەسنووس نووسراوەتەوە نرخی زۆر بووە، وەکو ئێستا نەبووە بکەوێتە دەست هەموو کەس.

ئەم کتێبە دوای ئەوەی برا بۆ هندستان، پاش ماوەیەك ئەفسەرێکی بەریتانی بردوویەتی بۆ ئیگلستان، ئێمە نازانین ئەو کتێبەی ئەفسەرەکە بردی نوسخە ڕاستەقینەکە بوو یان ئەوەی لەرووی نوسرابووەوە، پاشان لە بەریتانیا (دەیوی) بە هاوکاری پرۆفیسۆر (وایت) مامۆستای دانشگای (ئۆکسفۆرد) کتێبەکەیان وەرگێڕایە سەر زمانی ئینگلیزی‌و لە ساڵی ١٧٨٣ی زاینی بڵاویانکردەوە.

من لەبەر ئەوەی مامۆستای مێژوو نیم، تا ئێستا بۆم دەرنەکەوتووە ئایا نوسخە ئەصلیەکە کە دەسنووسەکەی لای جەعفەر پاشای یەمەن ماوە یاخود نە؟، ئەگەر مابێ تا ئێستا چاپ نەکراوە، وا ئێستا بە هەوڵی مارسل بریون ئەم کتێبە دەکەوێتە بەر دەست خوێنەرانی بەرێز.

مارسل بریون زمانی عەرەبی دەزانی‌و ئاشنای زمانی فارسی‌نی‌یە، ئەو سەرچاوانەی کە بە فارسی نووسراون‌و سوودی لێوەرگرتوون، لە کاتێکدا بووە

کە وەرگێڕاونەتە سەر زمانەکانی ئینگلیزیو فەرەنسیو ئەڵمانی، لەبەر ئەوەی من فارسی زمانم هەندێ سەرچاوەی مێژوویی وە زانیاریم کە لەسەرچاوەکانی فارسییەوە دەس کەوتووە خستووتە سەر ئەم کتێبە کەلە ناوەڕۆکە فەرەنسییەکەدا نییە.

جگە لە بیرەوەرییەکانی تەیموور بە قەڵەمی خۆی، مارسل بریون لەو زانیارییە زۆرەی کە لەمێژووی تەیموور هەندێ شتی زیاتری لەم کتێبەدا خستۆتە سەر.

مرۆڤ کاتێك ئەم بەسەرهاتە دەخوێنێتەوە ناتوانێ سەبارەت بە کەسایەتی تەیموور تێڕوانینێکی روونو ئاشکرا دیاری بکات، بەڵام دەبێ دان بەوە دابنرێت کە مرۆڤێك بووە ماندوو نەناس، کۆڵنەدەرو بێ وێنە لەمێژوودا.

بەڵام ئەگەر پاش خوێندنەوەی ئەم کتێبە نەتوانین تێڕوانینێکی روون لەسەر کەسایەتی تەیموور دیاری بکەین، ئەتوانین لە باتی ئەو دیاریکردنە زانیاری و شارەزایی بخەینە سەر ئەو زانیاریو شارەزاییەیکە هەمانە، هەر بۆیە خوێندنەوەی ئەم کتێبە تەنانەت بۆ مامۆستایانی مێژوو و خاوەن ئەزمونیش بەکەڵکە. هەر کەس لە هەر تەمەنێکدابێت بە خوێندنەوەی ئەم کتێبە کەڵك وەردەگرێت. ئەم کتێبە پاشکۆیەکی هەیە بە قەڵەمی قەشەی سوڵتانیە، کە سەبارەتە بە بیرەوەرییەکانی تەیمووری لەنگ.

زەبیحوڵڵای مەنصووری

پێشەکی چاپی دەهەمی فارسی

# یەکەمین بەش

## سەردەمی منداڵیو خوێندن لای شێخ شەمسەدین

باوکم ناوی (تەرقائی)یە، یەکێکبوو لە خاوەن زەویوزارە کەمدەرامەتەکانی شاری (کەش)، لەگەڵ ئەوەشدا خەڵکی ئەو شارە زۆر ڕێزیاندەگرت.

پێش لە دایکبوونم، باوکم خەوی دیبوو، پیاوێکی نوورانی بەرانبەری وەستاوە و شمشێرێکی داوەتە دەست باوکم .باوکم شمشێرەکەی لە پیاوەکە وەرگرتبوو، بەهەر چوارلادا هەڵیسوڕاندبوو، دوای ئەوەی خەبەریبووبووەوە .بۆ نیوەڕۆی ڕۆژی دوایی، وەك ڕۆژانی تر بۆ نوێژی نیوەڕۆ باوکم چووبوو بۆ مزگەوت، دوای تەواوبوونی نوێژ چووبووە لای ئیمامەکەوە، کە ناوی (شێخ زیدەدین) بووەو خەوەکەی بۆ گێرابووەوە. شێخ لە باوکمی پرسیبوو: لە چ کاتێکی شەودا ئەو خەوەت دیوە؟ باوکم لە وەڵامدا وتبووی: دەمەو بەیانی.شێخ وتبووی: لێکدانەوەی ئەو خەوەت بەم چەشنەیە، خوا کوڕێکت پێ ئەبەخشێ بە شمشێری خۆی دنیا دەگرێو دینی ئیسلام بەرفراواندەکات، وریابە، لە پەروەردە کردنی ئەو منداڵەدا کەمتەرخەمی نەکەی، زۆر چاك فێری قورئانخوێندنو دەرسو دەورو خەتی جوانی بکە!..

ساڵی دوایی من لە دایك بووم، باوکم بۆ هەڵبژاردنی ناوێك بۆ من چوو بووە لای ئیمامەکە، ئەویش وتبووی ناوی بنێ (تەیموور)، واتە (ئاسن).

باوکم دەیوت، ئەو ڕۆژەی من چووم بۆ مزگەوت، ئیمامەکە خەریکی خوێندنی سورەتی(المُلك) بوو، ئایەتی (١٦):﴿ءَاَمِنتُم مَّن فِي السَّماءِ أن يَخْسِفَ بِكُمْ الأرضَ فإذا هيَ تَمور﴾، وشەی (تَمور) بەواتای بوومەلەرزەو ڕۆچوون دێ، وتنەکەشی لە وشەی (تەیموور)ەوە نزیکە، بەو بۆنەیەوە (شێخ زەیدەدین) ناوی (تەیموور)ی بۆم هەڵبژاردبوو، یەکەمین یادگاری سەردەمی منداڵیم کەهەمیشە لە یادمە ئەمەیە: ڕۆژێکیان گوێم لێبوو دایکم بە باوکمی ئەوت: ئەم منداڵە چەپلەرەو بە دەستی چەپ کار دەکات!. بەڵام من زوو بۆم دەرکەوت کە نەڕاستەمو نە چەپەم، بەڵکو بە هەردوو دەست کار دەکەم!...

دوای ئـەوەی خرامـە بـەر خوێنـدن، بـە هـەردوو دەسـت دەمنووسـی. کـە گەورەشبووم ئەمتوانی بە هەردوو دەست شمشێر بوەشێنمو تیریش بهاوێژم.

ئـەمڕۆش کـە تەمـەنم گەیشـتۆتە حـەفتا سـاڵ بـۆ مـن ڕاسـتو چـەپ هیـچ جیاوازییـان نییـە. کـاتێك کـە خرامـە بـەر خوێنـدن ئـەوەندە بچکۆلـە بـووم، نەمئەتوانی مۆمەکە بەسەر تەختەکەی بەر دەستما بڵاوبکەمەوە. لە شـارەکانی (ماوەڕائەننـەهر)دا (ئۆزبەکسـتانی ئێسـتا) دابو نـەریت وابـوو، کـە قوتـابی دەخرایە بەر خوێندن کلۆیەك مۆمو تەختەیەکیان دەدایەو فێریاندەکرد کە چۆن مۆمەکە لەسەر تەختەکە بڵاوبکاتـەوە، بـە تواندنـەوە وەکـو پارچـە کاغـەزێکی باشی لێبکاتو بە قەڵەم لەسەری بنووسێ.

کـەڵکی ئـەو تەختەیـە ئـەوەبوو کـە کاغـەزی کـەم بـەکاردەهێنرا، قوتـابی دەیتوانی چەند جارێك ئەو مۆمە بتوێنێتەوەو بەکاریبێنێ. من نەمدەتوانی ئەو کارە بکەم، دایکم بۆمی جێبەجێدەکرد!...

یەکەمین مامۆستام پیاوێکبوو، ناوی (مەلاعەلی بەگ)بوو. قوتابخانەکە لە ناو مزگەوتی گەڕەکەکەماندا بـوو. هـەموو ڕۆژێ لـە کـاتی نوێـژی نیـوەڕۆدا خـەڵك ئەهاتن بۆ نوێژی جەماعەت. ئێمە منداڵبووین، نەمان ئەتوانی بێدەنگبین، جا بۆ ئـەوەی بیری جەماعـەت جـەنجاڵ نەکـەین، پشـوو یـەکیان دەدایـنێ. لەبـەر ئەوەی من زۆر منداڵبووم، هەندێ جار دایکم، یان کەسێکی تری خێزانەکەمان لە کاتی پشووەکەدا دەهـاتو دەیبردمـەوە. هـەندێ جاریش ئەیاندامـە دەسـت یەکێك لە قوتابییە گەورەکان تا دوای قوتابخانە دەستم بگرێ. چونکە ئێسترو ئەسپو حوشتری زۆر بەسەر شەقامو کۆڵانەکاندا هاتوچۆیاندەکرد. کە گەورە بوومو دەستەڵاتم گرتە دەست پایەو پلەیەکی باشم بەو کوڕە بەخشی.

مامۆستاکەمان زۆر پیر بوو، ددان لە دەمیا نەمابوو، لەبەر ئەوە نەیدەتوانی هەندێك وشە بە باشی بڵێ، بەم چەشنە هەموو قوتابییەکان، بەهەڵە هەندێك وشە فێر بووبووین. مەلا عەلی باوەڕی وابوو کە باشترین ڕێگەی فێر بوون تـەنیا هـەر دارەو بـە داریـش قوتـابیی فـێر دەکـرد! تاقـە قوتابییەکیشـی کـە داری بەرنەکەوتوبوو هەر منبووم، هەر چی دەوت یەکسەر فێر دەبووم، پێم سەیر بوو کە قوتابییەکانی تر وەکو من زووفێر نەدەبوون!

ڕۆژنکیان مەلاعەلی بە باوکمی وت: نرخی ئەم کوڕەت بزانە، چونکە سەرەڕای زیرەکییەکەی، بە هەر دوو دەست دەنووسێت! کەسێك بە هەر دوو دەست بنووسێ دەبێتە حوکمڕەوای ڕۆژهەڵاتو ڕۆژئاوا!...

وانە نووسینەوە بۆ قوتابی ئەرکێکی زۆر گرانبوو، بەڵام بۆ من زۆر ئاسانو خۆشبوو، لەماڵەوە هەر خەریکی نووسینەوەی وانە بووم. لە تەمەنی حەوت ساڵیما لە قوتابخانەی مەلا عەلی دەرهێنرامو برامە قوتابخانەیەکی تر، مامۆستا تازەکەم ناوی (شێخ شەمسەدین) بوو. لەبەر ئەوەی خۆی ناوی (شەمس)بوو، داب و حوڕەوشت وابوو لە سوورەتی (الشمس)ەوە منالّ فێری قورئانخوێندن بکات! هەر لە یەکەم ڕۆژدا ئەو سوورەتەم لەبەر کرد، مامۆستاکەم سەرسامبوو! ناردی بە دوای باوکماو پێی وت: بە درێژایی تەمەنم قوتابیم نەدیوە لەم کوڕەی تۆ زیرەکترو بە تواناتر بێت، هەر ئەمڕۆ سوورەتی (الشمس)ی لەبەرکردەوە!...
پاشان وتی: ئادەی ئەو سوورەتە بۆ باوکت بخوێنە. کە خوێندم، باوکم هەردوو دەستی بۆ ئاسمان بەرز کردنەوەو وتی: خوای گەورە، ئەم کوڕەم لە نەخۆشیی ئاوڵەو سووریژە بپارێزە؛ پاشان دەستیکرد بە گیرفانیداو دراوێکی خەستە ناو دەستی مامۆستاوەو وتی: ئەوەش دیاریی منە!

پاش ئەوەی حەفتەیەکم تەواو کرد ڕۆژێکیان مامۆستام لەهەموو قوتابییەکانی پرسی: باشترین شێوەی دانیشتن کامەیە؟! هەر یەکە وەڵامێکی دایەوە، کە نورە هاتەسەر من، وتم: چاکترین جۆری دانیشتن ئەوەیە کە مرۆڤ لەسەر ئەژنۆ دانیشێ. وتی: بەڵگەت چییە؟! وتم: موسڵمانان لە کاتی نوێژ کردندا لەسەر هەردوو ئەژنۆ دادەنیشن، ئەمەش نیشانەی ئەو پەری ڕێزو خوا پەرستییە لە ڕووی خوای گەورەدا. مامۆستا بە دەنگی بەرز سێ جار ئافەرینی لێمکرد!... دوای سوورەتی (الشمس)، بۆ ئەوەی زۆر ماندوو نەبم، مامۆستا سوورەتە کورتەکانی پێ لەبەر دەکردم، هەر سوورەتێکی یەك جار بۆ بخوێندمایەوە، یەکسەر لەبەرمدەکرد. تا من زیرەکترو، بە پەرۆشتر بوومایە بۆ فێربوون، مامۆستاکەم پتر پێی خۆشبوو. ڕۆژێکیان وتی: تەیموور، سوورەتی(یس) (٨٣) ئایەتە، بامن یەکجار بەوردی بۆت بخوێنمەوە، تۆش چەند جارێك بەباشی بەدوای مندا بیخوێنە، هەرچیت نەزانی من یارمەتیتدەدەم.

دوایی لێمی پرسی: ئەزانی واتای (یس) چییە؟ وتم: لەزمانی عەرەبیدا پیتی (یاء) بۆ ئاگادار کردنەوەیە، بەڵام واتای پیتی (سین) نازانم. ماموستا وتی: (سین) واتە مرۆڤ، بەڵام نەك هەموو مرۆڤێك، بەڵکو مرۆڤی تایبەت! وتم: من تا ئێستە نەمبیستووە پیتی (سین) واتای (مرۆڤ) بێت! وتی: ڕاستە، بەڵام ئەم پیتە یەکەم پیتی وشەی (سرە)یە، کە لە زمانی عەرەبیدا بە واتای گوڵو ڕێحانە دێت؛ خوا بە جۆرێ پێغەمبەری ئیسلامی (د.خ) خۆشدەوێت لێرەدا بە گوڵو ڕێحانە ناوی دەبات! دوای ئەوەی ماموستام واتای ئایەتەکەی بۆم لێکدایەوە، تەنیا یەك جار سوورەتەکەی بۆم خوێندەوە، قورئانەکەی خۆمم گرت بەدەستەوەو لەسەرخۆ دەستمکرد بە خوێندنەوە، پاش چەند جارێك سوورەتەکەم لەبەر کرد.

بەرنامەی ڕۆژانەم بەم جۆرە بوو: دوای نانی بەیانیان دەچوومە قوتابخانەو تا نیوەڕۆ دەمامەوە، دوای نوێژی نیوەڕۆ ڕێی بیابانم دەگرتە بەر.

هەموو جارێك باوکم دەیوت: ئێمە بنەماڵەیەکین هەموو پیاوانی جەنگاوەرو چەکدارو بەهێزن، تۆش دەبێ هەر بە منداڵی فێری هونەری جەنگ ببی! لە دەورو بەری شاری (کەیش)دا لەوەڕگەی فراوان هەبوون، کە ڕەوە ئەسپو ماینیی تێدا دەلەوەڕان، ئێمەش ڕەوە ئەسپێکی بچووکمان هەبوو. کە منداڵبووم یەکێك لە تەکما ئەهاتو فێریدەکردم کە چۆن سواری ئەسپی نیوە یاخی ببم. فێریدەکردم کە نابێ لە دواوە بچم بۆ لای ئەسپی یاخی چونکە جووتە ئەهاوێ، نابێ لە پێشیشەوە بچم چونکە قەپدەگرێ. دەیوت: لە لای چەپەوە، یان ڕاستەوە بچۆ، بەدەستی ڕاست، یان چەپ توند یاڵی ئەسپەکە بگرە. ئەسپ کە یاڵیت گرت لە ڕادەبەدەر غاردەدات، بۆ ئەوەی ئەو کەسەی دەیەوێت سواریبێ بکەوێت؛ کە یاڵییشت گرت نابێ بەریبدەیت تا خۆت هەڵدەدەیتە سەر پشتی، کە سوار بووی هەر دوو ئەژنۆت لەلا قەبرخەی توند بکە تا لەنگەرت ڕێکبێ، ئینجا ئەگەر یاڵی بەردەیت، کە زۆر غاریکردو زانی ناکەویت، هێمنو هێور دەبێتەوە!...

پاش ئەوەی چاك فێری سواری بووم، ڕاهێنەرەکەم فێری تیر هاویشتنی کردم، پاشان فێریکردم کە بە سواریش تیر بهاوێژم، دواتریش ڕاهاتم کە بە هەموو لایەکا تیر بهاوێژمو چاك نیشان بپێکم، بەڵام لەبەر ئەوەی بازووم لاواز

بوو، تیرم کەم بڕی دەکرد، ڕاهێنەرەکەشم هەمیشە هەر هانیدەدامو دەیوت: کە بازووت بەهێز بوو، تیریشت زۆر بڕدەکات.

ڕۆژێکیان وەکو ڕۆژانی دیکە چووم بۆ بیابانو تا ئێوارەیەکی درەنگ سەرقاڵی سواریو ڕمبازیو تیر ئەندازی بووم، کە گەڕامەوە ماڵێ، دوای نانخواردنو نوێژی شێوان خەوتم. بۆ ڕۆژی دوایی مامۆستا لێمی پرسی: ئایا ئەتوانی بە باشی سوورەتی(یس) بخوێنی؟! وتم: مامۆستا، بە تەواوەتی سوورەتەکەم لەبەرە!.. کاتێ لەبەر بۆم خوێند، بۆ دووەم جار سێجار وتی: زۆر باشە، ئافەرین.

دوای سێ ساڵ هەموو قورئانم لەبەرکرد. ڕۆژێکیان مامۆستاکەم لەناوقوتابخانەدا میوانداریی هەندێك زاناو خانەدانو پیاوماقووڵانی شاری کردبوو، باوکیشم یەکێکبوو لە میوانەکان. مامۆستا داوای لە زاناکان کرد کە تاقیمبکەنەوەو بزانن قورئانم لەبەرە، یان نا. سیان لە زاناکان چەند سوورەتێکی قورئانیان ناوبردنو منیش بە دەنگی بەرز هەر هەموویانم خوێندن، هەموویان پێیان خۆشبوو، ئافەرینیان لێکردمو نازناوی (حافظ قورئان)یان لێنام، واتە لەبەرکەری قورئان!...دوای تەواو بوونی کۆڕی میوانداری، (شێخ شەمسەددین) بە باوکمی وت: ئەوەی لە توانای مندا بوو بە کوڕەکەتم وت: وفێرمکرد، جا دەبێ مامۆستایەکی وای بۆ هەڵبژێری کە فێری زانستی مرۆڤو خواییو نهێنیی گەورەی زانیاریی بکات!...

بەو بۆنەیەوە کە قوتابخانەی شێخ شەمسەدینم تەواو کرد، باوکم ئەسپو ماینێیکی ڕەسەنی پێبەخشی. دوای چەند ڕۆژێك برامە قوتابخانەی مامۆستا (عەبدوڵلاقوطب)، ئەم مامۆستایە زۆر پایە بەرزو زاناودانا و خواناسبوو. هەندێك لە کوڕانی پیاوماقووڵانی شار لەو قوتابخانەیەدا دەیانخوێند. دەبێ ئەوەش بڵێم، منیش ڕۆژ بە ڕۆژ تەمەنم هەڵدەکشاو قوزترو جوانتر دەبووم، کە بووم بە چواردە ساڵ، لە ناو خەڵکدا بە قوزترین کوڕی (ماوەڕائەننەهر) ناو دەبرام.

یەکێك لە قوتابییە لاوەکانی قوتابخانەکەمان، ناوی (یولاش) بوو، لە تورکەکانی ڕۆژهەلاتی (ماوەڕائەننەهر) بوو. بۆم دەرکەوت ئەو تورکانە هەندێکیان نیشتەجێی شارەکەی ئێمەنو لە خەڵکی‌تر جیاوازو سەرەڕۆن؛ لە هەڵسوکەوتی ئەم کوڕەدا پتر ئەم باسەم بۆ روونبووەوە. هەر کە قوتابخانە

بوو، تیرم کەم بڕی دەکرد، ڕاهێنەرەکەشم هەمیشە هەر هانیدەدامو دەیوت: کە بازووت بەهێز بوو، تیریشت زۆر بڕدەکات.

ڕۆژێکیان وەکو ڕۆژانی دیکە چووم بۆ بیابانو تا ئێوارەیەکی درەنگ سەرقاڵی سواریو ڕمبازیو تیر ئەندازی بووم، کە گەڕامەوە ماڵێ، دوای نانخواردنو نوێژی شێوان خەوتم. بۆ ڕۆژی دوایی مامۆستا لێمی پرسی: ئایا ئەتوانی بە باشی سوورەتی(یس) بخوێنی؟! وتم: مامۆستا، بە تەواوەتی سوورەتەکەم لەبەرە!.. کاتێ لەبەر بۆم خوێند، بۆ دووەم جار سێجار وتی: زۆر باشە، ئافەرین.

دوای سێ ساڵ هەموو قورئانم لەبەرکرد. ڕۆژێکیان مامۆستاکەم لەناوقوتابخانەدا میوانداریی هەندێك زاناو خانەدانو پیاوماقووڵانی شاری کردبوو، باوکیشم یەکێکبوو لە میوانەکان. مامۆستا داوای لە زاناکان کرد کە تاقیمبکەنەوەو بزانن قورئانم لەبەرە، یان نا. سیان لە زاناکان چەند سوورەتێکی قورئانیان ناوبردنو منیش بە دەنگی بەرز هەر هەموویانم خوێندن، هەموویان پێیان خۆشبوو، ئافەرینیان لێکردمو نازناوی (حافظ قورئان)یان لێنام، واتە لەبەرکەری قورئان!...دوای تەواو بوونی کۆڕی میوانداری، (شێخ شەمسەددین) بە باوکمی وت: ئەوەی لە توانای مندا بوو بە کوڕەکەتم وت: وفێرمکرد، جا دەبێ مامۆستایەکی وای بۆ هەڵبژێری کە فێری زانستی مرۆڤو خواییو نهێنیی گەورەی زانیاریی بکات!...

بەو بۆنەیەوە کە قوتابخانەی شێخ شەمسەدینم تەواو کرد، باوکم ئەسپو ماینێیکی ڕەسەنی پێبەخشی. دوای چەند ڕۆژێك برامە قوتابخانەی مامۆستا (عەبدوڵلاقوطب)، ئەم مامۆستایە زۆر پایە بەرزو زاناودانا و خواناسبوو. هەندێك لە کوڕانی پیاوماقووڵانی شار لەو قوتابخانەیەدا دەیانخوێند. دەبێ ئەوەش بڵێم، منیش ڕۆژ بە ڕۆژ تەمەنم هەڵدەکشاو قوزترو جوانتر دەبووم، کە بووم بە چواردە ساڵ، لە ناو خەڵکدا بە قوزترین کوڕی (ماوەڕائەننەهر) ناو دەبرام.

یەکێك لە قوتابییە لاوەکانی قوتابخانەکەمان، ناوی (یولاش) بوو، لە تورکەکانی ڕۆژهەلاتی (ماوەڕائەننەهر) بوو. بۆم دەرکەوت ئەو تورکانە هەندێکیان نیشتەجێی شارەکەی ئێمەنو لە خەڵکیتر جیاوازو سەرەڕۆن؛ لە هەڵسوکەوتی ئەم کوڕەدا پتر ئەم باسەم بۆ روونبووەوە. هەر کە قوتابخانە

تەواو دەبوو، خۆی ئەگەیاندە لامو چەند وشەیەکی وای بە زاردا دەهاتن، پێم شەرمە بیانگێڕمەوە. چاك دەمزانی کە یاسای باپیرە گەورەم (جەنگیزخان) بەرانبەر بە نیازی گڵاوی یولاش کوشتنەو دەبێ سەری لە لەشی جیا بکرێتەوە!...

{ڕوونکردنەوە: تەیمووری لەنگ وەچەی جەنگیز خان نەبووە، تەنها بۆ شانازی، خۆی وا ناساندووە. یاسای جەنگیزخانیش هەر ئەوە بووە کە خۆی داینـاوە دوای خۆیشی هەر یەکە لە کوڕەکانی لە قەڵەمڕەوی خۆیدا پەیرەویدەکرد.((وەرگێڕی فارسی))}

چەند جارێك هەڕەشەم لە یولاش کرد کە وازبێنێ، ئەگینا سەرەنجامی کوشتنە، بەڵام ئەو بە جۆرێك سووربوو، تەنانەت هەندێ لە قوتابییەکان لە مەبەستی گەیشتبوونو چاوەڕێی ڕقهەستانی من بوون. ڕۆژێکیان، لە دوای گەڕانەوەمان لە قوتابخانە، یولاش لەوانی تر جیا بووەوەو خۆی گەیاندە لای من، ئەیزانی ڕوودەکەمە بیابان بۆ سواریو تیرهاویشتنو شمشێر بازیو ڕمبازی. لە نزیك ئەو لەوەڕگەیەوە کە ڕەوە ئەسپ و مایینەکەی ئێمەی لێبوو، خانوچکەیەك هەبوو، کەلوپەلو پێداویستی خۆمم لەوێ دادەنان. هەرکە گەیشتمە ئەوێ تیروکەوانم لە خۆم بەستو ویستم بەرەو ڕەوەکەمان بڕۆم، سواربمو مەشقی ئەوە بکەم کە بە سواریو لە گەرمەی غاردا ڕوو بۆ دواوە وەرچەرخێنمو تیر بهاوم. لەم کاتەدا یولاش ڕوو بەڕووم هاتو وتی: تەیموور، بۆچی سەبارەت بە من بێ سۆزی؟! ئەی نازانی من چەندە تۆم خۆش ئەوێ! لەناو هەموو قوتابییەکاندا تەنیا تۆم هەڵبژاردووە! تۆ دەبێ لەگەڵ مندا، کە باوکم(خان)ە، کاتی خۆش بەسەربەریو..... نەمتوانی بواری بدەم لەسەری بڕوات، تیرێکم گرتە سنگی،بەپشتا کەوتودەمی نەکوتاو مرد.

یەکەم کەسێك کە کوشتم یولاش بوو! بێ ئەوەی بترسم، یان خەمباربم، ماوەیەك لە لای لاشەکەیدا وەستام، هیچ پەشیمانیش نەبووم، چونکە ئەگەر ئەو جۆرە قسانەی لەگەڵ مندا نەکردنایە نەمدەکوشت! پاشان بە پێویستم زانی باوکم ئاگادار بکەم، کاتێ کە پێم وت، تێکچوو، وتی:کارێکی خراپت کردووە چونکە باوکی داوای خوێنی دەکات! وتم: ئایا تۆ قایلدەبیت کە تورکێکی ڕۆژهەڵاتی (ماوەرائەننەهر) ئەو جۆرە قسانە لەگەڵ کوڕی تۆدا بکاتو کوڕەکەشت هیچ گوێ نەداتیو پێیان قایلبێ؟! باوکم وتی: نەخێر، بەڵام ئەگەر

تۆ پێشتر بە منت بوتایە، منیش باوکیم ئاگادار دەکرد کە کوڕەکەی تەمێبکات، بەڵام ئێستا هیچ چارەیەکمان نییەو دەبێ خۆمان ئامادە بکەین بۆ تۆڵەی باوکی یولاش!.. وتم: بابەگیان، هەندێك لە قوتابییەکان ئاگادارن، دەزانن چەند دڕندە بوو، هەر هەموویان ڕقیان لە من دەبووەوە کە ئەوەندە خۆم دەگرتو بە سزای خۆیم نەدەگایاند! باوکم وتی: ئەگەر ئەوان گەواهی بدەن کە یولاش تاوانکارە، باوکی ناتوانێ تۆڵەمان لێبکاتەوە.

یەکەم کەس کە دەربارەی کوشتنی یولاش لێکۆڵینەوەیکرد، مامۆستاکەمانبوو.دوو بە دوو پرسیاری لێمکردو منیش بە ڕاستی وەڵاممدایەوە. پاشان پرسیاریکرد: ئایا هیچ کەس لە نیازی گلاوی ئەو ئاگادار بوو؟! منیش ناوی هەندێك قوتابیم هێنا. لەدوای لێکۆڵینەوە لەگەڵیاندا مامۆستا بڕیاری دەرکرد کە من لە کوشتنی یولاشدا گوناهبار نیمو ئەو لاوەش بە گوێرەی یاسای جەنگیزخان شیاوی کوشتنبووە.پاشان مامۆستاکەمان لەگەڵ داروغەی شاردا وتووێژیکرد، ئەویش دوای لێکۆڵینەوەی زۆرو گوێگرتن لە گەواهەکان، بڕیاریدا کە بە پێی یاسا ئەو کوڕە شیاوی کوشتنبووە! باوکی یولاشیشی ئاگادار کرد، کە ناتوانێ داوای خوێن بکات! بەناچاری باوکی یولاش دەسبەرداری داواکردنی خوێن بوو، بەڵام تا دوا ڕۆژی ژیانی هەر بە چاوی دوژمنکاری دەیڕوانیە ئێمە... هەمیشە دەمزانی بۆ هەلێك دەگەڕێ من بکوژێ، بەڵام ئەو هەلەی بۆ هەڵنەکەوت، لەگەڵ تێپەڕ بوونی ڕۆژگاردا من بەهێزترو قۆزترو جوانتر دەبوومو هەستمدەکرد کە تایبەتمەندییەکم تیایە لە خەڵکی تردا نییە!.

## دووەمین بەش

## سەرەتای لاوی‌و پێشکەوتنی هونەری جەنگ

کە بووم بە شازدە سالان، هیچ کام لە هاوتەمەنەکانم لە تیرهاویشتنا نەیاندەتوانی بەرەنگاریمبکەن. کاتێ تیرم بەرەو ئاسمان بهاویشتایە لە چاو وندەبوو!!، پاش ماوەیەك وەختێ دەکەوتەوە سەر زەوی. گەلێ بەوە دلّم خۆش دەبوو، زۆر جار سێ ئەسپم لە پالّ یەکتردا‌و لە یەك کاتدا پێکەوە تاو دەدا و لە گەرمەی غاردا لەسەر ئەم ئەسپەوە خۆم هەلّدەدایە سەر ئەوی ترو لەو سەریشەوە دەگەڕامەوە سەرپشتی یەکەم ئەسپ. کاتێك کە ئەسپەکانمان لە دەشت‌و دەر بەربدانایە، پێویستیان بە نالّکردن نەبوو، بەلاّم کە دەمانگرتنەوە بۆ سواری‌و بار، دەبوو نالّیانبکەین. من بۆ خۆم بە بێ یاریدەی هیچ کەس دەمبەستنەوە‌و نالّمدەکردن، بێجگە لە من هیچ سوارێك نەیدەتوانی ئەم کارەبکات!

یەکێکی تر لە هونەرە دلّخۆشکەرەکانم ئەوەبوو کە لە گەرمەی غاردا لەسەر زینەکە دەردەچووم‌و لەلای ڕاست، یان چەپی ئەسپەکەوە چاك خۆم دەگرت، بەمەش لە کاتی جەنگدا خۆم لە تیری دوژمن دەپاراست. زۆر جار ئەسپەکەم دەکوژرا، بەلاّم خۆم سەمەلاتدەبووم. لە هونەری مەلەوانیشدا زۆر کارامەو مامۆستا بووم، تەنانەت لە گەرمەی لافاوو هەلّچوونی ڕووباری (جەیحوون)دا، کە هیچ مەلەوانێك نەیدەوێرا توخنیبکەوێ، من لێمدەداو دەمبڕی! یەکێکی تر لە هونەرەکانم کەمەندهەلّدانبوو، لەکێوو دەشتەکاندا کام ئەسپەی زۆر کێوی‌و سەرکەشبوو، دەمتوانی بە کەمەند بیگرم‌و بیبەمەوە بۆ شار. لە شازدە سالّیدا دەستم لە هەموو زانستێکدا هەبوو، تەنیا لە پزیشکی‌و ئەستێرەناسیدا هیچ

شارەزاییم نەبوو، ئێستاش کە تەمەنم لە حەفتا ساڵ تێپەریوە، هیچ زانیارییەکم لەو دووانەدا نییە. شازدە ساڵانم تەواو کردبوو،

ڕۆژێکیان باوکم بردمی بۆ سەرگۆڕی باپیرم، وتی: تەیموور، ئێمە لە بنەماڵەی (جغتائی)ین و باوو باپیرانمان دەچنەوە سەر (یافت) کوری (نووح) پێغەمبەر. یەکەمین کەسێك لە باپیرانمان کە ئیسلامبووە ناوی (کراشەر_نویان) بووەو زاوای (جغتائی) بووەو بە(گورگان) ناویانبردووە، واتە (زاوا)، ئەم نازناوە بۆ منیش ماوەتەوەو دوای منیش نازناوی (گورگان) بۆ تۆ دەمێنێتەوە. باوکم زۆر ئامۆژگاری کردم و وتی: ئەم جیهانە جامێکی ئاڵتوونەو پڕە لە دووپشك‌ومار، بەشی هەر کەسێك لەم جامە زێڕەدا هەرپێوەدانی دووپشك‌و مارە. خۆشی و مزگێنی لەوانەی کە هەر چاکە دەکەن‌و لەدوای خۆیشیان هەر چاکە بەجێدەهێڵین!.. هەر ئەو ڕۆژە پەیمانمدا بە باوکم هەمیشە پەیرەویی دینی (موحەممەد_د.خ) بکەم، ڕێز لە زانایانی ئایین بگرم، بە پێی توانا مزگەوت‌و قوتابخانە دروستبکەم‌و سامانم تەرخانبکەم بۆ بەرژەوەندییان. پاش هەڵوێستەیەك باوکم وتی: تەیموور، هەرچەندە بە تەمەن بچووکی لەگەڵ ئەوەشدا بە تەواوی وەکو پیاوێکی بیست ساڵانەی، نامەخوا سەرم ناگاتە شانت، ناوشان‌و سنگپانی، بازووت زۆر بەهێزە، ئیتر کاتی ئەوەت هاتووە ژن بێنیت‌و وەچەت لێبکەوێتەوە. وتم: بابەگیان جارێ هەموو مەراقێکم ئەوەیە کە بە باشی فێری زانیاری‌و شمشێربازی‌و ڕمبازی‌و تیرەندازی ببم، بەڕاستی ئەوەندە ماوەم نییە کە بیر لە ژنهێنان بکەمەوە!... باوکم وتی: ئەوانە بە جێی خۆیان‌و ژنهێنانیش بە جێی خۆی، پیاو دەبێ بە گەنجی ژن بهێنێ تاکو منداڵەکانی گەنجزادە بن!..

من وای بۆ دەچووم گەر پیاو ژن بێنێ هێزی کەمدەکات، لەبەر ئەوە تکام لە باوکم کرد کە دووساڵی تر لێم بوەستێ. دواتر لە گفتوگۆیەکدا لە تەك قەشەیەکدا بۆم دەرکەوت کە هەڵەبووم، ژنهێنان هیچ لە هێزکەم ناکاتەوە. کە

شازدە ساڵانم تەواو کرد، چووم بۆ شاری (سەمەرقەند)و پەیوەندیم لەتەک (میری کەلال)دا پەیدا کرد، ئەم پیاوە لە زانستدا میر بوو، لەم بوارەدا بە میرو پیر دەزانراو کەڵکی زۆری لێوەدەگیرا.

بەر لە رۆیشتنم مامۆستا (عەبدوڵلاقوطب) نامەیەکی دامێ بۆ میری ناوبراو بۆ ئەوەی باشتر پێشوازیم لێبکات؛ تەمەنی میر نزیکەی هەشتا ساڵدەبوو، ریشی سپیو زۆر درێژ بوو، چاوەکانی زۆر گەشو پڕ لە خۆشەویستیبوون. کە نامەکەی خوێندەوە داوای لێمکرد کە بچمە تەنیشتیەوە بۆ ئەوەی باشتر بمبینێ، ئینجا وتی: تەیموور، من ناوی باوکتم بیستووە، بەلام نەمدیوە. عەبدوڵلا قوطب وای نوسیوە کە تۆ هەموو قورئانت لەبەرە، هەروەها گەلێك هۆنراوەی شاعیرە ناودارەکانی عەرەبو فارست لەبەرە. وتم: بەڵێ وایە، خوای مەزن توانایەکی وای داومەتێ تەنیا یەك جار هەر هۆنراوەیەك بخوێنمەوە بە تەواوەتی لەبەریدەکەم.!! پاشان پرسی ئایا لە هۆنراوەی (ئەعشا)شتێك دەزانی؟ وتم: نەخێر، هیچم لەبەرنییە، چونکە ئەم شاعیرە عەرەبە سەراپا هۆنراوەکانی هی دڵداریو خۆشەویستیو منیش حەز لەو جۆرە هۆنراوانە ناکەم. وتی: تۆ لاوێکی لێهاتووی، نابێ رقت لەو جۆرە هۆنراوانە بێت، چونکە بە هۆیانەوە شاعیرەکان نهێنیی خواپەرستی دەردەبڕن، چاو، برۆ، مەیو ئەشق چەند وشەیەکن بۆ دەرخستنی نهێنیی خواناسی، بە شێوەیەك کە تەنیا پێشیاوانی ئەم ڕێبازە تێیدەگەن، پێنە شیاویش هەرگیز تێ ناگات.

پاشان (میر) هۆنراوەیەکی (ئەعشا)ی خوێندەوە کە دە دێربوو، داوای لێمکرد هۆنراوەکە بڵێمەوە، منیش بە بێ وەستان هەموویم خوێندەوە. یەکێك لە ئامادەبووان وتی: پێم وایە ئەم لاوە ئەم هۆنراوەیەی بیستووە، ئیستا من هۆنراوەیەکی نەبیستراوی عەرەبی دەخوێنمەوە، ئەگەر ئەم لاوە بە یەك جار لەبەریبکات، دیارە خاوەن بیرو هۆشێکی زۆر بالایە. هۆنراوەکەی خوێندەوە، تەنیا حەوت دێر بوو، منیش دەمودەست دەقاودەق وتمەوە، کۆڕەکە

بێدەنگبوو!... میر دەستێکی خستە سەرسەرەو بە وردی تێمی ڕووانی، ڕوویکردە کۆڕەکە وتی: من لە نێوچەوانی ئەم لاوەدا نوورێکی مەزن بەدیدەکەم، ئەم لاوە دەگاتە پلەو پایەیەکی وا کە هیچ کەس بە دەستی نەهێنابێ، من تا ئەو کاتە نامێنم، بەلاّم ئێوە دەمێنن ئەبینن‌و ئەبیستن ئەم لاوە کە ناوی تەیموورە، جیهان دەگرێت!

دوای ئەوە (میر) بە نۆکەرەکەی خۆی وت: کە حەوت کولیچە بێنێ، کولیچەکان لەناو توورەکەڵەیەکابوون، میر وتی: کە گەڕایتەوە شاری (کیش) لە هەر یەکەیان تۆسقاڵێك بخۆو ئەوی مایەوە هەڵیگرە، من پێشبینیدەکەم کە حەوت قەڵەمڕەوی جیهان گوێڕایەڵی فەرمانی تۆ دەبن. میری کەلال لە ساڵی (٧٥٢)ی کۆچیدا ئەم پێشبینیەیکرد، منیش باوەڕم نەدەکردوا دەرچێ. هەرکە گەیشتمەوە ماڵێ، باوکم وتی: میری کەلال پیاوێکی مەزن‌و پیرۆزو خاوەن کەرامەتە، چی وتووە وابکە. ئێستا بۆم دەرکەوتووە کە میر ڕاستی وت، واحەوت قەڵەمڕەی جیهان گوێڕایەڵی منن!

باوکم مامۆستایەکی بۆ ڕاگرتم کە بە باشی فێری شمشێربازیم بکات، ناوی (سەمەرطهرخان) بوو. هەر لە یەکەم مەشقدا بۆم دەرکەوت شێوازی تایبەتمەندی خۆی هەیە، بە پەتێکی درێژو قاییم دەستی ڕاستمی بەست بە لەشما، پاشان وتی: تەیموور تۆ ئێستا دەستی چەپت هەیە، هەر جەنگاوەرێك دەستی ڕاستی زامدار بێ‌و لە کار بکەوێ، وەك مردوو وایە، دیارە ئەگەر جەنگاوەر هەردوو دەستی بەکار بێنێ وەکو دوو نەفەر وایە. مامۆستاکەم چاك ڕایهێنام بۆ بەکار هێنانی دەستی چەپ، دواتر لە گۆڕەپانی جەنگدا، بەهۆی ئەم هونەرەوە، گەلێ جار لە مردن ڕزگار دەبووم.

کە بە پلەو پایەی خۆم گەیشتم ئەو مامۆستایەم ئەوەندە پیربوو بووددان لە دەمیا نەمابوو، منیش زۆر بەسەرمکردەوەو مووچەی باشم بۆ تەرخانکرد، لە هەمان کاتدا هەموو مامۆستاو هاوڕێ کۆنەکانم لە یاد نەچۆوە، کارو مووچەی

باشم دانیٚ. هەرگیز بە بیریشما نەهاتووە کە تۆڵە لە دوژمن‌و ناحەزانی سەردەمی هەرزەکاریم بکەمەوە؛ لەبەرئەوەی ئەوەندە دەسەڵاتدار بووم، بەزەبوون‌و داماو دەهاتنە بەرچاوم‌و پێم جوان نەبوو کە تۆڵەیان لێبکەمەوە.

مامۆستای شمشێربازییەکەم لە کاتی ڕاهێناندا، بۆماوەی یەك ساڵ دەستی ڕاستمی بەلەشمەوە دەبەست، تاوام لێهات کە دەستی چەپم باشتر بەکار بێنم.

تەمەنم گەیشتە (٤٦) ساڵ، ڕۆژێکیان لە نزیك شاری (ئەنگوریە)،- ئیستا پێی دەوترێ (ئەنکارا-)، لەشکری من‌و لەشکری سوڵتانی عوسمانی (بایەزید) بەرانبەر وەستاین. هەواڵم نارد بۆ (بایەزید) کە شەڕی نەفەر بە نەفەر بکەین، هەر کەس کوژرا لەشکرەکەی دەسگیربێ. دڵنیابووم کە بەسەریا سەردەکەوم و دەیکوژم، چونکە ئەو تەنها هەر بە دەستی ڕاستی شمشێربازیدەکردو من دوو شمشێرم بە دەستەوە بوو، بە هەر دوو دەست چاك شمشێرم دەوەشاند. (بایەزید) نەیوێرا بێتە مەیدان‌و ڕووبەڕوومبێتەوە.

سەرەڕای فێربوونی هەموو هونەرەکانی جەنگ، بە هیچ جۆرێك زانستم پشت گوێ نەخستبوو. دووکتێبی فارسیم تەواوکردن کە (مەثنەوی _ نووسینی جەلالەدینی ڕۆمی)وە (گوڵشەنی ڕاز _ نووسینی شێخ مەحمودی شەبستەری) بوون، هەردووکیان هۆنراوە بوون، هەرچەندە خوێندنەوەی (مەثنەو ی) بێزار بووم، کەچی بە پێچەوانەوە، (گوڵشەنی ڕاز)م پێ خۆشبوو، هۆنراوەکانی دەربارەی خواو ئەم دنیاو ئەو دنیا زۆر کاریان تێکردم؛ هەر لەبەر ئەمەشبوو کاتێك بە خوێن‌و ئاگر ئازربایجانم داگیرکرد، نەمهێشت دەست لە شاری (شەبستەر) بدرێت چونکە نووسەری (گوڵشەنی ڕاز) خەڵکی ئەو شارە بوو، ئەو ڕۆژەی من گەیشتمە شاری ناو براو، هەموو دانیشتووانی لە ترسی گیانیان هەڵاتبوون، منیش ناردم بە دوایاندا کە بگەڕێنەوە، سەرو ماڵ‌و ناموسیان پارێزراوە! خەڵك دەیانزانی میری ڕۆژهەڵات‌و ڕۆژئاوا ڕاستگۆیەو

پەیمانی خۆی دەباتە سەر، بەم جۆرە هەموویان گەڕانەوە سەر ماڵو حاڵی خۆیان.

بڕیارمدا كە سەرژمێرییەكی دانیشتووانی شاری (شەبستەر) بكرێ تا بزانم ژمارەی ئەوانەی تەمەنیان لە پانزە ساڵ زیاترە چەندە، پاشان دەركەوت كە(٣٨٩١) كەسن، منیش بڕیارمدا كە هەر یەكەیان (٥) مسقاڵ زێڕیان بدرێتێ؛ بەم جۆرە(١٩٤٥٥) مسقاڵ ئاڵتوون دابەشكرا بەسەریاندا!.. نەئەفسەرو سەربازەكانم، نەدانیشتووانی شار نەیاندەزانی لە بەرچی ئەو زێڕەم بەخشیوەتەوە، منیش بەكەسم نەوتبوو! بە تایبەتی نەزانان ئامادەنین لە مەبەستو نیازی دانایان بگەن... وا لێرەداو بۆ یەكەم جار هۆی دابەشكردنی ئەو ئاڵتوونە ئاشكرا دەكەم: كتێبی (گوڵشەنی راز) دەلاقەی بیرو هۆشمی والاو فراوانكردو هەندێك بابەتو باسو لایەنی نهێنیی پەندو زانیاری بۆ ئاسانكردم.

كە تەمەنمبوو بە (١٨)ساڵ، باوكم منی لە جێی خۆی داناو خانەنشینیی بۆ خۆی هەڵبژاردو هەموو كۆتایی تەمەنی بە خواپەرستی بردە سەر.

هەروەكو باسمكرد، باوكم لە دەرەبەگە بچووكەكانی شاری(كیش) بوو، سامانمان زۆر نەبوو، بۆیە لێبڕام بۆ زۆرتر كردنی سامانەكەمان، بە تایبەتی لە (سەعدی شیرازی) پەندم وەرگرتبوو، كە مرۆڤ تا دوا هەناسەی ژیانی دەبێ هەوڵبدات بۆ دارایی‌و سامانو فێر بوونی زانست، تاكو بە هۆی سامانەكەیەوە نەزانەكان رێزی لێبگرنو بە هۆی زانستو هونەریشەوە داناكان رێزلێنانی بە ئەرك بزانن. بۆ ئەوەی سامانی باوكیشم زۆر بكەم بە پێویستم زانی كەبچمە بارەگای یەكێك لە میرەكانی (ماوەرائەننەهر).

# سێیەمین بەش

## بەخزمەتگەیشتنی میری یاخماق

لەو سەردەمەدا فەرمانڕەوای شاری (سەمەرقەند) مێرێکی ناودار بوو، ناوی (میر یاخماق) بوو، تەمەنی حەفتا ساڵبوو، دوو کوڕی گەنجی بووبوون، هەر دووکیان کوژرا بوون، تەنها یەك برازای هەبوو، ئەشترسا کە بیکوژێتو تەختی فەرمانڕەوایی لێداگیر بکات.

(میر) باوکمی دەناسی، خەبەرم بۆ نارد ئەگەر حەزدەکات لە خزمەتیدابم، ئامادەم بۆ ڕاپەڕاندنی هەموو فەرمانێك. میر قایلبوو، کاتێ کە بینیمی سەرسامبوو، وتی: نەمزانیوە (تەرقائی) کوڕی وا جوانمەردو لێهاتووی هەیە! پاشان لێمی پرسی: تۆ لە چ کارێکا کارامەیت؟

وتم: لە بەکار هێنانی قەڵەمو/شمشێر وەشاندندا زیرەکم، ئەتوانم دیوانی بەڕێزتانوسوپاشتان بەڕێوەبەرم! دوای کەمێك سەرنجدان وتی: بۆ بەڕێوەبردنی دیوان هێشتا گەنجی، بەڵام دەتوانم کارو باری بەڕێوەبردنی سوپا بە تۆ بسپێرم.

بەم جۆرە لە تەمەنی (١٩) ساڵیمدا بووم بە لێپرسراوی بەڕێوەبردنی سوپای میر. فەرمانداەی لەشکری میر پیاوێکی قەڵەو بوو ناوی (قولورکەمال) بوو، وادیار بوو کە تەمەنی لە پەنجا ساڵ تێپەڕیکردبێ، کە زانی میر ئەو بەرپرسیارییەی پێسپاردووم، تەماشایەکیکردمو پێکەنی، جا ڕوویکردە سەربازەکانیو وتی: (میر یاخماق) کوڕێکی پر چدرێژی بۆ ناردووین بۆ ئەوەی لە گەڵیا چاك ڕابوێرین!!...

شمشێرم لە کێلان دەرهێناو هاوارمکرد: هەر ئێستا کە پێتی دەسەلمێنم کە من کوڕێکی پرچدرێژ نیمو دەتوانم سزای جنێودەر بدەم! کە هێرشمکردە سەری، ترسی لێنیشتو زانی گیانی لەمەترسیدایە، ئەویش شمشێری هەڵکێشاو بەرەنگارمبووەوە، بە جۆرێ لە سەرخۆ دەجووڵا، دڵنیا بووم دەیەوێت بمکوژێت. بەلای چەپا شمشێرێکم بۆ لاملی داهێنایەوە، تا سەر ئێسقان ملو قوڕقوڕاگەو شادەماری بڕییەوە! دەمودەست کەوتو خوێن لە ملیەوە وەك جۆگە لە دەرێیشت، دوای چەند چرکەیەك مرد. شمشێرە خوێناوییەکەم بە جلەکانی سڕیو پاکمکردەوەو خستمەوە کێلان، ڕوومکردە سەربازەکانو وتم: من (تەیموور)م، کوڕی (تەرقائی)، خەڵکی شاری (کیش)م، لە ئێستاوە من فەرماندەی لەشکرو ئێوەشم، هەر کەس سەرپێچی بکات بەم شمشێرەم دەکوژرێت! سەربازەکان سەیری یەکتریان کردو بێ دەنگ بوون؛ زانیم کە فەرماندەییم جێگیر بووە!

ڕەنگە هەبن کە ڕەخنەم لێبگرن، بۆ پاراستنی ناموسی گەنجە قۆزو جوانەکان زۆر توندڕەوم، هەر کەس بەرانبەر هەر کوڕێکی گەنجو جوان ڕەوشتی ناشیرین بنوێنێ دەبێ بکوژرێت! ئەم توندڕەوییەشم لەوەوە هاتووە لە سەردەمی لاویما بۆم دەرکەوتو تێگەیشتم کە جوانی یەکێکە لە تایبەتمەندییەکانی خوای گەورە. لە سنوورو قەڵەمڕەوی حکومڕانیمدا هەموو گەنجێکی جوانو قۆز بە ئاسوودەییو لە باوەشی ئاسایشدا دەژیا. ئەو ڕۆژەی کە من (قولور کەمال)م کوشت، (میر یاخماق) ناردی بە دواماو پیرۆزبایی لێمکردو وتی: تۆ منت لە دەست پیاوێکی تێکدەرو ناپەسەندو نالەبار ڕزگار کرد. منیش وتم: میرم، سوپای بەڕێزتان زۆر نارێکو بێ سەرو شوێنە، ڕێمبدە کە بە شێوەیەکی نوێ ڕێکوپێکی بکەم! میر وتی: چی بە چاك ئەزانی بیکە!..

منیش هەر دەسەربازم کردنە یەکو یەکێکم کردە لێپرسراویان کە پێی دەوترا (ئونباشی)، هەر دە دەستەم کردنە سەد کەسو لێپرسراوەکەیان پێی

دەوترا (یوز باشی)، وە هەر هەزار سەربازم خستنە ژێر فەرماندەیی یەك کەسەوە پێی دەوترا (مینباشی). پێش من سوپای میر کە سەرانسەر بە ناو سوارەبوو بێجگە لە خواردنو خەوتن هیچ کارێکی تری نەبوو، من بڕیارمدا کە ڕۆژانە سەربازەکان لە بیاباندا مەشقبکەنو نوێژەکانیشیان لە یاد نەکەن. بەم جۆرە لە ماوەی دوو حەفتەدا پێشکەوتنی زۆر چاك بەدیکرا.

دوای مانگێك چووم بۆ سەردانی میر، بینیم هەندێ لە پیاوەکانی لە بیابانەوە بە گریانەوە هاتنە بارەگای میرو دادو فەریادیانبوو لە دەست خێڵی (قەرەخەتائی) کە لە باکووری سەمەرقەندا نیشتەجێبوون، هێرشیان کردبووە سەریان، شەش هەزار مەڕیان بە تالان بردبوونوسێ شوانیشیان لێکوشتبوون. منیش داوام لە میر کرد کە ڕێمبدات بڕۆم جەردەکان بگرمو بە سزای خۆیانیان بگەیەنمو مەڕو ماڵاتەکەش بهێنمەوە! میر وتی: تەیموور، پیاوانی خێڵی (قەرەخەتائی) زۆر خەتەر ناکنو ژمارەیان لە بیست هەزار پترە! وتم: ئەگەر بەڕێزتان قایلبن دووسەد کەس لەگەڵ خۆمدا دەبەمو هەموو مەڕەکانیان لێدەسەنمەوەو ئەیانهێنمەوە. میر وتی: دەتەوێ بە دوو سەد سوارەوە بچی بەگژ بیست هەزار جەنگاوەردا؟! وتم: بۆ سزادانی جەردەکانو گەڕاندنەوەی مەڕەکان دووسەد کەس بەسە!..

هەر هەمان ڕۆژ کەوتمە ڕێ، دوای بڕینی بیست قۆناخ، گەیشتمە قەڵەمڕەوی خێڵی (قەرەخەتائی) داوامکرد کە چەند پیاو ماقووڵێکیان بێن، کە کۆبوونەوە،پێیانم وت: من سەر لەشکری (میریاخماق)م، هەندێك لە پیاوەکانی خێڵی ئێوەشەش هەزار مەڕیان دزیوە و سێ شوانیشیان کوشتووە، داواتان لێدەکەم کە مەڕەکانم پێبدەنەوەو جەردەکانیشم پێبناسێنن!... لە وەڵاما وتیان: ئەم خێڵە یازدە تیرەیە، ئێمە نازانین کام تیرە ئەم کارەی کردووە! وتم: ڕەنگە لە هەر تیرەیەك هەندێك دز هەبن! بێ گومان ئێوە جەردەکان دەناسن،

داواتان لێدەکەم پێم بڵێن کێنو هیچ کارێکم لەگەڵ ئێوە دانییە. هەموویان وتیان : ئێمە جەردەکان ناناسین!

زانیم کە ناوو جێگەی جەردەکان وابە ئاسانی لەو پیاوانە وەرناگیرێن، وتم: ماوەی خوێندنی سوورەتی (فاتحە) لەسەرتان دەوستم تا ناوی دزەکان بدەن، ئەگینا یەکە یەکە لە ملتان دەدەم! بەبیستنی ئەم قسانەم پێکەنین، پیاوێکی سوورومل‌ئەستوری سمێڵزلو کەڵەگەتیان وتی: کورە، ئەم قسانە لە دەمو پلی تۆ نایەت، هێشتا زووە، پەلە مەکە، با قەڤ سمێڵت ئەوەندەی هی منی لێبێت، ئەوسا ئەم قسە زلانە بکە!! هەر دەمودەست داوام لە پیاوەکانم کرد کە بیگرنو لە ناو دەوارەکەدا وەدەری نێن، داواشم لێکردن کە لەسەر زەوی دایبنێنو دوورکەونەوە. پیاوەکانی تری خێڵەکە نەیاندەزانی مەبەستی من چییە. وەکو برووسکەو با، شمشێرم لە کێلان دەرهێناو، بەو هونەرەی کە مامۆستای شمشێربازی فێریکردبووم، نەمهێشت کابرا کە ڕاستبێتەوە، شمشێرم بۆ داهێنایەوەو بە یەك شمشێر سەریم پەڕاند، وەکو فوارەی حەوزەکەی ماڵی (میر یاخماق) خوێنی ئەو پیاوە فیچقەیکردو بەرز بووەوە! هەر چوار پیاوەکەی‌تر کە لە گەڵیابوون، بە جارێ پەلاماریاندام. داوام لە سەربازەکانم کرد کە دوورە پەرێز بوەستن. بە دوو شمشێرەوە هێرشمبردو پەلامارمدان، دەستی ڕاستی یەکێکیانم بە جۆرێ بریندارکرد لە کارکەوت، سیانەکەی تریشیانم بریندار کرد، هەر یەکەیان لە عاستی خۆیەوە دەستیکردە پاڕانەوە بۆ ئەوەی بیبەخشمو وازی لێبێنم. داوام لێکردن کە شمشێرەکانیان فڕێبدەن، لە هەمان کاتدا بە پیاوەکانم وت شمشێرەکان هەڵگرنەوەو هەر چواریان ببەنە ناو دەوارەکەوە.

دوای ئەوەی دەستی بریندارەکە تیمار کرا، پێم وتن: ئێستا منتان ناسی، ئەگەر ناوی جەردەکانم پێ نەڵێن دەتانکوژم! وتیان : ناویان نازانین، بەڵام دەزانین کە لە تیرەی (ئاق مەربووج)ن. پرسیم: سەرۆکی ئەو تیرەیە کێیە؟

وتیان: ناوی (جەودەت گولتو)یە. وتم: وەك دیل ئێوە لەگەڵ خۆمدا دەبەم، کە گەیشتینە ئەوێ، پەیمانیێ بەرتاندەدەم. هەر چواریان سواری ئەسپ کرانو کەوتینە ڕێ. هەستمکرد کە سەربازەکانم زۆرتر ڕێزم لێدەگرن، بۆیان دەرکەوت هەر چەندە تەمەنی فەرماندەکەیان کەمە، بەڵام ترسنۆك نییە! کاتی عەسر گەیشتینە ناوچەی خێڵی ناوبراو. کە چاوم بە یەکەم کەس کەوت پرسیم: (جەودەت گولتو) لە کوێیە؟ پیاوەکە ئاماژەی بۆ خێوەتێکی گومەزیی سپی کردو وتی: ئەو گومەزە مەڵبەندی سەربازگەیەتی .

بۆ ئەوەی لە پڕ بدەم بە سەریاو وەخۆ نەکەوێ، داوام لە سەربازەکانم کرد کە ئەسپەکانیان تاو بدەنو زۆر گورجو خێرا خۆمان کرد بە ئوردووگەکەدا. لەگەڵ یەکێ لە دەسگیرکراوەکاندا کە (جەودەت گولتو)ی دەناسی، خۆم کرد بە خێوەتەکەیدا، پیاوێکی سەروڕیش ماشو برنجیم دی، خۆی بوو، تەمەنی نزیکەی شەست ساڵ دەبوو، لەگەڵ ژنەکەیو دوو کوڕی گەنجدا دانیشتبوو، بێ یەکو دوو داوام لە سەربازەکانم کرد کە پیاوەکەو هەر دوو کوڕەکەی قۆڵبەستبکەنو بە ئەسپدا دایانبەستنو، پێش ئەوەی ئوردووگەکە بە ئاگا بێت بۆی دەرچین، ئەوەکو شەڕ بقەومێتو هەموومان لە ناو بچین... وای بۆ دەچووم کە ئوردوگەکە نزیکەی سێ هەزار پیاوی تێدابێت، هەر چەندە بە دلێریو ئازایەتیما دەمنازی، بەڵام لەو باوەڕەدا نەبووم کە سەربازەکانم وابن، هەر لەبەر ئەمە بوو کە بە چاکم زانی سەرەك خێڵو هەردوو کوڕەکەی بڕفێنین، کە زانیم ئەوەندە دوورکەوتووینەتەوە بێ خەمبووین، بڕیارمدا بوەستین.

کاتێ کە خۆم بە سەرەك خێڵەکە ناساند، لێمی پرسی: چیت لەمن گەرەکە؟! کە بۆم باسکرد بۆچی هاتووم، ویستی وا خۆی پیشانبدات ئاگای لە هیچ نییە! منیش وتم: تۆ سەرۆکی خێڵی (ئاق مەربووج)یت، چۆن بە بێ قایلبوونی تۆ پیاوەکانت خۆیان دەگەیێننە ناوچەی سەمەرقەندو شەش هەزار مەڕ دەدزنو سێ شوانیش دەکوژن؟! ئەگەر مەڕەکانمان بدەنەوەو خوێنی هەر سێ

شوانەکەش بدەن، واباشە، ئـەگینا یەکـەم جار هـەر دوو کوڕەکـەت دەکـوژم، ئینجا سەری خۆیشت دەپەڕێنم ! کابرا هیچ نقەی لێوە نەهات! وتم: ئەگەر تۆ موسڵمانبیتو لە قورئان بزانی، بە پێی یاسای خوا، سزای کوڕەکانت کوشتنە، چونکە دیارە کە ئەو تاوانە بە سەرپەرشتیی هەردووکیان کراوە!..

(جەودەت گولتو) وتی: ئایا دەزانی من پێنج هـەزار جەنگاوەرم هەیە؟! ئەگەر خۆمو کوڕەکانیشم بکوژێت، خۆێنمان لە تۆو (میری یاخماق) دەستێننو هەردووکیشتان دەکـوژن!.. وتم: هەرەشـەو گوڕەشـە دادت نـادات، مـن داوای هـەموو مەڕەکانو خوێنی شوانەکان دەکەم، ئەگـەر داواکارییـەکانم جێبـەجێ نەکەیت، سەد هـەزار جەنگاوەریشت هـەبێ، هـەر دەتـانکوژم! کـە زانیـم گـوێ ناداتـە هەڕەشـەکانم، فـەرمانمدا بـە سـەربازەکانم پـەت بخەنـە ملـی کـوڕە گەورەکەیـەوەو لـەم لاو لـەو لاوە شـەتەکیبدەن، کـە کوڕەکـە کەوتـە لەقـەفرتێ، باوکی هاواریکرد: ئەیدە... ئەیدەم! فەرمانمدا بوەستن، کە پەتەکەیان لە ملی کردەوە، کوڕەکە گیانی تیا نەمابوو!... باوکە دەستیکرد بە شیوەنو گریان، منیش دوو سێ جار بە هێواشی کێشام بە پشتیداو وتم: ژنانی، تۆ ئەوەندە بۆ مەرگی کوڕەکەت داماو زەبوونیو دەگریت، ئیتر بۆچی دزیدەکەیت؟! ئەگەر دەتەوێ خۆتو کوڕەکەی ترت بمێنن داواکارییەکانم جێبەجێ بکە.

بەم جۆرە (جەودەت گولتو) هاتەکایەوە، وتی: خوێنی شوانەکان چەندە؟ منیش وتم: چونکە بە ئەنقەست کوشتووتانن، خوێنـی هەر یەکەیان سێسەد حوشترە!..وتی: زۆرەو نیمە! وتم: نۆسەد ئەسپ بدە، تۆخاوەنی ئەسپی زۆری! وتـی: ئەسپیخێڵن! وتم:ئەسـپی خێـڵ بـدە!... کـە زانـی وازی لێنـاهێنم، بـە ناچاری بڕیاریدا، داواکانمان جێبەجێ بکات، لەو کاتەدا یـەکێك لـە پیاوەکـانی لـەوێوە دەڕۆیشـت، بـانگیکردو ناردیـە لای سـەرانی خێـڵو داوای لێکـردن کـە هەموو مەڕە دزراوەکان بنێرنەوە، لەگەڵ نـۆ سـەد ئەسپا لـە جیـاتی خوێنـی شوانەکان، ئەگینا خۆیو کوڕەکەی دەکوژرێن.

دوای ئەوەی مەڕو ئەسپەکان هێنران، خۆی‌و کوڕەکەیم بەر نەدا!، چونکە لەوانە بوو لەشکر کۆبکاتەوەو پەلامارمانبدات. سەد سوارم دانا بۆ وە بەردانی مەڕو ئەسپەکان بەرەو سەمەرقەند، بە سەد سوارەکەی تریشەوە بە دیار (جەودەت گولتو)و کوڕەکەیەوە مایەوە، تاکو هەوالّمان بۆ هات کە مەڕەکان‌و ئەسپەکان گەیشتوونەتە سەمەرقەند، ئینجا هەردووکیانم بەرداو ڕێگەی سەمەرقەندمان گرتە بەر. پێش ئەوەی لە قەڵەمرەوی خێڵی (قەرەخەتائی) دەرچین، لەبەر خێوەتێکدا چاوم بە کچێکی شۆخ کەوت، کە بۆ سەیر کردنی ئێمە وەستا بوو، هەر کە ئەو کچەم بینی دڵم کەوتە تەپە تەپو بارو دۆخێکی سەیرم بە سەرداهات! پێم سەیر بوو، چونکە هەرگیز لە ئاستی هیچ ترس‌و لەرزێکدا دڵم تەپەتەپی نەکردووە! بێ ئاگا لە خۆ، ئەم تاکە هۆنراوەیەی (حافظی شیرازی) هاتەوە یادم:

مرا عشق سیه چشمان زدل بیرون نخواهد شد
قضای اسمان است این‌و دیگر گون نخواهد شد*

کە بە لای خێوەتەکەدا تێپەڕیم‌و لامکردەوە، سەیرمکرد کچەکە سەیرم دەکات، چەند جارێك ئاوڕمدایەوە، ئەو هەر سەیریدەکردم، کە لە چاو ونبوو، زانیم کە ناتوانم بیری ئەو کچە لە مێشکمدا دەرکەم. من خۆم زۆر لەوە بە تواناتر دەزانی کە کچێکی جوان بە جۆرێك من بگۆڕێت هەست بە شەرمەزاری بکەم، بە ڕاستی زۆر نارەحەتبووم، بیرم لەوە دەکردەوە کە بە شمشێرەکەم هەناوم ڕادەم، نەکو خۆم بە زەبوون‌و ڕسوا بێتە بەرچاو..!

هەر کە گەیشتمەوە سەمەرقەند هەموو شتێکم بە میر ڕاگەیاندو بە درێژی باسی هەموو شتێکم بۆ کرد. میر زۆر سەری سڕماو وتی: تەیموور، کاری تۆ

---

*من ناتوانم ئەشقی چاو ڕەشان لە دڵم دەرکەم، ئەمە ویستی ئاسمانییەو گۆڕینی بۆ نییە!

وەرگێڕی کوردی

کردووته له توانای پیاوه دێرینەکانیشدا نەبووە!! له پاداشتیشدا سەد ئەسپی پێبەخشیم.

لەگەڵ ئەوەشدا که میر زۆر لێم قایلبوو، بەڵام من هەستم بە دواکەتوویی خۆم دەکرد، چونکه نەمدەتوانی بیری ئەو کچه، که ناویم نەدەزانی، لەسەرم دەرکەم! وام به باشزانی که پشوو یەك لە میر وەرگرمو سەر لە شاری (کەش) بدەمەوەو بچمه لای مامۆستای بەڕێزم (عەبدوڵڵا قوطب)و باری دڵو دەروونی خۆمی بۆ باسبکەم.

مامۆستاکەم بە بینینم دڵشاد بوو، وتی: ئامەخوا بووی بە پیاوێکی تەواوو لە بەرچاو!.. وتم: گەورەم مامۆستا، ئەم پیاوە تەواوو هەڵکەوتووەی لەبەر دەمتایە، بریتییە لە منداڵێکی بێ دەسەڵات! هاتووم ئاگادارتکەم کە زۆر بە شەرمەزارو ڕسوا دێمە بەرچاو خۆم، تەنانەت بیرم لەوە کردۆتەوە بەشمشێرەکەم کۆتایی بە ژیانم بێنم!..مامۆستاکەم پرسی: بۆچی خۆت دەکوژیت؟!.. منیش بە تەواوی بەسەرهاتی دەردی دڵمم بۆ باسکرد، ئەویش وتی: کوڕم، ئەم گۆڕانکارییەی بەسەرتۆدا هاتووە، کارێکی خوداییەو لە ڕێی هەموو کوڕو کچێکی لاودایە، بۆ ئەوەی ژیانی خێزانی پێکبێنن‌و وەچەیان لێبکەوێتەوە، ئەگەر ئەم گۆڕانکارییە نەبێت، نەکوڕ ژن دێنێ‌و نە کچ شوو دەکات...! نابێ تۆش سەخڵەتبی، ئەم تەنگژەو جۆش‌و خرۆشەشت نیشانەی ئەوەن کە دەبێ ژن بخوازی، بە باوکت بڵێ ئەو کچەت بۆ بخوازێت!..وتم: ناتوانم بە باوکم بڵێم...وتی: ڕاستدەکەی، هەر ئەمڕۆ دەچمە لای باوکت‌و پێی دەڵێم ئەو کچە بخوازێ بۆت. بەم چەشنە کچێك کەدواتر بووە دایکی جیهانگیر _ شێخ عومەر_ میرانشا، بوو بە هاوسەرمو هاتە ماڵم. دوای زەماوەندو یەك لا بوونەوەو ئارامی، بۆم دەرکەوت کە ئەتوانم بە بێ دڵەڕاوکێ‌و ڕاڕایی فەرماندەیی سوپای (میر یاخماق) بگرمە ئەستۆو بەڕێوەیبەرم.

# چوارەمین بەش

## مردنی میر یاخماق و بەربەرەکانیٚ لەگەڵ ئەرسەلاندا

لە ساڵی (٧٥٦)ی کۆچیدا، بەرانبەر بە ساڵی (١٣٥٥)ی زاینیی، تەمەنم (٢٠) ساڵبوو، ئەوەندە بە هێزو بە توانا بووم کە دەمتوانی لەگەڵ پیاوانی (٣٠_٤٠) ساڵانا زۆرانبگرمو بیاندەم بە زەویدا. بە جۆرێك پەنجەکانم بە هێز بوون، کەس نەیدەتوانی لە پەنجەشکاندنەوەدا بەرەنگاریمبکات. پلەدارو سەربازەکانی میر ئەوەندەی لە من دەترسان، لە میر نەدەترسانو پتر گوێڕایەڵی منبوون. ڕۆژانە داوام لە هەموو سەربازەکان دەکرد کە چاك مەشقی جەنگی بکەنو گەلێکیش دڵنەواییمدەکردن.

وەکو وتم، میر برازایەکی هەبوو، گەلێك دەترسا کە بیکوژێت، لە سەرەتاوە نەمدەزانی هۆی ئەم ترسە چییە، پاشان زانیم، میر برایەکی بووبوو، مردبوو، ئەمیش دەستیگرتبوو بەسەر هەموو سامانەکەیدا هیچی نەدابوو بە برازاکەی، بەم جۆرە (ئەرسەلان)ی برازا ئەو پەڕی ڕقی لە مامی بوو. دوای ئەوەی لە دیوانو دامودەزگای میرا بووم بە خاوەن دەسەلاتو لەشکرم ڕێکوپێککردو سەلماندم کارامەو بە توانام، ئەرسەلان زۆر بە خیلی پێم دەبرد، تەنانەت داوای لە مامی کرد بوو کە دەرمبکات، گوایا ئەگەر دەسەلاتم فراوانتر بیٚ دەست بە سەر لەشکرەکەدا دەگرمو بۆ بەرژەوەندیی خۆم بە کاریدێنم!! بەڵام میر گوێی پیٚ نەدابوو.

هەر لە ساڵی (٧٥٦)ی کۆچیدا میر بە نەخۆشییەکی کوشندە کۆچی دواییکرد، هێشتا بە خاك نەسپێردرابوو، ئەرسەلان، کە جێگریبوو، بە لەبەرچاوی هەموو لێپرسراوانو ئەفسەرو سەربازەکانەوە بە منی وت: ئەی (میری تەرقانی) هەر لە ئێستاوە وا تۆم دەرکرد، ئیتر هیچ پەیوەندییەکت بەم لەشکرەوە نییە!

ئەگەر ئەرسەلان دوو بە دوو وای پیٚ بوتمایە هیچ سەر پێچیم نەدەکردو نەمدەگرتە دڵ، چونکە بە پێی یاسا جێنشینی مامیبوو، بەڵام کەبە بەرچاوی هەمووانەوە بەو جۆرە منی شکاند زۆر سەخڵەتبووم، بە دەنگی بەرز وتم: ئەرسەلان تۆ دابو نەریتی گەورەیی نازانی!! وتی: من (ئەمیر ئەرسەلان)م!!

وتم: ئەگەر میر بوویتایە ئەتزانی کە ناشێ لەبەر چاوی خاوەن پلەو پایەی خوارتر، خاوەن پلەی بەرز دەرکەیت!!..

میر ئەرسەلان روویکردە لێپرسراوەکانو وتی: ئادەی، ئەم منالە بێ شەرمو بێ ئابڕووە دەرکە نەدەری! منی خوێن پڕ قولپو بە کوڵ نەمتوانی لە ئاستی ئەو جنێوانەدا خۆمبگرم، یەکسەر شمشێرم هەلکێشاو پەلاماری ئەرسەلانمدا، ئەوانەی لە دەوریدا بوون، هەموو شمشێریان هەلکێشاو ویستیان ڕێم لێبگرن، ئەگەر لە هێزو تواناو هونەری جەنگم ئاگادار بوونایە، وایان نەدەکرد. هەر بە یەکەم شمشێر قۆلی یەکێکیانم هێنایە خوارێ، خێرا شمشێرەکەیم هەلگرتەوەو بە هەردوو دەستو بەدوو شمشێرەوە تێیانکەوتم، هاوارمکرد: ئەگەر تۆ ئەمیر ئەرسەلانی دەرنەچی تا دەگەمەوە لات! لەگەڵ ئەوەشا کە هێشتا هەندێ شمشێر بە دەست لە نێوانماندا بوون، هەستمکرد ڕەنگی پەڕیوە!.. کە ئەوانیشم خستو لە میر نزیکبوومەوەو بینی هەموو گیانم خوێناوییەو خوێن لە هەردوو شمشێرەکانم دەتکێ، یەکسەر بۆی دەرچوو!..

دوای ئەکەوتم، ڕوومکردە ئەو لێپرساوو ئەفسەرو سەربازانەی کە نەهاتبوونە ناو شەڕەوە، وتم: من میرم، یان ئەو، کە مشکئاسا لە ترسی گوربە ڕادەکا، ڕایکرد؟! پاش هەلوێستەیەك ڕوومکردە ئەفسەرەکانو سەربازەکانو پێم وتن: ئەگەر ئێوە مەردو نەبەردنو ڕێز لە مەردایەتی دەگرن، نابێ ئەم لاوە ترسنۆکە بە فەرماندەی خۆتان دابنێن؛ هەر وەك لەمەوبەر بە فەرماندەیی من قایلبن، منیش هەموو داواکاریو پێویستیەکانتان جێبەجێدەکەم!..

هەموویان بە یەك دەنگ وتیان: بە فەرماندەیی تۆ قایلین بەو مەرجەی هەموو مانگێك مووچەمان بۆ دابینبکەی. منیش پەیمانمدانێ کە گوزەرانی هەموویان باشترو مسۆگەرتر بکەم. لەو ڕۆژەوە بە تەواوەتی فەرماندەییو کارو باری بەڕێوەبردنی لەشکری خوالێخۆشبوو (میر یاخماق)م گرتە دەست.

(میر ئەرسەلان) لەبەر ترسو شەرمەزاری، خۆی شاردبووەوەو کەناریگرتبوو، بەلام من ویستم بیسەلمێنم کە لەو باشتر ڕەویەی گەورەیی دەزانم، بۆیە نیوەی دارایی مامەیم دایە، دەستیشمگرت بەسەر نیوەکەی تریدا، تاکو بتوانم بوودجەی لەشکرەکەم دابینبکەم. کە ئەو پەڕی دەسەلاتو تواناشم بە دەستهێنا، هیچ لاقەم نەکرد، لە نامەیەکیا کە بۆمی نووسیبوو، وتبووی : خوای گەورە بەندەی گوناهکار دەبەخشێ، تۆش لە سەر زەوی

نوێنەری تواناو دەسەڵاتی خوایت، تۆبەی من وەرگرەو لێمببورەو. لە وەڵامیدا بۆم نووسی: وا تۆبەی تۆم قبووڵکرد، ئەوەش بزانە کە زامی شمشێر سارێژ دەبێت، بەڵام هەرگیز زامی قسەی ناخۆش سارێژ نابێت!.. تۆ ئەگەر تۆ بەشت نەکردایە، بە هیچ جۆرێك ئازارم نە ئەدایتو دەستم بۆ نەئەبردی...

من هەرگیز دەمم بۆ خواردنەوە نەبردووە، قومارم نەکردووە، بە درێژایی تەمەنم ڕێزم لە هەموو زانایانی ئایین گرتووەو پەیوەندیی چاکم لەگەڵ هەندێکیانا هەبووەو پرسو ڕاوێژیشم پێکردوون، بۆ خۆیشم سەرچاوەی فتوا بووم و ئەمتوانی فتوای شەرعی دەربکەم، چونکە بە تەواوەتی قورئانی پیرۆزم لەبەرە، بۆنەو هۆی هاتنە خوارەوەی هەر ئایەتێکیش دەزانم.

دوای ئەوەی بوومە خاوەن تواناو دەسەڵاتی فراوان، داوامکرد لە پارچەدار مزگەوتێکم بۆ دروستبکرێت، کە بتوانرێت لە شوێنێکەوە بگوێزرێتەوە بۆ شوێنێکی تر. هەندێك دار تاشی کارامەو دەستڕەنگین داواکارییەکەمیان جێبەجێکرد. فەرمانمدا کە مزگەوتەکە بە ڕەنگی ئاوی و ڕەنگی سوور بۆیە بکرێت، چونکە ڕەنگی ئاوی نیشانەی ئاشکرا بوونی توانای خوایە لەسەر زەوی، ڕەنگی سووریش نیشانەی دەرکەوتنی جۆرە مرۆڤێکە لەم سەر زەمینەدا. مزگەوتەکەم منارەیەکی ئاوی و منارەیەکی سووری هەبوو. هەموو پارچەکانی مزگەوتەکەم بە بیستو پێنج گالیسکە لە شوێنێکەوە دەگوێزرانەوە بۆ شوێنێکی تر، ئەگەر لە ناوچەیەکیشا ڕێگاوبانی گالیسکە نەبوایە، بە چوار سەد ئەسپو ئیستر ئەم کارە دەکرا.لە هەر شوێنێك بمویستایە، مزگەوتەکە هەڵدەدراو بانگدەر دەچووە سەر منارەو بانگیدەدا.

لەم کاتەدا کە سەرقاڵی نووسینەوەی بیرەوەرییەکانمم، دەمەوێ بۆ داگیرکردنی وڵاتی چین بەڕێبم، بتخانەکانی چین بگۆڕم بە مزگەوت!.

باوەڕم وابوو هەر کەسێك لەگەڵ مندا بووەو لە جەنگدا کوژراوە، پلەی وەکو پلەی گەشمەردەکانی* سەردەمی سەرەتای ئیسلامە، چونکە من بۆ بڵاوکردنەوەی ئایینی ئیسلام جەنگاوم هاوڕێکانیشم سەربازی ڕێبازی (خوای مەزن) بوون.

---

* گەشمەردە: شەهید

ئەوەی بووە مایەی فراوانبوونی سنووری دەسەڵاتم، ڕاوێکی بە کۆمەڵبوو لە پاییزی ساڵی (٧٥٧)ی کۆچیدا، کە تەمەنم ٢١ ساڵان بوو، ڕۆژێکیان لەگەڵ چەند ئەفسەرێکدا دەرچووم بۆ ڕاو، هەندێك سەربازم ناردن بۆ ڕاوناو هەڵبڕینی حەیوانە کێویی بیابان. لەگەڵ ئەفسەرەکانمدا چووینە ناوچەیەك کە کەوتۆتە سەرووی ڕۆژئاوای سەمەرقەندەوە، چونکە دەمزانی ڕەوە حەیوانە هەڵبڕاوەکان ڕوودەکەنە ئەوێ. من نەمدەزانی خێڵی (گرولتائی) لەو ناوچەیەدا دەژی. کە دەستمانکرد بە ڕاو هەندێك پیاوی ئەو خێڵە ڕێیان پێگرتینو وتیان: بۆتان نییە لەم ناوچەیەدا ڕاوبکەن چونکە هی ئێمەیە!.. وتم: ئەگەر زەویوزاری ئێوەیە، کوا بەڵگەتان؟! نە کشتوکاڵتان دیارە، نە دارودرەختێك، نە خانووبەرەیەك، تەنانەت چادرێکی ئێوە لەم بیابانەدا بەدیناکرێت!! ئێرە بیابانەو هی هەمووانە! پیاوەکان قسەکانی منیان دانەدواوەو وتیان: وتمان ئەم ناوچەیە هی ئێمەیەو هەر کەسێك ڕاوی تێدابکات دەکوژرێت، ئەگەر بشییەوێت نەکوژرێت دەبێ سەرانە بدات. ئێمە حەوت کەسبووینو ئەوان لە پەنجا کەس پتر بوون، هەر شەش ئەفسەرەکەم گەلێ بروایان پێمبوو، دەیانزانی چ جەنگاوەرێکی چاونەترسو ئازاو نەبەردم. نەمدەویست مشتومڕەکەمان بگاتە کوشتار. لە دڵی خۆمدا وتم: لەوانەیە ڕاستبکەنو باوو باپیریان مافێکیان لەم زەوییەدا هەبێت. ڕوومکردنێ ووتم: باشە، هەر چیمان ڕاوکردووە دەتاندەێنێو دەڕۆین. وتیان: نەخێر، ئێوە بەبێ ڕێپێدانی ئێمە ڕاوتانکردووە، دەبێ هەزار لیرەمان بدەنێ ئنجا وازتان لێدێنین! وتم: ئێمە بۆ ڕاو هاتووینو هەزار لیرەمان لەگەڵ خۆماندا نەهێناوە. وتیان: کەواتە: قۆڵبەستتاندەکەینو دەتانبەین بۆ خێڵەکەی خۆمان، لەوێ بنێرن هەزار لیرەتان بۆ بهێنینو بەرتانبدەین، ئەگینا دەکوژرێن!!.. دوای بیستنی ئەو هەڕەشەو گوڕەشەیە، داوام لە هاوڕێکانم کرد کە ئامادەبن. لەو کاتەدا هەموومان پیادە بووین، وەك بروسکە خۆم هەڵدایە سەر ئەسپەکەم؛ بە داخەوە هاوڕێکانم ئەو تەکانەی منیان نەبوو. دوژمنەکانمان ویستیان خۆیان بگەیەننە هاوڕێکانم، خێرا تیرێکم گرتە دانەیەکیانو تەختی ناو شانی گرت، دووەم تیرم بەر قوڕگی یەکێکی تریان کەوتو هەردووکیان کەوتن، هەر کە ئەمەیان لە من دی، بە هەموویان هێرشیان بۆ هێنام. منیش ئەوەندە بە دەستوبرد بووم، لە ماوەی دوو چاوترووکاندنا تیرێکی کاریگەرم دەهاویشت. پێش ئەوەی سوارانی دوژمن بگەنە لام، بەرتیرمدانو سیانیان

لەسەرزین بەربوونەوە، چوارەمیان لە سەر ئەسپەکەی شلبوو، کە ئەسپەکەی بەلاماتێپەڕی‌و سەرنجمدا شمشێری کابرا بە ولاخەکەدا شۆڕبووەتەوە، دەستمدایە مشتووەکەی‌و بە دەستمەوە هات، بە دووشمشێرەوە کەوتمە وێزەی سوارانی (گرولتائی)، هەموویان بە شمشێر دەجەنگان. لەولاوە بوار بۆ هاوڕێکانم ڕەخساو سوار بوون‌و کەوتنە تیربارانکردنی دوژمن. ئەسپەکەم لە نەژادی ئەسپی (خوارزم) بوو، شارەزایان دەزانن ئەم جۆرە ئەسپە بەرزترین ئەسپی سەرزەمینەو لە هەموویان چاکتر دەکشێ‌و دووقاتی ئەسپی تر خێراترە، هەر لە بەربەرزیی ئەسپەکەشمبوو کە ئەمتوانی بە ئاسانی شمشێر دابێنمەوە بۆ تەوقەسەری دوژمن. ئەو ڕۆژەو بۆ یەکەم جار بۆم دەرکەوت‌و بڕوام پەیدا کرد لە چاو خەڵکیتردا خاوەنی هێزو توانایەکی تایبەتی‌و جیاوازم. کە شمشێر وەشاندنی خۆم بە هەردوو دەست لەگەڵ هی ئەواندا بەراورد دەکرد، وەکو ئەوە وا بوو کە پیاوێکی ئازا بەربێتە منداڵە وردکە، ئەزۆرێکی ئەوتۆیان هەبوو، نە لە هونەری بەکارهێنانی شمشێریان دەزانی. هەرکە شمشێرم دائەهێنایەوە بەر یەکێکیان دەکەوت، ئەوکەسەش یان سەری دەپەڕی، یان کۆڵەوار دەبوو، نەیدەتوانی بجەنگێ، لەسەر ئەسپەکەی بەردەبووەوە. هەر ئەو ڕۆژە بۆم دەرکەوت کە ئازایەتی بریتیە لەوەی مرۆڤ هەر چەندە دەزانێ دەکوژرێت، بەلام بە بێ ترس‌و لەرز بەرەو مەرگ دەڕوات. لەو کاتەدا کە دوژمنم قەلاچۆ دەکرد، لەولاوە هاوڕێکانم سوارانی (گرولتائی)یان دابوونەبەر تیر باران‌و هێرشی دوژمنیان لە سەرمن سووک‌و کەمکردبووەوە.

لە ناکاو دوژمنەکانمان ترس دایگرتن‌و، ورەیان نەماو هەلاتن. ئێمە دوایان نەکەوتین، زانیمان بەرەوخێڵەکەیان هەڵدێن، ئێمەش نەماندەویست لەگەڵ هەموو پیاوانی خێڵدا بەجەنگبێین.

لە گۆرەپانی جەنگدا بیست‌و دوو کوژراوو بریندار بەجێمابوون، ئەسپ‌و چەکەکانیانمان دەستکەوتن. هەر ئەو ڕۆژەزانیم کە خوا منی بۆ فەرمانڕەوایی دروستکردووە، بە خۆمم وت: ئەی تەیموور، تۆ کە خاوەنی ئەم هەموو هێزو تواناو چاو نەترسییەیت، هەرگیز نابێت بە فەرماندەیی لەشکرێکی بچووک قایلبی کە لە (میریاخماق)ەوە بۆت ماوەتەوە، (جەنگیزخان)ی باپیرەت نیوەی تۆ لێهاتوو نەبوو، کەچی گەیشتە پلەی بەرزی فەرمانڕەوایی، تۆ دەبێ بگەیتە

پلەیەکی بەرزتر،دەبێت دەستبگری بەسەر ڕۆژهەڵاتو ڕۆژئاوای جیهاندا. کەلە ڕاو گەڕامەوە بوو بوومە پیاوێکیتر، ژنەکەشم کوڕێکی بووبوو، بەم جۆرە دوو ڕووداوی باشو یەك لە دوای یەك هاتنە بەرەوە، لە دڵی خۆمدا وتم: خوا مژدەم دەداتێ کە بە ئاواتی خۆم دەگەم، بۆیە کوڕەکەمم ناونا (جیهانگیر) تاکو نیازی دەروونیم دەربڕێ.

لێکمدایەوە، بۆ ئەوەی بگەمە فەرمانڕەوایی دەبێ لەشکرێکی زۆر بەهێزم هەبێ، ئەمەش زێڕو زیوو پارەی چاکی دەویست، بۆیە بڕیارمدا هەرچیم هەیە بیفرۆشم بۆ پێکهێنانی لەشکرێکی بەهێز، خۆ ئەگەر یەکێکی تر لە جێی مندا بوایەو دوو هەزار جەنگاوەری هەبوونایە، دەستیدەکردە جەردەییو ڕووتکردنەوەی خەڵك، هەر لە سەمەرقەندیشا هەموو میللەتی تاڵاندەکرد، بەڵام لەبەر ئەوەی ئیمانداربووم، هەرچیم لە (میریاخماق)ەوە بۆ مابووەوە فرۆشتم بۆ بە دیهێنانی ئاواتەکەم.

هەرچیم هەبوو زۆر بە نرخو بایەخداربوو، کە خەڵك زانیان دەیفرۆشم بەگێلو گەمژەیان دەزانیم، هەر چەندەشتەکانم بە هەرزان فرۆشتن، لەگەڵ ئەوەشدا چل هەزار لیرەم بەدەستهێنا. دەمو دەست دەستمکرد بە مووچەو ئازووقەدان بە هەموو سەربازەکانم، پیاوی گەنجم هەڵبژاردن بۆ سەربازی کە تەمەنیان(٢٠_٢٥)ساڵبوو، چونکە ئەم تەمەنە بۆ هونەرو توانای جەنگ زۆر لەبارو باش بوو...

## پێنجەمین بەش

## چۆن شاری بوخارام داگیرکرد؟

بۆ فێر کردنی ئەو گەنجانەی بۆ سەربازی وەرمدەگرتن،هەمان ڕێبازی خۆمم گرتەبەر. هەموو پیاوێکی نەزانو بێتوانا دەتوانێ ببێتە زاناو بە توانا بەو مەرجەی خۆی لە تەمەڵیو سستی ڕزگار بکات. بۆ ئەوەی مرۆڤ زانا بێت پێویستە ڕێی زانست بەرنەدات، بۆ ئەوەی بە تواناشبێت دەبێت لەشی وەگەڕخاتو ڕایبێنێ. هەر لە یەکەم ڕۆژی مەشقی سەربازەلاوەکانەوە زۆر تێدەکۆشام بۆ ئەوەی بە وردی لە یاسای شەرع بگەنو چاك پەیڕەوییبکەن؛ ئێستاش کە تەمەنم حەفتا ساڵە بە تەواوەتی ڕێز لە شەرع دەگرمو پەیڕەوی دەکەم.

دەمزانی پیاوێك کە هەموو تەمەنی سواریی ئەسپە، دەبێ بە باشی شارەزای شەرع بێت بۆ ئەوەی لە هیچ شوێنێك سەرپێچی لێ نەکرێت، هەروەها دەمزانی لە هەر ناوچەیەکی زۆر دووری قەڵەمڕەوی منا یاسا جێبەجێبکرێت وەك ئەوە وایە کە خۆم لەوێبم. ئاگادار بووم کە (جەنگیزخان)ی باپیرەم لە هەموو کارەکانیدا پشتی تەنها بە زۆرو ستەمو ڕق بەستووە، بەلاّم من هەمیشە لەگەڵ شەرعدا بوومو تۆزقاڵێ لام نەداوەلێی. سەربازەکانیشموا ڕاهێنا بوون کە پەیڕەویی یاسا بکەن، ئەگینا بە پێی یاسا سزا دەدران. هەموو ڕۆژێك دوو جار خواردنم دەدا بە سەربازەکانم، جارێکیان لە چێشتەنگاودا، جارێکی کەش لە سەرەتای شەودا، دوای نوێژی بەیانیانیش ئاگادارمدەکردن کە خەریکی هونەری شەڕکردن بنو خەریکی وەرزشی سەخت بن بۆ ئەوەی زۆر بەهێزبن. دەمزانی بە ئامادەبوونی خۆم لەو بیابانەداو لە گۆڕەپانی مەشقو ڕاهێناندا سەربازەکانم کارامەترو بە توانا تر دەبن. لە ڕۆژانی هاوینی گەرمیشا، مەشقو ڕاهێنان لە عەسرەوە دەستی پێدەکرا بۆ ئەوەی گەرما پەکی سەربازەکان نەخات. ئاگادار بووم کە سەرباز ڕێز لە فەرماندەی بێ هێزو بێ توانا ناگرێت، بۆیە جاربەجار لە کاتی مەشقی سەربازەکاندا، لەبەرچاوی هەموویان منیش

مەشقی تیر هاویشتن‌و ڕمبازی‌و شمشێربازیم دەکرد تاکو بزانن فەرماندەکەیان پیاوێکی ناشی‌و بێ توانا نییە!

لەساڵی (٧٥٨)ی کۆچیدا، کە تەمەنم (٢٢) ساڵبوو، هەندێك سەربازی (میری بوخارا) لە بیاباندا شەش سەربازی منیان کوشتبوون. بە پێی شەرع هەرکەسێ بە هەڵە بکوژرێت، خوێنەکەی سەد حوشترە، کەسێکیش بە ئەنقەست بکوژرێت خوێنەکەی وا بەستەیە بە داوای خاوەن خوێنەوە.

دوای لێکۆڵینەوەی تەواو، بۆم دەرکەوت کە پیاوانی (میری بوخارا) دەستپێشخەرو تاوانکارن. نامەیەکم بۆ میر نووسی‌و تیایدا وتم: پەنجا سەربازی تۆ شەش سەربازی منیان لە بیاباندا کوشتوون، جا دەبێ بۆ خوێنی هەر سەربازێك یان سێ (٣) هەزار مسقاڵ زێڕ بدەیت، یان دەبێ ئەو پەنجا سەربازەم بدەیتێ تا بە پێی یاسای شەرع لە ملیان بدەم! لە وەڵامدا میر نووسیبووی: هەڵەی سەربازەکانی تۆ بووەو دەستپێشخەریشیانکردووە، ئەگینا نەدەکوژران!..لەگەڵ ئەوەشدا کە دڵنیا بووم تاوان هی سەربازەکانی ئەوە، نامەیەکی ترم بۆ نووسی، تیایدا وتم: سەربازەکانی تۆ درۆیان لەگەڵدا کردوویت‌و بە شێوەیەکی تر ڕووداوەکەیان بۆ گێڕاویتەوە، بۆ خۆت چاك دەزانی کە سەربازەکانت تاوانکارن، کە پێ نەیەیت واتە تۆش دەڕۆزنی‌و دوژمنی خوای گەورەی! لە شەرعدا نەوتراوە کە بکوژو دز دوژمنی خودان، بەڵکو درۆزن دوژمنی خودایە، کەواتە درۆ گەورەترین گوناهە!

( میری بوخارا) وەڵامی دووەم نامەمی نەدایەوە، منیش بڕیارمدا کە هێرشبکەمە سەر (بوخارا). دوای تەواوبوونی مانگی ڕەمەزان، لە سێیەم ڕۆژی مانگی شەوالی (٧٥٨)ی کۆچیدا لە سەمەرقەندەوە بەرەو بوخارا کەوتمە ڕێ. هەموو لەشکرەکەم سوارەبوو، هەر سوارەی دووئەسپی هەبوون بۆ ئەوەی ئەگەر ئەسپێکیان ماندوو ببێت سواری ئەوی تر بێت‌و زووتر بگەینە بەرەوە. نەخشەی ڕۆیشتنەکەم وا دارشت کە شەو بگەینە بوخارا، بۆ ئەوەی پاسەوانەکانی شار لە دوورەوە نەمانبینن، میر ئاگادار نەکەن‌و دەروازەکانی شار قایم نەکەن‌و لەشکرەکەیان لە ئامادەبووندا نەبێت. پێش ئەوەی لە سەمەرقەندەرچین دەستوورمداکە هەر سەربازەی هەندێك سونبولی بۆنخۆشی پێ بێت بۆ ئەوەی کە گەیشتینە نزیك شوورەو دیواری دەوری شاری بوخارا، بیدەن لە لووت‌و لمۆزی ئەسپەکانیان تاکو نەحیلێنن! چونکە سروشتی ئەسپ

وایە، دوای ڕێکردنێکی زۆر، کە گەیشتە بەرەوە ئەحیلێنێ. کە گەیشتینە بەر دەروازەکانی شار، هەموو لایەك کشوماتبوو، دەستوورمدا بە ئەستووندەکی گەورەو درێژ، کە بەپەنجا سەربازێك هەڵدەگیرا، دەروازەکان بشکێنن، گەلێ لە سەربازەکانم بە پەیژە سەرکەتنە سەر دیوارەکان، چوونە ناو شارەوە، چاوەڕوان نەبووین‌وا بە زوویی‌و بێ بەرەنگاری‌و بێ جەنگ بچینە ناوشارەوە. دوای ماوەیەك هات‌و هاوار بەرپابوو. میری بوخارا بە ئاگا هات‌و دەستووریدا کە دەروازەی کۆشکەکەی چاك دابخەن. دەبوو دەوری کۆشکەکەمان بدایە،لە هەمان کاتیشا دەستوورمدا کە دەوری شاریش بگیرێت، شارەزاشبووم کە هەموو کۆشکێکی میری ڕێی نهێنیی ژێرزەمینی هەیە بۆ کاتی تەنگانەو هەڵاتن بۆ دەرەوەی شار! سەربازەکانم ئاگادار کردن کە هەر چۆنێك بووە دەبێ دەمی کونی ڕێگا نهێنیەکە بدۆزنەوەو هەرکەسێك لەوێوە دەرچوو تیر بارانیبکەن. وای بۆ چووم کە ئەو شەوە میری بوخارا ڕاناکات‌و چاوەڕێدەبێ بۆ بەیانی تاکو لە ژمارەو توانای لەشکرەکەم بگات‌و بزانێ دەتوانێ بەرەنگاری بکات یا نا!!...
بۆ سبەینێ کە ڕۆژ هەڵات، میر لە سەر بورجی کۆشکەکەیەوە لە تەکما دواو وتی: بۆچی هاتوویت‌و چیت لە من دەوێ؟! منیش باسی کارەساتی کوشتنی هەر شەش سەربازەکان‌و هەردوو نامەکەم بۆ کرد، دوایی وتم: ئێستاش ئەگەر ئەتەوێ شارەکەت چۆڵبکەو بگەڕێمەوە دواوە پێنج سەد هەزار مسقاڵ زێڕی ساغ دانێ، ئەگەر نیتە، بایی ئەو زێڕە موڵك‌و کەلو شتی نایاب بدە! میر وتی: ئەی ئەگەر نەتدەمێ چی دەکەی؟!

وتم: دەتکوژم، چونکە تۆ بکوژی سەربازەکانی منی!! وتی: من سەربازی تۆم نەکوشتوە. وتم: سەربازەکانی تۆ بکوژن، تۆش پەناتداون، بەم جۆرە تۆش بەشداریت‌و دەبێ بکوژرێیت! دوای کوشتنیشت هەرچی داراییت هەیە داگیریدەکەم‌و فەرمانڕەوایی بوخاراش دەگرمە دەست! میر وتی: ئەگەر تۆ توانێت من بکوژی، باوابێ...ئەمەی وت‌و دیار نەما. پاش دوو سەعات هەرایەك لە دەرەوەی شار هاتە بەر گوێم، دوای کەمێك هەندێ سەربازی دەرەوەی شار چەند کەسێکی گیراویان هێنانە لام، لەناویانا (میری بوخارا)م ناسییەوە، وای زانیبوو ئێمە بێ ئاگاین، بۆیە ویستبووی خۆی‌و دەستو پێوەندەکانی لە ڕێ نهێنییەکەوە دەرچن. میر وتی: ئامادەم داواکارییەکانت جێبەجێبکەم، تۆش دەبێ شارم بۆ چۆڵبکەیت! وتم: ئەمڕۆ، سەر لە بەیانی داواکاریم پێکەشکردو

تۆ داتە دواوە، ئەوسا مــن خــاوەنی سـەروماڵی تـۆ نـەبووم، بـەڵام ئێسـتا چارەنووسـت بــە دەسـت منـە! دەسـتوورمدا بـە سـەربازەکانم تـا دەسـتەی دامودەزگاو دەستو پەیوەندەکانی میر لەسەر زەوی پاڵبخەن، خۆیشم شمشێرم هەڵکێشا، بەجۆرێك دام لە ملی مـیر، یەکسـەر سـەری لـە لەشـی جیـابووەوەو کەوتە سـەر زەوی! ویسـتم هـەموو دانیشـتووانی شـار تێبگەیـەنم کـە دەبـێ هەموویان گوێڕایەڵی فەرمانم بن. کەدیم خوێنی شادەماری میر بە بەرزیی یەك گەزونیو فیچقەی فوارەی بەرزبووەتەوە، دامە قاقای پێکەنین!

دوای کوشـتنی مـیری بوخـارا، دەسـتمگرت بـە سـەرهەموو داراییەکـەیدا، هەرچیشــی هــی گواســتنەوەبوو، گواســتمەوە بــۆ ســەمەرقەند. پاشــان فەرمانمدەرکرد کە سەربازانی میری کوژراو، لەگەڵ هەندێك لە دانیشـتووانی شارا، بە بێگار شوورەو دیوارەکانی (بوخارا) تەختبکەن نـەکو کەسـێکی تـر بیەوێ کەڵکیان لێوەربگرێت! ئەمە ڕێبازی منەو تاکو ئەمڕۆش هەر شـارێکم گرتبێ وامکردووە.

کاروباری دەوڵەتی بوخارام سپارد بە یەکێك لە ئەفسەرە بەتواناکانو داوام لێکرد بە پێی یاساو دەستووری ئیسلام فەرمانڕەواییبکات، وە ئاگاداریشمکرد ئەگـەر هـەر کێشـەیەکی سـەختو دژوار هاتەکایــەوە، ئاگادارمبکــات تــاکو ڕێنماییبکەم.

بەر لە گەڕانەوەم لە شاری (بوخارا)وە بۆ (سەمەرقەند) خەوێکی زۆر سەیرم دی، پەیژەیەك بەرانبەرم وەستابوو، پێچکەکانی خـوارەوەی لەسـەر زەویبـوون، کەچی ئەوانەی سەرەوە لە بۆشاییدا بوون! زۆر سەرم سڕماو لەبەرخۆمەوە وتم: ئەم پەیژەیە چۆن ناکەوێ؟! لە ناکاو دەنگێك کەوتە بەرگوێمو وتـی: تـەیموور، بەم پەیژەیەدا سەرکەوە. وتم: ناوێرم، چونکە ئەکەوێ! هەر هەمان دەنگ وتـی: مەترسە، سەرکەوە، ناکەوێ! بەڵام من هەردوو دڵبـوومو سـەرنەکەوتم. دەنگەکە وتی: ئەی تەیموور، ئەوە دەترسـی؟! وتم: هـەر کـەس پـەیڕەویی مێشکو ئـاوەز بکات ترسنۆك نییە، هەر لەبەر ئەوەی چاونەترسو ئازام، نابێ خۆم بخەمە نـاو ئاگرەوە چونکە ئەسووتێم! خاوەن دەنگەکە وتـی: مـن پێت دەڵێم ئـەم پەیژەیـە ناکەوێت، مەترسە، پیا سەرکەوە!... کە پێم خستە سەر یەکەم پلە هەستمکرد زۆر چەسپو قاییمە، بەبێ تـرس سـەرکەوتم، لـەپڕ هەسـتم بـە ئـازارێکی زۆر ناهەموار کرد لە لاقـی چـەپمدا، ئـازار زۆری بـۆ هێنـامو لاقـی چـەپم لەتـەکما

نەدەهات. دەنگەکە وتی: ئەوە بۆ وەستاویت؟! کە تێمگەیان، وتی: لەکارکەوتنی لاقی چەپت نابێتە هۆی سەرنەکەوتنت!.. هەرچۆنێکبوو لاقی چەپم بەدوای خۆما ڕاکێشا، کەچی لەپڕ هەستمکرد دەستی ڕاستم لەکارکەوتووە، لەگەڵ ئەوەشا هەر سەرکەوتم تا گەیشتمە دوا پلەی پەیژەکە. دەنگەکە وتی: ئایا دەزانی چەند پلەت بڕیون؟! وتم: نا. وتی: چاکتر کە نازانی، ئەم پلانە ژمارەی ساڵەکانی تەمەنتن، تۆ ڕۆژبەڕۆژ هەر سەردەکەویتو هەرگیز نایەیتە خوارێ. زۆر ڕێزی زانایانو پیشەسازانو شاعیران بگرەو هەرگیز ئازاریان مەدە، ئەگەرچی لەگەڵیشتا نەبنو لەسەر دینیشت نەبن. دوای ئەم ئامۆژگارییە لە خەو ڕاپەڕیم. وا ئەمڕۆ چلو هەشت ساڵ بەسەر ئەو خەوەدا گوزەریکردو ئێستا دەتوانم بەچاکی لێکیبدەمەوە، لەم ماوەیەدا هەر لە گەشەکردندا بووم، هەمیشە سامانو توانام فراوانتر بوون، هەموو خۆبەزلزانەکانی سەر زەمین لەئاستی مندا، یان سەریان خستە خاك، یان سەریان پەڕێندرا. ئێستاکەش دەمەوێ بەرەو (چین) بکشێمو سەرانسەری داگیربکەم.

ئەوەش لەیادنەکەم، لەکارکەوتنی پێی چەپم لەسەر پەیژەکە بەو جۆرە بەدیهات، لە یەکێك لە جەنگەکاندا بە سەختی بریندار کرا، ئیتر لەو ساوە ئەم لاقەم شەلە. هۆی لەکارکەوتنی دەستی ڕاستیشم، ئەوەبوو لە شەڕکردنما دژ بە (تورك تامیش) زۆر بە خەستی بریندار کرا، لەو ڕۆژەوە تاکو ئەمڕۆ ناتوانم پەنجەکانی دەستی ڕاستم باش بجووڵێنم، ئەوەتا ئێستا داستانی ژیانم بەدەستی چەپ دەنووسمەوە، لەگەڵ ئەوەشدا دەتوانم بە دەستی ڕاستم شمشێر بگرمو بەکاریبێنم، چونکە شانو ئانیشکو بازووم تەواون. لە ماوەی ئەم چلو هەشت ساڵەدا سەدو حەفتاو دوو جار بریندار کراوم، تاکو ئێستاش هیچ کەس هاواری لە زاری من نەبیستووە.

کە گەیشتمە شاری شیراز دەستوورمدا (شەمسوددین موحەممەد شیرازی) کە بە (خواجە حافظ) ناویدەرکردبوو، بهێنن بۆ لام، پیرەمێردێکی لاوازو بێهێزیان هێنا. ئاو بە چاوێکیدا دەهاتە خوارێ، کە لێمپرسی: ئایا تۆ شەمسوددین موحەممەد شیرازیت؟ وتی: بەڵێ، ئەوم، ئەی میری جیهانگیر. وتم: ئایا تۆ وتووتە:

**خدایا محتسب مارا باواز دفو نی بخش**

**که ساز شرع زین أفسانه بی قانون نخواهد شد***

شاعیری شیرازی وتی: بەڵێ، ئەی ئەمیری جیهانگیر، من ئەم هۆنراوەیەم وتووە. وتم: ئەی نازانی ئەمە سووکایەتیکردنێکی گەورەیە بە ئایینی پیرۆز؟! پیرەمێرد وتی: من مەبەستی وام نەبووە، ویستوومە بڵێم ئاوازی دەف و نەی ئەوەندە کاریگەر نییە کە بتوانێ کۆڵەکەی دین بخاتە لەرزە! وتم: دەمێکە زانیومە کە تۆ لە دین وەرگەڕاوی!. مەبەستی شیعرەکەت بەو جۆرە نییە کەوتت، ئاشکرا دیارە کە مەبەستت لاوازکردنی دینە!

پاشان هەر بۆ دڵدانەوەی پرسیم: تۆ لە هۆنراوەکانتا گەلێك ستایشی سەمەرقەندو بوخارات کردووەو ناوت هێناون، ئایا دڵت پێوەیە ئەو دوو شارە ببینی؟ لە وەڵامدا وتی: میران، ئەگەر لاو بوومایە بێ یەکەو دوو دەچووم بۆ بینینی هەردووکیان، بەڵام ئێستا زۆر پیرو بێتوانام، ئەترسم یان نەگەمە بەرەوە، یان ئەگەر گەیشتم نەگەڕێمەوەو بمرم! پاشان وتم: ئەی (شەمسوددین موحەممەد)، تۆ بێجگە لە شیراز شاری ترت نەدیوەو پێت وایە هیچ شارێك لە شیراز جوانترو خۆشتر نییە؟! چاك دڵنیابە کە شیرازی تۆ لەچاو سەمەرقەندی مندا شارێکی بچووكو بێبایەخە..! لە شیرازی تۆدا تەنها حەوت مزگەوت هەن، بەڵام لە سەمەرقەندی مندا دووسەد مزگەوتی گەورە هەن، هەریەکەیان دوو، سێ، چوار منارەی هەن و لەسەر گومەزی هەر مزگەوتێك مانگێکی کەنگەرەیی (هیلالی) زێڕین چەسپکراوە، گەر لەسەر گردێکی قەراخ شارەوە سەرنجی شار بدەیت، کەوتۆتە ناوەڕاستی باخە فراوانەکانەوە، وا دەزانی بەهەشت دەبینی!..

بەپێی بۆچوونی من (شەمسوددین موحەممەد) لە دین وەرگەڕابوو، لەگەڵ ئەوەشدا دەستوورمدا کە هەزار لیرە زێڕی بدرێتێ بۆ ئەوەی دواڕۆژەکانی ژیانی بە خۆشی بەسەربەرێت.

---

* خوایە ئەوەی ڕێمان لێنەگرێ ببەخشە بە ئاوازی دەف و نەی، گومانی تێدا نییە کە ڕێبازی شەرع لەگەڵ ئەم ئەفسانەیەدا گونجاوە.

وەرگێڕی کوردی

هەروەکو باسمکرد، ڕێبازی ڕێزلێنانی زاناو شاعیرو پیشەسازو داناو بلیمەتانم بەرنەدا. (قەشەی سولطانیە) کە پێشان لە (نەخچەوان) دەژیاو ڕابەری ڕوحانی ئەرمەنییەکانبوو، هاتە لامو بەڕێزەوە پێشوازیم لێکردو لەپاڵ خۆمدا دامنیشاند، لەبەرئەوەی بە هۆی جەنگەوە لە (سولطانیە) ئازووقە کەمبوو، داوامکرد کە خواردنی باشی بۆ بهێنرێت، کە تێربوو لەجیاتی سوپاس و ستایش دەستیکرد بە قسەی نابەجێ!! وتی: ئەی (میر تەیموور) تۆ دەڵێی موسڵمانیو بڕوات بە خوا هەیە، ئەی بۆچی ئەم هەموو خوێنە دەڕێژیو بەندەکانی خودا دەکوژی؟! وتم: من ئەوانەم کوشتوونو دەکوژم کە لە دینی ئێمە پەشیماندەبنەوەو هەڵدەگەڕێنەوە! قەشە وتی: تۆ لە ئەرمەنستان خەڵکێکی زۆری مەسیحیت کوشتن، خۆ ئەوانە موسڵمان نەبوون تا بڵێی لە دین وەرگەڕاون!... وتم: ئەوانە بەڵگەو بیانوویان دادەتاشین بۆ شەڕکردن دژی موسڵمانان، ئەو جۆرە کەسانە کافری جەنگنو دەبێ بکوژرێن! تۆش کە پیاوێکی گاوری، گەلێك خۆشبەختی چونکە لە ڕیزی زانایانی گاوران دادەنرێیت، ئەگەر لە دەستەی زانایان نەبوویتایە، هەر ئێستاکە فەرمانمدەدا بەبەر چاوی خۆمەوە بە زیندوویی بتگرون!... هەر دەمودەست داوای لێبوردنیکرد، منیش لێی خۆشبووم، ئینجا داوامکرد کە بگوزرێتەوە بۆ سەمەرقەند تا چاك پایتەختی من ببینێ. پاش ئەوەی ماوەیەك لە سەمەرقەندا مایەوە، وەك نوێنەرو نێردراوێکی خۆم ناردم بۆ ڕۆژئاوا، بۆ ئەوەی ناوو ناوبانگی من بگەیەنێتە شای فەرەنگ.

دوای گەڕانەوەم بۆ بوخاراو بینینی ئەو خەوەی باسمکرد، بیستم پێنج میر لە میرانی (ما وەرائەننەهر)، کە دۆستی میری بوخارا بوون دژ بە من یەکیانگرتووەو دەیانەوێ بە لەشکرێکی سەد هەزار کەسەوە هێرشبکەنە سەر سەمەرقەندو تۆڵەی میری بوخارا بکەنەوەو من بکوژن. پێش خەوەکەم لە خۆم گەیشتبووم کە چەندە بەهێزو نەترسم، دوای بینینی خەوەکەم بۆم دەرکەوت کە یەزدانی مەزن پشتیوانمەو لە جەنگەکاندا یارمەتیمدەدات، لەگەڵ ئەوەشا دووربینیو بەهرەو تەگبیرم لەدەست نەدان، زانیم پیاوی ژیرو کارامەو دووربین پێشیاوی یارمەتیی خوای گەورەیە.

بەر لەوەی ئەو لەشکرە گەورەیە دەست بە هێرش بکات، بڕیارمدا کە هێرشبەرمە سەر یەکەیەکەی ئەو پێنج میرە. فەرمانڕەوایی شاری سەرمەرقەندم

بە ئەفسەرێکی ناوداری خۆم سپارد کە ناوی (شیر- بەهادر) بوو. بە لەشکرەکەمەوە کەوتمە ڕێ تا گەیشتمە کەناری ڕووباری (جەیحوون) لە ناوچەی (تورمون). ویستم لە ڕووبارەکە بگەمە ئەو بەر، بەڵام ئەوەندە لافاوی ڕووبارەکە بەهێز بوو، نەك ئەسپ، فیلیش نەیدەتوانی لێی بدات. بۆ پەڕینەوە پێویستم بە بەلەمی گەورە گەورە بوو، نامەیەکم نارد بۆ ( شیر- بەهادر) داوامکرد کە دەستبکەن بە بەلەمدروستکردن، بەلەمەکان بە جۆرێکبن کە ئەسپ بپەڕێننەوە، بە هۆی گالیسکەشەوە بگوێزرێنەوە. لە هەمان کاتیشا بۆ ئەوەی دوانەکەوم، هەندێ سوارم بەرەو باکوورو باشوور ناردن بۆ کۆکردنەوەی کەشتیی بچووك‌و بەلەمی ئەو ناوە. لە ماوەیەکی زۆر کورتا ژمارەیەکی باش کەشتی‌و بەلەم کۆکرانەوەو هەموو سوارەو ئەسپەکانمان بە کەشتی لە جەیحوون پەڕاندنەوە. دوای ئەوە گورج‌و خێرا هێرشمبردە سەر ناوچەی فەرمانڕەوایی میری (غەضنەفەر) کە یەکێکبوو لەپێنج میرەکانی دژ بە من، بەڵام پێش ئەوەی بگەمە بەرەوە، میری ناوبراو بۆی دەرچووبوو، دەستمگرت بەسەر هەموو ئەسپ‌و مەڕو ماڵات‌و دەوارویدا. لەبەر ئەوەی کەس بەرەنگارمان نەبووەو کەس ڕێی پێمان نەگرت، خوێنی کەسمان نەڕشت. دوای ئەوە بەرەو ناوچەی میرێکی تریان کشام کە ناوی (لیك توتون) بوو، ئەم میرە ئیسلام نەبوو.

سوارانی میر (لیك توتون) چوار هەزار دەبوون، سەرەڕای لەشکری تەواو، چوار هەزار سوارو چوار هەزار ئەسپی زیادەم پێ بوون، بۆ ئەوەی لە کاتی ماندوو بوونی ئەسپەکاندا بگۆڕدرێن، ئیتر بەم چەشنە ئەنجامی باش‌و لەپڕمان بەدیدەهێنا، ئەم ڕەوش‌و خووەشم لە باپیرە گەورەمەوە (جەنگیزخان) وەرگرتبوو، گەلێ جار ماوەیەکی زۆر لە نێوان ئێمەو دوژمندا هەبوو، کەچی بە کاتێکی زۆر کورت، زوو دەگەیشتینە سەری‌و چارماندەکرد. بۆ نموونە، کە بڕیارمدا (سەبزەوار)، ناوەندی ناوچەی (خوراسان)، بگرم، بە ماوەی بیست ڕۆژ بە هەموو لەشکرەکەمەوەلە (بوخارا)وە گەیشتمە (سەبزەوار)، ئەوەندە گورج‌و کوتوپڕ گەیشتینە جێ، خەڵکی شار کەلە دەرەوەی شوورەی شاردا بوون پیانەگەیشتن خۆیان بگەیەننەوە ناو شار.

هەموو دانیشتوانی (سەبزەوار) لە دین هەڵگەڕابوونەوە. ﴿تەیمووری لەنگ بەرانبەر بە شیعەکانیش هەمان بڕواو بۆچوونی هەبووە، بێ گومان بەڵگەی

نەبووە– وەرگێڕ بۆ فارسی ﴾. پاش ئەوەی دەستمان بەسەر هەموو شاردا گرت، دەستوورمدا جاڕبدرێت کە دەسەری بڕدراو بە یەك دینار دەکڕم، چونکە من موسڵمانم‌و لە ڕێی خوادا خەباتدەکەم. سەربازەکانم سەدو پەنجا هەزار کەللە سەری بڕدراویان دانەدەست ژمێریارانو پازدە هەزار دیناریان وەرگرت. فەرمانمدا بەو سەدو پەنجا هەزار کەللەسەرە ڕوو بە قیبلە منارەیەك دروستبکرێت تا خودای (کەعبە) ئاگادار بێ بۆ ڕەزامەندیی ئەو لە دین وەرگەڕاوان لە ناو دەبەم!..

دوای ئەوەی منارە سی(٣٠) گەز بەرزبووەوە، داوامکرد کە شوورەو دیواری شار وێرانبکرێتو لەشکرم بەڕێخست، بەڵام بۆ ڕۆژی دوایی لە پڕ خۆم کردەوە بە شاردا، دەمزانی هەندێ لە دانیشتووانی (سەبزەوار) لەپە ناوچەپەکدا خۆیان شاردۆتەوەو دوای دەرچوونی لەشکر لەشار، لە شوێنە نهێنییەکاندا دێنە دەرەوە. بۆچوونەکەم ڕاستدەرچوو، ئەوانیشمان لەناوبردن.

ئێستاش بە کورتی باسی داگیرکردنی سەبزەوار تۆمار دەکەم. لە بیستو دووەم ڕۆژی مانگی ذیلحیججەی ساڵی (٧٥٩)ی کۆچیدا، شەڕ لە نێوان سوارانی منو سوارانی میر (لیك توتون)دا هەڵگیرسا. بەر لە هەڵگیرساندنی جەنگ دووسەد سەربازم دانان بۆ ئاگاداریی ئەسپە زیادەکانمان، بۆ خۆیشم بەسێ هەزارو هەشت سەد سوارەوە دەستمکرد بەهێرشبردن. گۆرەپانی جەنگەکە پانتاییەکی فراوانبوو.فەرمانمدا بە (حسێن)ی زاوم، کە مێردی خوشکەکەمبوو، بە پێنج سەد سوارەوە پاشەوپاش بکشێتەوەو واخۆیان دەرخەن کە هەڵاتوون بۆ ئەوەی هەندێك لە سوارانی دوژمن بنیشنەسەریان، جا لەناکاو لێیان وەرگەڕێنو تیر بارانیانبکەنو لەناویانبەرنو دوایی خۆیان بگەیەننەوە لام. لە هەمان کاتیشدا داوام لە ئەفسەرەکانم کرد کە بەرەو نێزە ئەسپەکانی دوژمن لە ناوبەرن، بۆ ئەوەی سوارانی دوژمن پیادەبن، ئەوسا لەناوبردنیان ئاسانە. کە سەربازەکانم خەریکی لە ناوبردنی ئەسپی دوژمنبوون (حسێن)ی زاوامو سەربازەکانی کەوتنە هەڵاتن. من وام زانی کە دووسەد، سێ سەد سوارێك دوایاندەکەون، کەچی نزیکەی هەزار سوار نیشتنە سەریان، کاتێ کە ئەمەمان دی هێرشی توندترو سەخترمان کردە سەر ئەسپەکانی دوژمن. بەم جۆرە ژمارەیەکی زۆر لە سوارانی دوژمن بێ ئەسپ مانەوە، یەکێك لەگەورە لێپرسراوانی خۆم، کە ناوی (نەصرەتلی) بوو، ڕاسپارد بە پێنج سەد سوارەوە

بکەوێتە وێزەی پیادەکانی دوژمنو لەناویانبەرن. سەرنجمدا سەربازانی دوژمن ئەوە نەبوون بتوانن بەرەنگاریبکەن، وەکو کۆمەڵە مێرووله کەوتبوونە ژێر پێی سەربازەکانمەوە.

ئەو ڕۆژە بۆم دەرکەوت کە نابێ هەرگیز بە نازناوی قەبەوزلو پیاهەڵدانی خەڵك هەڵخەڵەتێم. (لیك توتون) یەکێکبوو، لە ناودارە زۆر گەورەکانی هەموو ناوچەکە، هەر کاتێ سواربوایە، ئاڵایەکیان بۆ هەڵدەکردو دەیانشەکاندەوە کە نۆ دەواڵ، یان قامیش بە شێوەی کلکی گابادراوی پێوە بوو. ئەم میرە خۆی لە نەژادی بەوەجاخترین سوڵتانەکانی تورك ئەزانیو نرخو بایەخی بۆ هیچ کەس دانەئەنا.

هەرکەسێ سەرگوزشتەی من دەخوێنێتەوە با ئەم ڕاستییە دروستە بزانێ: ئەگەر لە مەیدانی شەڕدا سەرباز ترسنۆکو بێ توانابێت، ئەوا فەرماندەکەشی وایە، چونکە سەرباز وێنەی فەرماندەکەیەتی. دوای ئەو جەنگە (نەصرەتلی)م ڕاسپارد کە هەموو بەیانییەك، دوای نوێژی بەیانی بە دەنگی بەرز ئەم تاکە هۆنراوەیەم بۆ بخوێنێتەوە:

نبیند دو چشم بجز گرد رزم   حرام است بر جان من جام بزم

"بێجگە لە تۆزو گەردی گۆرەپانی جەنگ، با چاوم لە هیچ نەبێ، جامی بەزمو مەیو ڕابواردن بۆ گیانی من حەرامە"

(حسێن)ی زاوام بە تەواوەتی کاری خۆی کردو گەڕایەوە. ئەگەر بمزانیایە لەشکری دوژمن ئەوەندە بێ دەسەڵاتە ئەو کارەم بە حسێن نەئەسپاردو لە خۆم دوورم نەدەخستەوە. شەڕ گەرمتر بوو، هێرشی بەرینتر کرایە سەر دوژمن. بە داخەوە لەو شەڕەدا حسێن کوژرا، پێش کوژرانی ڕێی هەڵاتنی لەمیر (لیك توتون) گرتبوو، لەو باوەڕەدا بووم ئەگەر ڕێی هەڵاتنی لێ نەگیرایە، لەشکرەکەی بەجێدەهێشتو بۆی دەردەچوو. میر نزیکەی چل ساڵانبوو، ڕوخسارێکی ڕەشو چرچو لۆچی هەبوو،کڵاوی ئاسنو زرێی پۆشیبوون. کاتێك لەگەڵ چەند سەربازێکما لێی نزیکبوومەوە، بە تورکی بانگیکرد: ئەی لاو تۆ کێیت؟! منیش وەڵاممدایەوە: بۆ کوشتنی تۆ هاتووم....... بە تورکی وتی: نازانم ئەڵێی چی؟! وتەی خۆم دووبارە کردەوە. بە ددانم لغاوی ئەسپەکەم گرتو بە دوو شمشێرەوە پەلامارمدا، چەند پاسەوانێکی دەورو بەریم لەناوبردنوگەیشتمە سەری، چەند جارێك کەمەندی بۆ هەڵدام، هەموو جارێك بە شمشێرەکانم

لەتوپەتمدەکرد. میریش وەکو هەموو سەربازەکانی بە یەك شمشێر شەڕیدەکرد. ئەگەر زریو کڵاوە ئاسنەکەی نەبونایە زۆر زووتر دەمکوشت. پاشان شمشێرێکم داهێنایەوەو لاقێکیم پەڕاند، شمشێرێکی ترم بۆ داهێنایەوە دەستی چەپیشیم پەڕاند، نەیتوانی خۆی بگرێتو لەسەر ئەسپەکەی بەربووەوە. دەستوورمدا کە سەری لە لەشی جیا بکرێتەوەو بکرێت بە سەری رمێکەوە بۆ ئەوەی لەشکرە تێکشکێنراوەکەی چیتر نەجەنگێن. هەر کە سەربازەکانی زانیان میرەکەیان کوژراوە، بە جارێ بە هەموو لایەکدا پەرەوازە بوونو کەوتنە هەڵاتنو راکردن. پێش نوێژی نیوەڕۆ جەنگ کۆتاییهات. هەندێ سەربازم راسپاردن کە دوای سەربازە هەڵاتووەکان بکەونو خێڵەکانیان تاڵانبکەنو هەر شتێکیش هی راگوێزانە لەگەڵ خۆیاندا بیهێنن؛ هەروەها هەموو ژنە جوانەکانیان بەدیلبگرن تا دابەشبکرێن بەسەر ئەفسەرو سەربازەکاندا ، چونکە بە گوێرەی شەرع بە کەنیزەکبردنی ژنانی کافرانی جەنگ رەوایە.

دوای ئەوەی لە گۆڕەپانی جەنگ هاتمە دەرێ دەستم نوێژنمگرتو نوێژمکردو گەلێ سوپاسی خوام کرد وابەئاسانی سەرکەوتم. دوو رۆژ دواتر سەربازەکانم بە پێنج هەزارو سەد ژنی لاوەوەو ماڵو سامانێکی زۆرەوە گەڕانەوە،هەر ئەفسەرو سەربازێك کەنیزەکێکی بەرکەوت، هەرچیشیان زیاد بوون بەرێمکردن بۆ بازارەکانی کۆیلە فرۆشی لە (ماوەرائەننەهر) تا لەوێ بفرۆشرێن.

لەو جەنگەدا پێنج سەدو بیستو پێنج ئەفسەرو سەربازم کوژران، بەڵام بە کوشتنی (میر لیك توتون) توانیم هەموو پیلانەکانی میرەکانی (ماوەرائەننەهر) بکەمە بڵقی سەر ئاو، ئیتر نەیانتوانی دژ بە من بوەستن.

دوای جەنگ گەڕامەوە بۆ (سەمەرقەند)، ئاگادارکرام کە دوو زانای گەورەو بەرێز لە (وڵاتی شام)ەوە هاتوون بۆ سەمەرقەند، یەکێکیان دانیشتووی شاری (حەلەب) بوو، ئەویتریان خەڵکی شاری (دیمەشق)بوو. ئێستا کە تەمەنم حەفتا ساڵە، ئەوسا چاوەڕێ نەبووم کە رۆژگارێ بێتە پێشەوە ئەو دوو میوانە هەریەکەیان کوڕێکی ببێو هەریەکە لەو کوڕانە کتێبێك دەربارەی من دابنێ. یەکەمیان ناوی (کەمالەدین)بوو، کوڕەکەی ناوی (نیظامەددین شامی)بوو، کتێبەکەشی بەم سەرباسە نووسیبوو(ظەفەر نامە). دووەم زانا ناوی

(عەرەبشا)، کوڕەکەشــی نــاوی (ئیـبن عەرەبشــا) بــوو، کتێبەکــەی کــە تــەواوی نەکردووە ناوی ناوە (عجائب المقدور فی نوائب تیمور).

ئەو دوو ڕێبوارە، هەردووکیان خەڵکی وڵاتی دەستە چەپ (شام) بوون، بە جیا دەعوەتم کردن بۆ نان خواردن.

یەکـەم جـار کەمالـەددین خـەڵکی شـاری حەلـەب هاتــە لام، بـۆ ڕێزلێگرتنـی هەستامە سەر پێو لە ناوەڕاستی جەماعەتدا، دامنا. پاش نانخواردن بۆ ئەوەی بزانم زانیاری لە چ ئاستێکدایە لێم پرسی: تۆفانی نوح کەی دەستی پێکردو چ کاتێك کۆتایی هات؟

وەڵامی دامەوە، بەڕواری دەستپێکردنو کۆتایی هاتنی تۆفانی نوح ئاشکرا نییە، بەڵام (دە کرۆر)* ساڵ درێـژەی کێشاوە. وتم باشـە ئـەو دە کرۆر ساڵە، نوحو ئەو گیاندارانەی لـە کەشتیەکەدا بوون؟! وتـی: مەسئەلەی تۆفانی نوحو کەشتیو ئەو گیاندارانە مەسئەلەیەکی " عرفانیە"

چونکـە خـوا مـۆڤو گیـانداری لـە نـاو لـە خـاکێ لـە نـاو نـاودا بـووە دروسـتکردووە، پێـم وت: ئافـەرین مـن، ئـەو ڕاسـتیەم لـە لای مامۆسـتاکەم (عەبدوڵلا قوطب) فێر بووم، پێـی وتم: مەبەست لە تۆفانی نوح ئەو بارانە بێ پچرانە دوورو درێژە بووە کە دەریاکانو چاڵەکانی پڕ ئاو کردەوە.

پاشان عەرەب شا هاتە لامو وەك کەمالە ددیـن ڕێـزم لێگـرت، پرسـیم (رجال الغیب) کێنو لە کوێن؟ ئایا ڕاستە ژمارەیان ٣٥٢کەسە، نەکەم دەبنـەوە، نـەزیاد دەکەن، دنیـا بـەهۆی ئەوانـەوە وەسـتاوەو مەحکەمـە، ئەگـەر لـەناو بچـن دنیـا تێکدەچێت؟!

وتـی: ئـەی ئەمیر نـاوی (رجال الغیـب) بۆ ئەوە وتـراوە خـەڵکی دواکـەوتوو شتێك تێبگەن! بزانن لە پشتی پەردەدا هێزێك هەیە دنیـا بـەڕێوە دەبات. ئـەو هێزەش نەکـەم دەکـاتو نـەزیاد! وەهـەروەهاش جێگەیـەك نییـە شـتی دنیـای لەسەر دابنێن تا دنیا کەم کات.

پێـم وتــن: ئافــەرین دانشــمەندانی وڵاتــی دەســتە چــەپ شــتێکتان لــە دانشمەندانی ماوەڕائەننەهر کەمتر نییە.

---

* یەك کرۆر =(٥٠٠)هەزار

دوای میوانداری‌و ڕێزلێگرتن‌و گفتوگۆی قووڵی زانست‌و شەرع‌و گێڕانەوەی بەسەرهاتی دنیا بینان، کە ویستیان بگەڕێنەوە بۆ وڵاتی خۆیان، هەر یەکەیان یەك ئێستری باش‌و پێنج سەد دیناری زێڕم دایە.،

# شەشەمین بەش

## جەنگی تاشکەند

ئەگەر بمەوێ بەسەرهاتویادەوەرییەکانم بنووسمەوە، لەوانەیە تەمەنم تەواو بێتو ئەم کارەم بۆ تەواو نەکرێت، لەبەر ئەوە بە کورتی تەنیا بەشێك لە ڕووداوەکانی ژینم دەنووسمەوە، بۆ ئەوەی بتوانم ڕووداوە گرنگو مەزنەکانی، کە لە یادمن، تۆمار بکەم.

لە ساڵی (٧٦٠-٧٧٠)ی کۆچی، بەردەوام سەر قاڵی جەنگبووم، لەو ماوەیەدا توانیم سەرانسەری (خوارزم)و (ماوەرائەننەهر) داگیر بکەم، سنووری حکومڕانیم لە سەرێکەوە گەیشتە (سیبریا)، لە سەرێکی تریشەوە گەیشتە (دەریای مازندەران). لەو ماوەیەدا یەکێك لە جەنگە زۆر مەزنەکانم داگیر کردنی شاری (تاشکەند)بوو، کە تیایدا لاقی چەپم خراپ برینندار کرا، ئیتر لەوساوە من شەلم.

فەرمانڕەوایی (تاشکەند)م سپارد بە یەکێك لە فەرماندەکانم کە ناوی (ئەلجاتیو موحەممەد قولوق)بوو، ئەم پیاوە لە ماوەی دوو ساڵی فەرمانڕەواییدا دارایی‌و سامانێکی زۆری پێکەوە نابوو لەشکرێکی گەورەشی لە دەوری خۆی کۆکردبووەوەو لێم یاخیبوو، منیش ناچار بووم بە لەشکرێکی مەزنەوە بچمەوە سەر(تاشکەند).

لە مانگی شەوواڵی ساڵی (٧٦٨)ی کۆچیدا بە (٧٢) هەزار سەربازی سوارەوە هەر چوار دەوری شارم گرتو داوام لە دانیشتووانی شار کرد تا دژ بە (ئەلجاتیو) ڕاپەڕنو بیکوژن، بەڵام لەم بارەیەوە هیچ ڕووی نەدا. دوای ئەوەی دڵنیابووم کە ڕێی ژێر زەمین نییە بۆ دەرەوەی شار، دەستوورمدا دوو تونێلی بچووك لێبدرێن تا ژێر شوورەی شار، یەکێکیان لە باکوورەوە، ئەویتریان لە باشوورەوە. دەمزانی لەو کاتەدا کە سەر گەرمی لێدانی تونێلەکانین، بە تایبەتی لە شەودا، پیاوانی (ئەلجاتیو) گوێیان لە دەنگی پاچوخاکەنازەکانمان دەبێتو بە کارەکەمان دەزانن‌و چاوەڕێماندەبن بۆ ئەوەی هەر کەسەربازەکانم سەر دەربێنن بکوژرێن‌و دەمی تونێلەکە کوێربکەنەوە.

لەڕۆژی (١٨)ی شەووالّدا هەردوو تونێلەکە گەیشتنە ژێر دیواری شاری (تاشکەند). هەموو ئەفسەرەکانم ئاگادار کردن کە بۆ بەیانیی ڕۆژی دوایی هێرشدەکەینە سەر شار. لەگەڵ تاریکو ڕوونی بەیاندا داوام لە سەربازەکانم کرد کە چوار جەواڵ باڕووت ئامادە بکەن دووانیان لە ژێر دیواری باکوورو دووانەکەی تریشیان لە ژێر دیواری باشووردا قایمبکرێن، من بۆ خۆم پلیتەی تونێلی باکوورم ئاگردا، (شیر بەهادر)یش پلیتەی تونێلی باشووری ئاگردا. لە هەردوو شوێنەکەدا بە زرمەیەکی زۆر بە هێزی دنیا وێرانکەر ئاسا هەردوو دیوارەکان بەسەریەکا ڕووخان. لەبەر ئەوەی سوارەکان نەیاندەتوانی بە ئەسپەکانیانەوە لەو شوێنانەوە بچنە ناوەوە، داوامکرد هەندێکیان بە پیادەیی پەلامار بەرنودەروازەکانی شار بکەنەوە بۆ ئەوەی سوارەکان لە دەروازەکانەوە هێرشبکەنە سەر دوژمن. هەر کە دەروازەکان کرانەوە فەرمانمدا بەو سەربازو ئەفسەرانەی دەوری شاریاندابوو، لە جێی خۆیان بمێننەوە تاکو ڕێی هەڵاتن لە (ئەلجاتیو)و ئەفسەرەکانی بگرن. ئینجا خۆیشم لەگەڵ هەندێك سوارچاکدا چوومە ناو شار. (ئەلجاتیو) ئەیزانی گەر بەردەستمبکەوێت وەك ناپاکێك دادگەییدەکەمو بە زیندوویی پێستی لەشی دەگیرێتەوە، دوای ئەوە ئەگەر ما دەخرێتەوە ناو قازانێکی گەورەی پڕ لە ڕۆنی هەڵقرچاو، بۆیە تا توانی بە نائومێدییەوە جەنگا.

وەکو باسمکرد من بە هەردوو دەستو بە دوو شمشێر دەجەنگام، لەبەر ئەوەی زرێو پۆشاکی جەنگیی زۆر قایمو باشو دانسقەم دەپۆشین، هەرگیز تیغی دوژمن کاری تێ نەدەکردم.لە کاتی هێرشبردندا تەنها هەر سەیری پێشەوەمدەکرد، لە ڕاستو چەپو پشتەوەی خۆم بێ خەمبووم، دڵنیاشبووم کە دوژمن لە دوامەوە نییە. لە پڕ لەلای چەپەوە سەربازێکم کوژرا، پێش ئەوەی سەربازێکی تر بێتە شوێنەکەی، دەمی تەورزینێکی زۆر تیژ بەر لاقی چەپم کەوتو زریکەی لێهەستاند. تێسرەواندنەکە ئەوەندە توندو بەهێز بوو، وام زانی لاقم لە لەشم جیا بووتەوە، هەر بەمو دەست سەربازێکی تر شوێنی ئەوی پێشووی گرتەوەو جارێکی کەش لە لای چەپی خۆم بێ خەمبووم. کە زامدار بووم ناڵەو هاوارم لێوە نەهاتن، لەبەر ئەوە هیچ سەربازێکم نەیزانی برینداریم؛ ئاخرەکەی یەکێك لە سەربازەکانم کە دیبووی خوێن لە لاقم سەر دەکات، پێمی وت:میران، لاقی چەپت بریندارە!.. لەبەر ئەوەی سوور بووم لەسەر تێنو گوڕی

هێرشەکەمانو دەمویست لەناو سەربازەکانمدابمو باشتر پەلامار بدەن، هیچ گوێم نەدایە برینەکەم. من دەمویست (ئەلجاتیو) بە زیندوویی بگیرێت، بەڵام لەبەر ئەوەی زۆربە سەختی بەرەنگاریکردبوو،خۆی نەدابوو بە دەستەوەو کوژرا بوو، تەنها سێ کەس لە یاریدەدەرەکانی ، کە بەرانبەر بە من ناپاکیانکردبوو، دەستگیر کران، فەرمانمدا بە زیندوویی کەوڵبکرێن، لە کاتی کەوڵکردندا هەر سێکیان مردن. دوای داگیر کردنی شار فەرمانمدا دەستبکرێ بە کۆ کوژیو تاڵانکردن، کون بە کونی شار بپشکێنرێ، هەموو ژنو کچو کوڕی لاو بە دیلبگیرێنو بە پێی دەستووری یاسای جەنگ دابەشبکرێن بە سەر ئەفسەرو سەربازەکاندا، بۆ خۆیشیان سەر پشکبن، دەیانکەنە کەنیزەکو نۆکەر، دەیانکوژن، یان لە بازاڕدا دەیانفرۆشن، ئارەزووی خۆیانە...

ڕۆژی(١٩)ی شەووال، بۆ کاتی عەسر شەڕ تەواو بوو، لە شار چوومە دەرەوە بۆ ئۆردووگەیەکی خۆم. لەو کاتەدا ویستم سەیرێکی لاقم بکەم، بەڵام نەمتوانی لەسەر ئەسپەکەم دابەزمەخوارێ، سەربازەکانم دایانگرتمو بردمیانە ناو چادرێك، پۆشاکی جەنگیان لەبەرم داکەند، پزیشکی تایبەتی هاتو تیماریکردم، وتی: کەشکە ئەژنۆت بە خەستی بریندار بووە، دەبێ ماوەیەکی زۆر لە جێدابی تا چاکئەبێتەوە. وتم: ئەی ئەگەر لە جێدا نەکەومو بگەڕێم چی دەبێ؟! وتی: ئەگەر بگەڕێی زامەکەت پیس دەبێو دەگۆڕێ، یان لێتدەکا بە دەردێکی کوشندە، یان تاماوی دەشەلی.

شەوو ڕۆژێك لە ناو جێدا مامەوە، بۆ ڕۆژی دوایی داوامکرد کە بمخەنە سەر قەرەوێڵەیەكو بمبەن بۆ ناو شار تا بە چاوی خۆم هەموو شتێك ببینمو دڵنیابم کە فەرمانەکانم جێبەجێکراون. کوشتار تەواو بوو بوو، بە هەزاران لاشە لە کۆڵانەکاندا کەوتبوون، ژنیشیان تێدا بوو، ئەوانیش بەرەنگارییانکردبوو؛ تاڵان هەر بەردەوامبوو. بۆیە وام لە دانیشتووانی (تاشکەند) کرد تاکو ببنە پەندو ئامۆژگاری بۆ شارانو وڵاتانی تر!! ئەو چێژەی خەڵکان لە خواردنەوەی مەیدا هەستی پێدەکەن، من لە سەیر کردنی خوێن ڕشتندا هەستی پێدەکەم، کە دوژمنێکیشم بە دەستی خۆم دەکوشت گەلێك لە سەیر کردنی خوێنڕشتن زیاتر چێژم لێوەردەگرت، هەر بە خوێنڕشتن کارو باری وڵاتم هەڵدەسووڕاند! ئەمڕۆ (٣) سێ هەزار جەللادی تۆمار کراو لە قەڵەمڕەوی مندانو مانگانە مووچەی

تایبەتی خۆیان وەردەگرن!. ئەنجامی توندو تیژیی من بەرهەمی مەزنی هەیە، هەر بۆ نموونە، ئەگەر کاروانێك بەبێ پاسەوان لە (ئەنگوریە)وە –ئەنکارە– بەڕێبێت بۆ (سەمەرقەند)، کەس ناتوانێ چاوی تێببڕێتو، بێ‌وەی دەگاتە جێ.

تەشتێکی پڕ لە لیرە بخەرە سەر سەری منالێك، با لەم سەر بۆ ئەو سەر بە ولاتی مندا بگەڕێ، تا دەبێتە هەرزەکار، یەك لیرەی لێ کەم نابێتەوە، چونکە هیچ کەس ناوێرێ توخنیکەوێ. لە ولاتی مندا ناوی دزی نەماوە؛ لە هەر شوێنێکا دزییەکبکرێتو نەزانرێ دزەکە کێیە، یەکەو ڕاست دەستی لێپرسراوی ئەو شوێنە دەبڕم، چونکە دەزانم ئەگەر لێپرسراو پشتگیریو هاوکاریی دزنەکات دزی ڕوونادات. لەم ولاتە بەرینەمدا جەردەییو ڕێگریو دزی نەماون. گرانیونەبوونیم لە ناوبردن، سوالکردنم نەهێشت، مووچەی تایبەتیم بڕییەوە بۆ هەموو هەژارە کە لەلاکان، دوای ئەوە ئەگەر سوالیانبکردایە لە ملیان دەدرا. ئەوانەشیان کە ساخو تەواو بوون، داوامکرد کار بکەنو بژێویی خۆیان وەدەستبێنن، ئەوی کاری نەکردایە لە ناو دەبرا. بەر لە حکومڕانیی من بە دەیان هەزار لە نەوەی پێغەمبەری ئیسلام (د.خ) بە سوال دەژیان، بۆ ڕێزلێنان لەو هەموو سەییدانە، لە بوودجەیەکی تایبەت، کە بە پێی شەرع موسوڵمانان پێنج یەکی دەسکەوتی خۆیان بۆ تەرخانکردبوو، مووچەم بۆ هەموویان بڕییەوە. هیچ ولاتێك هێندەی ولاتی من ئاوەدان نەکراوەتەوەو بە ئاسوودەییو بێ‌خەم نەژیاوە. هیچ سەربازێك یان ژەندەرمەو پۆلیسێك نەیتوانیوە یەك تۆ سقاڵ ئەرك بخاتە سەر هیچ هاوولاتییەك، چونکە ئەگەر بیکردایە سەری دەپەڕێنرا.

ئەی کوڕانی من، ئامۆژگاریتاندەکەم، کە بوون بە فەرمانڕەوا لەسەر ڕێبازی من بڕۆن، بە زەییتان بە جەردەو لێپرسراوی دەوڵەتو پۆلیسا نەیەتەوە کە لەگەڵ دزانا هاوبەشن، ڕێز لە وەچەی پێغەمبەر (د.خ) بگرن، پشتگیریی زاناو شاعیرو نووسەرانو پیشەسازان بکەن. پەیمانمبدەنێ کە توخنی مەیو خواردنەوە نەکەون، چونکە سەرچاوەو دایکی خراپەکارییە، بەخواردنەوەو مەستی دەسەلاتتان لە کیسدەچێ.

بێینەوە سەر باسی شاری (تاشکەند)، یەك پیاوی گەنج نەما، ئەو ژنانەش کە بەرنگارییانکردبوو کوژران، تەنها منالو پیرو پەککەوتەکان مانەوە، ژنە لاوەکانیش دابەشکران بە سەر سەربازەکاندا. هەر شتێك هی بردنبوو نەما، هەموو شتێکی (ئەلجاتیو موحەممەد قولوق) ڕاگوێزرا بۆ (سەمەرقەند). دیوارو شوورەکانی تاشکەند وێرانکران، نەبا لە پەنای ئەو شوورەیە کەسێکیتر لێم یاخیبێ.

بە داگیر کردنی (تاشکەند) لە وڵاتی (ماوەرائەننەهر)دا شوێن نەما لە ژێر ڕکێفی مندا نەبێ. دوای ئەوە ماوەی حەوت ساڵم لە تەمەنی خۆم تەرخانکرد بۆ ئاوەدانکردنەوەی ئەو ناوچە بەرینو فراوانە. لە ڕووبـاری (جەیحوون)و(سەیحوون) چەندەها لقی گەورەم هەڵکردن بۆ ئەو زەوییانەی کە هەزاران ساڵبوو بێ ئاو بوون، یەك بە دووسەد تا چوار سەد بەرهەمی گەنمیان دەدا، هەموو جووتیارەکان دەوڵەمەند بوون. لە ساڵ (٧٧٥)ی کۆچیدا لەو ناوچەیەدا ئەوەندە گەنم زۆر بوو جووتیارەکان هەمووماڵەکانیان پڕ کردبوون لە گەنم، هەرچیشی جێی نەبووەوە لە دەشتەکاندامایەوە، لە بەرباران و بەفردا رزیو پوا. لەو ماوەیەدا گوزەرانی خەڵك زۆر باشبوو، ئەو بارو دۆخە کارێکی باشیشی کردە سەرمنو زیاتر ئارەزووم لە ژنبوو، دوو ژنم هەبوون، دوانی کەشم هێنانو چەندان کەنیزەکیشم بۆ خۆم هەڵبژاردن. لە ماوەی ئەو حەوت ساڵەدا بە خۆشی ژینم بە سەربرد، ژنی جوان، خواردنی باش، حەوانەوەی زۆر، ئەمانە هەموو تەمەڵیانکردم، لەگەڵ ئەوەشدا هەمیشە خەریکی سەر پەرشتیکردنی ئاوەدانکردنەوەی (ماوەرائەننەهر)و (خوارزم) بووم، لە کۆششدا بووم بۆ ئاوەدانکردنەوەی دەشتە فراوانەکانی نێوان دەریای (مازندەران)و دەشتەکانی (سیبریا)، هەموو لایەك بوو بە باخو کشتوکاڵ.

دوای ئەو حەوت ساڵە خۆشگوزەرانییە، ڕۆژێکیان شمشێرەکەی خۆم، کە سەنگەکەی هەزارودوو سەد مسقاڵبوو، لە کێلان دەرهێنا، بە دەستی ڕاستم هەندێك هەڵمسوڕاند، هەستمکرد زۆر قورسە، کە بە دەستی چەپم گرتم هەستمکرد قورسترە. ئەوە بوو حەوت ساڵ لەوەوپێش هەر لە بەیانییەوە تا ئێوارە ئەو شمشێرەم بەم دەستو بەو دەست لە گۆرەپانی جەنگدا

هەڵدەسووڕاندو دەموەشاند، بۆ ئەوەی هەست بە قورسایی‌و ماندوو بوون بکەم. زانیم خۆشگوزەرانی‌و ڕابواردن لەگەڵ ژنانی جوان‌و ناسک‌و شۆخ‌و شەنگدا، سەرەڕای شەلبوونی لاقی چەپم، ئەمانە هەموویان زەمینەیەکی زۆر لە بار بوون بۆ تەمەڵی‌و سستیم. خۆممدایە بەر پلارو توانج‌و لەبەر خۆمەوە وتم: ئەی پیاوی دابەستەو تەمەڵ، تۆ ئەگەر شەلیشبی، خۆ توانای شمشێربازی‌و تیر هاویشتنت هەیە، خۆ نابێت دەردی تەمەڵی لەشکرە کەشت بگرێتەوە، ئەی تەمەڵی‌و لێنەهاتوویی میرەکان‌و لەشکرەکانیان نەبوونە هۆی ئەوەی تۆ بە ئاسانی تێکیانبشکێنی لەناویانبەریت‌و وڵاتەکانیان داگیر بکەیت! ئایا دەکرێ هەموو کۆشش‌و هەوڵت ئەوە بێ وەکو ئاژەڵ بخۆیت‌و بخۆیتەوەو بخەوی!. تەنانەت نەتوانی هەر هیچ نەبێ دەیەکی باپیرت (جەنگیزخان) لەم جیهانە فراوانە داگیر بکەیت!.. ئەو پەیمانانەی لە سەردەمی لاویتا داتن چییان لێهات! ئەی نەتدەوت دەبێ سەرانسەر دنیا داگیر بکەیت‌و تەنها دروای یەکگرتووی تۆ ڕەواجی هەبێ‌و تەنیا پەیڕەویی یاسای تۆ بکرێت!! هەر لەو ساتەدا بڕیارمدا کە یەکەم مەرجم ئەوەبێ دەست لە خۆشگوزەرانی‌و ڕابواردن هەڵگرم، خۆم لە ژنەکانم دوورخەمەوەو لەو بیابانەدا درێژە بە ژیانم بدەم.

دەستوورمدا کە شەش قۆناخ دوور لە (سەمەرقەند)ەوە ئوردووگە هەڵدرێ‌و ڕوومکردە ئەوێ. لەوێ دەستم بەرەو ئاسمان بەرزکردەوەو پەیمانم بە خوای خۆمدا کە تا ئەو ڕۆژەی لە گۆڕەپانی شەڕ دەگەڕێمەوە توخنی هیچ ژنێک نەکەوم. سێ ساڵی تەواو لە سەریەک لە بیاباندا ژیام‌و لە کاتی پێویستیدا نەبوو بێ پێم نەناوەتە ناو شارو تا پێمکرابێ لە باوەشی ژنەوە دوور بووم. زستانانیش زۆر سارد بوو، سەراپا بیابان بە بەفر دادەپۆشرا. بەیانییەکیان دوای نوێژی بەیانی فەرماندەکانم هاتنە چادرەکەم، مشتێک لیرەم لەبەر باخەڵم دەر هێناو وتم: ئێستا بیابان بە بەفر داپۆشراوە، هەر کامێکتان ئایەتێکی قورئان بخوێنێ کە باسی بەفری تێدا بێت ئەم لیرانەی پێشکەشدەکەم. هەر یەکەیان بەرەو چادری خۆی کشا تاکو ئایەتێک بدۆزنەوە دەربارەی بەفربێت. لەبەر ئەوەی هەموو قورئانی پیرۆزم لەبەر بوو، دڵنیا بووم کە ئایەتێک نییە باسی بەفری تێدا بێت، چونکە لە عەرەبستاندا بەفر نابارێ!.. بۆ نیوەڕۆ

ئاگادارمکردن‌و وتم: ئەگەر قورئانتتان باش بخوێندایە دەتانزانی لە قورئاندا ناوی بەفر نەهێنراوە. کورە گەورەکەم پرسی: ئەی بۆچی خوا لە قورئاندا وتویەتی (لا رطب ولایابس الا فی کتاب مبین) واتە: هیچ تەڕو وشکیەك نییە لە قورئاندا باس نەکرابێ.

وتم: کورم عیلمی قورئان نەزانی مانایی ئایەتی قورئان نازانی، ئایەتی قورئانی کەلامی خوایە، خۆی لە قورئاندا دەڵێ: مانایی هەندێ لە وتەکانی قورئان بۆ هەموو کەس روون نییە مەگەر ئەوانە کە خوێندنی خۆیان بۆ حاڵی بوون لە کەلامی خوا ئامادە کردووە.

کتابی مبین بریتییە لە کۆمەڵێ مانایی ئایەتی قورئان چ مانایی ئاشکرا یا پەنهانی، دەبێ ئەوانە بە هێزی عیلم دەرك بکەیت وە بزانیت پاشان بۆت ئاشکرا دەبێ کەشتێك لە دنیادا نییە لە قورئاندا باسی لێوە نەکرابێ.

خوا دەڵێ (لا رطب ولایابس الا فی کتاب مبین) نالێ الا فی القران....، یاخود، الا فی الفرقان خوا لەبەر ئەوە دوو وشەی (کتاب)، (مبین) نوسیوە، تا تێبگەین مەبەستی مانایی پەنهانی ئایەتی قورئانە ئەو مانایەش دەبێ بۆ زانینی ئایەتەکانی قورئان شی بکەیتەوە. تا مانایی باطنی روونبێتەوە.

پاشان لە دیمەشق (ابن خلدون)م بینی هەمان وتەم دووبارە کردەوە زۆر خۆشحاڵبوو وتی: تا ئێستا کەسم نەدیوە بەم جۆرە بتوانێ کەلامی خوا مانا بکات!..

# حەوتەمین بەش

## بەرەو زێدی فیردوسیو جەنگی نەیشاپوور

چنین گفت گای جوشن کارزار — بر ا سودی از جنگ یك روزگار*
کنون گار پیش امدت سخت باش — بهر کار پیراهن بخت باش

هۆنراوەکانی فیردەوسی لە گوێما دەزرنگانەوەو نەمدەتوانی ئارامبگرم. حەوت ساڵی ڕەبەق پیشەم خواردنو خەوبوو. شمشێرو پۆشاکی جەنگم وەلا نابوون. ئەو کاتە هاتەپێشێ کە بەتەواوەتی بەرگی جەنگ بپۆشمو دەست بدەمە شیرو ڕووبکەمە ئەو سەر زەمینەی کە (فیردەوسی) بەر لە (٣٥٠) ساڵ ئەم هۆنراوەیەی تێدا وتبوو. کاتی ئەوە هاتبوو بۆ بە دیهێنانی ئاواتو ئارەزووەکانم هەنگاو بنێمو لە (خوراسان)ەوە دەستبکەم بە گرتنی دنیا!

بیستبووم کە خاکی خوراسان بۆنخۆشەو هەر خوراسانییەك بگری شاعیرێکی گەورە، یان تێگەیشتوویەکی بەرزە. وای بۆ چوو بووم کە هەر چۆن خاکی سەمەرقەند چاکترینو شیرینترین کاڵەکی ئەم سەر زەمینەی هەیە، خاکی خوراسانیش زانستو وێژە بەرهەمدێنێ، شاعیرانو دانایانیشی بەشێکن لە دلاوەرانی جیهان؛ یەکێك لەو بلیمەتانەش (فیردەوسی) بووە کە بەرهەمی نووسینی خۆی بۆ پەروەردە کردنی دلاوەران تەرخانکردووە.

دەمویست بڕۆمو لەگەڵ پیاوانی خوراساندا پەنجەبپێکم تا بزانم لە شمشێر وەشاندندا کاممان زیرەکترین. سەربازگەکەمم کردە مەیدانی جەنگ، هەموو ڕۆژێ هەر لە بەیانییەوە تا ئێوارە، خۆمو ئەفسەرو سەربازەکانم سەر قاڵی ڕاهێنانو مەشقی جەنگبووین. بۆ ئەوەی تەمەڵی لە لەشما دەرکەمو بۆ جەنگی ئایندە ئامادەبم دەستمکرد بە مەشقی سەخت، شمشێربازیم دەکرد، ئەسپم تاو دەدا، گورزم هەڵدەدا، تیرم دەهاویشتو زۆرانبازیمدەکرد. زانیم واخەریکە چل

---

* وتی ئەی زرێی جەنگ، سەردەمێك کەسێکت لە مەترسی جەنگ ئاسوودەو بێ خەمکرد، ئێستاکەو هەمیشە ئەم ڕێبازە بەرمەدە، لەبەرخاتری من ببە بە کراسی بەختو شادی.

وەرگێڕی کوردی

ساڵ لە تەمەنم تێدەپەڕێت، وەکو ئەشڵێن مرۆڤ کە بوو بە چل ساڵ بە تەواوەتی ئاوەزو لەشی پێدەگەن. مووسا(د.خ) لە چل ساڵیدا لە کێوی (طوور) بووە پێغەمبەر، پێغەمبەری ئێمەش (د.خ) لە تەمەنی چل ساڵیداو لە ئەشکەوتی (حەڕا) سروشی بۆ هاتە خوارێ‌و بوو بە پێغەمبەر.

ئایا لەبەر ئەمە بووبێ کە لەو تەمەنەدا بە ئاگا هاتم بۆ ڕادانی تەمەڵی‌و سستی‌و بڕیارمدا لە ڕابواردنەوە بە دووربم! ئایا ئەگەر تەمەنم نەگەیشتایەتە چل ساڵ هوشیار نەدەبوومەوە؟! ئەوە بوو کە تەمەنم بوو بەچل ساڵ بە تەواوی پەشیمانبوومەوە. هەر چۆنێکبوو لە ساڵی (٧٧٧)ی کۆچیدا ئیش‌و کارم تەنها خۆڕاهێنانبوو لەسەر هونەرەکانی جەنگ، ڕۆژانە لەگەڵ پاڵەوانەکانی خۆمدا زۆرانبازیمدەکرد، ڕێکدەکەوێت لە جەنگدا دوو کەس بەرەنگاری یەکتر دەبنەوەو دەستدەدەنە یەخەی یەکتر، دیارە ئەوەی بەهێزترەو باشتر شارەزای هونەری جەنگە ئەوی‌تر دەدا بە زەویداو دەیکوژێت.

دڵنیا بووم کە لێپرسراوان‌و ئەفسەران‌و سەربازەکانم وەکو خۆم بەهێزو چالاکبوون‌و سستی‌و تەمەڵییان نەماوەو ئامادەی جەنگن. کە بەهاری ساڵی (٧٧٨) هاتەبەرەوەو گوانی ماینەکان پڕ بوون لە شیر، وەکو دابو نەریتی ناوچەکە، دانیشتووانی شاری سەمەرقەندیش لە شار دەرچوونە دەرەوە بۆ سەیرانی دەشت‌و دەری سەوزوجوان‌و خواردنی فرۆی ماین، فەرمانی جووڵاندنی لەشکرم دەرکرد، لە پێشەوە دوو ڕەوەی مەزن لە ئەسپی بیابانم پێشخست‌و داوامکرد لە سنووری خوراساندا جێگیربکرێن تاکو لە کاتی هێرشبردندا لە زیادە ئەسپە زۆرەکان کەڵك وەربگرین‌و بتوانین بێ وەستان، شەوو ڕۆژ ڕێ ببڕین؛ دەستووریشمدا کە وشکە ئاڵف‌و کاو وێنجەیان بدەنێ، چونکە ئەسپێك لە دەشتا بلەوەڕێ‌و سەوزەگیا بخوات ناتوانێ بۆ ماوەیەکی زۆرو بەردەوام غار بدات، بەرگە ناگرێ‌و ئەپرووکێ.

یەکەم ویست‌و ئامانجم لە خوراساندا داگیرکردنی شاری (نەیشاپوور) بوو، چونکە شارێکی زۆر دەوڵەمەند بوو، ناوەندێکی گەورەو فراوانی بازرگانیبوو، ڕۆژانە دوو سەد کاروانی گەورە ڕوویاندەکردە شار، یان لە شارەوە بەرەو چین‌و ڕۆم دەکەوتنەڕێ، ئەو شارە مەڵبەندی لیرەیەکی زۆرو دراوی زیوو ئاوریشمێکی زۆر بوو، وەکو بیستبووم ئەوەندە ئاوریشمی تیا بوو، بەشی ئەوەی دەکرد ڕێگەی نێوان سەمەرقەندو نەیشاپووری پێ داپۆشرێ!. لە

خوراساندا، بێجگە لە شاری نەیشاپوور، شاری گەورەتر هەبوون وەکو (سەبزەوار)و (بەشرویە)، یەکەمیان لە باکووری خوراسانو دووەمیان لە باشووردابوو، ئاگادار کرابووم کە سەبزەوار گەورەترین مەڵبەندی فەرشچنینی دنیایەو سێ هەزار کرێکار لە کارگەی فەرشچنیندا کار دەکەن، دەربارەی (بەشرویە) ئاگادار کرابووم کە سەرانسەری دانیشتووانی داناو دانشمەندن، تەنانەت وڵاخدارو شوانو گاوانو دڕکفرۆشو چیلکە فرۆشەکانی ئەو شارە وەکو موفتیی شار لە زانستا شارەزانو دەتوانن کتێبە عەرەبییەکان بخوێننەوەو واتایشیان بزانن، من بۆ خۆم زۆر مەراقمبوو ئەو خەڵکە هەڵکەوتووە سەیرە ببینمو بزانم بەو جۆرەن کە ئاگادار کرابووم.

بۆ ئەوەی کەس نەزانێ مەبەستم داگیرکردنی خوراسانەو بتوانم لە پڕیدەم بەسەریا، هیچ کەسم لە مەبەستی خۆم ئاگادار نەکرد، وام لە ئەفسەرو گەورە لێپرسراوەکان گەیاندبوو، کە ئەمەوێ هێرشبەرمە سەر (ئەرشك ئاباد). بەڵام لەبەر ئەوەی ڕێی (ئەرشك ئاباد) بۆ (نەیشاپوور) زۆر سەختبوو، ویستم لە ڕێگەیەکی تەختانەوە بەرەو نەیشاپوور بکشێم تاکو سوارەکانم بتوانن بە پڕتاوو خێرا ڕێگە ببڕن.

کە گەیشتمە (مەرو) چوار وڵاخداری شارەزای ئەوێم بەکرێگرتن بۆ ڕابەریکردنمان بەرەو شاری (نەیشاپوور)، چونکە کەس وەکو وڵاخدار شارەزای ڕێگە نییە، بە تایبەتی هەموو تەمەنی ڕێکردنە لە شارێکەوە بۆ شارێکیتر.

من وام دەزانی کە بەهاری (ماوەرائەننەهر) جوانترین بەهاری جیهانە، بەڵام کە بەهاری خوراسانم بینی، بۆم دەرکەوت کە ئەم جوانترە؛ هەموو بناری کێوەکان بە سەوزە گیاو گوڵاڵەسوورە داپۆشرا بوونو ڕووبارە سپییەکان لە سەر ڕا هاژەیاندەهات، ئەوەندەدیمەنەکان جوانو دڵکێشبوون، سەرەڕای وەستانو پشوودان بۆ نوێژ کردن، بوارم بە خۆم نەدا کە بۆ ماوەیەکی زیاتر سەیری دیمەنە ڕەنگینەکان بکەم. هەرچەندە دەمزانی کەس ناتوانێ پێشمان بکەوێت، دەستورم دا ئەگەر کەسێك ویستی پێشمان کەوێت تەنانەت ئەگەر نامە بەریش بێت بیکوژن !چونکە لە کاتی لەشکر کێشیدا کوشتنی چەند کەسێك ئەوەندە ئەهمیەتی نییە.

ڕۆژی هەینی گەیشتمە دێی ( دەبالا ) لەوێدا مزگەوتێك هەبوو کاتی نوێژیش چۆڵ بوو! پرسیم ئێرە مەلای هەیە یان نا؟ پیاوێکی ڕیش سپییان

هێنایە لام مێژەر بەسەر بوو پرسیم خەڵکی ئاوای چ دینێکیان هەیە؟ ووتی: موسوڵمانن، وتم باشە بەم ڕۆژی هەینی‌یە بۆچی مزگەوت چۆڵە، وتی خەڵکی لەماڵ نوێژ ئەکەن، وتم نوێژی هەینی‌یش؟ وتی بەڵێ، پێم ووت : کەواتە تۆو خەڵکی ئەم دێیە کافرن، بەسەر سوڕمانەوە وتی بۆ؟ وتم: لەبەرئەوەی ڕۆژی هەینی حەتمەن دەبێ لەناو مزگەوتا جەماعەت بکرێ. وتم قورئا دەخوێنی، وتی‌بەڵێ. وتم درۆ دەکەی!!، ئەگەر قورئانت بخوێندایە دەتزانی‌گرنگی نوێژی هەینی چەندە و وە خواوەند لە قورئاندا چەند گرنگی پێ داوە. لە سورەتی جومعەدا لە سێ ئایەتا ئەرکی نوێژی هەینی تەئکید کردووە، ئینجا ئایەتەکانم بۆ خوێندەوەو ووتم: مانایان دەزانی؟ وتی نەء.

من زۆرسەرم سوڕما تا ئەو کاتە نەم دیبوو پێشەوای ئاینی مانای ئایەت نەزانێ، ئەویش مانای ئاشکرای. پێم ووت زمانی عەرەبی نازانیت؟ وتی نەء، وتم ئەی لەم ئاوایی‌یەدا چ کارەیی و چۆن ژیانت دەگوزەرێنی؟ وتی پێش نوێژی دەکەم، کاتی نوێژ ئیمامەتیان بۆ دەکەم لە ئێوارانلدا. وتم چۆن پێش نوێژی دەکەیت و زمانی عەرەبی نازانیت؟! کەسێك زمانی عەرەبی نەزانێ ناتوانێ پێش نوێژی بکات، چونکە مانای ئایەت نازانێ و ناتوانی بە تەواوەتی نوێژ بکات .

وتی: پێش منیش باوکم پێش نوێژی بۆ ئەم دێیە کردوە!، وە عەرەبیشی نەزانیوە. پاش ئەوەی گرنگی نوێژی هەینی‌یم بۆ باسکرد، بە بانگ دەرم ووت بانگ بدە، تا لەگەڵ سەربازەکانمدا نوێژی جەماعەت دابەستین. نوێژمان کردو کەوتینەوە ڕێ و لە کوشتنی کابرا چاوپۆشیم کرد چونکە لە شەرعدا نەزان و شێت جیاوازی‌یان نی‌یە.

کەلەنەیشاپوور نزیکبووینەوە، دەبوایە بە دەوری گردێکا پێچبکەینەوە بۆ ئەوەی ئاشکرا نەبین، بەم جۆرە ڕێمان دوورکەوتەوە، لە پڕ سەرمان لە تەختانێکەوە دەرچوو کە نەیشاپوور کەوتبووە ڕۆژهەڵاتیەوە، ڕێگا پڕبوو لە کاروانو کاروانی، هەندێ سوار کە لەشکرەکەی منیان بینی، بەرەو نەیشاپوور کشان، خێرا تیر بارانکران، هەندێکیان لێکوژران، ئەوانی‌تر خۆیان گەیاندە شار .دەمویست بە زووترین کاتو بە جۆرێ بگەینە شار کە پیا نەگەن دەروازەکانی شار دابخەنو قایمیانبکەن، بەڵام لەبەر زۆریی کاروانو خەڵك نەماندەتوانی بە

ئاواتی خۆمان ئەسپەکانمان تاو بدەین، لەسەرێکی کەشەوە لەبەر ئەوەی تا چاو برکا کشتوکاڵبوو، نەماندەتوانی بدەینە لاڕێ.

هەرچی توانام هەبوو خستبوومە کار بۆ ئاوەدانکردنەوەی دەشتەکانی (ماوەرائەننەهر)، بە تایبەتی دەشتو دەری سەمەرقەندو بوخارا، بەڵام کە دەشتەکانی دەورو بەری نەیشاپوورم بینین بۆم دەرکەوت کە ناوچەی نەیشاپوور گەلێك ئاوەدانترو گەشاوەترە.

کاتی خۆر ئاوابوون گەیشتمە نەیشاپوور؛ هەموو دەروازەکان داخرابوون، پاشان زانیم بۆ زیاتر قاییمی، پشت دەروازەکان بە بەردی گەورە گەورە هەڵچنرا بوو،بەڵام دانیشتووانی شار تا ئەو کاتە بێ ئاگا بوونو نەکەوتبوونە خۆ بۆ ئازووقە خستنو پێداویستییە گرنگەکانیتر. بۆ ئەوەی لە دێهاتەکانی دەورو بەرەوە یارمەتیو کۆمەك نەگاتە شار، دەستوورمدا کە هەر ئەو شەوە هەندێك لە ئاواییە نزیکەکان داگیر بکرێنو ڕێ نەدرێت کەس ڕووبکاتە شار. دوای دوو ڕۆژ لە گەمارۆدانی شار، هەستمکرد کە سەربازەکانم زۆرشەکەتو ماندوون، بۆیە بە پێویستم زانی چەند ڕۆژێك بحەسێنەوەو پشوو بدەن، لە هەمان کاتیشدا داوام لێکردن دەسبەرداری مەشقی سەخت نەبن.

لە وتەی گوند نشینەکانی ئەو ناوە بۆم دەرکەوت کە دیوارو شوورەی شار لەبەرد دروستکراونو بناغەش دە گەز قووڵە!! بەڕاستی باوەڕم بەمە نەکرد، چونکە هەڵکەندنی بناغەی لەو جۆرە زۆر سەختو ناڕەحەتە، بەڵام بە پێی ئەو تەپۆلکانەی لە دەورو بەری شاردا هەبوون وا پێدەچوو بناغەکە وابێ!!.. بەوەی باشبوو بە دەوری شوورەکەدا خەندەق هەڵنەکەندرابوو، بەمەش کاری ئێمە ئاسانتر بوو. لێکمدایەوە کە ئەگەر ئەو بناغەیە دە مەتر قووڵبێت، دیوارەکان بە بارووت هەڵناتەکێنرێن، بۆیە پلانێکی ترم ڕەچاو کردکە بریتیبوو لە: یەکەم، هێرشبردنی ڕاستەوخۆ بۆ سەر دیوارەکانو هەر چۆنێ بووە سەرکەوینە سەرەوە، دووەمیش، بە هۆی گەمارۆوە شار لە پەلوپۆ بخەین تا هەموو دانیشتووان ناچار بکەین خۆیان بدەن بە دەستەوە. دوای لێکۆڵینەوە بۆم دەرکەوت کە هەندێ تونێل قەڵاکان دەبەستنەوە بە دەرەوەی شار، دەرکی تونێلەکانمان دۆزینەوە، هێزی تایبەتیم تەرخانکرد بۆ بڕینی هەر پەیوەندییەکی شار بە دەرەوە. لە دووەمو سێیەم ڕۆژی گەمارۆدا هەموو ئەو جۆگەو کارێزانەمان کوێرکردنەوە کە بۆ شار هەڵکرابوون. لە چوارەم ڕۆژدا

فەرمانمدەركرد كە هەرچی گوندنشین بەردەستدەكەویٚ كۆیانبكەنەوە بۆ دار برینی ئەو ناوە، بە تایبەتی چنارو دارە بەرزەكانی‌تر، تاكو بتوانین زۆرترین قەڵاو بورجی جووڵاو دروستبكەین؛ هەرچی دارتاشی دێهاتو شارۆچكەی ئەو ناوە هەبوون، تا شاری (طووس)، هەموویانمان كۆكردنەوە بۆ دروستكردنی بورجەكان، هەموو گورجوگۆڵو چالاكانە دەستبەكار بوون، چونكە دەیانزانی ئەگەر كەمتەرخەمیبكەن، یان ڕابكەن دەكوژرێن. دەستوورمدەركرد كە سەربازەكانم بكەونە تاڵانكردنی ناوچەكە بۆ دابینكردنی بژێویی خۆمانو كرێكارەكان، هەروەها بۆ دابینكردنی ئالیكی ئەسپەكانیشمان.

لەناو ڕیزی لەشكرەكەما ژمارەیەكی زۆری خەڵكی (چەتین) هەبوون، كە دەكەوێتە ناوچەی (سیبریا)وە. ئەمانە هەر گۆشتی‌كاڵو گۆشتی سەگیان دەخوارد، هەر چۆنێ بووتوانیم وایان لێبكەم كە دەست لە خواردنی گۆشتی سەگ هەڵگرن، بەڵام نەمتوانی خواردنی گۆشتی كاڵیان پێ تەرك بكەم. لەبەر ئەوەی بە چەوریی گۆشتی مەڕ سەخڵەتدەبوون گۆشتی مەڕیشیان نەدەخوارد، بەڵام بە ئارەزووی خۆیان بە كاڵی گۆشتی ئەسپیان دەخوارد، هەر ئەسپێك پەكیبكەوتایە، یان كەلەلابوایە دەدرا بەوان تاكو ورگیانی پێ پڕبكەن. ئەم سەربازانەم بێجگە لە برسییەتی، لە هیچ نەدەترسان، هێندەی خۆم نەبەردو ئازا بوون، بەڵام لە هۆشو بیرو ئاوەزا وەكو منداڵێكی سادە بوون، هەر فەرمانێكیان بە سەرا بدرایە بێ سڵەمینەوە ڕادەپەڕین بۆ ڕاپەڕاندنی!

داوام لە سەربازانی (چەتین) كرد لەبورجەكانەوە خۆیان بگەیەننە سەر دیوارەكان، بەرهەڵستكاران لە ناوبەرنو دەروازەكانمان بۆ بكەینەوە، لە هەمان كاتیشدادداوام لە سەربازەكانی‌تر كرد لە تیر بارانو قۆچەقانی هاویشتنا دەستبەكار بن، بە ئەزموون بۆم دەركەوتبوو كە بەردی قۆچەقانی دەستو بازووی بەهێزترین جەنگاوەر لە پەلوپۆ دەخات.بۆ خۆیشم بە سواری بە دەوری شاردا دەگەڕامو دەچووم بۆ سەرپەرشتیكردنی بورجەكانو جەنگی سەربازەكانم دژی بەرهەڵستكاران. بۆ یەكەم جارو لەو شەڕەدا بیرمكردەوە كە لە تەقینەوەی بارووت كەڵك وەربگرم بۆ پەككخستنی دوژمن لە قەڵایەكی سەختو قاییمدا، ئەویش بەم شێوەیە: گۆزە پڕبكەم لە بارووت، پلیتەی پێوەببەستم، پلیتەكە دابگیرسێنریو فڕێبدرێتە ناو دوژمنو لە ناویانا بتەقێتەوە. ئەم بیرۆكەیەم لە جەنگی نەیشاپووردا پیادەكرد، هەروەها لە

جەنگی (ئەنکارە)شدا دژی لەشکری (سولّتان بایەزید)ی عوسمانی کەڵکم لە گۆزەی باروت وەرگرت.

شارەکانی تری ناوچەی خوراسان، وەکو (طووس)، سەبزەوار، ئەسفراین، ئاگادار بوون کە نەیشاپوور گەمارۆدراوە، لەگەڵ ئەوەشدا نەهاتن بە سەردەمیەوە، ئەگەر بە لەشکرێکی بەهێزەوە بهاتنایە سەرمان، بەسەریشمانا سەرنەکەوتنایە لەوانە بوونا چارمانبکەن دەست لە گرتنی ئەو شارە هەڵگرین‌و دوورکەوینەوە. کە شەڕ هەڵگیرسا، بۆم دەرکەوت فەرمانڕەوای شار بێ ئاوەزو بێ بەهرەیە، خۆ ئەگەر بۆ پەرچدانەوەی هێرشەکەمان مەنجەنیق بەکار بهێنرایە، زیانێکی گەورەمان لێدەدرا. سەربازەکانی دوژمن تەنیا بە شیرو ڕم بەرهەڵستیاندەکردو هیچی تری ئەوتۆیان بەکار نەدەهێناکە نیشانەی کارامەیی‌و هونەری جەنگیی. کە سەربازانی (چەتین) بەڕێبوون، داوام لێکردن پاچ‌و تەشوێ لەگەڵ خۆیاندا بەرن بۆ هەڵوەشاندنی دیوارە هەڵچنراوەکانی پشت دەروازەکان، ئاگاداریشمکردن کە دەستەیەکی تریشیان دەستبەکارەکان بپارێزن‌و چاك ڕووبەڕووی دوژمن ببنەوە، (جیهانگیر)ی کوڕیشم لە تەکیانا نارد، لەم کارەدا دوو مەبەستم هەبوون یەکەمیان:بۆ ئەوەی کوڕەکەم هەست بە مووچرکەی مەرگ بکات‌و ترسی قەڵاگرتن لە دڵیا دەرچێ؛ تا ئەو ڕۆژە (جیهانگیر) نەچوو بووە ناو قەڵایەکی گەمارۆ دراوەوە، نەیدەزانی سەرەنجامی چۆن دەبێت؟. دووەم مەبەستم ئەوە بوو هەموو لێپرسراوان‌و ئەفسەران‌و سەربازەکانم بزانن کە کوڕە لاوەکەم بەختدەکەم. جیهانگیری کوڕم وەکو سەربازانی (چەتین) بەرگی جەنگی پۆشی‌و بەڕێبوو.

پاش نوێژی نیوەڕۆ دەستمانکرد بە هێرشی توندو بەهێز، لە هەموو بورجەکانەوە بە تیرو قۆچەقانی بەربوویتە دوژمنی بەرهەڵستکارو سەرمان لێشێواند، لە هەمان کاتدا سەربازانی (چەتین) لەگەڵ (جیهانگیر)ی کوڕمدا سەرکەوتنە سەر دیوارەکان، یەکەو ڕاست جەنگێکی زۆر سەخت‌و گرنگ لە نێوان ئەوان‌و بەرهەڵستکاراندا ڕوویدا،چەند سەربازێکم خرانە خوارەوەو مردن، ئەوانی تر بەو دیودا چوونە خوارێ، پەیتا پەیتا چەند کۆمەڵێك سەربازم ناردن بە هانایانەوە. سەربازەکانم لە بیست بورجەوە، کە کەوتبوونە ئەم لاو ئەو لای دەروازەی ڕۆژهەڵاتەوە چوونە سەر دیوارەکەو لە هەمانکاتدا هەستمکرد سەربازەکانی ترم لە هەموو لایەکەوە بە گەرمی هێرشدەبەن،

سەردەکەونە سەر دیوارەکانو بەو دیودا دەچنە خواریّ. دەنگی شیوەنو شەپۆری دانیشتووانی شار بە چەشنێك بەرزبووەوە هەر دەتوت ڕۆژی بەریّ (حەشر) هەستاوە.

دەمەو عەسر چوومە سەر دیوارەکە، سەیرمکرد ژمارەیەکی زۆر لە سەربازەکانم کوژراون، بەڵام دەستەیەك لە (چەتین) بە پاچ خەریکی ڕووخاندنی دیواری هەڵچنراوی پشت دەروازەکە بوون، ئەوانی تریش دژبە سەربازانی دوژمنو دانیشتووانی شار دەجەنگانو هاورێکانی خۆیانیان دەپاراستن تاکو بتوانن دەروازەکە بشکێنن. کە دڵنیا بووم سەربازەکانم گەیشتوونەتە پشت دەروازەکە، فەرمانمدا لە دەرەوە خەریکی شکاندنیبن.دوای سەعاتێك دەروازە کرایەوەو سەربازەکانم لافاو ئاسا هێرشیانبرد، داوام لێکردن تا دانیشتووانی شار داوای بەخشینو لێبوردن نەکەن، هەر کەسیان بینی بیکوژن چونکە دژ بە من جەنگاون!... خێرا دەستوورمدا کۆمەڵێك سەرباز خۆیان بگەیەننە دەروازەی ڕۆژئاوای شارو تێکیبشکێنن تاکو بێ خەمو بێ ترسبین. کە دەروازەی ڕۆژهەڵاتمان شکاند، بینیم کە بە جاریّ وڕەی جەنگاوەرانی دوژمن هاتۆتە خواریّ، بەشێکیان ویستیان لە دەروازەکەوە هەڵبێن بەڵام کوژران، ئەوەی بە رەنگارمانبووەوە کوژرا، ئەوەیشی داوای لێبوردنی کرد بەخشرا. بەر لەوەی تاریکی دابێت دەروازەی ڕۆژئاواش کرایەوە، شەڕ تا بەرەبەیان درێژەیکێشا. شەویّ ئاگادارکرام کە جیهانگیری کوڕم ماوە، بەڵام کەمێك بریندارە، کە گەیشتمە لای، داوام لێکرد درێژە بە جەنگ بدات بۆ ئەوەی قاڵو لێهاتووتربێ.

بۆ بەیانی فەرمانڕەوای شار کە ناوی (میر حسێن)بوو، بە قۆڵبەستراوی هێنرایە بەر دەمم، پاڕایەوەو وتی: ئەی ئەمیر(تەیموور) تۆ سەرکەوتی، ئێستا ئەیشاپوور هی تۆیە، بەزەییت بە بەندەکانی خوادا بێتەوە، سۆزت بنوێنەو لە کۆکوژییان چاو پۆشیبکە... وتم: ئێوە لە ڕووی منا دەروازەکانتان قایم داخستن، زەحمەتێکی زۆرتان دایە بەرمن، بەو پەڕی هێزتانەوە بەرەنگاریتانکردم، ئێوە پێشیاوی بەزەییو سۆز نین!..وتی: ئەی ئەمیر (تەیموور)، من فەرمانمدەرکرد بۆ قایمکردنی دەروازەکانو بەرەنگاربوونەوە لەگەڵ تۆدا، تەنیا هەر من تاوانبارم، دانیشتووانی شار بێ تاوانن، من بکوژە!.. وتم: ئەگەر تۆ سەرکەوتیتایە ئێمەت دەبەخشی؟! وتی: باووباپیرانم لە شەڕدا تووڕەو بێ بەزەییبوون، تۆ دەبێ دوای سەرکەوتن دلێریو جوانمەردیی خۆت

بنوێنی!.. وتم: من ناتوانم لە دابو نەریتی جەنگ لابدەم، دانیشتووانی شار بەرهەڵستییانکردووە، دەبێ ڕەشە کوژی بکرێن! ئەگەر ئەم دەستوورو نەریتە بگۆڕم ئیتر ناتوانم درێژە بە جەنگوداگیر کردنی وڵاتان بدەم! دەبێ سەرانسەری جیهان بزانن هەر کەس بەرەنگارمبێتەوە دەکوژرێت؛ دوای کۆکوژیی نەیشاپووریش شارەکانی تری خوراسان لە ئەرکی خۆیان ئاگادار دەبن، هەر کە لەشکرم گەیشتە سنووری ئەو شارانە دەروازەکانی شار والآ دەکەنو نایانگرن. پاشان فەرمانمدا بە جەللاد، سەری (میرحسێن)ی لە لەشی جیاکردەوە، ڕەشەکوژیی شاریش تا نیوەڕۆ درێژەیکێشا، پاشان ڕێمدا بە سەربازەکانم بە ئارەزووی خۆیان تالآنبکەن.

گەنجینەکانی بازرگانەکان ئەوەندە کاڵاو شتومەکیان تێدا بوو، ناچار بووین بۆ ڕاگوێزانو بردنیان بۆ سەمەرقەند هەموو وڵاخدارەکانی دەوروپشتو ناوچەکە بەکریبگرین. وەکو دابی خۆم لە کوشتنی زانایانو شاعیرانو پیشەکاران چاوپۆشیمکرد، بەڵام دەستوورمداو فەتوام دەرکرد بۆ دابەشکردنی ئافرەتە لاوەکانی شار بەسەر جەنگاوەرەکانمدا.

ڕاگوێزانی تالآنیو ڕووخاندنی دیوارو شوورەی شار مانگێکی تەواویان خایاند. بۆ تەواوکردنی هەموو کارەکان، جیهانگیری کوڕم لە نەیشاپوور مایەوە، خۆیشم بە سوپاوە ڕووم کردە شاری (طووس)، بەبێ هیچ بەرهەڵستکارییەك چوومە ناو شار، دەستم بۆ کەس درێژ نەکرد. دانیشتووانی (طووس)یش وەکو خەڵکی نەیشاپوور عەگاڵیان دەکردە سەریان، بەڵام کڵاویان نەبوو؛ لەوەوبەر بیستبووم کە عەگاڵ لە خوراسانەوە بڵاوبۆتەوە بۆ وڵاتە موسڵمانەکانی تر. (شێخ عومەر)ی کوڕم لەگەڵما بوو، کە بینی خەڵك بە عەرەبی ئەدوێنو عەگاڵیان بەسەرەوەیە، وتی: بۆچی ئێرە حیجازە؟! وتم: خەڵکی حیجاز عەگاڵ لەسەر ناکەن، هەر کەس عەگاڵ ببەستێ ئەوە لاسایی خەڵکی خوراسان دەکاتەوە، چونکە عەگاڵ سەرپۆشو سەربەستی ناوچەی خۆراسانە، دوای ئەوەی کە عەرەبەکان ئەم وڵاتەیان داگیرکرد، زمانی عەرەبیش بڵاوبۆتەوە. لە شاری (طووس)دا تەنیا دواکەوتووەکان بە زمانی عەرەبی ئەدوان، دانشمەندو تێگەیشتووەکانیان بە فارسی ئەدوان. کاتێ هەندێك لە زاناکانیان هاتن بۆ دیدەنیم زۆریان پێ سەیر بوو کە من بە فارسیو بە

عەرەبیش دەدوام!! کە کەوتینە گفتوگۆو پرسیارو وەڵام واقیان وڕما کە بە هیچ جۆرێك هاوشانییان نەدەکردم!

کە بەڕێبووم بۆ خوراسان سێ مەبەستم هەبوون، یەکەم: گرتنی نەیشاپوور، دووەم: گرتنی سەبزەوار، سێیەم: سەرزدانی شاری بەشرویە (مەشهەد). زۆر شتم لە بارەی دانیشتووانی ئەو شارەوە بیستبوون، دەوترا هەموویان زاناو دانشمەندو کارامەن، خەریکی کشتوکاڵو بەخێوکردنی مەڕوماڵاتن، لە چەرمی ڕەشەوڵاخ پێڵاو دەدروون، ڕووەدەکەنە بیابان بۆ دڕکهێنان، کە بۆ نانکردنو چێشتلێنان بەکاریاندەهێنا. لە شاری طووسدا دوو حەفتە مامەوە، پێش ئەوەی بکەومە ڕێ بۆ داگیرکردنی شاری سەبزەوار، کەوتەوە بیرم کە من لە سەردەمی لاویمدا گەلێ هۆنراوەی شاعیری مەزن (فیردەوسی)م لەبەرکردوون؛ بیستم کە گۆڕەکەی لە شاری (طووس) دایە، بۆیە بە دەرفەتم زانی بچم بۆ سەردانی، زانیم کە لە گۆڕستانی موسڵمانان‌دا نەنێژراوە، چونکە وا دەنگ بڵاوبووە کە (رافظی) بووە، لەبەرئەوە لە باخەکەی خۆیدا نێژرابوو. کە ڕۆیشتم بۆ باخەکەی، لەجیاتی باخ گژوگیاو دڕکو داڵێکی زۆرم بینین، لەو وێرانەیەدا تەپۆلکەیەکی بچکۆلەم دی وتیان: ئەمە گلکۆی (فیردەوسی)یە! لەپاڵ گلکۆکەدا وەستامو کەوتمە دەریای بیرکردنەوەو ئەندێشەوەو سەرم سڕما: چۆن ئەمە گۆڕی شاعیرێکی وەکو (فیردەوسی)یە!! تەنانەت بەردێکیش نەخرابووە سەری تاکو کوێر نەبێتەوە. هەر لەوێدا فەرمانمدا کێلی بۆ دابنرێ بۆ ئەوەی شوێنەواری دیار بێت.

هێشتا لەو وێرانەیەدا دەرنەچوو بووم، لەپڕ تەتەرێکی سواری سەراپا تۆز لە نزیکمەوە دابەزیو نامەیەکی دامێ. تەتەرەکەم دەناسی، یەکێك بوو لە تەتەرە هەرە بەتواناکانی دەوڵەت، بەبێ پشوو، شەوو ڕۆژ بەردەوام بەڕێوە بوو. نامەکە هی فەرمانڕەوای سەمەرقەند، (شیر بەهادر) بوو، ئاگاداریکردبووم (میر تووك تامیش)، کە پادشای وڵاتێکە لەوبەر دەریای مازندەرانەوە، بە لەشکرێکی گەورەوە کەوتۆتە ڕێ بۆ داگیرکردنی (ماوەرائەننەهر)، هەروەها تکای لێکردبووم کە بە زووترین کات بگەڕێمەوە چونکە پێویستی دەکرد لەوێبم.

هەر لە هەمان ڕۆژدا بە خۆمو (٣)سێ هەزار سەربازی هەڵبژاردەوە گەڕامەوە، بە بێ پشوودان شەوو ڕۆژ ڕێمان دەبڕی، بە شەوو ڕۆژێك هەر

ئەسپەی دوو گونکی وشکمان دەدایە، ئەوەندە ئەسپەکانیشمان ئاو نەدەدان کە تێر ئاو بن بۆ ئەوەی تووشی ژانە دڵ نەیەن‌و لە ڕێدا بە جێ نەمێنن، هەر بە دوو ڕۆژجارێك بۆ ماوەی یەك سەعات ئەسپەكانمان بەردەدان تاكو لە ناو پووش‌و پەڵاش‌و تۆزو خۆڵدا خۆیان بگەوزێنن‌و ماندوویەتییان دەرچێ. بەیەك حەفتە لە (طووس)ەوە گەیشتمە (مەرو)، لەوێ زانیم (تووك تامیش) گەڕاوەتەوە بۆ وڵاتی خۆی، كە ناوی (كەریمە)یەو دەكەوێتە باشووری ڕووسیاوە. ویستم دوایكەوم‌و بچمە سەری، تا بزانم چۆن پیاوێكە وا وێراویەتی هێرشبكاتە سەر وڵاتی من! بەڵام لە ترسی وەرزی زستان‌و بەفری زۆرو ڕێبەندان، گوێڕاكێشان‌و تەمێكردنی پادشای ناو براوم هێشتەوە بۆ كاتێكی‌تر.

# هەشتەمین بەش

## دووەمین سەفەرم بۆ خوراسانو جەنگی سەبزەوار

جیهانگیری کوڕم پاشماوەی لەشکرەکەمی لە خوراسانەوە هێنایەوە بۆ (سەمەرقەند)، چوار زانای (شیعە)شی لەگەڵ خۆیدا هینا. ئەو ساڵە زوربەی کاتم تەرخانکرد بۆ ئاوەدانکردنەوەو ڕێکخستنی لەشکر، هەندێ کاتیشم بە وتووێژ لەگەڵ زانایانی شیعەدا بەسەربرد. هەر چواریان میوانی منبوون، لەسەر دابو نەریتی پەیرەویکراوم هەمیشە ڕێزیان لێدەگیرا، ڕۆژانە دەمنارد بە دوایانداو لە کۆشکەکەی خۆمدا، پێش نانخواردنو پاش نانخواردن دەکەوتینە گفتوگۆ.

هەر لە یەکەم ڕۆژدا بۆم دەرکەوت کە بەڵگەی ئەو زانایانە بۆ لە پێشتر گرتنی ڕێبازی شیعە پشتبەستنبوو بە گێڕانەوە، نەك بەڵگەی ئەقڵگیر. کاتێ لێیانم پرسی: بەڵگەی ئەقڵگیری ئێوە بۆ سەلماندنی لەبەرترو لە پێشتری ڕێبازی شیعە چییە؟! لە وەڵامدا پەنایان هەر بۆ ئەفسانە دەبرد. دوای دوو مانگ میوانداری، هەریەکە بڕێکی باش پارەو ئەسپێکم دانیو بە ڕێزەوە بەڕێمکردنو گەڕانەوە بۆ وڵاتی خۆیان.

بۆ بەهاری ساڵی دوایی هەواڵم بۆ هات کە (میری سەبزەوار) لەشکری کۆکردۆتەوەو دەیەوێ پەلامارمانبدات، بەم جۆرە نەمتوانی ڕووبکەمە وڵاتی (تووك تامیش)و دووبارەو بۆ جارێکی تر بە لەشکرێکی مەزنەوە کە لەسەدو بیست هەزار جەنگاوەری کارامەو نەبەرد پێکهاتبوو ڕوومکردە خوراسان. بۆ خۆم فەرماندەیی چل هەزاریانم گرتە ئەستۆ، چل هەزاریشم بە (جیهانگیر)ی کوڕمو چل هەزارەکەی تیریشم بە (شێخ عومەر)ی کوڕم سپاردن. پلانی ڕۆیشتنمان بەرەو (سەبزەوار) بەم چەشنە داڕشت: خۆم لە ڕێگەی (قوچان)ەوە بڕۆم بۆ (طووس)، لەوێشەوە بۆ سەبزەوار، جیهانگیری کوڕم ڕێی (ئەسفراین) بۆ (جەوین) بگرێتە بەر لەوێشەوە بۆ سەبزەوار، شێخ عومەری کوڕیشم ڕێگەی دەشتی (تورکمان) بگرێتە بەر، تا دەگاتە (مزینان) لەوێشەوە بۆ سەبزەوار. لەم پلانەدا ئەوەشم ڕەچاو کرد کە دەتوانین هەموو خێڵەکانی باکووری خوراسان

بخەینە ژێر چاودێریمانەوەو ڕێی هەموو دژایەتییەکو بەرەنگاربوونەوەیان لێبگرین.

کە گەیشتمە (قوچان) پیاوانی بالآبەرزو بە هەیکەلم بینی، لەبەر ساردیی ناوچەکە هێشتا کە رەکیان لەبەردا بوو، هەموویان بە زمانێك دەدوان نە (فارسی) بوو، نە(عەرەبی)؛ بۆم دەرکەوت کوردن‌و لە کوردستانەوە هاتوونەتە (قوچان)و تیایدا نیشتەجێبوون. هەندێکیان چاوشین‌و مووزەرد بوون. ئەو کوردانە بە جۆرێك سەیری ئێمەیان دەکرد کە دیار بوو لێمان نەدەترسان. لەبەر ئەوەی زۆر بەهێزو بە توانابوون پێم خۆشبوو بێنە ناو لەشکری منەوە. بە یارمەتیی دیلماج لەگەڵیاندا دوام، پرسیان: تۆ کێیت؟ وتم: من (تەیموور)م، سوڵتانی (ماوەرائەننەهر)م‌و بەم زووانەش دەبمە سوڵتانی خوراسانیش. ئەو کوردانە لە وەڵاما وتیان: ئێمە نامانەوێ لە ژن‌و منالٌو ولآتی خۆمان دووربکەوینەوە، مەڕو مالآت بەخێودەکەین‌و ژیانمان مسۆگەر دەکەین‌و پێویستیمان بە سەربازی نییە. لەگەڵ ئەوەدا کە کوردەکانی (قۆچان) زۆر بەهێزو لێهاتوو بوون، زۆر بێ وەی هاتنە بەرچاوم، بێ خەم لێیان دڵنیا بوومو بەرەو(طـوس) بەرێبوومو چوومە سەر گڵکۆی (فیردەوسی)، ببینم وێنەی خۆی لەسەر کێلەکە کێشراوەو بە زمانی عەرەبیش ناوەکەی نووسراوە. وتم: ئەو هۆنراوەکانی بە زمانی فارسی داناون، کێلەکانی بگۆڕن، بە فارسی‌و بە عەرەبی لەسەریان بنووسن.

دوای ئەوە بەرەو ڕۆژئاوا بەرێبووم تا گەیشتمە (نەیشاپوور) دیم بە تەواوەتی وێرانە. لە نەیشاپوورەوە بە هەموو پێداویستیی جەنگەوە کەوتمە رێ، چونکە لەوانە بوو لەگەڵ لەشکری میری سەبزەواردا بەیەك بگەین‌و بقەومێ! ئەو ڕۆژەی گەیشتمە خوراسان هیچ هەواڵێکی هەر دوو کوڕەکەمم نەدەزانی، نەشماندەتوانی پەیوەندی بەیەکترەوە بکەین، چونکە لە ولآتی دوژمندا بووین.

لەبەرە بەیانی ڕۆژی دواییدا پێشەنگانی لەشکرەکەم ئاگاداریانکردم کە لەشکرێك لە دوورەوە دیارە، چوومە سەر گردێك، تەماشامکرد لەشکری میری سەبزەوار هەمووی پیادەیە، وەك دیوارێکی بێ درزو بۆشایی بەرەو ڕوومان دەهات، دیار بوو کە میری سەبزەوار پیاوێکی جەنگاوەرەو دەتوانێ سەر پەرشتیی گۆرەپانێکی بەرینی جەنگ بکات. وام دانا کە ژمارەی سەربازی دوژمن حەفتا هەزار بێت، منیش تەنیا چل هەزار سەربازم لەگەڵدا بوون، ئێمە

هەموو سوارو ئەوان پیادەبوون،کە نزیکتر بووینەوە، سەرنجمدا سەربازانی دوژمن ڕم بەدەستن، ڕمیش بۆ ئەسپەکانمان مەترسیدارە، لەبەر ئەوە لە دەرکردنی فەرمانی هێرشبردندا پەلەم نەکرد، بگرە چاوەڕێبووم ئەوان دەستپێشخەریبکەن. کە لەشکری دوژمن زۆرتر نزیکبووەوە، فەرمانمدا تیر هاوێژەکان بە تیری سێ جار ئاو دراوەوە بە خوێناوی خەست، ئامادەبن، بۆ خۆیشم تیرم خستەکەمانو هەمووان چاوەڕێی تیری منبوون. ئەو جۆرە تیرانەی ئێمە بەکارماندەهێنان لە نزیکەوە بەرگی زرێداری دەسمی. گەلێك چاوم گێرا بۆ میری (سەبزەوار)، کە ناوی (عەلی سەیفە ددین) بوو، هاوتەمەنی منبوو، سا بەڵکو دەرکەوێتو بە تیرێکی ئاودار لە پەلەپۆی بخەمو هونەری تیر هاویشتنی میری(ماوەرائەننەهر)ی نیشانبدەم. زانیم ورەی سەربازانی دوژمن بە ڕمەکانیان بەرزە، هەر لەبەر ئەوەشبوو کەبەر لە ئێمە هێرشیانهێنا.

کاتێك کە هەستمان بە تێکەڵوپێکەڵیی ڕیزەکانی دوژمن کرد، تەورەکانمان بە دەستەوە گرتنو کەوتینە هێرشبردن، بەڵام بەر لەوەی دەستمان بگاتە دوژمن بە قۆچەقانی بەردەبارانکراین، بەمەش گەلێك لە ئەسپەکانمان پەکیانکەوتو سەربازەکان پیادە بوونو گەڕانەوە دواوە، چونکە مانەوەیان بەو جۆرە لە گۆرەپانی جەنگدا باش نەبوو. (ئورگون چەتین) کە فەرماندەی باڵی باشووری لەشکرەکەمبوو، بە دوو هەزار سواری چەتینییەوە دڕندە ئاسا هێرشیانکردە سەر باڵی ڕاستی لەشکری سەبزەوار، (قولور بەگ) یش کە فەرماندەی باڵی باکووری لەشکرەکەمبوو، بەهەموو سەربازەکانیەوە، کە وەکو خۆی (مەغۆل) بوون هێرشیانکردە سەر باڵی چەپی لەشکری سەبزەوار. منیش لە ناو جەرگەی سوپاکەمدا، لەگەڵ سەبازەکانمدا بووم، کە هەموویان خەڵکی ماوەرائەننەهەر بوون، وەك خۆم کەڵەگەتو جەنگاوەر، هەموویان دەیانزانی ئەوەی لە مەیدانی جەنگدا پشت لە دوژمن بکات، یان سستی بنوێنێ بە دەستی من دەکوژرێت، دەشیانزانی ئاگاداری جموجووڵی یەك بە یەکیانم؛ لە گۆڕەپانی جەنگدا هەر چۆن بەزەییم بە خۆمدا نەدەهاتەوە، بە هەمان جۆر بەزەیشیم بە کەسدا نەدەهاتەوە. کە لەگەڵ سوپای دوژمندا دەستەو یەخە بووینەوە، زۆرتر خزانە پاڵ یەکترو بە ڕمەکانیان سنگی گەلێك لە ئەسپەکانمانیان شەقکردو ورگی زۆریشیان ڕادا. لە باڵی باشووردا (ئورگون چەتین) دەستێکی وای وەشاند کە بە جارێ ڕیزەکانی دوژمنی تێکوپێك

شکاندنو دوژمن پاشەکشەیکرد. لەولاشەوە (قولور بەگ) بەرەو پێشەوە دەکشا، بەڵام من لە ناوەڕاستو لە ناوجەرگەدا نەمدەتوانی بەرەوپێشیْ بڕۆم، چونکە لەو ئاستەدا نەبەردترین سەربازی دوژمنی لێبوو، هەر لەو کاتەداو لە گەرمەی جەنگا بەردەقۆچەقانییەکی زۆر بەهێز زرمەی لە کڵاوە ئاسنەکەمەوە هەستان، ئەگەر کڵاوە ئاسنەکەم لەسەردا نەبوایە زۆر خراپ سەرمی دەشکاند. لەو کاتەدا هێرشە دوو قۆڵییەکەی تری سوپاکەم شکستی زۆری بە دوژمنداو گەلێك لە سەربازانی دوژمن بە دیلگیران، یەکێکیان (موحەممەد سەیفەددین)بوو، کە برای میری سەبزەواربوو، شەڕ تا دوای عەسر درێژەیکێشا، سەربازەکانم لە هەموو لایەکەوە هێرشیانبرد بۆ ئەوەی ناوجەرگەی سوپای دوژمن گەمارۆ بدەن، منیش بە جۆرێك دەجەنگام بوارم نەدەدا کە سەربازانی دوژمن بچن بە هانای باڵەکانی ترەوە. کاتیْ میری سەبزەوار زانی دەرەتانی ناو جەرگەی سوپاکەی نەماوە، فەرمانی کشانەوەیانیدا، بەم جۆرە جەنگ بە سوودی من کۆتاییهات. لەبەر دوو شت دوای میری سەبزەوار نەکەوتم، یەکەم دەمەو خۆرئاوا بوو، کەشەو داهاتایە لەوانەبوو تووشی تەنگوچەڵەمە بهاتمایە، بە تایبەتی شارەزای ئەو ناوچەیە نەبووم، دووەم گەلێك لە سەربازەکانم بریندار بوونو زۆریشیان کوژرا بوون، جا وام بە باش زانی چاوەڕێبم تا کوڕەکانم دەگەنەلام. دوای ئامار کردن بۆم دەرکەوت پازدە هەزار کوژراوو بریندارمان هەن. کە مەیدانی جەنگ کشوماتبوو، داڵەکەر خۆرەکان لە ئاسماندا دەرکەوتن. بۆ شەویْ داوامکرد براکەی میری سەبزەوار لە ژێر چاودێریی خۆمدا بێت بۆ ئەوەی بتوانین هەندێك نهێنیو زانیاری لە بارەی میرو هێزەکانیەوە بزانین.

بۆ ئێوارەی ڕۆژی دوایی پێشەنگانی لەشکری جیهانگیری کوڕم پەیدا بوونو خۆشی کەوتە ناومانەوە؛ بۆ نیوەشەو جیهانگیریش خۆی گەیاندەلام. بەگەیشتنی هێزەکەی جیهانگیر ئێمە زۆر بەهێز بووینوخۆمان ئامادە کرد بۆ هێرشێکی تر بۆ سەر لەشکری میری سەبزەوار، ئەویش کە بەمەی زانی زوو کشایەوە بۆ سەبزەوارو لە پەنای دیوارەکانو شوورەی شاردا خۆیان قایمکرد. دەربارەی شاری سەبزەوار هەر لەوەندە ئاگادار بووم کە برا بەدیلگیراوەکەی میر بۆمی باسکرد بوو. هەر لە یەکەم ڕۆژی گەمارۆ دانی شارەوە تا تەواو بوونی

جەنگ گەردەلوولو ڕەشەبایەکی بەردەوام هەبوو، کە هەموو تۆزو خۆڵی بیابانی دەکرد بە سەرو چاوماندا.

چ نەخشەو پلانێکم دانا بوو بۆ داگیر کردنی شاری نەیشاپوور، بۆ داگیر کردنی سەبزەواریش هەروامکرد. چوار کۆمەڵەی زۆر شارەزام لە هەڵکەندنی ڕێی ژێر زەمیندا (تونێل) ئامادەکردن، دەستوورمدانێ کە لە چوار لای شارەوە خەریکبن تا دەگەنە ژێر دیواری شوورەی شار ، ژێر دیوارەکان بدەنەوەلا تاکو بتوانین بە بارووت دیوارەکان هەڵتەکێنین. بورجەکانی کە بۆ داگیر کردنی سەبزەوار دروستکرابوون، ئەوەندە بەرز بوو بە ئاسانی ناو شار دەبینرا. لەو کاتەدا کە خۆمان ئامادە دەکرد بۆ داگیر کردنی شار، دواکەوتنو نەگەیشتنی شێخ عومەری کوڕم مەراقی زۆری بۆ پەیدا کردم! دەبوایە بە خۆیو چل هەزار سەربازیەوە زووتر بگەیشتایەتەجێ. داوام لە جیهانگیر کرد بە خۆیو (٣) هەزار سەربازەوە بەرەو باکوور بڕواتو هەواڵێك بزانێ.

ڕۆژانە بە تیر چەندان نامەمان هەڵدانە ناو شار، داوامدەکرد کە بە بێ جەنگ خۆیان بدەن بە دەستەوەو سەروماڵیان پارێزراون، بەڵام بە هیچ جۆرێك بە دەنگەوە هاتنێك نەبوو، ڕۆژێکیان بە چەند نامەیەك داوام لە میری سەبزەوار کرد بۆ عەسر بێتە سەر دیواری شارو بە چاوی خۆی دیمەنێك ببینێ. کە هاتە سەر دیوارەکە فەرماندا (موحەممەد سەیفەددین)ی برای لە دیوارەکەوە نزیکبکەنەوە. جارچی بە دەنگی بەرز وتی: ئەی میر (عەلی سەیفەددین) ئەگەر دەروازەکانی شار نەکەیتەوەو شار نەدەیت بە دەستەوە، براکەت دەکوژینو سەری لە لەشی جیا دەکەینەوە! میری سەبزەوار بانگیکردە براکەی ؛ وتی: ئەی موحەممەد، ئایا پێت خۆشە ئێمە شار بدەین بە دەستەوەو تۆ بمێنی، یان بەرگریبکەینو تۆ بمری؟! موحەمەد لە وەڵاما وتی: بەرگریبکەن! ئینجا داوای لێکردم: تەیمووری لەنگ، بە جەللاد بڵێ لە سەرم بدات! منیش وتم: بوەستە، ئایا ئامادەی براکەت بکڕیتەوە و چەند دەدەیت؟! میر وتی: بەڵێ، ئامادەمو سەد هەزار دینار دەدەم! منیش وتم: تۆ خەرجی سەد هەزار سەرباز دەکێشی، ئەمە پارەیەك نییە بۆ بەردانو ئازاد کردنی برای تۆ کە لە مەیدانی جەنگدا بە دیلگیراوە! میر وتی: ناتوانم لەوە پتر بدەم! وتم: لەبەر ئەوەی کڕیاری براکەت نیتو کڕیارێکی تریش دەست ناکەوێت، دەیکوژم، تالە زەحمەتی ئاگاداریکرنو چاودێریکردنی ئاسوودەبم! بە گۆشەی چاو ئامارەیەکم بۆ جەللاد کردو دەمو

دەست لەسەری (موحەممەد سەیفەددین)ی دا، لەسەر دیوارەکەوە دەنگی شین‌و شەپۆڕ بەرزبووەوە. دەستوورمدا تا سەری (موحەممەد) بکرێ بە لوتکەی یەکێ لەو بورجانەی دەیانڕوانی بەسەر شاردا، تاکو دانیشتووانی شار بیبینن!

هەر ئەو شەوە میری سەبزەوار، بۆ تۆڵەی براکەی لە ناکاو هێرشیکردە سەرمان. کەسێ‌یەکێکی شەو تێپەڕی، بە جارێ دەروازەکانی شار کرانەوەو لەشکری سەبزەوار هێرشیهێنا، هەزاران سەرباز بە پەیژە لە دیوارەکانەوە دەهاتنە خوارێ، هەندێکیان کە چرای ڕووناککەرەوەیان پێ بوو، خۆیان گەیاندە چادرەکانمان‌و ئاگریان لە هەندێکیان بەردا بۆ ئەوەی ئێمە بترسین‌و پەرش‌و بڵاوبینەوە. بەوەی باشبوو هەموو ئەسپەکانمان لە دواوەو دوور لە چادرەکانەوە بەستبوونەوە، ئەگینا ئەگەر لە ناو ئاگرەکەدا، یان لە نزیکیەوە بوونایە، ڕەشۆکانیان دەپچڕاندن‌و هەڵدەهاتن. (قولوربەگو ئۆرگن چەتین) خۆیان گەیاندە لای من‌و هەموو هێزەکان بوونەوە بە یەکو کۆبوونەوە. من لە ڕۆژهەڵاتی شاردا بووم، فەرماندەیی هێرشم گرتە ئەستۆ. قولور بەگم کردە سەرکردەی باڵی ڕاستو (ئۆرگن چەتین)یش هی باڵی چەپ. بە تەور هێرشی بەرنگاربوونەوەمان دەست پێکرد، من بە دوو تەور، بەڕاستو چەپدا دەستم دەوشاند، دوژمنم هەڵپاچو داپاچدەکرد، باڵی ڕاستمان بە کوور، وە باڵی چەپمان باشووری شاری گرتەوە، بە شێوەیەکی ڕێکوپێك لە هەردوو دەروازە گەورەکانی شارەوە نزیکدەبووینەوە، کە هەردووکیان کەوتبوونە ڕۆژهەڵاتەوە. سەربازانی دوژمن بە شمشێر دەجەنگان، ئێمەش بە تەور تێیانبەربووین‌و لە پەلوپۆماندەخستن. نزیکەی پەنجا گەزێکمان مابوو بگەینە دەروازەکان، لە پڕلەڕوماندا داخران. میری سەبزەوار کە زانی هێرشەکەی سەری نەگرت، هەر چۆن براکەی خۆی کردە قوربانی ، بە هەمان جۆر ڕێی گەڕانەوەی لە کۆمەڵێك لە سەربازەکانی خۆی گرت، ئەوانیش کە ئەوەیان دی دەستو دڵسارد دامان‌و چەکیان فڕێداو خۆیان دا بە دەستەوە، بەمەش کارمان ئاسانتر بوو، زووتر گەیشتینە دەروازوەکان، بەڵام لە دیوی ناوەوە زوو بە زوو بەڕوویاندا دیواری قاییم هەڵچنرابوو. بۆ بەیانیی ڕۆژی دوایی فەرمانمدا ئەو بریندارە سەبزەوارییانەی کە برینەکانیان ناهەموارن بکوژرێن، چونکە نەماندەتوانی چاودێرییانبکەین‌و بارێکی گرانبوون لەسەرمان، بەڵام ئەوانەی کە برینەکانیان سووکبوون لەگەڵ دیلەکاندا هێشتماننەوە بۆ کاتی گۆڕینەوە.

سەرنجمدا گەلێ لاشەی سەربازەکانم لەناو خۆڵەمێشی چادرەکاندا کەوتوون، ئەوەندە سەخڵەتبووم پەیمانمدا دوای گرتنی سەبزەوار کەس دەرنەکەەو هەموو دانیشتووانی شار بکوژم.

بۆ ئەوەی سەربازەکانی دوژمن گوێیان لە دەنگی پاچو خاکەنازی ناو تونێلەکانمان نەبێت، بڕیارمدا شەووڕۆژ سەرقاڵیانبکەین، بە شەو لە هەموو لایەکی دەرەوەی شوورەکەدا ئاگر دەکرایەوە، بە ڕۆژیش هەندێك سەرباز هەوڵیاندەدا لە دیوارەکەوە بچنە ئەودیو، هەرچەندە ژمارەیەك لەو سەربازانەم گیانی خۆیان بەختکرد، لەگەڵ ئەوەشدا کارێکی وایان کرد کە دوژمن بە نەخشەو پلانەکەمان نەزانێ، بەم چەشنە سەربازەکانم بەبێ کێشە سەرگەرمی هەڵکەندنی ڕێی ژێرزەمینبوو، (گورخان)یش، کە فەرماندەی دەستەی باروووت دروستکەرەکانبوو، لە نەیشاپوور خەریکی دروستکردنو ئامادەکردنی بارووتبوو. لەبەر دوو هۆ بوو داوامکرد لە نەیشاپوور بارووت دروستبکرێ، یەکەمیان لە لەشکرەکەمەوە دوور بێ، نەکو بتەقێتەوەو کارەساتی ناهەموار بوو بدا، دووەمیشیان دەمویست لە چاوی سیخوڕانی میری سەبزەوارەوە دوور بێت، نەبادا فێری دروستکردنی بێن.

سەبارەت بە خەندەقەکانی ژێرزەمینیشمان، ئەوەی لای ڕۆژئاوا زۆر دوورکەوتبۆوەو لاریو پێچاوپێچی زۆری تێکەوتبوون، چونکە ئەندازیاری سەرپەرشتیکەر زۆر هەڵەیکردبوو، کاتێکی زۆرمان لێ بەفیڕۆ چوو، بۆ ئەوەی هەموو ئەندازیارەکان ئاگادار بنو کاری خۆیان چاك جێبەجێبکەنو چاوترسێن بکرێن، ئەو ئەندازیارەم کوشت. خەندەقی لای باکووری شاریش تاشەبەردێکی گەورە بووە ڕێگرو کرێکارەکان بە دەستییەوە دامان، ئەندازیارەکەی زۆر دەترسا، دڵنیامکردو پێم وت: خەتای تۆی تیا نییە. لە ئەنجامدا بڕیارماندا لە کونەکانی ڕۆژهەڵاتو باشوورەوە خۆمان بگەیەنینە شار.

بۆ ئەوەی سەربازەکانم هەموو شتێك ببینن و ئاگایان لە جموجووڵی هەموو لایەك بێ، بڕیارمدا لەگەڵ سپێدەی بەیاندا بارووتی ناو هەردوو خەندەقەکان بتەقێنرێتەوە. لەبن هەر دیوارێکدا سەدمەنی ولاّتی خۆم بارووت دانرا، پلیتەی گەورەو درێژمان پێوە بەستو بە درێژایی خەندەقەکە هاتە دەرێ. دەستەیەکی زۆرم لە کەرەنا لێدەران ئامادەکرد، بۆ ئەوەی لەگەڵ تەقاندنەوەی بارووتا لە هەموو لایەکەوە دەنگی کەرەنا بنێشێتە ئاسمان، تا بەرهەڵستکاران زیرە بکەنو

وابزانن بەو دەنگە دیوارەکان رووخاون، بەم چەشنە بۆ ماوەیەکی زۆر ورە بەردەدەن. پێش هێرشبردن بە ئەفسەرو سەربازەکانم ڕاگەیاند بە هیچ جۆرێ بەزەییان بە هیچ بەرهەڵستکارێکا نەیەتەوەو هەموویان بکوژن، چاوپۆشی تەنیا لەوانە بکەن کە پەنادەبەنە بەر ماڵی (شێخ حیسامەددینی سەبزەواری). سەبارەت بە شێخی ناوبراو بیستبووم کە زۆر دانشمەندەو پێشەوای ئایینە، چونکە زۆر زانا بوو دەمویست ڕێزی تایبەتی لێبگرم.

بۆ بەیانیی ڕۆژی دوایی، کەمێك بەر لە خۆرهەڵاتن، فەرمانمداکە پلیتەکان داگیرسێنرێن و لە هەموو لایەکەوە بەردەوام کەرەناڵیبدرێت. بەڕاستی ناتوانم بە قسە تەقاندنەوەی باروتو دارمانی دیواری شار بەرجەستە بکەم، هەموو لایەك بوو بە بوومەلەرزە، تەنانەت ئێمەش ترساین، پاشان زانیمان هەرچی خانووی نزیك دیواری ڕۆژهەڵاتو باشووری شار بوون تەپیون بەسەر دانیشتووانیاندا. لە ڕۆژهەڵاتو باشوورەوە هێرشی سەختونەبەرد دەستی پێکرد، لەناو شاردا دەنگی هاتو هاوارو قیژەقیژ بەرز بووەوە. ئەوەندە ناوشار جەنجاڵبوو، نەمتوانی لەسەر بورجەکانەوە بە باشی بارى دۆخەکە هەڵسەنگێنم. ناچار بووم بچمە سەر دیوارەکە تابتوانم ئاگاداری گۆرەپانی جەنگبم. سەربازانی دوژمن چاك دەجەنگانو باش بەرەنگاریباندەکرد، لە هەمان کاتدا سەربازەکانی من لە هەموو لایەکەوە نەبەردانە بەرەو ناوەندی شار دەکشان دڵنیابووم کە سەردەکەوین. میری سەبزەوار کوڕێکی لاوی هەبوو، پێش ئەوەی لە جەنگا بکوژرێ، هەموو ژنو کچانی خێزانەکەیانی کوشتبوون نەبادا بە دیلبگیرێن. کە بە هەواڵی کوشتنی میرو کوڕەکەیم زانی دڵنیا بووم سەبزەوار بە دەستمانەوە دەبێت. جارچی جارپیدا: هەر کەس دەیەوێ نەکوژرێ، با پەنا بەرێتە مزگەوتی(شێخ حیسامەددین)، بۆیە مزگەوتەکەیم ڕەچاو کرد چونکە جێی خەڵکی زۆرتر دەبووەوە.

کە ڕۆژ گەیشتە ناوەڕاستی ئاسمان لە دەروازەی ڕۆژئاواوە چوومە ناو شارەوە، هەموو کووچەو کۆڵانەکان بە لاشە داپۆشرابوون، لە هەندێك کۆڵانی ناوەڕاستی شاردا جۆگەلەی خوێن سەرڕێژدەکرد، دیار بووکە هێشتا کوشتار بەردەوامە. بۆ کاتی نوێژی عەسر جەنگی سەبزەوار تەواوبوو، ئەوانەی خۆیان گەیاندبووە مزگەوتی (شێخ حیسامەددین)،یان خۆیان دابوو بە دەستەوە دەستیان بۆ نەبرا. پاشان دەستوورمدا بەسەربازەکانم دەست بە تالانکردن

بکەن. هەر ئەو ڕۆژەش (شێخ حیسامەددین)یان هێنا بۆ ئوردوگەکەم لە دەرەوەی شار، پیاوێکی زۆر پیر بوو، ریشێکی سپیو درێژی هەبوو.لەو کاتەدا سەربازەکانم مزگەوتەکەمیان ئامادە دەکرد تا نوێژی ئێوارەی تیا بکەم، کە شێخ مزگەوتەکەمی بینی زۆر سەری سڕما ، پرسیاریکرد:بۆچی ئەم منارەیە ئاوییەو ئەوی‌تر سوورە؟ لە وەلامدا وتم: ڕەنگی ئاوی نیشانەی توانا و دەسەلاتی خوایە، ڕەنگی سووریش نیشانەی توانای جۆرە مرۆڤێکە. شێخ تکای لێکردم کە لە تالانکردنی شار چاوپۆشیبکەم؛ بە تایبەتی خەڵکێکی زۆر کوژراون. منیش وتم: یا شێخ، ئەی ئەو هەموو سەربازانەی من کە کوژراون خوێنیان بە فیڕۆ بڕوات! ببوورە، ناتوانم داواکارییەکەت پەسەند بکەم. پاش بێدەنگییەکی کەم شێخ وتی: باشە، فەرمانبدە کە ژن‌و کچ‌و کوڕی خەڵك بە دیل نەگیرێن‌و نەبرێن! وتم: یا شێخ ، بۆ ئەمەش ناتوانم، چونکە دانیشتووانی سەبزەوار بەرهەڵستییانکردووە، کافری جەنگن! بە پێی دەقی ئایەتی قورئانی پیرۆز دەبێ دیل بکرێن‌و ببرێن!..

که خۆرئاوا بوو، دەنگی بانگ هات، بە شێخم وت : با بچین لە مزگەوتەکەمدا نوێژ بکەین، وتی: ئەی ئەمیر تۆ بچۆ بۆ مزگەوت، من لێرە نوێژ دەکەم. وتم: ئەم مزگەوتە هی من نییە، هی خوایە. شێخ خۆی ئامادەکرد کە هەر لەوێدا نوێژ بکات، شتێکی لە گیرفانیدا دەرهێناو لەسەر زەوی داینا، کە لێم پرسی: ئەوە چییە؟ وتی: ئەمە مۆرەو لە کاتی کڕنووشبردندا تەوێڵمان دەخەینە سەری چونکە پاکەو دەبێ کڕنووشگەش خاوێنبێ. وتم: کەواتە دەبێ حەوت مۆرە پەیدا کەی، چونکە لە کاتی کڕنووشبردندا بۆ خوای گەورە حەوت ئەندامی لەشمان دەکەونە سەر زەوی، هەر دوو لەپی دەستمان، هەردوو پێ، هەردوو ئەژنۆو تەوێڵمان! ئەی شێخ، نوێژکەر تەنیا پێویستی بە شوێن‌و جێگەیەکی پاکەو هیچی‌تر، پێغەمبەری ئێمە (د.خ) لە کاتی کڕنووشدا تەوێڵی خستۆتە سەر زەوی‌و ئەرکی پێویستی بەجێهێناوە.پاشان دەربارەی گەلێ بابەتی شەرعی‌و ئایینی دواین، سەرەنجام شێخ وتی: ئەی ئەمیر، من چاك دەزانم کە تۆ دانشمەندی، ئەو زانیارییانەی تۆ دەیانزانی من نایانزانم.

ئەو شەوە تا بەیانی گورگو کەمتیاری ئەو ناوە بەربوونە لاشەی کوژراوانی ناوشارو لە هەموو لایەکەوە دەنگیان دەبیسترا، لەگەڵ بەیانیشا باڵدارە

گۆشتخۆرەکان پۆل پۆل دەرکەوتن، ڕوو بەشار دەرۆیشتن بۆ ئەوەی ئەوانیش بەشی خۆیان بخۆن.

ویستم سەرکەوتنم بەسەر میرو دانیشتووانی سەبزەواردا ببێتە پەندو ئامۆژگاری بۆ هەموان و هەر کەسێ بیەوێت بەرهەڵستیی من بکات ئەوا چارەنووسی وەك هی سەبزەواری لێدێت. بۆ ڕۆژی دوایی هەموو زیندووەکانی شار کۆکرانەوە، داوام لێکردن کە سەری کوژراوەکان لە لەشیان جیا بکەنەوە! پاشان ئاگادار کرام کە نەوەد هەزار کەللە سەر* لە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوای شارەوە کۆکرانەوە، داوام لە ئەندازیارەکانم کرد لە ڕۆژهەڵاتی شارەوە هەرەمێکی شازدە گەزی و لە ڕۆژئاوایشەوە هەرەمێکی‌تر بە هەمان ئەندازە لەو کەللە سەرانە دروستبکرێن، ئاگادارمکردن کە قسڵ بەکاربێنن بۆ ئەوەی زۆر قایمبن تاکو بە درێژایی ڕۆژگار بمێنن، دەستووریشمدا شەوانە لەسەر هەردوو هەرەمەکە چرا بگرێ تا لە دوورەوە ببینرێن. دوای دروستکردنی هەرەمەکان دیوارەکانی شارم وێرانکردن و شارم بەلاشەکانی سپاردو بەرەو باشووری خوراسان کەوتمە ڕێ.

---

* لە پێنجەمین بەشدا، لە ئاماژەیەکدا بۆ داگیر کردنی شاری (سەبزەوار)، دەڵێ: سەدو پەنجا هەزار کەللە سەر کۆکرانەوە.
وەرگێری کوردی

# نۆیەمین بەش

## بەرەو باشووری خوراسان

دوای کوشتنی میری سەبزەوار (عەلی سەیفەددین)و کۆکرۆی ویرانکردنی شار، دڵنیا بووم کە لە ناوچەی خوراساندا کەسێ نەماوە ئەوەندە هێزی هەبێ بوێری ڕوو بە ڕوومبێتەوە. چەند میرێك هەبوون کە هەر یەکەیان لەشکری تایبەتی خۆی هەبوو، دەمویست هەموویان بکەم بە گوێڕایەڵی خۆم. دەنگوباسی جەنگی سەبزەوار بە شێوەیەکی وا سامناك گەیشتبووە هەموو شارەکانی خوراسان کە هەموو میرەکانی ئەو ناوچەیە حسابێکی سەرەنجامی خۆیان کردبوو، لەگەڵ ئەوەشدا واباشتر بوو کە زانیاری لەسەر خوراسان بە دەستبێنم. چاوەڕوانی شێخ عومەرو جیهانگیری کوڕمبووم بگەنە بەرەوە، دوای ئەوە بەرەو باشووری خوراسان بکشێم. کاتێك گەیشتنە لام بۆم دەرکەوت کە نیوەی سەربازەکانی شێخ عومەر لە جەنگی بەرەنگاربوونەوەدا دژ بە تورکمانەکان کوژرابوون! شێخ عومەر بۆی باسکردم کە لەو ڕۆژەوە گەیشتبووە دەشتی تورکمانەکان تا ڕۆژی دەرچوونی لەو دەشتە، شەووڕۆژ سەر گەرمی شەڕ بووبوو، تورکمانەکان کە خاوەنی ئەسپی زۆر گورج و خێرا بوون شەوانە هێرشی لەناکاویان کردبووە سەریان و زۆریان لێکوژرا بوون.

شێخ عومەر وتی: بابە ئەگەر بتەوێ ببیتە خاوەن تواناو دەسەڵات، دەبێ تورکمانەکان تەمێبکەیت. دڵنیامکرد کە وادەکەم. وتی: تورکمانەمان جیاوازیی زۆریان لەگەڵ دانیشتووانی نەیشاپوورو سەبزەوارو وڵاتانی‌تردا هەیە، ئەوان شار نشین نین تا بتوانی بە ئاسانی لەناویانبەریت، هەموو خاوەنی ئەسپی چاکن، دەتوانن زۆر بە خێرایی لە شوێنێکەوە بگوێزنەوە بۆ ناوچەیەکی‌ترو خۆیان لە تەنگانە ڕزگار بکەن. وتم: کوڕم دڵنیابە کە ئێمە چاپوکترو خێراترین، ئەوان کە دەجووڵێن ژن و ماڵ و منداڵیان پێ‌ن و ناتوانن وەکو ئێمە گورج و خێرابن، ئێمە هەر خۆمانین و لە کێشەو تەنگو چەڵەمەوە دوورین. پاشان پێم وت: دوای گەڕانەوەمان لە باشووری خوراسان، هێرشدەکەمە سەر تورکمانەکان.

شێخ عومەرم لە باکووری خوراساندا داناو، خۆیشم بە (٣٠) سێ هەزار سەربازەوە ڕووەمکردە باشووری ئەو وڵاتە. ڕێی نێوان سەبزەوارو باشووری خوراسان بە (کەویر)دا دەڕواتو لە (قاین) تەواو دەبێت، لەبەر ئەوەی پڕبوو لە ماری ژەهراوی و کوشندەو سامناك، وام بە باش زانی لە (طووس) ەوە بەرێبم تا دەگەمە (گەناباد). جیهانگیرم بە هەزار سوارەوە پێشخست بۆ کۆکردنەوەی ئازووقەو ئالیك تاکو بێ خەمبینو پەکمان نەکەوێ. کەلە (طووس) بەڕێبووم هەوا فێنکبووبووەوە، لەدوا مانگی هاویندا گەیشتمە شوێنێك پێی دەوترا (وڵاتی مانگ)، دەشتێکی پانو بەرینی هەبوو، تا چاو بڕیبکردایە کرابوو بە کاڵەك. کە کاڵەکیان بۆ هێنام سەیرمکرد ناوەکەی سوورسوور بوو، باش گەییبوو،بەڵام لە بۆنو بەرامەو چێژدا نەدەگەیشتە کاڵەکی سەمەرقەندا دانیشتووانی ئەو ناوچەیە ئەوەندە نانو کاڵەکیان خواردبووو هەموو قەڵەوو سوورو سپیبوون. دوای ئەو ناوچەیە گەیشتمە شاری (بوجستان) میری شار بە خۆیو کوڕەکانو براکانیەوە پێشوازیی گەرمیان لێکردمو میواندارییەکی زۆر چاکیکرد. بەرلە نانخواردن بە دەستی خۆی ئاوی چەند هەنار ێکی بۆم گرتو لە جامێکدا لەبەر دەمما داینا، وتی: نەریتمان وایە پێش نانخواردن ئاوی هەنار دەخۆینەوە! بۆ ئەوەی باشتر ئارەزووی خواردنمان بکریت، قومێك ئاوی هەنارم خواردەوە، هەستمکرد کە بە درێژایی تەمەنم هەنارم نەخواردووە ئەوەندە خۆشو بە چێژبێ. دوای نانخواردن هەستمکرد میر کەمدەرامەتە، لەبەر ئەوە دوو هەزار لیرەم پێبەخشی. کاتێ ماڵئاواییمکرد لەگەڵ براوکوڕەکانیدا تا نیوە قۆناخێك بەڕێیانکردم.

دوای چەند ڕۆژێك گەیشتمە نزیك شاری (بەشرویە)، هەر وەکو باسمکرد، بیستبووم کە هەموو دانیشتووانی زاناو دانشمەندو کارامەن. تاریکو لێڵیی بەرەبەیانبوو،بینیم هەندێك پیادە بەرەو ڕووی من دێن، کە نزیکبوونەوە زانیم خەڵکی شارن، وای بۆچووم کە لە خانەدانەکانی شارینو بۆ پێشوازیم هاتبن. کە گەیشتنە بەرەوە سەیرمکرد لەوە دەچێ گوند نشینبن. لەبەر ئەوەی بڕێك هەوا ساردیکردبوو بەسەر بەرگە ئاورییەکانیاندا کەوای خوری خۆڵەمێشییان پۆشیبوو، لەسەر دابو سروشی ناوچەی خوراسان هەموویان عەمامە بەسەربوون. هەموویان لەبەر دەم ئەسپەکەما وەستان، یەکێکیان کە زۆر پیرو ردێنسپیبوو، بە دەنگی بڵند دەستیکرد بەهۆنراوە خوێندنەوە، بەم واتایە

هۆنراوەیەکی خوێندەوە (ئەی ئەمیرێ کە خۆرو مانگو چەرخی دەورانو گەردوون لە ژێر فەرمانی تۆدانو بە ئارەزووی تۆ دەگەڕێن، هەنگاوی تۆ بۆ بەشرویە پیرۆز بێ، ئێمەش کەدانیشتووانی بێ نەوای ئەم شارەین تا ئەو پەڕی توانامان ئامادەی پێشوازیو میوانداریو خزمەتکردنین...)کە لێبووەوە ، پرسیم: میری ئەم شارە کێیە؟ لەوەلاما هەمان پیاو وتی: میران ، ئەم شارە میری نییە. وتم: چۆن! ئەگەر شار بێ میر بێ چۆن ئاسایشی دەپارێزرێ؟! چۆن کارو باری دانیشتووان رایینەکرێ؟! وتی: ئەی ئەمیری مەزن، ئێمە هەموومان پیرەوی شەرعو دابو نەریتی کۆمەلایەتیی خۆمان دەکەین. وتم: من زووتر باسی شاری ئێوەم بیستووە، بەلام لەو بڕوایە دانەبووم بێ میرو بێ فەرمانڕەوا بن! وتی: فەرموو بۆ شاری ئێمەو شادین کە بە چاوی خۆت شێوەی ژیانی ئێمە ببینی. لە فراوانی شەقامو کۆلانەکانی ناو شار سەرم سڕما، چونکە لە شاری سەمەرقەنددا بەو جۆرە پانو بەرین نەبوون، دانیشتووانی شار لەم بەرو لەوبەری شەقامەکاندا وەستابوون، هەر یەکە توورەکەیەکی پێبوو، شتێکیان لێدەردەهێناو دەیانکرد بە دوو کەرتەوە، هەر کەرتەیان دەخستە گیرفانێکیانەوە. لە پیاوە ریشسپیەکەم پرسی: بۆچی ئەو خەلکە وادەکەن؟! وتی: میران توورەکەکان مەویان تێدایە، کورکەکە لە مووەکە جیا دەکەنەوە هەر یەکەیان لە گیرفانێکی دەهاون، کورکەکە بۆ بەرگچنینو لە مووەکەش جاجمو کلیم دروستدەکەن. وتم: ئەی بۆچی لە خوری کەلك وەرناگرن؟ مامەی ریشسپی وتی: لەبەر ئەوەی لەوەرگەمان نییە ناتوانین مەڕ راگرین، بەلام بزن بە ئاسانی لە بیابان بە پووشو دڕکودالێ هەلدەکات، شیری باشو مووی نایابمان دەداتێ.
پاشان چووم بۆ کارگەی چنینی قوماش، دیم کە چوار کرێکاری چالاك خەریکن کار دەکەن، داوامکرد نموونەیەك لە قوماشیان ببینم، کە هێنایان سەیرمکرد لەئاوریشمی چینی، کەلە سەمەرقەنددا زۆر بوو، سفتترو جوانترو نەرمتر بوو، بەڕاستی تا ئەو کاتە قوماشی وا نایابو دانسقەم نەدیبوو. لە کۆتایی سەردانەکەمدا دەستمکرد بە گیرفانمداو مشتێك لیرەم دەرهێنا کەبیدەم بە هەر چوار کرێکارەکە، بەلام لێیان وەرنەگرتم، وتیان: ئەی ئەمیری مەزن، سەردانی بەرێزتان گەورەترین دیارییە بۆ ئێمە، ئەوەی لەم کارگەیەدا دەستماندەکەوێت بەسەو گوزەرانی پێدەکەینو لەوە پترمان ناوێ. کەلە کارگەکە هاتمە دەرێ، کەوتمە گەڕان بەناو بازاڕی شاردا. سەرنجمدا دووکاندارەکان کە شتێکیان

دەفرۆشت، ئایەتێکی قورئان، یان وتەیەکی پیرۆزی پێغەمبەریان (د.خ) لەبەر دەخوێند بۆ ئەوەی بیسەلمێنن کیشانەو پێوانەیان بە پێی شەرعو دەستووری خوای مەزنن، کاتێك واتای هەندێك لەو ئایەتو فەرمایشتانەم لە هەندێکیان پرسی، زۆر بە باشی دەیانزانی! بە دووکاندارێکم وت: ئەی پیاو چاکی خوامن کەمندالٌبووم مامۆستاکانم وەکو تۆ واتای قورئانیان نەدەزانی، بەلاّم تۆ بۆچی لە کاتی فرۆشتندا ئەم ئایەتو فەرمایشتانە دەخوێنیتەوە؟ لە وەلاّمدا وتی: ئەی میری میران، کە دەستدەدەمە ترازوو فەرمایشتی خوا دەخوێنم تاکو خوا چاودێر بێتو سەنگەکەم سووك نەبێت.

دوایی لەگەلٌ مامەی ریشسپیدا، کە ناوی (شێخ حسێن-ی کوڕی ئیسحاق)بوو، وەسەر گەورەی پیاو ماقوولانی شارو ئیمامو پێشنوێژی شاربوو، بەرێبووم بۆ خانوویەکی چاك کە بۆ حەسانەوەی من ئامادەکرابوو، لەو کاتەدا دەنگی بانگ کەوتە گوێم، سەیرمکرد دووکاندارەکان پۆشاکی کاریان داکەندو پۆشاکی جوانترو خاوێنتریان لەبەر کرد، کە هۆی ئەوەم لە دووکاندارێك پرسی، دەقی ئەو ئایەتەی بۆ خوێندمەوە کە خوا دەفەرمویٚو فەرمانمان پێدەکات بە جوانترین شێوەی رێکوپێکیو پاكو خاوێنیو پۆشاکی جوانەوە رووبکەینە مزگەوت بۆ خوا پەرستی. من تا ئەو رۆژە بەوەوە شانازیمدەکرد کە هەموو قورئانم لەبەرە، کەچی هەموو دانیشتووانی ئەو شارە قورئانیان لەبەر بوو. منیش لەوان وانەم وەرگرت، چوومە مالٌەکەمو بەرگی جوانترو نوێترم کردە بەرو دەستمکرد بە نوێژ کردن. پێم سەیر بوو کە دووکاندارەکان بەرەو مزگەوت کشان، دووکانەکانیان دانەخستن، چونکە لە شاری (بەشروپە)دا دزی نەبوو!! (شێخ حسێن) بۆی باسکردم وتی: لەم شارەی ئێمەدا دزی نییە، بە بیرەوەریی ئێمە کەس کەسی نەکوشتووە، ژنو پیاو هەر لە بەیانییەوە تا ئێوارە هەموو سەر قالٌی ئیشو کارو رستنو چنینن، لە کاتی سەوداکردندا کەس دەنگ بەرز ناکاتەوە، تا ئێستا رێك نەکەوتووە پیاوێك ژنەکەی تەلاّقبدات، هیچ کێشەیەك لەسەر میراتو کەلەپووری باوو باپیران رووی نەداوە، هەرگیز پۆلیسو زیندانو دادوەرمان نەبوون، بۆ رێکەوتنو چارەسەر کردنی هەر کێشەیەك دانیشتووان دێنە لای منو هەمووان بە بۆچوونو قسەو بڕیاری من قایلن، ژنو پیاو هەموویان خوێندەواری چاکن، قورئانیان چاك رەوانەو باش دەنووسن، بۆ خۆیشم جووتیارم، هەر لە

بەیانییەوە دەچمە سەر زەوییەکەم، بۆ نیوەڕۆ دێمەوە بۆ بەر نوێژی، دوای نوێژ دەچمەوە سەر کاری خۆم.

لەو شارەدا دوو شتم بینین، ئەوانیش کەتیرەو سرێژبوون،کەلە گژوگیای بیابان دەریاندەهێنان‌و کەڵکی زۆریان لێدەبینین. بۆ یەکەمین جاریش ڕۆنێکی ڕەشم دی کەبۆنێکی سەیری هەبوو، دەیانکردە چراوەو پڵێتەیان تێدەخست‌و باش دەگڕا، بۆمیان باسکرد لە شوێنێکیا هەڵدەقوڵێت دەکەوێتە ڕۆژئاوای شارەوەو بیست فرسەنگی* دوورە.

لەبەر نزیکبوونەوەی وەرزی سەرماو لەشکرکێشی نەمتوانی پتر لەو شارەدا بمێنمەوەو زیاتر کەڵك لە دانشمەندی‌و گفتوگۆی بەنرخی دانیشتووانی وەربگرم، چاك بۆم دەرکەوت هەموویان تینووی زانست‌و فێر بوونن، جیاوازی لە نێویاندا نەبوو، جووتیارو شوان، مامۆستاو قوتابی، هەرکەسێکت بگرتایە پلەو پایەیەکی باشی لە خوێندنی بە کەڵکدا هەبوو. ئەو ڕۆژەی ویستم لە شاری (بەشرویە) دەرچم، فەرمانێکمدەرکرد، ئەمە دەقەکەی بوو: (تاکو دوا ڕۆژی حوکمرانیی پشتاوپشتی وەچەی من شاری بەشرویە لە هەموو باجی سەرانەیەك بەخشراوە).

دەمزانی هەندێك شار نازناوی (شاری زانست)یان پێبەخشراوە، هەندێکی‌تر نازناوی (شاری ئاسایش)، فەرمانمدەرکرد کە نازناوی شاری (بەشرویە) (شاری زانست‌و ئاسایش) بێت، هەروەها نووسیم کە وەچەی من بە هیچ بیانوویەك هێرش نەکەنە سەر ئەو شارە. لە ڕۆژی دەرچوونمدا ئەسپێکی زۆر چاك‌و ڕەسەنم بەخشی بە (شێخ حسێن کوڕی ئیسحاق)، بەڵام ئامادەیی خۆی پیشان نەدا بۆ وەرگرتنی، وتی: ئەی ئەمیری مەزن، ئێمە هەموو بۆ سوار بوون تەنیا گوێدرێژ بەکاردێنین‌و بەمەش کارمان جێبەجێدەبێ.

بەرەو شاری (قائن) کەوتمە ڕێ، میرێك فەرمانڕەوایبوو، ویستم لەوە دڵنیابم کە ڕۆژێ لە ڕۆژان سەرپێچی نەکات‌و گوێڕایەڵمبێ. لە سێیەمین ڕۆژدا بایەکی سارد هەڵیکرد، وام زانی بای پاییزە، بەڵام لەپڕ زۆر بەهێز بوو، کردی بە گەردەلوولێکی وا کەنەمدەتوانی بەردەمی ئەسپەکەم ببینم، ناچاربووم کە بوەستم.

---

* فرسەنگێك شەش کیلۆمەترە

وەرگێڕی کوردی

# دەیەمین بەش

## زابولستان

ئەوەبوو (جیهانگیر)ی کوڕم پێشکەوت بۆ دابینکردنی ئازووقەو ئالیك، هەمیشە پەیوەندیمان هەبوو، ڕۆژانە تەتەری هەردوو لامان لەم سەرو لەو سەردا بوون، بەلام دوای نیشتنەوەی گەردەلوولە لماوییەکە هیچ هەواڵێکی نەبوو، دوای ڕاوێژکردنم لەگەڵ ئەو شارەزایانەی لەگەڵما بوون، وتیان: لەوانەیە جیهانگیرو سوارەکانی لەو گەردەلوولەدا ڕێیان لێ تێکچووبێتو ونبووبن، سوپاسگوزاریشبە کە پاییزەو هەوا فێنکە، ترسی گەرماو تینیوێتییان نییە....

داوایان لێکردم کە کۆمەڵێك بنێرم بۆ دۆزینەوەیان. هەندێك لە دانیشتووانی شارەزایانی ناوچەکەم ناردن بۆ دۆزینەوەی جیهانگیرو سوارەکانی، خۆیشم کەوتمەڕێ بۆ شوێنێك پێی دەوترا (بادامۆشك) کە پڕ بوو لە داری بادامە کێویلە لەوێ وەستامو چاوەڕێی دەنگوباسبووم

ڕۆژێکیان کاروانێك، کە لەدوو سەدو پەنجا حوشتر پێکهاتبووو، گەیشتە (بادامۆشك). هەواڵی جیهانگیرو سوارەکانیم لە سەر قافڵەچی پرسی، لە وەلاما وتی: ئێمە لە (یەزد)ەوە هاتووینو کەسمان نەدیوە. دوایی بۆمی باسکرد کە دوازدە شەووڕۆژ بەڕێوەبوون، لەو ڕۆژەشەوە ئەوە دووەم جار بوو حوشترەکانیان ئاو بخۆنەوە، چونکە لەو میانەیەدا نەئاو هەیەو نە ئاوەدانی، بە درێژایی شەست فرسەنگ ڕێ نەدارو دەوەند دەبینرێن، نەتەڵێ درك! پاشان وتی: خوا بیابانی لەمەوشکترو چۆڵترو سامناکتری دروست نەکردەوە، لە هاویندا کەس ناتوانێ بیبڕێ، چونکە دەخنکێ، لە زستانیشدا بە سەرماو سۆڵە تیادەچێ، تەنیالە بەهاردا، کە جارجارە باران دەبارێ، هەروەها لە پاییزیشا، کە هەوا فێنکدەکاتەوە، کاروان پیایدا گوزەردەکات!! لەوەلامی پرسیارێکی ترما وتی: لە (یەزد) وێنجەی تەواومان لەگەڵ خۆماندا هێناوە بۆ حوشترەکانمان، بۆ خۆیشمان خۆراکی باشمان هێناوە.

لەو ڕۆژەدا بۆم دەرکەوت کە بە هیچ جۆرێكو لە هیچ وەرزێکا ناتوانم بە بیاباندا بگەمە (یەزدوکرمان)، واتە ڕێی باکوورم وەلاخستو بیرم لە ڕێی

ڕۆژئاوا کردەوە، واتە ڕێی (ڕەی ، ئەسفەهان) بۆ ئەوەی لەوێوە هێرشبەرمە سەر کرمانو فارسو یەزد.

لە دوای دوو ڕۆژ، کاروان بەرەو باکوور کەوتە ڕێ. من لەوێ مامەوەو هەر چاوەڕوانی هەواڵێکی جیهانگیر بووم. دوای دوو ڕۆژیتر کاروانێکی دیکە گەیشتە (بادامو‌شك)، دوای ئەوەی حوشترەکانیان بۆ لەوەڕو حەسانەوە بەردان، کاروانییەکان، کە باوکێکو شەش کوڕیبوون، ئاگرێکیانکردەوە، بە دەوریدا بەردیان دانان، تەشتێکی گەورەیان خستە سەر ئاگرو بە ئەندازەی نیوەنی سەمەرقەند ڕۆنیان کردە تەشتەکەوە، پاشان هەندێك کەشکی خووساویان لەمەنجەڵێکدا دەرهێناو کردیانە ناو ڕۆنەکەوە، دوای هەڵقرچان، تەشتەکەیان لەسەر ئاگرەکەدا داگرتو نانەوشکەیەکی زۆریان تێکوشیو کەوتنە گلاندنی پارووی گەورە گەورە. نانخواردنەکەیان بە لامەوە زۆر سەیر بوو، چوومە لایانەوەو لە باوکە ڕیشسپییەم پرسی: ئێوە کوێندەرین؟ لەوەڵاما وتی: خەڵکی زابولستانین. پرسیم: ئایا ڕۆستەم لە وڵاتی ئێوەدا هەڵکەوتووە؟ وتی: بەڵێ، وایە. پاشان دەستی بە پشتی کوڕەکانیدا کێشاو وتی: هەریەکە لەمانە ڕۆستەمێکە! بەم کەڵەگەتییەی خۆمەوە؛ کەلە پاڵیانا دەوەستام کورتە بالاّ بووم، بە ڕادەیەك کەڵەگەتبوون، سەریان ڕێکی کورتانی حوشترەکانیان دەوەستا، ئەوەندە بەهێزیشبوون بۆ بارکردن حوشتریان نەدەمرخاند، بەڵکو هەر بە پێوە بارياندەکرد، دەیانگوت: حوشتر خاوەنی ڕەوشو خووی ناسکەو ناکرێ ئازار بدرێت، بەڕاستی حوشترەکان لەچاو ئەو زەلامانەدا لاوازو بێ هێز بوون. من بۆ خۆم باوەڕم پەیدا کرد کە ئەوانە نەوەی پاڵەوانی مەزنی شانامەی فیردەوسین. کە سەیری منو سەربازەکانمیان دەکرد تۆسقاڵێ ترس لە سەرو سیمایانا بەدی نەدەکرا، لەوە دەچوو وەکو مێرووله تێمانبڕوانن. کاتێ ئامادەی ڕۆیشتنبوون، بە مامە پیرەم وت: تۆو کوڕەکانت زۆر کەڵەگەتن، ئایا خەڵکی زابولستان هەموویان وەکو ئێوەن؟ وتی: بەڵێ، هەموویان وەك ئێمەن، زابولستان وڵاتی مەردانی ئێرانە! تا ئەو ڕۆژە وشەی (ئێران)م لە زاری کەس نەبیستبوو، ئەو پیاوەش لە فیردەوسییەوە فێری ناوی (ئێران) بووبوو. دیمەنی ئەو پیرەو کوڕەکانی بە جۆرێك کاری تێمکرد، بە ئاواتەوە بووم کە زوو بگەمە وڵاتی پیاوانی کەڵەگەتو سوپایەیەکی مەزنیان لێدروست بکەمو بیخەمە سەر لەشکرەکەی خۆم.

دوای دە رۆژ مانەوەم لە (بادا موشك) شارەزاکان (جیهانگیر)یان لەگەڵ تەنها حەفتاو دوو کەسدا هێنانەوە، لەبەر برسییەتی‌و تێنویتی بە تەواوەتی پەکیانبوو. جیهانگیر ئاگاداریکردم کەبەر لەگەردەلوولەکە سوارەکانی بڵاوەیان لێکردووەو سەرگەرمی کۆکردنەوەی خۆراکو ئالیکبوون، کە گەردەلوول هەڵیکردووە لەیەك دابڕاون، بەڵام ئەوو ئەو کۆمەڵە سوارەی لەگەڵیدا بوو بوون لە شوێنی خۆیاندا بۆ ماوەیەکی زۆر مابوونەوە، دوای ئەوە گەڵ هەوڵیاندابوو کە رێدەرکەن، بەڵام لەگەڵ هەر هەوڵو کۆششێکیاندا زیاتر پەرێشان بوو بوونو پتر رێیان لێتێکچوو بوو، لەبەر برسییەتی‌و تێنویتی ئەسپەکانیان لە پەلوپۆ کەوتبوون، بەڵام لەبەر فێنکیی هەوای پاییز خۆیان لە تینوییدا نەخنکابوونو مابوون، تا ئەو ساتەی شارەزاکان ئەوانیان دۆزیبوونەوەو لە مەترسی مەرگ رزگاریانکردبوون! لەو کارەساتە وانەیەکی زۆر کاریگەرمان وەرگرتو لەوەودواش کەڵکی باشمان لێوەرگرت.

دوور نەبوو سوارەکانی دی، کەلە بیاباندا سەرگەردانبوو بوون، خۆیان بگەیەننەوە (باداموشك)و رزگاریانبێ، بەڵام من نەمتوانی پتر چاوەڕێی ئەوانبم، بۆیە بەرەو (قائن) بەرێبووم. میری شاری ناوبراو کە زۆر پیر بوو، پێنج فرسەنگ بەرەو پیرم هات، کە نزیکبووەوە لە ئەسپەکەی دابەزی‌و ویستی سەری ئەسپەکەم ماچبکات، بەڵام لەبەر رێزی پیری نەمهێشت، وتم: سواربەرەوە، میر گەلێك نەوازشی نواندو زۆر مەراییکردم، کە گەیشتینە کۆشکەکەی‌و دانیشتین، یەکێك لە نۆکەرەکانی بە سینییەك لیرەوە هاتە ژووری‌و لەبەر دەمما داینا، میر وتی: پێشکەشە بە ئەمیری مەزنمان، منیش وتم: من چاوم نەبڕیوەتە ماڵو سامانی تۆ، ئەگەر بمویستایە بە سەرکەوتن بەدەستمدەهێنا، بۆیە هاتووم تا لە گوێڕایەڵی‌و ملکەچیی میرەکانی باشوور دڵنیابم، خاوەن ماڵ وتی: بەرێزتان لە خۆم لە پێشتر دەزانمو بەندەی هەموو فەرمانێکتانم.

پاشان میری (قائن)م تێگەیاند کە نیازی (زابولستان)م هەیەو راوێژم لەگەڵدا کرد، وتی: بۆ ئەم مەبەستە وەرزێکی تر هەڵبژێرە، تا دەگەیتە ئەوێ زستان دێتە پێشەوە، رێی گەڕانەوەت لێدەبڕێت، لەو کەویرەدا سەربازەکانت گیرۆدەی سەرماو سۆڵەی سەخت دەبنو زیانی زۆریان لێدەکەویت، وەرزی هاوینیش لە بارنییەو زیانی گەورەتان لێدەکەوێ، هەر لێرەوە تا زابولستان ئاواییەکی وا

نابینرێت جێی حەسانەوەی لەشکری تۆی تیا بێتەوە. بەڵام لەبەر ئەوەی گەیشتبوومە دەروازەی زابولستان، زۆرتر مەراقی بینینی ئەو وڵاتەمبوو کە فیردەوسی زۆر باسیکردووە، دەمویست وڵاتی لە دایکبوونی ڕۆستەمی زاڵ ببینم، لە ڕاستیشا بە بینینی کابرای ڕدێنسپیو کوڕەکانی ئەو مەراقە زۆرتر دایە سەرم، دەمویست بڕۆمو ئێران ببینم.

لەشکرم بە جیهانگیر سپاردو لە (قائن) هێشتمنەوە، خۆیشم بەسێ هەزار سوارەوە، کە بۆ جەنگێکی بچووك بەسبوون، بەڕێبووم. دڵنیا بووم کە کۆسپ نایەتە ڕێم، دەمتوانی زوور بگەمە جێو بشکەڕێمەوە. میری (قائن) چوار شارەزای چاکی دامێ کە بە تەواوی لە هەموو کونو قوژبنێکی بیابان شارەزا بوون. کە بەڕێبووم هەوا ساردی کردبوو، منیش بە پێی ڕەوشو دابی ڕێبڕینی جەنگ کە پەیڕەویمدەکرد، ڕێمدەبڕی، سەربازەکانم چاك ڕاهاتبوون، تەنیا هەر ڕابەرو شارەزاکان دادیان بەرزبووەو وتیان: میران بۆچی ئەمەندە پەلەتە، ئێمە دەزانین بۆ شەڕ ناچی، مەبەستت تەنیا سەیرو گەشتە!

ڕۆژێکیان، پێش نیوەڕۆ لە ڕۆژهەڵاتەوە کێوێکی ڕەش دەرکەوت، شارەزاکان وتیان: ئەوە سەرەتای خاکی زابولستانە، هاتەوە یادم کە فیردەوسی لە هۆنراوەکانیدا باسی ئەو کێوەی کردووە. کە لە کێوەکە تێپەڕین هەستمانکرد هەوا گەرمە، بۆ شەوێ گوێم لێبوو بە ئاسمانەوە دەنگی قازو قولنگ دێ، پاشان بۆم دەرکەوت بەرەو دەریای (هاموون) دەفڕن کە لەکەویری زابولستاندایە. تا بەرەو پێشتر دەچووین ئاوەدانی زۆرتر دەردەکەوتو هەوا گەرمتر دەبوو، زانیم ئەو ناوچەیە گەرمیانە، ڕۆژێکیان دەریای هاموونمان لێدەرکەوت، ئەم بەرو ئەو بەری دیار نەبوو، بەهەر چوار دەوریدا تا چاو بڕیدەکرد لەوەرگەی سەوز دیاربوو، ڕەوە گای زەلامو بەهێزو شاخدار دەلەوەڕان، لە دەریاکەشدا کەشتیی چارۆکە دارو بەلەمی زۆر لە هاتوچۆ دابوون، جار جار دەنگێکی بەهێز دەهاتە گوێ، شارەزاکان وتیان: ئەوە دەنگی دەریاوانە زابولییەکانە، ئەوەندە دەنگیان گەورەیە لەم بەر بۆ ئەوبەر دەریاو لەم کەشتیو بەلەمەوە بۆ ئەوانی تر بەباشی دەبیسترێت، کەلە نزیکەوە گوێمان لە دەنگیانبوو، وەکو ناڵەی ڕۆستەمبوو، دەمانگوت: ڕۆستەمی زابولی هەمیشە دەنگو ناڵەی بەم جۆرە بووە.

لە کەناری دەریای هاموندا وچانم گرتو ویستم نوێنەرێکی خۆم بنێرم بۆ لای میری زابولستان کە ناوی (گورشاسب) بوو، پێی ڕاگەیەنێ بۆ شەڕ نەهاتووم، بەڵکو هاتووم بۆ گەشتو گوزارو سەیرانو سەردان. کە گەڕایەوە، وتی، ئەی ئەمیر تەیموور، گورشاسب دەڵێ، ئەگەر بە میوانی هاتووە بە خێر بێ، ئەگەر بۆ شەڕیش هاتووە، ئامادەین... منیش بۆ ئەوەی بیسەلمێنم بۆ شەڕ نەهاتووم دیاریی باشم بۆ نارد، دوای ئەوە هەواڵیان هێنا کە میری زابولستان دێت بۆ پێشوازیمان. چاوم بڕیبووە ڕێگە تاکو سوارانی (گورشاسب) ببینم، کەچی لە دوورەوە هەندێ گاسوار بە چوار ناڵەوە دەرکەوتنو نزیکبوونەوە، من تا ئەو کاتە لەشکری گاسوارم نەدیبوو، گاکان ئەوەندە زەلامو بەهێز بوون مرۆڤ سەری سڕدەمالێیان.

پیرەمێردێك کە سەد ساڵان دەبوو، بەڕیشێکی سپیو درێژەوە لەسەر گاکەی دابەزی، تەماشایەکی دەوروبەری کرد، بەدەنگی بەرز وتی: من (گورشاسب)م، وەچەی (گودەرز)م، سالاری زابولستانم... ئەمیر تەیموور کێیە؟ هەموو ئەوانەی لەگەڵیا بوون پیادە بوون، ئەوانەی لە دەوری مندا بوون بە جاری حەپەسانو بە ددان سەرپەنجەی خۆیان دەگەزی! ئەوەندە کەڵەگەتو باڵا بەرز بوون دەتگوت: هەموو دێوزادەن، نەك ئادەمیزاد! هەموویان ڕیشی درێژیان بەردابووەوە، پارچە قوماشێکی ئەستوورو درێژیان لەبەردا بوو، لایەکیان دابوو بە سەر شانی چەپیاندا. کە میر نزیکبووەوە، منیش چەند هەنگاوێك چوومە پێشەوە، وتم: ئەی سالاری زابولستان،من تەنها بە نیازی سەردانی وڵاتی بەڕێزتان هاتوومەتە ئێرەو نیازی شەڕم نییە، ئەویش وتی: هاتنت پیرۆز، فەرموو با بچینە کۆشکەکەم. وتم: ئەی ئەمیری زابولستان ئێمە سێ هەزار کەسین، دەبینە ئەرك، میر وتی: لەشکری تۆ سێ ڕۆژ میوانی منەو خواردنیان بۆ دەهێننە ئوردوەگەکەیان، بەڵام دەبێ خۆت لە ماڵی مندا بحەسێیتەوەو لەوێ نان بخۆیتو بخەوی.

(گورشاسب)و یاوەرانی سواری گا بوون، منیش لەگەڵ هەندێك لە سوارەکانما سواری ئەسپبووینو بەرەو شار کەوتینە ڕێ. لە ڕێگەدا سەرنجمدا کەهەموو لایەك سەوزەوپڕە لە باخو بێستانو کێڵگەی زۆر، جووتیاری زەلامو خاکەنازو بێڵ لەسەر شان سەر قاڵی کاری کشتوکاڵبوون، بە گای بەهێزو زەلام جووتیاندەکرد، کە گەیشتینە ناو شار، سەرنجمدا زۆر فراوانو بەرینە،

کەلوپەلو کالای هیندستانم تێدا بینی، دیار بووبازرگانیی لە تەك ئەو ولاتەدا هەبوو، (گورشاسب) زۆر بە چاکی میوانداریمیکردو کاتێکی زۆر خۆشم لەگەلیا بەسەر برد.

لە دووەم ڕۆژدا، ئەو بە سواریی گاو من سواری ئەسپ لە شار چووینە دەرەوە، گەیشتینە قەلایەکی وێران، وتی: ڕۆستەم لێرەدا هاتوتە دنیاوە، پرسیم: لە چ ڕۆژێکا ڕۆستەم لە دایکبووە؟ وەلامی دایەوە: هەزارو پێنج سەد سال لەمەوبەر. پاشان چووینە نزیك کێوێك، وتی: ئەمە ئەو کێوەیە کە ڕۆستەم بە مندالی هاتۆتە سەریو لەگەل هەلۆکاندا جەنگاوە، ئێستا چونکە زستانە هەلۆکان ڕەویانکردووە، ئەگەر هاوینبوایە دەتبینین.

سالاری زابولستان زانیی کە هۆنراوەی فیردەوسیم زۆر لاپەسەندە، هەر بواری هەبوایە هۆنراوەیەکی ئەو شاعیرەی بۆ دەخوێندمەوە. فیردەوسی لە هۆنراوەکانیدا باسی تەنیا یەك ڕۆستەمی کردووە، کەچی من لە زابولستانا هەزاران ڕۆستەمم بینین. خەلکی زابولستان دەیانتوانی سالی سێ جار ...ردەمی کشتوکال بە دەستبێنن، چونکە نارچەکەیان گەرمەو ئاوی زۆرە، بەلام لەبەر ئەوەی خاکەکەی زۆر بە پیتە سالی جارێك بەرهەمیان بەسە. میر (گورشاسب) گەشتێکی دەریای سازداو بە ناو دەریای هاموندا گەڕاین، لەسەردەمی ڕۆستەمدا ئەم دەریایە زۆر فراوانتر بووە، بەلام سال بە سال کەمدەکا، ڕۆ دەچێو وشکایی نوێ دەردەکەوێت، لەوانەیە دوای هەزار سالیتر بە تەواوی وشکبێتو نەوەکانی ئەو سەردەمە نەیبینن.

بەر لە گەڕانەوەم بۆ (قائن) لە سالاری زابولستانم پرسی: ئایا دەتوانم لە لاوچاکانو بالابەرزانو بەهێزانی زابولستان سوپایەکی باش پێکەوە بنێم؟! وتی: ئەی ئەمیر تەیموور، تۆ میوانی منیو دەبێ داواکاریت جێبەجێبکەم، بەلام بە داخەوە ناتوانم ئەم داواکارییەت بەدیبێنم، چونکە دانیشتووانی ئەم خاکە سەربازی تەنیا بۆ ولاتی خۆیان دەکەن، ئێرە ئێرانەو لە سەردەمی ڕۆستەمەوە تاکو ئەمڕۆ پەیڕەویی ئەم دابو نەریتە دەکەن، لە ڕۆژی گەڕانەوەمدا، میر گورشاسب دەگای سواریو قاتێك بەرگی جەنگی پێمبەخشین، لەبەر گەورەیی قاتەکە، تاکو ئێستا لەبەرم نەکردووەو هەر ماوە.

لە کاتی مالئاواییدا میر وتی: لەوانەیە من تۆ نەبینمەوە، بەلام بەرلەمردنم سپاردەیەکم بۆ وەچەکانم ئەوە دەبێ کە پشتاو پشت لەگەل خۆتو وەچەدا

دۆستین. کاتێ لێم پرسی: ئەگەر لەگەڵ دوژمندا بەجەنگهاتم یارمەتیمدەدەی؟ لە وەڵاما وتی: ئەگەر دوژمنەکەت دوژمنی ئێمەشبوو یارمەتیتدەدەم، ئەگەر لەگەڵ دۆستی مندا بجەنگێی ناتوانم یارمەتیتبدەم!

لە سەرەتای زستاندا زێدی رۆستەمم بەجێهێشتو لەگەڵ سوارەکانما بەرەو (قائن) بەرێبووم، کە کێوەرەشمان بەجێهێشت، سەرماو سۆڵە دەستی پێکرد، ئەوەندە سارد بووترساین لە ناوبچین. بەیناو بەین پشوویەکمان دەداو بە درکودالّی بیابان ئاگرێکماندەکردەوەو کەمێك خۆمان گەرمدەکردەوە. بەفرێکی ئیگجار زۆر باریبوو، بەلاّم شارەزاکانمان ئەوەندە کارامەو لێهاتووبوون، رێیان لێتێك نەدەچوو، بەم جۆرە دوای سەرماو بۆرانێکی زۆر گەیشتینەوە (قائن).

# یازدەمین بەش

## جەنگی ئەسفەهان

بڕیارمدا هەر لە هەمان وەرزدا بگەڕێمەوە بۆ (ماوەرائەننەهر). بۆ ئەوەی بارم سووکتر بێ، مزگەوتەکەمو هەندێ جلوبەرگو کەلو پەلی سوپام لە خوراسان بەجێهێشتن، تاکو دواتر کەڵکیان لێوەرگرم. (جیهانگیر)م ڕاسپارد کە پێشبکەوێتو قوناغ بە قۆناخ خۆراکو ئالیکو سووتەمەنی ئامادە بکات، دەمزانی وەرزی بەفرو بەستەڵەکە پێویستە هەموو پێداویستییەك دابینبکەین. تا بیستو پێنج فرسەنگی باشووری شاری (طووس) سەفەرەکەمان بە ئاسانی گوزەراند، کە گەیشتینە (کۆچان) لەبەر سەرماو سۆڵە ناچار بووم پازدە ڕۆژ بمێنمەوە، لەو ماوەیەدا باری بژێویمان ئەوەندە دژوار بوو کە نرخی دوو هێلکە گەیشتە درهەمێك. کۆمەڵێك لە پیاوانی شار هاتنە لامو وتیان: ئەی ئەمیر، ئەگەر ئەم لەشکرەی بەڕێزتان پتر بمێنێتەوە ئێمەشو سەربازەکانیشت لە برساندا دەمرین!.

بەوەی باشبوو هەوا خۆشبوو، بەڕێبووین، تاکو گەیشتینە (سەمەرقەند) هیچ ڕوو داوێکیوا نەهاتە پێشمان شیاوی باسبێ. کە گەیشتمە (سەمەرقەند) بیستم مامۆستای شمشێربازیم (سەمەر طەرخان) کۆچی دواییکردووە، بەو هەواڵە گەلێ دڵگران بوومو ساتەمیم، چونکە بەڕاستی مافێکی زۆری بە سەرمەوە هەبوو، فێری گرنگترین هونەری جەنگی کردم، ڕایهێنام کە دەستی چەپیشم وەکو دەستی ڕاستم بەکاربێنم، کاتێ کە قۆڵی ڕاستم بە خەستی بریندار بوو، بەدەستی چەپم جەنگامو نەکوژرام، ئەوەتا ئێستاش کە ناتوانم بە دەستی ڕاست بنووسم، بە دەستی چەپ دەنووسم.

هەر لە کاتی گەیشتنما لە (صەدرەددین ئەسفەهانی)یەوە، ناسراو بە (حەکیمی ئیلاهی) نامەیەکم بۆهات، دەربارەی (جەبرو تەفویض) وەڵامی منی داپووەوە. (جەبر- کەسێك بەزۆر کارێکی پێبکرێ- ناوی ڕێبازێکە، لایەنگرەکانی پێیان دەوترێ جەبریە، بە باوەڕی ئەوان هەموو هەڵسو کەوتێکی ئادەمیزاد بە دەست خوایەو بۆخۆی خاوەنی بڕیارو هەڵبژاردن نییەو ناشتوانێ بەرەنگاریبکات). ئەو زانایە، وەکو بەڵگە چەند ئایەتێکی هەڵبژاردەی

نووسیبوون، وتبووی: بەپێی ئەو ئایەتانە مـرۆڤ لـە ژیـانی خۆیـدا هـەرچی شتێکی بیـەوێ دەتوانـێ لە سنوورێکی دیـاریکراودا بیکـا. بە بـاوەڕی منیـش بێجگەلە دایکبوونومردن، مرۆڤ لە ژیاندا ئازادەو چی بوێت دەیکات، ئەوانەی وا هەستدەکەن بێ شانسو بەدبەختن زۆر هەڵەن، ئەوەی بە کۆششو بەکاربێ هەرگیز بەد بەختو ڕەنجەڕۆ نابێ. وەڵامی نامەکەی((صەدرەددین))م نووسیو داوام لێکـرد لـە (ئەسـفەهان) دەرچێـتو بچێـت بـۆ شـاری (طـووس)و لـەوێ نیشـتەجێبێ، یـان بێتـە (سـەمەرقەند)و تیـایدا بـژی، هـۆی ئەوەشـم بۆیـە نەنووسیوو، چونکە نەمدەویست کەس بزانێـت ئەمـەوێ (ئەسفەهان) بگـرمو دوای ناوچـەی خوراسـان ناوچـەی عـیراق بخەمـە سـەر قەڵـەمڕەوی خـۆم. (ڕوونکردنەوە: عیراق، ناوچەیەکە دەکەوێتە ناوەڕاستی ئێرانەوە، لەسەردەمە کۆنـەکاندا بـە هـەموو ناوچـەکانی ناوەڕاسـتی ئـێران دەوتـرا عـیراق، هێشـتا گوندنشینەکانی مازندەرانو گەیلان بە خەڵکی تارانو کاشانو ئەسفەهان دەڵێن عیراقی– وەرگێر بۆ فارسی) .

لە بەهاری ساڵی (٧٨٠)ی کۆچیدا بە لەشکرێکی (١٢٠) سەدو بیست هەزار کەسەوە بەڕێبووم بۆ خوراسان بەو نیازەی ئەسفەهانو فارس داگیر بکەمو (شا مەنصوور موظەففەر) کە شای فارسبوو، تەمێبکەمو بە سزای سەختی خۆی بگەیەنم؛ ئەمەش لەبەر ئـەوە بـوو کـە لـە دووەم گەشـتی خوراسـانمدا خـراپ نەخۆشکەوتم، پزیشکی تایبەتیم بڕوای وابوو بە تینی گەرماو شەرا وام بەسەر هاتبوو، وتی: بە ئاوی لیمۆی فارس چاکدەبیتەوە. ڕاوێژکاران وتیان: داوا لە (شا مەنصوور) بکە بە کاروانی خێرادا، یان بە گالیسکەدا هەندێکت بۆ بنێرێ. هەر چەندە داواکارییەکە زۆر سادە بوو، هی ئەمیرێکی وەك منیش نەبوو، بەڵام بۆ ئەوەی دۆستایەتیی خۆم بۆ ئەو شایە دەربڕم نامەم بۆ نووسی، لە بڕگەیەکا وام نووسیبوو: ئەگەر نەخۆش نەبوومایەو دەرمانەکەشم ئاوی لیمۆ نەبوایە ئەم داواکارییەم لە بەڕێزتان نەدەکرد.

بـێ گومـان ئەگـەر بـە دەنگمـەوە بهاتایـە گـرەوی دۆسـتایەتیی دەبـردەوە. وەڵامی شـای نـاوبراو لە یەکەم وشەوە تـا دوا وشـە نابەجێبوو، نووسـیبووی: بارەگـای مـن دووکـانی عەتاری نییـە، ڕەنگە وابزانـی کەلـە نـەوەی جـەنگیزبی، خـۆت بـە گـەورەو مـن بـە بچـووك بزانـی، دەبـێ پێـت بڵێـم باووباپـیرانت بـە جەنگیزیشەوە نەیانتوانیوە بـە چاوێکی سـووكو نزمـەوە بڕواننـە پاشـایانی

فارس، چ جا تۆ کەلە چاو جەنگیزدا لە مێرووڵەیەك زیاتر نیت!! لە کۆتاییدا نووسیبووی: گەر ئاو لیمۆ فرۆشیش بوومایەو تاقە دەرمانیشت بێت بۆم نەئەناردی، بۆ ئەوەی بەو نەخۆشییە بمریتو وەچەی جەنگیز بپڕێتەوە!....

بەگەیشتنی نامەی ناوبراو گەلێ تووڕە بووم، لەهەمان کاتیشا بۆم دەرکەوت ئەو پیاوە زۆر خۆپەسەندو خۆپەرستو لە خۆبایی‌و نەزانە، هەردەمودەست بڕیارمدا عیراق بگرمو لەوێوە بگەمە فارس‌و مێشکی شای ناوبراو تێکەڵ بە خاکبکەم. لەشکرەکەمم کرد بە سێ بەشەوە، هەر یەکە لە کوڕەکانم فەرماندەی چل هەزار سەرباز بوو، خۆیشم فەرماندەیی چل هەزاری سێیەمم گرتە ئەستۆ، لە شاری (طووس)ەوە بەڕێبووم، بەبێ هیچ تەگەرەیەك گەیشتمە شاری (ڕەی).

دوو ساڵ لەوەوپێش‌و لەنیوەشەودا بەبوومەلەرزەیەکی زۆر بەهێز ئەو شارە گەورەیە کاول‌و وێرانبووبوو، بێجگە لە کەلاوە کۆنو وێرانە هیچ خانوویەك بە پێوە نەمابوو، گوندنشینەکانی دەوروبەر دەیانگوت: بەسەدان لاشەی مردووان لە ژێر دارو بەردو پەردووی شاردا ماوسنەتەوەو کەس ناتوانێ دەریانبێنێ. تەنها ژمارەیەکی زۆر کەم ڕزگاریانبووبوو، ئەوانیش ڕۆژانە لەگەڵ دێهاتەکانی دەروبەردا لەناو کەلاوەکاندا بۆ کەلوپەل‌و فەرشی بەنرخ‌و زێڕو زیو دەگەڕان، بەم کارەش هەندێکیان چاك دەوڵەمەند بووبوون، لە شاری (ڕەی)دا زۆر نەمامەوە، بەرەو ئەسفەهان کەوتمە ڕێ، بە شاری (قوم)دا گوزەرمکرد، کە ناوە ڕاستییەکەی (گوم)ە، بە واتای (میسر)، پاشان وردە وردە لە ئەسفەهان نزیکدەبوومەوە، لەشکرەکەشم پتر ئامادەی جەنگبوو.

ئەو ڕۆژەی گەیشتمە (ڕەی) فەرمانمدەرکرد کە هیچ کەسێك لەو شارەوە بەرەو ئەسفەهان نەچێ، تاکو هیچ کەس بە لەشکرکێشییەکەم نەزانێتو لە پڕ بدەم بە سەر ئەسفەهاندا. کە لە شار نزیکبوومەوە دوو بۆسەم ناردنە پێشەوە، پێنج فرسەنگ لەیەکەوە دوور بوون، نێوان لەشکرەکەمو یەکەم بۆسەش هەر پێنج فرسەنگبوو، دەفرسەنگی مابوو بگەمە ئەسفەهان، لە ئاواییەکدا وەستام چونکە یەکەم بۆسە ئاگاداریکردم کە ئەسفەهان بۆ بەرگری ئامادەیەو دەروازەکانی بە قاییمی داخراون! بە ڕاستی ئەو هەواڵەم پێ سەیر بوو، چونکە بە هیچ جۆرێ نەمدرکاند بوو کە نیازی داگیر کردنی ئەسفەهانم هەیە. هەر چۆنێبێ ئەسفەهانییەکان بە هێرشەکەمیان زانیبوو. لە دانیشتووانی ئاواییەکە، کە ناوی (بامورچە)بوو، گەلێك زانیاریی باشم وەرگرتن، ڕووباری

(زایندە) لە ڕۆژهەڵاتەوە بە شاردا تێپەڕ دەبێتو لە ڕۆژئاواوە دەردەچێت، پێرمکردەوەکە ئەو دوو شوێنە ڕێی چاکن بۆ چوونە ناو شار. پاشان پتر لە شار نزیکبوومەوەو لە ئاوایی (سەددە) داگیرساینەوە. لەو ئاواییە شا زانیاریی بە کەڵکم بە دەستگەیشت، بە هۆی بۆسەی تایبەتییەوە بۆم دەرکەوت کە لە دەرەوەی شاردا لەشکری دوژمنی لێ نەبوو، درێژیی شووورەی شار حەوت فرسەنگو نیو بوو، لە نێوان هەر سەدو پەنجا مەترێکدا قولەیەك هەبوو، واتە سێ سەدو پەنجا قولە لە دیوارو شوورەی شاردا هەبوون. شوورەکەش ئەوەندە پانبوو کە بە ئاسانی گالیسکە بە سەریا هاتوچۆیدەکرد، بەردو تیرێکی زۆریش لەسەر دیوارەکە کەڵەکە کرابوون، لە دیوی دەرەوەش بە هەر چوار دەوری شووورەکەدا، شوورەیەکی بچووکتر دروستکرا بوو بۆ ئەوەی هێرشبەران نەتوانن خەندەق لێبدەن بۆ ژێر شوورەی سەرەکی. هەروەها ئاگادار کرام کە شاری ئەسفەهان ئاوە ڕۆو زێرابی فراوانی هەیە، تا ئەودەمە شارێکم نەدیبوو ئاوەڕۆی بۆ کرابێ.

لە چەند خاڵێکی دیاریکراودا لەشکرەکەمم دانا، بەم جۆرە شار لە ژێر چاودێریدا بوو، ئەگەر دوژمنیش نیازی هێرشی بەرەنگاری هەبوایە بە ئاسانی لەناو دەبرا، لەبەر ئەوەی دەوری بەهار بوو، ئاوی ڕووباری (زایندە)ش زۆر بوو، نەمدەتوانی لە هیچ سەرێکی ئەو ڕووبارەوە بچمە ناو شارەوە. بڕیارمدا بە شێوەی گرتنی شارەکانی‌تر، خەندەق لێبدەین. لە یەکەم هەنگاودا هێرشمانکردە سەر دیوارە بچووکەکە، لەبەر ئەوەی بەرەنگاری بەرگرییەکی کەم بووینەوە لە ماوەی چەند سەعاتێکدا دوژمنان چۆڵیانکردو خۆیان کردەوە بە شاردا، لە هەر چوار لای شارەوە دەسکرا بە خەندەق لێدان، تاکو بە باروت دیوارەکان هەڵتەکێنینو هێرشبەرین. دوای ماوەیەك ئیشکردن ئەندازیارەکان ئاگاداریانکردم کە لە هەموو لایەکەوە ئاو هاتۆتە ناو خەندەقەکانەوە. بۆمان دەرکەوت کە زەویی ئەسفەهان ئەوەندە ئاوی زۆرە، لە هەر شوێنێکا کەمێك هەڵکەندرێت زوو دەگاتە ئاو. ناچار بووین کە واز لە تونێللێدان بێنینو بیر لە ڕێگەی تر بکەمەوە. تەنیا دووڕێمان لەبەردا بوون، یان لە شوورەی شارەوە هێرشبەرینو بۆ ئەمەش قولەی بەرزو قاییمو جووڵاو ئامادەبکەین، یان لە ڕووباری شارەوە بچینە ناو شارەوە. لەگەڵ ڕاوێژکارەکانمدا نەخشەمان دارشت بۆ ئەوەی ئاوەڕۆی ڕووبارەکە بگۆڕین، پاشان بۆمان دەرکەوت ئەو کارە پتر لە

سێ مانگی دەویستو ئەو ماوەیەش بۆ ئێمە زۆر بوو، لەبەر ئەوە پەنامانبردە بەر دروستکردنی قولەی جوولاو، بۆ ئەمەبەستەش درەختەکانی دەوروبەری شارمان بڕینو لە ماوەی سێ ڕۆژدا دروستکران، پاشان سەربازەکانم لە قولەکانەوە بەرەنگاری دوژمن بوونەوە، بەرەی ئێمە ڕوو بەڕووی بەردە بارانو تیربارانێکی خەستو چڕ بووەوە. هەر جارەی دەستەو تاقمێك لەسەربازەکانم بیانویستایە خۆیان بگەیەننە دیواری شوورەکە تاکو لە بن دیوارەکەدا چاڵێك هەڵکەننو بە باڕووت شوورەکە هەڵتەکێنن بەردەبارانەکرانو دەکوژران.

دوای گەمارۆدانی شار بۆم دەرکەوت هەرگیز ڕێی ناوی لێ ناگیرێ، بە تایبەتی لە هەر شوێنێ بیر لێبدرێت، زۆر زوو دەگاتە ئاو. بیرمکردەوە بە برسییەتی شار لە پەلو پۆ بخەم. دانیشتووانی ئاوایی ئاگاداریانکردم کە دابو ڕەوشی خەڵکی ئەسفەهان وایە ساڵەو ساڵ ئازووقەو خۆراکی ساڵێکی تەواو دەخەنو تا خەرمانکوتاندنی ساڵی ئاینده بیریان ئاسوودەیە، تەنانەت سووتەمەنیو ڕۆنو هەموو پێداویستییەکی‌تری ساڵێکی تەواو دابیندەکەنو بێخەم پاڵی لێدەدەنەوە، تەنیا لە دوای تەواو بوونی وەرزی زستان کەمبوونەوەی خۆراکیان دەست پێدەکات.

من نەمدەتوانی تا تەواو بوونی هاوین بەسەدو بیست هەزار سەربازەوە لە دەوری شوورەی ئەسفەهاندا بمێنمەوە لە سەرێکی دیکەوە ترسی ئەوەم هەبوو کە ئەمیرانی خووزستانو باکوورو پادشای ئازربایجان دژ بە من یەك بگرنو بەلە شکرێکی زۆر بەهێزەوە پەلامارمبدەنو لەناومبەرن.

ئەسفەهانییەکان زۆر بە توندیو سەر سەختی بەرگرییاندەکرد، هەر شوێنێکمان برووخاندایە لە کەمترین ماوەدا چاکیاندەکردەوە، یان هەر لە ڕێکی ئەوێداو لە پشتەوە بە بەردو خشت دیوارێکی تریان دروستدەکرد. بۆ ئەوەی نەمانبیینن، بڕیارمدا تەنها لە شەودا خەریکی چاڵهەڵکەندنی بنی دیوارەکە بن، بەڵام ئەوەش هەر کارەساتبوو، سەربازانی ئەسفەهان کە گوێیان لە دەنگی پاچو خاکەناز دەبوو، بە گوریس چرای ڕۆشنکەرەوەیان دادەهێڵایە خوارێو خێرا بە بەردی گەورە گەورە بەردبارانی سەربازەکانم دەکراو دەکوژران.

خەڵکی گوندی ( سەددە) ئاگاداریانکردم کە ئەسفەهانییەکان زۆر هۆگری کۆترنو ژمارەیەکی ئیگجار زۆر ڕادەگرنو بۆ نامە ناردنو نامە هێنانو هەواڵزانین بەکاریاندێنن. کە گەیشتمە ئەسفەهان بە چاوی خۆم دیم پۆلەکۆتری

زۆر بە ئاسمانی شاردا دەفرن، بۆم دەرکەوت لەوانەیە بە هۆی کۆتری نامەبەرەوە ئەسفەهانییەکان لە نزیکبوونەوەی من ئاگادار بووبن‌و خۆیان بۆ بەرگری ئامادە کردبێ. دڵنیا بووم کە ئەو کۆترانە لە خاڵێکەوە بۆ خاڵێکی تر کەڵکیان لێوەردەگیرێت، گومانیشم بۆ ئەوە دەچووو کە لەوانەیە بە هۆی ئەو کۆترانەوە داوای یارمەتی لە وڵاتانی تربکەن، بۆ ئەوەی لە مەترسیی کۆتری نامەبەر بێ خەمبم پەنامبردەبەر ڕاگرتنی شەهێن(باز)، چونکە مڵۆزمی کۆترە، دوای ئەوە هیچ کۆترێکی نامەبەر لە هەڵمەتی شەهێنەکان دەرباز نەدەبوو.

بەو هەموو بەرگری‌و بەرنگاربوونەوەی ئەسفەهانییەکان گەلێك ڕقم هەستا، چەندان نامەم بە تیرەوە بەستن‌و بەرەو شار هاویشتمن، لە نامەکاندا وام نووسیبوو:س هەر کاتێ دەست بەسەر شاردا بگرم هیچ کەس نابوێرم‌و هەمووتان دەکوژم!.. بێ گومان بە تەواوەتی ئەو هەڕەشەیەم جێبەجێنەدەکرد، چونکە لەسەر دابی خۆم هەر شارێکم داگیر بکردایە، زاناو داناو شاعیرو پیشەکارانم دەبواردن. ئاگادار کرا بووم شیرگەری کاارامەو چاك لە ئەسفەهاندا هەن، شمشێری ئەسفەهانی لەسەرانسەری عیراق‌و فارسدا دەنگی داوەتەوە، زانیم کە پێویستی زۆرم بەو وەستایانە هەیە، جا بڕیارم وابوو لە دوای داگیر کردنی ئەسفەهان بیانبەم بۆ سەمەرقەندو بوخاراو پیشەکەیان لەوێ بڵاوبێتەوە.

وەرزی بەهار تەواو بوو، هاوین هاتە بەرەوە ئەسفەهانییەکان نەتووشی قاتوقڕانی بوون، نە ئامادەشبوون دەروازەکانی شار بکەنەوە. لەبەر پیسیی ئاوی ئەو ناوە هەندێك لە سەربازەکانم تووشی نەخۆشیی سێبەڕۆ بوون. هەندێ جار دەهاتمە سەر ئەوەی لە گەمارۆی ئەسفەهان گەڕێم‌و بچم بۆ جەنگی پادشای فارس، بەڵام ترسی ئەوەم هەبوو گەر ئەسفەهان هەروا بەو تواناو هێزەیەوە بمایایەتەوە، لەوانەبوو ڕێی پاشەکشێم لێبگرێ. جاری واش هەبوو دەمویست بەرەو وڵاتی خۆم بگەڕێمەوە، بەڵام لە خۆبایبوونم دەبووە ڕێگرم. لە وەرزی هاویندا ئاوی ڕووباری (زایندە) کەمیکرد، بەڵام هێشتا لەشکرەکەم نەیدەتوانی لێبپەڕێت‌و لەو ڕووبارەوە بچێتە ناو شارەوە. هەندێك ئەندازیارم ڕاسپاردن کە نەخشەیەك دابڕێژن بۆ وەچەرخاندنی ئاوەڕۆی ڕووباری ناوبراو، لە ئەنجامدا لەبەر سەختیی جێبەجێکردنی پرۆژەکەو بڵاوبوونەوەی نەخۆشی لەناو ژمارەیەکی زۆر لەسەربازەکانمدا ئەو کارەم دواخست بۆ سەردەمێکی تر.

گەماڕۆدانی ئەسفەهان درێژەیکێشا تا هاوینیش تەواو بوو. پاییز هاتە پێشەوەو هەوا فێنکبوو، شنەبای پاییز کەوتە شنەشن ئاوی ڕووباری (زایندە) بە جۆرێك کەمیکرد، نەك سوار، بەڵکو پیادەش بە ئاسانی لێیدەدا. بە هۆی نەخۆشییەوە نۆ هەزار سەربازم لە دەورو بەری ئەسفەهان دوور خستبوونەوە. پێنج هەزار سواریشم کوژرا بوون، بەم جۆرە سەدو شەش هەزار سەربازم مابوونەوە. پێش ئەوەی هێرشبکەم، پەنجا هەزار سەربازم جیا کردنەوە، بیستو پێنج هەزاریانم لە دەرەوەی شارا دانان بۆ کاتی خۆی. شەشتو شەش هەزارەکەی ترم کردن بە سێ بەشەوە، دەستەیەکیان لەو شوێنەوە کە ڕووبارەکە دەچێتە ناو شارەوە، دەستەیەکی تریشیان لەو شوێنەوە کە ڕووبارەکە لە شار دەردەچێ بچنە ناو شارەوە، سێیەم بەشیشیان هەڵتەکاندنی دیواری شاریان پێسپێردرا. بە هەر هەموویانم ڕاگەیاند بەزەیی لە دڵیانا دەرکەنو کەس دەرنەکەن، ئەویشی بە زیندوویی بمێنێتەوە، بۆ خۆم بڕیاری سەرەنجامی دەدەم! پێم وتن: بە داگیر کردنی شار هەمووتان دەوڵەمەند دەبن، وەکو دەڵێن جوانترین ژنانی ئێران لە ئەسفەهاندان، هەموو ژنەلاوو جوانەکان دابەشدەکەم بەسەرتانا!.. هەموو سەربازە هێرشبەرەکانم پیادە کردن، شمشێرو تەورو گورزیان لە خۆیان بەست، بۆیە هەمووشیانم پیادە کردن، چونکە کۆڵانو شەقامی تەنگەبەری شار بە کەڵکی سوار نایەنو گیرۆدە دەبن. سەبارەت بە دیواری ئەسفەهان پێشنوێژی (سەددە) بۆمی باسکرد کە (نووح پێغەمبەر د.خ) دروستیکردووە، ئەوەندە ئەستوورو قاییمە تەنانەت لافاوەکەی (نووح) کاری تێ نەکردووە، هەروەها وتی: بەر لە لافاوەکە (نووح پێغەمبەر د.خ) کەشتییەکەی خۆی لە ئەسفەهاندا دروستکردووەو هەر لەوێش سواربووە. بۆ ڕووخاندنی دیواری ناو براو وای بۆ چووبووم لە کاتی هێرشی سەربازەکانمدا لە ڕووبارەکەوە، زۆر لە سەربازانی سەر دیوارەکە بە هانای هاوڕێکانیانەوە دێنو کارەکەی ئێمە ئاسانتر دەبێ.

کە سەربازەکانم چوونە ناو شارەوە، لە هەموو ناو شاردا، ئەسپێك، ئێسترێك، وڵاخێك، ئاژەڵێك، تەنانەت یەك سەگیش نەمابوو! لەبەر برسییەتی دانیشتووانی شار هەموویان خواردبوون! ئەو برسییەتییە گەلێك یارمەتییداین بۆ گرتنی شار، خۆ ئەگەر وانەبوایە بەو ئاسانییە لە پەلوپۆ نەدەکەوتن! ئەو ڕۆژە هەر سەر لە بەیانییەوە بەری ئاسمان بە هەوری ڕەش داپۆشراو بۆ نیوەڕۆ

یەکەم تاوە بارانی پاییز باری‌و زۆر سەخڵەتیکردین، بەڵام شەڕ هەر بەردەوامبوو. بەو هەموو لاوازی‌و برسییەتییەوە ژن‌و پیاو، منداڵ‌و لاو و پیری ئەسفەهان بە هەموو جۆرێك بەرەنگارمانبوونەوە، بەڕاستی شەڕی مان‌و نەمانیان دەکرد، لەولاشەوە هەر چەندە بە باران بارووتەکەمان تەڕ دەبوو، چەند جارێك بووە هۆی نەتەقینەوەی، لەگەڵ ئەوەشا دەمەو عەسر توانیمان چەند کەلەبەرێك بکەینە ئەو شوورە قاییم‌و پان‌و بەرین‌و ئەستوورەوەو لە چەند لایەکەوە دیواری شاردارمێنین. سەربازانی (چەتینی)ش بەشێکبوون لەوانەی لەگەڵ شەبەقدا هێرشیانبرد، لە کاتی عەسردا هەواڵیان بۆ هێنام کە فەرماندەکەیان(ئۆرگون چەتین) کوژراوە، کە لاشەکەیان هێنا سەیرمکرد بێ سەرە، تەمزە ئەسفەهانییەکان سەریان لە لەشی جیا کردبووەوە! دەستوورمدا چاك لاشەکەی بپارێزرێ تاکو ببرێتەوە بۆ (ماوەرا ئەننەهر)و بدرێتەوە بە خێزانەکەی. ڕۆژی کورتی پاییز تەواو بوو کەچی هێشتا هەر گەرمەی جەنگبوو. کە باران دەستی پێکرد من لە دەرەوەی شاردا بووم، لە چادرەکەی خۆمەوە فەرماندەردەکرد، سەرپەرشتیی گۆڕپانی جەنگم دەکرد‌و دەمویست بە زووترین کات شارداگیر بکەین. پێش ئەوەی تاریکی دابێت، (قولور بەگ)ی فەرماندەم لەناو شارەوە گەڕایەوە لام‌و پێشنیاریکرد کە لەبەر باران‌و تاریکی‌و دژواری‌و سەخڵەتی، ئەو شەوە شەڕ ڕابگرم، سەربازەکان پشوویەکبدەن‌و بۆ ڕۆژی دوایی دەستبکەیتەوە بە شەڕ. لەوەڵاما وتم: ئەم هەنگاوەبە زیانی زۆری ئێمەو بە سوودی زۆری دوژمن دەگەڕێت، ئەسفەهانییەکان برسی‌و بێ دەرەتانن، ئەگەر بواریانبدەین لەوانەیە شەوێ لە شار بێنە دەری‌و زۆر دڕندانە پەلامارمانبدەن، بە تاریکی‌و لەبەر بارانیش حاڵمان شڕتر دەبێ. ئەو ڕۆژە هەشت هەزارو پێنج سەد بریندارو کوژراومان هەبوون. بۆ شەوێ توانیمان چەند کەلەبەرێکی‌تر بکەینە دیواری شارەوە بۆ ئەوەی بۆ بەیانییەکەی بواری چوونە ژوورەوە وەمان فراوانتربێ.

ئەوە بوو زۆربەی زۆری سەربازەکانم پیادە کردن، جا بۆ ئەوەی لەبەر باران‌و سەرمای پاییزدا ئەسپەکان نەمێنێتەوەو لە پەلوپۆ نەکەون، داوامکرد کە ئەسپە زیادەکان ببرێنەوە بۆ گوندی (سەددە)، لە داری ناوچەکەش پەنامان بۆ ئەو ئەسپانەش دروستکرد کە پێویستمانبوون، چونکە وەکو لەمەوپێش

باسمکرد، ئەسپەکانمان توخمێکی زۆر ڕەسەنبوونو هەرگیز قەرە بوو نەدەکرانەوە. ئەو شەوە تا بەیانی لێزمەی باران بەردەوامبوو، سەربازەکانم سەرگەرمی جەنگبوون، دیواریان دەڕووخاند، خانوویان کاولدەکرد، بۆ بەیانی زوو باران وەستاو خۆرهەڵاتو کەمێك هەوا گەرمبوو، داوامکرد هەرچی ئامێرو شتی وێرانکردن هەیە بخرێنە بەردەستی سەربازەکانم، بجەنگنو کاولبکەن! ئەگەر شوێنێکیش نەڕووخێنرا بە باڕووت بیتەقێننەوە. بۆ خۆیشم، دوای ئەوەی بیست هەزار سەربازم لە دەرەوەی شارا هێشتنەوە، بەهێزەکەی ترەوە هێرشمکردە سەر شار. لە چوار قۆڵەوە پەلاماری شارماندا، خۆمو سەربازەکانم پیادە بووین. بینیم کە سەربازەکانم هەموو فەرمانەکانمیان جێبەجێکردوون: کەلاوەی زۆرو زەبەندە، لاشەیەکی زۆرو لە ڕادە بە دەری پیاوو ژنو منداڵ لەو ناوەدا کەوتبوون!! بارانی بە خوڕ هەموو لایەکی کردبوو بە لیتە، زۆر بە سەختڵەتی ڕێماندەکرد، جار بەجارێکیش تا بەر ئەژنۆمان لەناو قوڕدا وندەبوو، هیچ گوێمان نەئەدایە، چونکە بە ڕاستی پیاوی جەنگاوەر را ڕاهێنراوە لە گۆڕەپانی جەنگدا تاکو بەر ئەژنۆی لەناو خوێندا نوقمبێ! لە هەموو لایەکەوە ئەسفەهانییەکان بەردەبارانو تیربارانیاندەکردین. سەربازەکانم بە پەلە خۆیان گەیاندە خانووەکان، هەر کە خانوویەك دەڕووخێنرا، دانیشتووانی هەوڵیاندەدا خۆیان بگەننە ماڵێکی دیکە. لەبەر سەختڵەتیو ڕقو کینەمان هەر کەسێکمان دەستکەوتایە بە بێ جیاوازی هەلا هەلاماندەکردو ورگیمان ڕادە دا تا بزانین چۆن ڕێخۆڵەکانی دێنە دەرەوە! دیار بوو کوژراوەکان بە دەردی برسییەتی زۆر تلابوونەوە، چونکە زۆربەیان ڕۆخساریان زۆر لاواز بوو، کە ورگی ژنێك، یان پیاوێکمان هەڵدەدڕی هەندێ سەوزەی تێدا بوو، دوور نەبوو گەلای داروەرختیان خواردبێ. تێکڕا لە هەموو قۆڵەکانەوە شەرگەرمبوو، ئەسفەهانییەکان لە هەموو ڕێگەکاندا بەربەرستیان دروستدەکردو هەوڵیاندەدا تاقە هەنگاوێك نەچینە پێشەوە، لە پەنا کۆڵانو ماڵەکانەوە بەردو تیر بەسەرماندا دەبارین. مزگەوتێکی گەورەمان لێوە دەرکەوت: لەوێشەوە لە ڕادە بەدەر تیر بارانو بەردەبارانکراین، بە باڕووت تەقاندمانەوە، هەر کەسێکمان بەر دەسکەوت یەکسەر کوشتمان. لە شوێنێکیترا گۆڕستانێکی گەورەمان دی،

سەرنجمدا هەموو کێلەکانی براون؛ هەموو کۆڵانەکانی سەرووی گۆڕستانەکەیان پێ هەڵچنرا بوون، کاتێ هەندێك سەربازم لە دیوارێك نزیکبوونەوە، بە بەردە کێلی گۆڕستانەکە بەردە بارانکرانو چەند کەسێکیان لەپەلوپۆ کەوتن، ئەوانی تر سەرکەوتنە سەر دیوارەکان، ئەوی کوژرا، کوژرا، ئەویشی توانی هەڵبێ، بۆی دەرچوو.

(قولور بەگ) لە قۆڵی باکوورەوە دەستیگرت بەسەر شەقامێکی بەربڵاودا، ماڵەکانی هەر دوو بەری شەقامەکان کاولدەکران بەسەر دانیشتووانەکانیانا، هەر کەسێکیش بەردەستکەوتایە دەکوژرا. (جیهانگیر)ی کوڕیشم لە قۆڵی باشووری شاردا توانی دەستبگرێت بەسەر شەقامێکی بەرینو سەرەکیدا، ئەویش وەکو (قولور بەگ) بەرەو پێشتر دەچوو، تا گەیشتبووە مزگەوتی گەورەی شار، کۆمەڵێکی زۆری تێدا بووبوون، ویستبوویان بەرگریبکەن، ئەویش بێجگەلە سێ کەس کە ئیمامی مزگەوتەکە بووبوون، لە ملی هەموویانی دابوو، کە هەر سێ ئیمامەکان هێنرانەلام، پرسیارم لێکردن، بۆ دەرکەوت لە یەك کاتا لە هەمان مزگەوتا هەر یەکە لە میحرابی خۆیدا پێشنوێژیدەکات! کاتێك پرسیم: ئەی ناکرێ تەنها یەکێکیان پێشنوێژ بێتو دووانەکەی تریش وەکو ئەو خەڵکە لە پشت سەریەوە نوێژ بکەن بۆ ئەوەی پەیڕەویی یەك ئیمام بکرێت؟! پیاوێکی ڕیشسپی وتی: ئەی ئەمیر، لەم شارەدا هەر کۆمەڵێك پەیڕەویی پێشنوێژێك دەکەن کە بەلایانەوە ڕاستو دروستو دادوەربێ، لەبەر ئەوە هەر کۆمەڵەو دەستەو تاقمێك پێشنوێژی تایبەتی خۆیان هەیە!.. بەڕاستی بەلامەوە شتێکی گەلێك سەیرو سەمەرە بوو، چونکە لە شەرعو دەستووری ئیسلامدا نوێژی بە کۆمەڵ لەپشت سەری تەنها یەك ئیمامەوە دەکرێت، گەرچی ئەو پێشنوێژە موسڵمانێکی ئاساییبێ. ئەو ڕۆژە ئەوەندە دەرفەتم نەبوو کەپتر لەو بارەیەوە لەگەڵ ئەو سێ زانایانەدا وتووێژ بکەم، ئەگینا پێیانم دەسەلماند کە لە هەر شوێنێکا بە کۆمەڵ نوێژ بکرێت دەبێ هەر یەك پێشنوێژ هەبێت، مەرجیش نییە پێشنوێژ فریشتە ئاسا بێت، خواناسێکی بێگەرد، پێشەوای ئایینی، یان ڕابەری ڕێبازێکی تایبەتبێ، ئەوەندە بەسە کە خەڵك بە موسڵمانی بزانن...

جەنگی ئەسفەهان گەلێك دژوارو ناهەموار بوو، زانیم تا دوا خانوو نەڕووخێنرێت ناتوانرێت دانیشتووانی لەناو ببرێن. (قولور بەگ)و (جیهانگیر) لە کاری خۆیاندا بەردەوامبوونو بەرەو پێشتر دەچوون، منیش بە هەمان شێوە دەجەنگام. دەمەو عەسر گەرما زۆرتر تینی سەندو کەمێك زەوی وشکبووەوە، ئەوەش بۆ زەمینەی جەنگی ئێمە زۆر لە بار بوو، هێزەکانی قولور بەگو جیهانگیری کوڕم گەیشتنەوە یەك، بەو جۆرە لە ڕۆژهەڵاتەوە بۆ ڕۆژئاوا هەموو خانووەکان وێرانکران. منیش کە گەیشتمە ناوەڕاستی شار سەیرمکرد خانووەکان بە دار دروستکرابوون، سەربازەکانم بڕێکی زۆر پەڕۆیان لە ڕۆن هەڵکێشان؛ ئاگریان تێبەردانو ئاگربەردرایە خانووەکان، ئاگر زوو بڵاو بووەو هەموو لایەکی گرتەوە، بە ناچاری دانیشتووان دەرپەڕینو دوچاری شیروڕمو گورزو نێزەکانمانبوونو لە ناومانبردن. لەو کاتەدا بینیم وا کۆمەڵێك لە دانیشتووانی شار زانایەکی پیریان پێش خۆیان خستووەو بەرەو ڕوومان دێن، زانا کە قورئانێکی بە دەستەوە بوو، کە گەیشتنە بەرەوە زاناکە بە پاڕانەوەوە وتی: ئەی ئەمیر تۆ پیاوێکی موسڵمانی، بیکە بە خاتری ئەم قورئانە، چاو پۆشی لە پاشماوەی دانیشتووانی ئەسفەهان بکەو مەیانکوژە! وتم: خەڵکی ئەم شارە بەرگریانکردەوەو هەزاران سەربازی منیان کوشتووە، من خوێنی سەربازەکانم دەوێ، هەر دەبێ کۆ کوشتار بکرێن! بەڵام ئەگەر خۆیان بە دەستەوە بدەن لەوانەیە ئەوانەی بە کەڵکی من دێن نەیانکوژم، زانا پیرەکە کەوتە گریانو وتی: دانیشتووان برسیو ڕووتو ڕەجاڵن،وزەو تینیان تیا نەماوە، بە زەییت بەم خەڵکەدا بێتەوە! وتم: ئەم خەڵکە دەیانتوانی دەروازەکان بکەنەوە پێشوازیم لێبکەنو میوانداریمبکەن، ئەوسا منیش دەستم بۆ کەس نەدەبرد، ئێستاش لەبەر ئەوەی ئێوە نێردراوی تایبەتین چاو پۆشیتان لێدەکەمو کەس پەنجەتان بۆ نابات.

دوای سەعاتێك ئاگادار کرام ئەگەر ئەو خانووانەی بەپێوە ماون وێرانبکرێن هەموو کەلوپەلێك دەبێ بە ژێرەوەو سەربازەکانم دەستکەوتی جەنگیان نابێ، بەڵام ئەگەر لێبوردنێکی گشتی دەرکەم بۆ پاشماوەی دانیشتووانی شار سەربازەکانم دەسکەوتیان زۆردەبێ. لێبووردنەکەم دەرکرد بەو مەرجەی

بەدەستی خاڵی لە ماڵەکانیان دەرچنە دەرێ. هەر هەمان رۆژیش داوام لێکردن لاشەی هەموو کوژراوەکان بە خاك بسپێرن، ژمارەی کوژراوەکان ئەوەندە زۆربوو، زیندووەکانی شار لەتوانایاندا نەبوو بیاننێژن، لەبەرئەوە دەستوورمدا لەپێشەوە کوژراوەکانی خۆمان بنێژرێن. کە ناشتنی لاشەکان تەواوکرا، فەرمانمدا دانیشتووانی شارو شارۆچکەو دێهاتەکانی دەورووبەر دیواری شار بروخێنن تاکو جارێکی تر دانیشتووانی ئەو شارە بەرهەڵستیم نەکەن. شیاوی یادکردنەوەیە کە من (صەدرەددین)م لە ئەسفەهاندا نەدی، دیاربوو ئامۆژگارییەکەمی وەرگرتبوو، بەر لە هەڵگیرساندنی شەڕ، ئەصفەهانی بەجێهێشتبوو. کاتێك ئەسفەهانم داگیرکرد، لە سێ بەش دوو بەشی شار وێران کرابوو، تەنها چواریەکی دانیشتوانیش بە زیندوویی مانەوە.

لەدوای تەواوبوونی ئەو جەنگە سەختو دژوارە ناچار بووم کە ماوەیەك لە ئەسفەهاندا بمێنمەوە بۆ دابەشکردنی ژنە لاوو جوانەکانو تاڵانیو دەسکەوتی شەڕ بەسەر ئەفسەرانو سەربازەکانمدا، هەروەها بۆ وێرانکردنی دیوارو شوورەی شار بە تەواوی.

## دوازدەمین بەش

## جەنگ دژ بە سالاری مەغۆل

هەروەکو وتم، بەتەما بووم پاش جەنگی ئەسفەهان رووبکەمە فارسو سەری شــای فــارس پانبکەمــەوە، چونکــە جنێــوی زۆری پێدابــووم، بــەڵام لــە سەمەرقەندەوە نامەم بۆ هات کە جارێکی دیکە (تووك تامیش) هەلی دووریـی منـی قۆسـتەوەو پـەلاماری وڵاتەکـەمی داوە، هـەندێکی کوشـتوونو برێـك لـە خزمــانو نۆکــەرانی بــەدیلبردوون. لەشــکرم ئامــادەکرد بــەو نیــازەی لــە ئەسفەهانەوە بەرەو ئازربایجان بکەوەمەڕێ، بە کێوی قافدا بەرەو وڵاتـی (تـووك تامیش) بکشێم، پاشان لێکمدایەوە کە رۆژبەڕۆژ هەواو کەش ساردتر دەبێتو رووبەرووی زسـتانێکی بەسـتەڵەکو سـەخت دەبمـەوە، بڕیـارمدا کـە هێرشـی ناوبراو دوابخەم بۆ وەرزی بەهار، لەجیاتی ئەوە بەرەو سەمەرقەند کەوتمەڕێ.

لە ئەسفەهانەوە تا شاری ڕەی هیچ سەختڵەت نەبووین، پێش گەیشتنمان بۆ سەبزەوار ئەوەندە سەرماو سۆڵە بوو، ناچار بووین بوەستین، هـەموو لایـەك بە بـەفرێکی زۆر داپۆشـرابوو، دەترسـاین هـەموو ئەسـپەکان لـەناوبچن، بەپەلـە تەویلەمان بۆ دروسـتکردنو لـە هـەموو لایەکـەوە بـە لبـاد دامانپۆشـین. پـاش هێوربوونـەوەی کرێـوەو سـەرما بـەرێبووینو لـە رێـی (طـووس)و (قۆچـان)ەوە خۆمـان گـەیاندە تورکمانسـتان، دوای ئـەوە هـەوا باشـتر بـوو. لـە دوا مـانگی زستاندا گەیشتمەوە سەمەرقەند. بۆئەوەی لە خۆشگوزەرانییەوە دووربم، تەنها پێنج رۆژ لە سەمەرقەنددا مامەوە، دوای ئەوە رووەمکردە بیابانو بنەو بارگەی خۆمـم سـازداو هـەر لـەوێ لەشـکرم ئامـادەکرد بۆئـەوەی بچمـە سـەر وڵاتـی (قەبچاق)، واتـە نیشتمانی (تـووك تـامیش). وەك بـۆم باسـکرا، تـووك تـامیش هێنـدەی مـن باڵابـەرز بـوو، هـەموو سەربازەکانی لە هۆزەکـانی کێـوی قـافبوون، چەکیشـیان تیروکـەوانو شمشـێری بـاریکو کەوانـەییبوو، کـە پێـی دەوتـرا (شاشکا) زۆر بە بڕشتو سووکەڵە بوو، بەئاسانی بەکاردەهێنرا.

لە سەرەتای بەهاردا ویستم بە خۆمو لەشکرمەوە بەرێبم، لەپڕ ئاگادار کرام کە لەشـکری مـەغۆل بەرێوەیـە بۆ داگیرکردنی (ماوەڕائەننـەهر)! بڕیـارمدا خـۆم بمێنمەوەو شێخ عومەری کوڕم بە هەشتا سەربازەوە ناردە سەر تووك تامیش، پێم وت: بیکوژەو سەرەکەیم بۆ بنێرە، ئەگەر رایشیکرد وڵاتەکەی خاپوور بکەو

بگەڕێرەوە. ئەمزانی ئەو کابرایە زۆر ترسنۆکەو لەوانەیە ڕابکات، چونکە هەردوو جارەکە کە هێرشی هێنابوو دوورکەوتنەوەی منی بە دەرفەت زانیبوو.

کە لە ئەسفەهان گەڕامەوە خێرا دەستوورمدا ژمارەیەك کۆتری نامەبەر رابگیرێن‌و پەروەردە بکرێن بۆئەوەی وەکو ئەسفەهانییەکان کەڵکیان لێوەربگرم. یەکەمین کۆترمان لە ڕۆژهەڵاتەوە هات‌و یەکەمین نامەی بۆ هێنام، زانیم فەرماندەی مەغۆلەکان ناوی (بیر- نۆرگۆن)ە، دیاربوو دەیویست جێی باپیرە گەورەم- جەنگیز- بگرێتەوە، لە دڵی خۆمدا وتم: تەیموور، دەبێ بیسەلمێنی کە خۆت کوڕی جەنگیزی!.. دووەمین کۆتر دەربارەی لەشکری دوژمن زانیاری بۆ هێنام، لە نامەکەدا نووسرابوو ژمارەی سەربازەکان دە، تا دوازدە (تمەن)ە، واتە سەد تا سەدو بیست هەزار، لەسەرخۆ رێدەکەن؛ گومانمکرد یان خێزانەکانیان لەگەڵیاندان، یان هۆی گواستنەوەیان ناتەواوە، خۆم ئامادەکردو بە حەفتا هەزار سوارەوە کە هەریەکەیان ئەسپێکی یەدەکیشی پێبوو بەرەو ڕۆژهەڵات بەڕێبووم تاکو لەپڕ بدەم بەسەر دوژمندا. بۆ ئەوەی بتوانین بە ئاسانی‌و ڕێکوپێکی بەڕێبین، سوارەکانم کردن بە بیست کۆمەڵە، هەر کۆمەڵەی سێ هەزارو پێنج سەد کەسبوو. کەلە دوژمن نزیکبووینەوە، دوو ڕێگەوانی شارەزاو وریام ناردن تاکو زانیاریی پترم بۆ بێنن، هەردووکیان بە زووترین کات ئاگاداریانکردم کەلەشکری دوژمن ئێگجار زۆرە، بەڵام ئەسپی یەدەکیان نییە، خێزان‌و ماڵ‌و منداڵێشیان لەگەڵدا نین.

گەیشتینە شوێنێك نزیکەی چوار قۆناخ لە دوژمنەوە دوور بووین، لەوێدا ئەسپە زیادەکانمان بە لای سەربازە یەدەکەکانمانەوە بەجێهێشتن. لە نیوە شەودا کەوتمە ڕێ بەو نیازەی لەگەڵ یەکەم گزنگی بەیاندا پەلاماری دوژمن بدەین. لەبەری ڕۆژهەڵات‌و ڕۆژئاواوە دەنگی چوار ناڵەی ئەسپی چل‌و پێنج هەزار سوار هەموو لایەکی گرتەوەو هەموو دەورو بەر کەوتبووە لەرزە، من لێرەدا ناتوانم وێنەی ئەو گۆڕەپانە دەربڕم، لە کتێبەکەی شاعیری (طووس) یشدا باس نەکراوە، لە هەمان کاتیشا بیست‌و پێنج هەزار سواری یەدەکیش بە دوامانەوە بوون. تا بڵێی هەستم بە تواناو دەسەڵاتی خۆم دەکردو لە خۆشیدا نەمتوانی خۆم بگرم، بۆیە نزیکەی چارەکە قۆناخێکمان مابوو نەعرەتەیەکی بڵندو درێژم لێدا، لە هەمان کاتا، لە قۆڵی ڕاست‌و چەپ‌و ناو جەرگەی سوپاکەما، لە هەمولایەکەوە بە یەك دەنگ نەعرەتەو هاواری جەنگاوەران بەرزبووەوە، هەر مەپرسە چ چێژێك لە ناخما گیر بوو! هەموو سەربازەکانم وەکو

خۆم بەهێزو توانای بێ وێنەو شادیو ورەی زۆر بەرزەوە هێرشیانکردە سەر دوژمن. لەو کاتەدا هەستمکرد هەموویان بۆ چوونیان وەك بۆچوونی منە کەلەم سەر زەمینەدا بۆ پیاو هیچ شتێك لە جەنگ بەنرختر نییە، هەموو چێژو خۆشییەکانی دنیا ناگەنە چێژو خۆشیی جەنگ، بۆیە کە پیاو سەر گەرمی چێژو خۆشییەکانی تر بێ لە پلەو پایەو نرخی دادەبەزێتو دەچێتە ریزی ژنانەوە!...

مەغۆلەکان لە پەلاماری لە پڕمان بێ ئاگا بوون، بۆیە نەیانتوانی بکەونەخۆو ریزی خۆیان ڕێکبخەن. لە هەر چوار لاوە ئابلۆوقەماندان، گەلێکیان هەر نەشیانتوانی شمشێر هەڵکێشن، تەنها لە هەندێ خاڵدا بەرەنگار بوونەوە ڕوویدا، هەندێك سەربازمان کوژران، لەبەرامبەردا ئێمەش کۆکوژمان کردنو وەکو مەڕ هەموویانمان گوریسن. لەبەر ئەوەی ئابلۆوقەکەمان زۆر بەهێزبوو،داوامکرد (بیل- ئۆرگۆن)و ئەفسەرەکانی بەزیندوویی دەستگیر بکرێن. کە هێنایان سەیرمکرد ئەوەندە کورتە بالآ بوو، سەری لە ناو قەدی من تێپەڕی نەدەکرد!.. بە هۆی دیلمانجەوە پرسیارم لێکرد: چۆن وێرات پەلاماری وڵاتی من بدەیت؟! ئایا ناوبانگی منت نەبیستبوو؟! لە وەڵاما وتی: بڕوام نەدەکرد ئەمەندە بە تواناو بەهێزبی!.. وتم: چونکە ئەوەندە بێ دەسەڵاتی، ناتکوژم، بەڵام خۆتو هەموو دیلەکان بەند دەکەم، تاسەرانە نەدەن بەرتان نادەم! وتی: ئامادەم نیوەی ئەم ئەسپانەمت بدەمێ بە مەرجێك ئازادم بکەیت. وتم: باسی ئەم ئەسپانە هەر نەکەیت، ئەمانە دەستکەوتی جەنگنو بەهەموو شتێکیترەوە هی منن! تۆ دەبێ سەرانەی ترم بدەیتێ. دوای دوو ڕۆژ وتووێژ قایلبووم کە شەست هەزار ئەسپو دوو سەدو پەنجا هەزار مەڕ لە باتی خۆی، بۆ هەر یەکە لە ئەفسەرەدیلەکانیشی هەزار ئەسپ وەربگرمو ئازادیانبکەم.
(بیل- ئۆرگۆن) زۆر بە سادەیی وتی: باشە، هەندێ لە سەربازەکانتم لەگەڵدا بنێرە بۆ مەغۆلستان تاکو هەموو ئەسپەکانو مەڕەکان پەیدا بکەمو بۆتیان بنێرم!... زۆرم پێ سەیر بوو، وای زانیبوو کەمن پیاوێکی سادەمو پێشنیارەکەی وەردەگرم! وتم: خۆتو ئەفسەرەکانت دیلن، هەر کاتێ لە مەغۆلستانەوە بە تەواوی سەرانەکە گەیشت ئەوسا ئازادتاندەکەم!.. وتی: ئایا دەزانی مەغۆلستان چەند دوورەو ئەوانەی دەیاننێرم بۆ ئەسپەکانو مەڕەکان تا دەڕۆنو دێنەوە چەندیان پێدەچێت؟! وتم: ئەبوایە پێش ئەوەی بیر لەم هێرشەت بکەیتەوە ئەو حسابەت بە چاکی بکردایە!.. دوا بڕیارم هاتە سەر

ئەوە ئەگەر تا پانزەی دووەمین مانگی پاییز سەرانەکە بە تەواوی نەگات هەموویان بکوژم. زانیم کە پیاوانی سالاری تێکشکاوی مەغۆل ناتوانن بە جارێکا ئەو هەموو ئەسپو مەڕانە بگەیەننە ولاتی من، بۆیە وتم: با وردە وردەو بە ڕەوەڕانی بچووک بچووک بە درێژایی ئەم ماوەیە ئەسپەکانو مەڕەکان بهێنرێن. ڕۆژان هاتن، ڕۆژان ڕۆیین،وەرزی بەهار تەواو بوو، هەروەها هاوینیش، بەلام هیچ ئەسپو مەڕێکی (بیل- ئۆرگۆن) دیار نەبوون.

ئەو ساڵە بە ئاوەدانکردنی ولاتو کاروباری سوپاکەمەوە خەریکبووم، هەندێ جاریش بە مەشقکردنو ڕاهێنانی چوارەمین کوڕمەوە خەریکبووم کە ناوی (شاهروخ)ە، ئەو ساڵە تەمەنی هەشت ساڵبوو، دەیتوانی چاك سواری ئەسپ بێتو تیرو کەوانی بچووکیش بەکاربێنێ. چونکە بچووکترین کوڕمبوو، زۆر خۆشمدەویستو چاوەڕێبووم بلیمەتێکی هەڵکەوتووی لێدەرچێتو جێی خۆم بگرێتەوە.

لە سەرەتای دووەمین مانگی پاییزدا نامەی (شێخ عومەر)ی کوڕم هات، بە پەلە داوای هەموو یارمەتییەکی جەنگی کردبوو، نووسیبووی کە حاڵی زۆر شڕەو ئەگەر زوو یارمەتیی پێ نەگات خۆیو لەشکری تیا دە چن. هەر چەندە وەرزی لەشکرکێشی بەسەر چووبوو، بەلام ناچار بووم، بڕیارمدا خۆم بەهانایەوە بچم، لەبەر ئەوە زوو کەوتمە خۆ بۆ ئامادە کر.نی لەشکر. دە ڕۆژیش دوای گەیشتنی نامەکەی (شێخ عومەر) کۆمەڵێك سەربازم بەرەو ڕۆژئاوا بەڕێکردن بۆ ئەوەی ئازووقەو ئالیك ئامادە بکەن. لە هەمان کاتا چاوەڕوانی سەرانەی دیلە مەغۆلییەکان بووم تاکو ئازادیانبکەم، بەلام هیچ دیار نەبوو، لەگەڵ ئەوەشدا ناچار بووم کە تا ڕۆژی (١٥)ی دووەمین مانگی پاییز بوەستم، جا ئەوسا بڕیار بدەم.

لەڕۆژی (١٦)ی مانگی ناوبراودا، سەر لە بەیانییەکەی خۆم ئامادە کرد کە بکەومە ڕێ. (جیهانگیر)م لە جێی خۆما دانا تاکو کاروباری ولات ببات بەڕێوە، ئینجا ناردم بە دوای (بیل- ئۆرگۆن)و ئەفسەرەکانیدا، ڕوومکردە میری لە خۆبایی، وتم: ئەمڕۆ شانزەیەمین ڕۆژی مانگی(عەقرەب- دووەمین مانگی پاییز)ە، چەند مانگە لە سەرتان وەستاومو سەرانەکەتان دیار نەبوو تا ئازادتانبکەم. دیارە تۆ درۆزنیو دەستی دەستیم پێدەکەیتو دەتەوێت بە هیوای دەرفەتێك کات بەسەربەریت، ئەگەر بتویستایە گیانی خۆتو ئەفسەرەکانت ڕزگار بکەیتو سەرانە بدەیت، ئەبوایە تا ئێستا هەر هیچ نەبێ

بڕێك لە ئەسپەکانو مەڕەکان بگەیشتنایە. ئێستاش من دەمەوێ بڕۆم بۆ جەنگ، خۆ ناکرێ بتانهێڵمەوە، چونکە دڵنیانیم لێتان، هیچ دەرەتانێکیشتان نەماوە، ناچارم خۆتو ئەفسەرکانت بکوژم! هاواریکرد: ئەی ئەمیری گەورە بەزەییت پێمدا بێتەوە!.. سەیر بوو، داوای بەزەیی بۆ ئەفسەرەکانی نەکرد!.. وتم: تۆ کافری جەنگی، هاتووی دژبە موسڵمانان بجەنگێی، سەرەڕای ئەوەش درۆزنی، لەوانەیە لە کافرێکی جەنگ ببوورم، بەڵام هەرگیز لە درۆزن چاوپۆشی ناکەم، ئەفسەرەکانیشت لە درۆ کردنا هاوبەشتن، لەسەری ئەوانیش دەدەم!!..
دوای ئەوە داوام لە جەللادەکان کرد لەسەری هەموویان بدەن، زۆری پێ نەچوو زەوی بە خوێنیان ئەرخەوانیبوو.

پاش یەك لابوونەوەی کێشەی سالاری مەغۆل، دەستبەجێ بەلەشکرێکی سەد هەزار سوارەوە کەوتمە ڕێ، لەبەر ئەوەی ڕۆژ زۆر کورتبوو، شەوانەش ماوەیەکی زۆرمان دەبڕی. کە گەیشتمە دەریای (ئابسکوون- دەریای خەزەر) دەستەو تاقمی ئامادەکەرانی خۆراکوئالیك چاوەڕێمبوون. لەوێوە بۆ وڵاتی (قەبچاق) سێ ڕێ هەبوون، نزیکترینو کورتترینیان ڕێی دەریا بوو، بەڵام نەکەشتیم هەبوو، نەکاتو بواریشم هەبوو ئامادەیبکەم. دووەمین ڕێ، ڕێگەی باشووری دەریاو وڵاتەکانی (گورگانو طەبەرستانو طالش) بوو، لەوێشەوە لەبەر خێڵە کێو نشینەکانو دارستانی زەبەندو چڕ تووشی چەرمەسەرێی زۆر دەهاتین، لەبەر ئەوە بڕیارمدا هەمان ڕێی شێخ عومەری کوڕم بگرینە بەر کەلە باکووری دەریای ئابسکوونەوە بەرەو وڵاتی قەبچاق دەبووەوە. لێپرسراوانی خۆراکو ئالیکم ڕاسپاردن کە لە کەناری ڕووباری (طەرخان-ڤۆڵگا) بنکەیەکی زۆر گەورە بکەنەوە بۆ ئازووقەو ئالیك تاکو کە گەیشتینە ئەوێ چەند ڕۆژێك پشوو بدەینو ماندوویەتیمان دەرچێت، پاشان بەرەو قەبچاق بکەوینە ڕێ.
لەشکرەکەمم کرد بە دە بەشی چوون یەکەوە، لە ئاخرو ئۆخری پاییزدا ڕێی باکوورم گرتەبەر، سەرماو سۆڵەیەکی زۆر دەستی پێکرد، وەکو دابی خۆمان هەر یەکە ئەسپێکی یەدەکی پێبوو، شەو ڕۆژ بەڕێوە بووین، بۆ ئەوەی توانای ئەسپەکانمان کەم نەبێتەوە، نواڵووە هەویرمان دەکرد بە دەمیانەوە، لەبەر ئەوەی وەستانیان نەبوو بە سەرماو سۆڵەکە ئالۆز نە دەبوون، بەڵام خۆمان هەڵدەلەرزاین، لەگەڵ ئەوەشا زۆر بە خێرایی ڕێمان دەبڕی، تا لە ئەنجامداو دوای ماندوو بوونێکی زۆر گەیشتینە کەناری ڕووباری (طەرخان) لەوێ تەویلەی باش بۆ ئەسپەکان ئامادەکرا بوون، خۆراکو ئالیکی زۆریش

کۆکرابوونەوە. ماوەی چوار ڕۆژماینەوە، خۆمانو ئەسپەکانمان چاك حەساینەوە، پاشان لەبەرە بەیانێکی زۆر ساردا بەرێبووین، ڕووباری (طەرخان) بە چەشنێك بەستبووی ئەسپەکانمان بە ئاسانی بەسەر بەستەڵەکدا دەڕۆیشتن، بەڵام هەندێکیان خزانو چوار پەلیان شکاو پەکیانکەوت. من تا ئەو ڕۆژە لە ڕووباری بەستەڵەکی وایانو بەریندانەپەڕیبوومەوە. پاش پەڕینەوەمان بۆم دەرکەوت دانیشتووانی ئەو ناوچەیە لە وەرزی زستاندا بە جۆرە ناڵێك ئەسپەکانیان ناڵدەکەن کەلەسەر ڕووبارو دەریای بەستەڵەك نەخزێن، بۆیە بڕیارمدا ناڵی هەموو ئەسپەکانمان بگۆڕێن کە ژمارەیان دوو سەد هەزار ئەسپبوو. جا لەبەر ئەوەی هەشت سەد هەزار ناڵمان دەست نەدەکەوتنو ئێمەش پەلەمانبوو، ناچار بووین ئەوەندەی بەردەستکەوتن بەکارمانهێنان. لەبەر ئەوەی قەوارەی ناڵەکان وسمی ئەسپەکانمان نەدەگونجان، ئەسپەکانمان وەك نیمچە شەل غاریاندەکرد، بە ناچاری هەموو ناڵەکانمان کێشانەوەو ناڵە کۆنەکانمان لێدانەوە. چونکە ئەسپەکانمان بەردەوام لە ڕەودا بوون. سەرما کاری تێ نەئەکردن، خۆشمان پاو پووزمان چاك چاك بە لباد داپۆشیبوون تاکو سەرما نەیانبات. سەرماو سۆڵەو زریان گەیشتنە ڕادەیەك کە ناچار بووین بوەستین تاکو نەفەوتێین. خێرا تەویلەی باشمان بۆ ئەسپەکانمان دروستکردن، بەڵام خۆمان بەدەست سەرمای کوشندەوە دەتلاینەوە. دوو شەوو دوو ڕۆژ لەسەریەك بەفرێکی زۆر باری، پاشان بوو بە سایەقەی سامانێ، سەرمایەکیوا دەستی پێکرد کەبەدرێژایی تەمەنم شتی وام نەدیوە. بەڕۆژ خۆرهەڵدەهاتو هیچ تینی نەبوو، لەبەر سەرمانەمدەوێرا سەر لە چادرە لبادەکەم دەربێنم، شەوانیش لەو دەشتە بەرینەدا لوورەی هەزاران گورگ هەراسی لێهەڵدەگرتین، ناچار بووین تاکو بەیانی پاسی ئەسپەکانمان بکەین نەکو گەلە گورگ بیانخۆن! ئەگەر خۆراکو ئالیکو سووتەمەنی کۆکراوەەو پاشەکەوتکراومان نەبوونایە لەو چۆڵەوانییە بەستەڵەکو زریانەدا دەفەوتاین.

شەوێکیان دەنگێکی زۆر بەهێزو نائاسایی بەرگوێم کەوت لە گرمەی لێك نەپچراوی هەور دەچوو، گومانم بۆ ئەوە چوو کە دەنگی چوار ناڵەی ئەسپی دوژمنبێو لەپڕ هێرشیهێنا بێ. لبادم لە خۆمەوە پێچاو لە چادرەکەم هاتمە دەرێ، تەماشامکرد هەندێك لە سەربازو ئەفسەرەکانیشم لە دەرەوەن، ئەوانیش هەمان دەنگیان بیستبوو، پاشان زانیم کە هەموو سوپاکەم بە ئاگان، ناچاو بڕ کا ئاسمان سافو ڕوونبوو، دەرکەوت کە دەنگەکە گرمەی هەور

نەبوو، هەمووومان بۆ پێشوازیی سوپای (توورک تامیش) ئامادە بووین، بەڵام هیچ دیار نەبوو. چەند دەستەیەکم لە سەربازەکانم هەڵبژاردن کە بڕۆنو بزانن چی هەیەو چی نییە! کاتێ ئاسۆ ڕوونبووو هەندێکیان گەڕانەوەو ئاگاداریانکردم کە دەنگی بەردەوامی ڕەوی گاکێویی شاخدارە، سەرەڕای زرمەو ناڵەی چوار پەلیان، دەنگی بە یەکا چوونو لێکدانی شاخە درێژو پەلدارەکانیشیان ئەوەندەی تر نیشتۆتە ئاسمان. لەگەڵ هەڵهاتنی خۆرا گەیشتینە لای ڕەوە لە ژمارە بەدەری گا کێوی، ئەوەندە زۆر بوو نە سەرەتای دیار بوو، نەکۆتایی. دەستوورمدا کە سەربازەکانم ڕاویانبکەن. ئەو ڕۆژە تاکو تاقی ئێوارە خەریکی ڕاوی گا کێوی بووین، ژمارەیەکی ئێجگار زۆرمان لێگلدانەوە، بەم جۆرە گۆشتێکی زۆرو زۆر چاکمان دەستکەوتو ترسی برسییەتیمان نەما، بە پێستەکانیش تەویلەی ئەسپەکانمان داپۆشین.

لەو سەرماو سۆڵە بێ وێنەیەدا گیرمانخواردو بە ناچاری ماینەوە لە هەمان کاتدا هیچ هەواڵێکی (شێخ عومەر)ی کوڕم نەبوو. زۆر جار بۆ ئەوە دەچووم کە بە هەموو خێڵو هۆزەکانی (قەبچاق) هێرشی سەختیان کردبێتە سەریو خۆیو سوپاکەی تەفرو توونا کرابن، یان دەشکرێ گیرا بێتو زیندانیبێ. ئەندێشەو مەراقی ئەو کوڕەمو لەشکرە هەشتا هەزار سوارەکەی هەراسیان لێهەڵگرتمو ئارامم لێبڕا. لە ناوەڕاستی مانگی (جەدی)دا ئەو ئوردووگە سەهۆڵبەندانەمان بەجێهێشت. هەر شوێنێك بەفر بوو بە ئاسانی لێماندەدا، کە دەگەیشتینە ڕووبارو گۆمی گەورەو بەستەڵەك، لبادمان دەبەستەسمی ئەسپەکانمان تاکو نەخزێن، کەلە یەخبەندان ڕزگارماندەبوو لبادەکەمان لێدەکردنەوە. لە ڕۆژی بیستەمی ئەو مانگەدا سەرمایەکی واهەڵیکرد هیچ کەس خۆی پێ نەدەگیرا، ژێر سمی ئەسپەکانمان یەك پارچە سەهۆڵێکی شووشەییبوو؛ لەبەر ئەوە گەلێکیان لێ خزانو کەلەلا بوون. یەکێك لە ئەفسەرە زۆر دڵسۆزەکانم کە زۆر بەڕاشکاوو لە خۆبوردوو ناسیبووم دەمەو نیوەڕۆ خۆی گەیاندە لامو وتی: میری مەزن بۆچی ئەمەندە لەسەر ڕۆیشتن سووری، ئەگەر کار وابڕوات تا ئێوارە یەك دانە ئەسپ چییە بۆمان دەرناچێ، ئەوسا هەموو سوراەکان پیادە دەبنو بە سەرما دەمرن!.. لەو کاتەدا لەدوورەوە دارستانێکی بەرین دەرکەوت ڕەشیدەکردەوە، وتم: با بکەینە ئەو جەنگەڵە، لەوێ دەوەستێن، ئاگر دەکەینەوەو گەرمماندەبێتەوە. پاش ماوەیەك گەیشتینە دارستانێکی سەروو، باشبوو خۆمانو ئەسپەکانیشمان لە سەرمای کوشندە ڕزگارمانبوو. هەورێکی

... بەری ئاسمانی گرتو هەموو لایەك هەر ڕەشی دەنواند؛ لەتاوسەرما ...ت تاقە قەلە ڕشەشێکیش لەو دارستانەدا نەبوو، بەڕاستی بارو دۆخێکی دژواری سەختبوو. هەموو ئەفسەرەکانم کۆکردنەوە، وتم: ئێمە لێرەدا تەنها سووتەمەنیمان زۆرە، خۆراکو ئالیکمان زۆر کەمن، ئاومان نییەو بەفر دەتوێنینەوە، ڕاستە کەمێك پشوومانداوە، بەڵام تاسەر نییەو پێویستە بڕۆین، جا ئەمەوێ ڕاپرسیتان وەربگرم تا بزانین (شێخ عومەر) لە کام قوڵەوەیە بۆ ئەوەی نزیکترین ڕێ بگرینە بەر. یەکێك وتی: من وای بۆدەچم لە (بابولئەبواب-دەربەندی خەزەر) بێ، یەکێکی دیکەش وتی: من وای بۆ ناچم، چونکە (شێخ عومەر) کەشتیی نییە تا لەدەریاوە خۆی بگەیەنێتە ئەوێ. ئەفسەرێکیتر وتی: ڕەنگە لە ڕێگەی باشوورەوە، بەزەویی ئاگردا خۆی گەیاند بێتە ئەوێ. منیش وتم: منیش وای بۆ دەچم، دەشێ لەڕێی زەوی ئاگرەوە ڕۆیشتبێ. ئەفسەرێکم لێمی پرسی: میری مەزن، سەرزەمینی ئاگر لە کوێیە؟! وتم: دەکەوێتە باشووری (بابولئەبواب) لە کەناری دەریای خەزەر، بۆیە ئەم ناوەشی لێنراوە چونکە گەلێ سەرچاوەی تێدان کە ڕۆنیان لێهەڵدەقوڵێ، هەندێکیشیان بەردەوام دەگرێنو کەس ناتوانێ ئەو کڵپانە بکوژێنێتەوە. ئەفسەرێك وتی: خۆزگە بە دانیشتووانی ئەوێ هەمیشە گەرمایانە! وتم: ئەو ئاگرە ئەوەندە بە تینە هیچ کەس ناتوانێ لێی نزیکبێتەوە.

یەکێك لە ئەفسەرەکانم، کە تا ئەو کاتە لەبیرکردنەوەدا بوو، وتی: من باوەڕم وایە (میر شێخ عومەر) لە کەناری ئەو بەری دەریا نییە، ئەگەر وابوایە لە ڕێی وشکانییەوە نامەی نەدەنارد، بەڵکو لە ڕێی دەریاوە بەزووترین کات هەواڵی دەنارد، چونکە ڕێگەیەکی کورتە، ئەم بۆ چوونە وا دەگەیەنێ کە لە دەریاوە دوورە!.. بەڕاستی بۆ چوونی ئەو ئەفسەرەم بە بیری مندا نەهاتبوو، بەلامەوە زۆر باشبوو، وتم: ئافەرین، بیری تۆ پەسەندە!.. بەڵام کێشەی ئێمە ئەوەیە کە نازانین لە کوێیە. دوای پرسو ڕایەکی زۆر، بۆ ڕۆژی دوایی، سەر لە بەیانییەکەی لەگەڵ بەفربارینا بەڕێبووین، ئەو بەفرەش بۆ ئەسپەکانمان باشتر بوو چونکە نەدەخلیسکان، ڕێگەوانی زۆر باشو چالاکم پێشخستن، بۆ ئاگاداریو دڵنیاییشمان هەندێکی ترم ڕاسپاردن بە دوامانەوەبنو چاك چاودێریی ڕێگاوبان بکەن نەکو لە ناوکاو دوژمن هێرشبکاتە سەرمان. خۆمانناسا زۆر خێراو چاك ڕێمان دەبڕی. بەیناو بەین کە خۆر دەرکەوتایە شەوقی بەفر کاریدەکردە سەر چاومانو هیچمان نەدەبینی، خوا خوامانبوو

هەتاو دەرنەکەوێ، نەماندەزانی چارەسەری ئەو کێشەیە چییە، تاکو ڕۆژێکیان چەند کەسێکمان بینین، کەلە دانیشتووانی ناوچەکە بوون،هەریەکە سواری یەکێ لەو جۆرە گالیسکانە بووبوو کەبەسەر بەفرا پاڵیان پێوە دەنرێتو دەخلیسکێنو تیژ دەڕۆن. هەریەکەیان بە پارچە قوماشێکی ڕەشو تەنك هەردوو چاویان داپۆشیبوون بۆ ئەوەی بەفر چاویان نەبات. ئێمەش پەیڕەویی ئەوانمان کردو لەو کێشە ناهەموارە ڕزگارمانبوو.

گەلە گورگی برسی زۆر بوون لە دواوەو لە پێشەوەی لەشکرەوە مەترسیی گەورەیان بەرپا دەکرد، زۆر جار بە ناچاری دژ بەوانیش دەجەنگاینو دەماندانە بەر لێزمەی تیرو دەمانکوشتن. شەوداهات بەفریش بەردەوامبوو، پێشەنگانی لەشکر ئاگاداریانکردم لەبەر زۆریی بەفر ئەسپەکانیان لە جوونە کەوتوونو ڕێگەش دەرناکەن، گەر درێژە بە ڕۆیشتن بدەین لەوانەیە لە ناو بەفردا ونبینو لەناو بچین!.. هەموو لایەك کشوماتبوو، لە هیچ لایەکەوە ترووسکاییەك دیار نەبوو، جار بە جارێك لەو دیو پلەپلی بەفرەوە چاوی گورگێك دەبریسکایەوەو پاش نەختێك نەئەما! دوا جار وام بە باشتر زانی بوەستینو پشوو بدەین. تەویلەی کاتیمان بۆ ئەسپەکانمان دروستکردن، دوایی خێوەتیشمان بۆ خۆمان هەڵدان، بەلام بێ ئاگری زۆر پەرێشانیکردین، ئەو شەوە یەکێکبوو لە شەوە ناخۆشەکانی تەمەنم. لەو لاوە ئێشکگران هەر خەریکی بەرگریکردنی گەلە گورگانبوون نەبادا لە تەویلەکانیشا پەلاماری ئەسپەکان بدەن، هەر ئێشکگرێ نۆرەی خۆی تەواو بکردایە لەبەر سەرما خۆی دەهاویشتە ناو تەویلەکانەوە تاکو کەمێ گەرمدابێ! بەسەرهاتەکانی ئەو شەوە بوو بوونە ئەفسانەو داستانو دەماو دەم دەگێڕرانەوە، مرۆڤی سادە پەسەندیدەکردن، بەلام خەڵکی داناو هوشیاری باوەڕی نەبوو شتی واڕوویدابێ.

برسێتی زۆری بۆ ئەسپەکانمان هێنا بوو، سەربازەکانیشم ئەوەندە توانای بەرگە گرتنی سەرماو سۆڵەکەیان نەمابوو، گەر شەوو ڕۆژێکی تر بەو شێوەیە بمایناینەوە سەربازەکانو ئەسپەکان دەفەوتانو لەشکرنەدەما. ئەو شەوە ئەوەندە سەخڵەتبووم هەستمکرد کە بۆ سەرپەرشتیو بەڕێوە بردنی لەشکر ناشێم! بەڕاستی نەدەبوو لەو وەرزە سەختو بەستەڵەکەدا بەو هەموو لەشکرە زۆرەوە ئەو وڵاتە کوێستانو ساردو سڕە بگرمەبەر، دەبێ پێبێم کە لەو ڕووەوە ئەزموونێکی ئەو تۆم نەبوو. شەو کردیو ئێمە کردمان، هەزارو یەك حسابمان بۆ ئەستێرەکانو ئەستێرەی بەیانو ڕۆژهەڵاتو ڕۆژئاوا دەکرد، هەر

چاوەڕێبووین بەڕاستی ڕۆژ بێتەوەو بزانین ڕوو لەکوێ بنێین. کە ڕۆژی ڕاست دەرکەوت و بیابان بە تیشکی خۆر ڕەنگینبوو، لە دوورەوەو بەلای خۆرئاوادا تارمایی دارستانێك دەرکەوت، دەمودەست وتم: دوا نۆر دووە هەویر بدەن بە ئەسپەکان، لە جیاتی ئاویش بادەمو لمۆزیان لە بەفر هەڵسوون، هەمووتان ئامادەبن! بە بیابانی پانو بەریندا بەڕێبووین، فرسەنگ بە فرسەنگیش لە دارستان نزیکتر دەبووینەوە، کە گەیشتینە بەرەوە دیمان دارستانەکە ئەوەندە فراوانبوو، ئەم سەرو ئەو سەری دیار نەبوو، نزیك بە دارستانەکەش ئاواییەکی گەورە دەبینرا زۆری پێ نەچوو ئاگادار کرام کە دەستەی ئامادە کردنی خۆراکو ئالیکیش بە باشی ئەرکی خۆیان بە جێهێناوە، هەناسەیەکی شادیم بەبەردا کراو زانیم لە ترسی لەناو چوون ڕزگارمانبووە، لەو ئاواییەدا خۆراکو ئالیکو سووتەمەنیمان دەستدەکەون!

دەمەو عەسر، ئێمەی برسی و ماندوو سەرما بردەڵە، گەیشتینە ئەو ئاواییە کە پێی دەوترا (کەلنە). تەویلە بۆ ئەسپەکان ئامادەکرا بوون، ئالیکیان بۆ هەڵڕێژرا، لەهەموو لایەکەوە ئاگری زۆر کرایەوە، خێرا خێراش پشکۆی زۆر دەبرایە تەویلەکان تاکو ئەسپەکانمان سەرما نەیانبات. کەلە لێپرسراوانی خۆراکو ئالیك پرسیارمکرد: بۆچی هیچ دەنگو ڕەنگێکتان نەبوو؟! لەوەڵاما وتیان: بەفرو سەرماو بەستەڵەك ڕێگر بوون. پاشان بۆیان باسکردم کە بەر لەوەی بەفرو سەهۆڵو بەستەڵەك هەموو لایەك داپۆشنو ڕێگای هاتوچۆ نەمێنێ ئاگادار بوون کە (شێخ عومەر) لە (بابولئەبواب)بووە، ئیتر دوای ئەوە ئاگادار نەبوون. فەرمانمدا کە ڕیشسپییانی ئاوایی کۆببنەوە بۆ ئەوەی سەبارەت بە ڕۆیشتن بۆ (بابولئەبواب) زانیارییان لێوەرگرم. کوێخای ئاوایی وتی: ئێستا وەرزی زستانەو سیمرغلیش ناتوانێ لە کێوی قاف بدات، چ جا ئادەمیزاد!.. خۆ ئەگەر بەفر بتوێتەوە سواری چاك دەتوانێ لێرەوە بە (١٢) ڕۆژ بگاتە ئەوێ. وتم:ئەی ئەگەر شەوو ڕۆژبەڕێوە بین؟! کوێخا وتی: بە(٥-٦) ڕۆژ دەگەن. لەوەڵامی پرسیارێکی‌ترا وتی: ئەی میر، ڕێگەی (بابولئەبواب) بە ملەی (طەبەر) دا دەڕوا، لەو ملەیەشا پانیی ڕێگە لە نێوان نیو گەزو گەزێکدایە، هەر خوا بۆ خۆی دەزانێ ئەو ڕێیە چۆنو کەی و کێ دروستیکردووە! ڕێگەکە پێچاو پێچی زۆرە، مرۆڤ ئەوەندە سەردەکەوێت تا دەگاتە قولەی کێوی قاف، لەوێوە

بەردەمی کێوەکەو هەموو وڵاتی قەبچاق‌و دەریا دەبینێ. پرسیم: باشە، چۆن هەواڵ بە شێخ عومەرم بدەم کەوا لێرەم؟ کوێخا وتی: مەگەر تەنها لە ڕێی دەریاوە، لێرەشەوە بۆ سەر دەریا ڕێیەکی ئاسان نییە، چونکە هیچ ئاواییەك بەدی ناکرێت، مەگەر سواری زۆر چاك، خۆراکی باشی پێبێ‌و خۆی لە گورگ ڕزگار بکات‌و بتوانێ بگاتە دەریاو لەوێ سواری کەشتی ببێت بۆ (بابولئەبواب). تەتەرێکی زۆر نەبەردو بێ هاوتام هەبوو ناوی (فاتین غوور) بوو، لە بیابانی فراوان‌و تەختا، بەدەم ڕۆیشتنەوە، بێ ئەوەی بە ئاگا بێت درێژەی بە ڕۆیشتنی خۆی دەدا، نامەیەکم بۆ شێخ عومەر نووسی، دامەتەتەری ناوبراو، لەتەك دووو سواری تردا بەڕێمکردن، داوام لێکردن هەر چۆنێك بووە خۆیان بگەیەننە کوڕەکەم‌و وەڵامم بۆ بهێننەوە. لە نامەکەدا بە درێژی باسی بەسەرهاتو تەنگوچەڵەمەو گێرمەو کێشەی خۆمانمان بۆ کردبوو، هەروەها نووسیبووم تا هەوا خۆش نەکات‌و بەفر نەتوێتەوە ناتوانم بکەومەڕێ وبیگەمێ.

لەو ئاواییەدا ئوردووگەی خۆمان قاییم‌و ئامادە کرد، هەمیشە پاسەوان‌و قەرەوڵی لێهاتوو چاوێکیان کردبووە هەزار، نەکو لە پڕێکا دوژمن بدا بەسەرماندا. لەبەر ئەوەی بەفر ڕێی لێگرتبووم‌و هیچ ئیشێکم نەبوو، کەوتمە بیری ڕاوکردن. خاوەن ئەزموونانی گوند پێشنیاریانکرد کەڕاوە ورچ بکەم، بەقسەکانیاندا بۆم دەرکەوت لە وەرزی سەرمادا ورچ خۆی دەخزێنێتە لانی چەپەڵ‌و پەنهانی خۆی‌و دەخەوێ، تا وەرز خۆش نەکات نایەتە دەرێ، تەنانەت سەگی ڕاویش ناتوانێ بە شوێنەکەی بزانێ، بەڵام ڕێوی بە ئاسانی دەیدۆزێتەوە.

ڕۆژێکیان لەگەڵ هەندێك لە پیاوانی کوتەك بەدەستی ئاوایی‌و چەند ئەفسەرێکما دەرچووین بۆ ڕاوە ورچ. ڕۆیشتین تا گەیشتینە شوێنێك شوێن پێی گیانداری دیار بوو، وتیان هی ڕێوییە، لەبەر ئەوەی تووکی زۆرو پڕو چڕە هەست بە سەرما ناکات، لەسەرێکی کەشەوە کە برسێتی زۆری بۆ دێنێ‌و ڕوو دەکاتە لانی ورچ چونکە دەزانێ لەوانەیە لەوێدا مشك‌و جرجی بیابان، یان دەڵەك هەبن! وتم: جا ئەو گیاندارانە لە لانی ورچدا چی دەکەن؟! وتیان: پێش وەرزی خەوتن، ورچ پێش بەفر بارین لانەکەی پڕ دەکات لە بەڕوو، هەنارە ترشی کێوی‌و هەنگوینی دارستان‌و شتی تر، لە هەمان کاتیشا لانەکەی

گەرمە،لەبەر ئەوەی خەویشی قورسەو بە ئاگا نایەت، ئەو جروجانەوەرانە لەوێ دەمێننەوە، دەخۆنو دەحەوێنەوە، بەیناو بەینیش دەچێتە ویزەیان، شوێن پێی ڕێویمان هەڵگرت تا گەیشتینە داوێنی کێوێك، لەوێداو لە عاستی درزەکانی شاخەکەدا شوێنەواری جێ پێی ڕێوی نەما. پیاوەکان وتیان: ئێرەیە! دوو سەگیان پێبوون، سەگەکان خۆیان کرد بە کونێکا، بەحەپەحەپو وەڕینی قاییمی سەگەکان ورچەکە خەبەریبووەوە، لە پێشەوە چەند جروجانەوەرێ دەرپەرینە دەرێ، ڕێوییەکی لمۆز خوێناویش کە دیار بوو ڕاوی خۆی کردووە تیسکەی بۆکردو دەرچوو، پاشان ورچێکی زۆر زەلامو خورمایی لە ئەشکەوتەکەدا هاتە دەرێ، هەرکە تیرم خستە کەوان هاوار بەرزبووەوە: میران، تیری تێ مەگرە با پێستەکەی خراپ نەبێت! جا بۆم دەرکەوت گەر ورچ بریندار بکرێت پێستەکەی کونکون دەبێتو پارەیەکی واناکات، هەر لەبەر ئەوەشبوو ئەو پیاوانە تەنیا هەر کوتەکیان پێبوو. لە هەموو لایەکەوە بەربووونە ورچەکە، ئەویش تا دەیتوانی دەیبۆڕاند، دەمی دادەپچڕاندو پەلاماریدەدا، بەڵام بەرگەی ئەو هەموو کوتەکانەی نەگرتو لا، ئەنجامدا لەسەر بەفرەکە کەوتو جووڵەی تێدا نەما. یەکێکیان وەستای کەوڵکردنبوو، کونێکی کردە بازۆڵەیەکیو دەمی نا بەکونەکەوە، بە هەموو هێزێکیەوە ئەوەندە فوویدا تا بە تەواوی ورچەکە هەڵئاوسا، تاکو بە ئاسانی کەوڵبکرێت. دوای کەوڵکردن لاکەکەیان پارچە پارچە کردو دابەشیانکرد، بەشی منیشیان جیا کردەوە؛ وتیان: کەبابی گۆشتی ورچ زۆر خۆشو جوانو بەچێژە، منیش وتم: ورچ گیاندارێکی چنگدارە، لە دینی ئێمەدا کە موسڵمانین، تەنها گۆشتی گیانداری سمدار حەڵاڵە.

پێم سەیر بوو کە بە هیچ جۆرێ جموجووڵێکی سەربازانی (تووك تامیش) بەدی نەدەکرا، لە دڵی خۆمدا دەموت: تۆ بڵێی ئەم پیاوە لە هاتنی لەشکرێکی سەد هەزار سوار بۆ وڵاتەکەی بێ ئاگاو بێ هەواڵبێ!خۆ ئەگەر وابێ دەتوانم زوو لە ناویبەرم.

(فاتین غوور) گەلێك لەوە زووتر گەڕایەوە کە من چاوەڕێمدەکرد، لە شێخ عومەری کوڕمەوە نامەیەکی بۆ هێنا بووم، تێیدا نووسیبووی کە لەگەڵ نیوەی لەشکرەکەیا واڵە(بابولئەبواب)، نیوەکەی تریشی لە جەنگەکانیدا دژ بە (تووك

تـامیش) لـەناو چـوون، هـەروەها نووسـیبووی ویسـتوویەتی لـە دەریـاوە بگەڕێتەوە، بەڵام لەبەر من نەیوێرا بوو، ئەگەر نەشهاتمایە بۆ یاریدەدانی لەو وڵاتەدا دەمایەوە تا بکوژرێت نەك بە ڕسوایی‌و تێکشکانەوە ڕوو بکاتەوە وڵاتی خۆی!.. پاش ئەوە نووسیبووی بە سەربازەکانیەوە وا لە ناوچەی (شەنگاری) کە دەکەوێتە باکووری کێوی قاف (قەفقاسیا)، بـەفرو سـەرمای زستان ڕێـی لێگرتووە، لەوانەیە دوای بەفر توانەوە لەڕێی ملەی (طەبەر)ەوە خۆی بگەیەنێتە (بابولنەبواب).

دوای گەیشتنی نامەکە ڕیشسپییانی ئاواییم بانگکردن تا بزانم (شـەنگاری) کەوتووەتە کوێی وڵاتی قەبچاقەوە. دەرکەوت ئەو ناوچەیە کەوتۆتـە ڕۆژئـاوای قەبچاقەوە، نزیك بە دەریای ڕەش، گەر تووك تامیش بیەوێ بگاتە بابولنـەبواب هەر دەبێ بە ئاوایی (کەلنە)دا بڕوات.

ئاوەڕۆکی نامەی کوڕەکەمم لای هیچ کەس نەدرکاند، دەترسام سـیخوڕان هەڵسوکەوتو مەبەستو نیازی من بگەیەننە دوژمن. جارێکی تریش بە (فاتێن غوور)دا نامەم نارد بۆ (شێخ عومەر) داوام لێکرد بە زووترین کات وەخۆ کەوێ، ئازووقەو ئالیکی باش پاشەکەوتبکات، هەر کە هەوا خۆشیکرد لە ڕێی دەریاوە بەڕێبێ بۆ (کەلنە)، خۆ ئەگەر کەشتی بۆ هەموو سـەربازەکان دابین نـاکرێ، لـەڕێی ملـەی (طەبـەر)ەوە خـۆی بگەیەنەتـە هـەمان ئـاوایی. هـەروەها بـۆم نووسیبوو: دەمـەوێ بەرەو ناوچەی شەنگاری بکەومە ڕێو لەپڕ بدەم بەسـەر (تووك تامیش)دا، هیوادارم لە کاتی خۆیدا بگەیتەجێ.

لەو ماوەیەدا کە لەو ئاواییەدا بووین، توانیم تا ماوەی چل فرسەنگ بەلای ڕۆژئاوادا هەموو زانیارییەکی ورد دەربارەی ناوچەکە بزانم، بەڵام لەبەر زۆریـی بەفرو بەستەڵەك زانیارییەکی ئەوتۆم لە بارەی ڕووبارەکانی ئەو ناوچەیـەوە بۆ نـەهات. هـەر کـە وەرزیـش کـەمێك خۆشـیکردو، وردە وردە بـەفر دەسـتی بـە توانـەوە کـرد، دەنگـی قـازوقوڵنگ بـە حـەواوە بیسـترا، لەبـەرە بـەیانی ڕۆژی حەڤدەیـەمی مـانگی (دەلو)دا، فەرمانی بـەڕێبوونی لەشـکرم دەرکـردو ڕێگـەی ڕۆژئاوامـان گرتـە بـەر. ڕێگـەوانی بـاش باشـم بـۆ پێشـەنگی سـوپاو دواوەی دەسنیشـانکردن، تـاکو بە زووتریـن کـات لـە هـەر جووڵەیـەکی سـەرنجڕاکێش ئاگادارمبکەن. ئاگادار کرابووم کە تووك تامیش بەر لەوەرزی بەهار بەڕێ نابێ

بۆ (بابولئەبواب). بەپێی ئەو پلانەی دامرشتبوو دەمویست لە ئوردووگە زستانەییەکەیدا لەناویبەرم. ئەو رۆژە تا ئێوارەو شەویش تا بەیانی بە بێ وەستان بەرێوە بووین، لەگەڵ خۆرهەڵاتا ئەسپەکانمان گۆڕینو هەر بەرێوە بووین، دەمەو نیوەڕۆ رێگەوانەکانم ئاگاداریانکردم کەلە دوورەوە رەشایی لەشکرێك دەبینرێت، فەرمانمدا کە هەموو لەشکر بوەستێ. وەك دابو رەوشی خۆم لەشکرم کردە سێ بەش، قۆڵی راستو چەپو ناوجەرگەی سوپا، هێزی یەدەکیشم جیاکردەوە بۆ کاتی خۆی، بەرگی جەنگم پۆشی، شمشێرو تەورم ئامادە کردن. دەربارەی ژمارەی دوژمن، جۆری چەکیان، جۆری پۆشاکیان، جووڵەو شوێنو هەڵسوکەوتیان پەیتاپەیتا زانیاریم بۆ دەهێنرا، کەچی لەپڕ رێگەوانانی پێشەوە ئاگاداریانکردم کە ئەو رەشاییە لەشکری دوژمن نییەو یەك رەوە گامێشەکێویی زۆر گەورەیە، لە رۆژئاواوە بەرەو باکوور رەو دەکەن. ناچار دەستوورمدا کەلەشکر وەکو جارانی لێبێتەوە، ئەسپەکانمان پتر تاودان تا بگەینە سەر گامێشەکێوییەکان، باشبوو توانیمان بە تیر بیست سەریان لێکلبدەینەوە. تا ئەو کاتە ئەو جۆرە گیاندارانەم نەدیبوون، دڵنیا بووم کە جۆرە گایەکن، شانو سنگو باهوویان لە هی گای ئاسایی پانترو گەورەتر بوون، روخساریان وەکو هی ئادەمیزادی دەنواند. لەبەر نەبوونی کات گۆشتەکەیانمان پارچە پارچە کردو هەڵمانگرت بۆ کاتێك دەرفەتمان هەبێتو بیبرژێنین. بۆ ئێوارە گەیشتینە ئاواییەکی بچووكو لەوێ وەستاین.

## سیازدەیەمین و چواردەیەمین بەش

## جەنگ لە وڵاتی قەبچاقدا

دوای ئەوەی گەیشتمە ئاوایی ناوبراو دەستوورمدا هەموو ڕێگاکان بگیرێن‌و کەس نەڕوات بۆ هیچ لایەك تاکو کەس نەتوانێ دوژمن لە هاتن‌و جموجووڵمان ئاگادار بکات. جێ‌و شوێنمان بۆ ئەسپەکانمان چاککرد بۆ ئەوەی سەرمایان نەبێت، تا نیوە شەو پشوومدا بە سەربازەکانم تاکو باش بخەون، خۆیشم خەوتم. لە خەوما لە شوێنێکا بووم کە بەفر دایپۆشیبوو، لە قەراخی جەنگەڵێکی زۆر ڕەش‌و چڕا وەستا بووم، هەوری ڕەش بەری ئاسمانی گرتبوو، هەموو لایەك تاریکبوو، تەنانەت بەفرەکەش ڕەشی دەنواند. لە ناکاو سوپای تووك تامیش گەیشتەبەرەوە، هەموو سەربازەکانی وەکو گاکێوی بوون‌و نەعرەتەیان بەرز بوو، خۆم‌و سەربازەکانم هێرشمانکردو کەوتینە ناو سوپای دوژمنەوە، لەپڕ سەیرمکرد دەستی ڕاستم نەماوە! لە ترسانا ڕاچڵەکیم‌و جێگەم بەجێهێشت. بەڕاستی ترسم لێنیشت، پێشبینمکرد کاردساتێکی دژوارم تووشبێ. لەگەڵ نیوەشەودا دەنگی شەیپوور بەرز بووەوە، بەبێ ترس ڕاپەڕیم‌و خۆم ئامادە کرد بۆ ڕۆیشتن. بەبێ هیچ ڕووداوێك تا بەیانی بەڕێوە بووین، لەگەڵ ڕۆژهەڵاتدا گەیشتینە بانێکی بەرین‌و بەرز کە بەفر دایپۆشیبوو. سەربازەکانم ئاگادار بوون کەئیتر بواری پشوو دان نییە، سامەگەر دوای جەنگ‌و پێکادان.

دەمەو نیوەڕۆ دووبارە ڕەوەیەکی زۆر گەورەی گامێشە کێوی لە دوورەوە دەرکەوت. ئەو ڕۆژە ئێمە لە باکوورەوە بەرەو باشوور دەڕۆیشتین، بۆیە ڕەوە گامێشە کێوییەکان بەرەو ڕووی ئێمە دەهاتن، دەمەوعەسر گامێشە کێوییەکان گەیشتنە لامان، لە ترساندا سڵیانکردەوە پاشەو پاش گەڕانەوە دواوە، بەوەش (تووك تامیش) زانیبووی کە ئێمە لە (شەنگاری) نزیکبووینەتەوە! خەڵکی ناوچەی قەبچاق چاك شارەزای سروشتی گامێشە کێوییەکانن، بۆیە کەوتبوونە خۆیان‌و ڕێگەوانی خۆیان ناردبووە پێشەوە تاکو هەواڵێ بزانن، لە ئەنجامدا هی هەردوو لامان لە یەکتر ئاشکرابوو بوون، بەو جەشنە نەمتوانی لە ناکاو پەلاماری لەشکری دوژمن بدەم. داوامکرد هەر چۆنێ بووە کەسێك، یان چەند

کەسێك لە ڕێگەوانانی دوژمن دەستگیر بکەن بۆ ئەوەی زانیارییان لێوەرگرین، بەڵام بۆمان نەکرا.

ئەو شەوە تا بەیانی ڕێگەمان بڕی؛ کە ڕۆژ بووەوە گەیشتینە بێشەیەکی دارسنەوبەر، فەرمانمدا لەشکر پشوو بدات، دەمزانی دوژمن نزیکە، بەهەمووانم وت کە بخەون بۆ ئەوەی ماندوویەتییان دەرچێتو ئامادەی جەنگو نەبەردی گۆڕەپانی بەرینبن. خێرا خێرا هەواڵم بۆ دەهات کە بەردەوام هەندێ سواری کڵاوی چەرم بەسەر دەبینرێن، سواری تر لە دواوە دێنو پەیوەندییان پێوە دەکەنو دەستەی یەکەم دەگەڕێنەوە. بۆم دەرکەوت کە ڕێگەوانانی دوژمن بەسەرمانەوەنو پەیتا پەیتا پەیامی خۆیان دەگەیەننە سەرکردەی خۆیان. لەشکرم ئامادە کرد، قۆڵی ڕاستو چەپو هێزی ناوجەرگەو سەربازانی یەدەکم دەستنیشانکردن بۆ ئەوەی هەرکە بە سوپای دوژمن گەیشتین ئامادەی جەنگبین. خۆم لە ناوجەرگەی سوپادا بووم، لە ماوەی نیو سەعاتێکدا هەموو قۆڵەکانی سوپام لەو دەشتە بەرینەدا بڵاوکردنەوەو بە تەواوی ئامادە بووین. بەهەموو ئەفسەرەکانم ڕاگەیاند کەداوا لە سەربازەکان بکەن شەڕی مانو نەمان بکەن، تا دوا هەناسە بجەنگێن، ئەگەر دەست دوژمن کەون هـەلا هەلا دەکرێن، ڕێی گەڕانەوەو هەڵاتینیش نییە، چونکە (تووك تامیش) هەموو هۆزو خێڵەکانی قەبچاقمان لێهاندەداتو یەك کەس ئاگاتە کەناری دەریای خەزەر. کەواتە با جەنگی نەبەرد بکەنو چاك سەرکەون، ئەوسا هەموو تاڵانیو کیژو ژنە جوانەکان دەبنە هی ئەوان! یەك ڕۆژ خۆیان بەختبکەنو تێبکۆشن، تاکو دوا هەناسەی ژیانیان بە شادیو توانای زۆرەوە بەسەر بەرن!... ئیتر ئەوەندە هاندانو ئامۆژگاری بەسبوون.

دەمەو نیوەڕۆ لەشکری دوژمن دەرکەوت، ژمارەی سەربازەکانیم بە سەد هەزار خەمڵاند، دوو لەسەر سێیان پیادە بوون. هەموو سەربازەکانم بە جاری چاوەڕوانی فەرمانی من بوون،دەستوورمدا هێرشێکی نەبەرد بکەنە سەر هەردوو باڵەکانی دوژمن کە هەموویان پیادە بوون، بۆ خۆیشم وامپیشاند هێرشدەکەمە سەر ناو جەرگەی سوپای دوژمن کە هەموویان سوار بوون، بەو مەبەستەی بجووڵێنو لە سنووری خۆیاندا بمێننەوە. هەردوو باڵی ڕاستو چەپی دوژمن بە تیرو کەوان دەجەنگانو ڕمو نێزەیان پێنەبوو. لە کاتی هێرشبردندا سوارەکانم چاك خۆیان دادەنەواندەوەو خۆیان بە ئەسپەکانیانەوە دەنووساند تاکو بە پێی توانا خۆیان لە تیری دوژمن بپارێزن؛ لەگەڵ ئەوەشا

چاوم لێبوو وەکو گەڵا ڕێزانی پاییز دەکەوتنە سەر زەوی، ئەو سوارەی ئەسپەکەی دەکوژرا خۆی دەگەیاندەوە دواوە بۆ ئەوەی سواری ئەسپێکی یەدەك ببێ، لەهەمان کاتیشدا خۆم بەرەو ناو جەرگەی سوپای دوژمن هێرشمدەبرد، نەشمدەزانی (تووك تامیش) لەناو لەشکرەکەیدایە، یان نا... ئەگەر تیر بەر شوێنی کاریگەر نەکەوێ کوشندە نییەو جەنگاوەر لە پەلوپۆ ناخات، بۆ خۆم زۆر جار تیرم بەرکەوتووەو دەرم هێناوەتەوە دەستبەرداری جەنگ نەبووم، هەروەها سەربازەکانیشم وایاندەکرد، بەڵام ئەگەر نووکی تیر ناو درابێ مەترسیی زۆری هەیەو زۆر جار کوشندەیە.

دوای ئەوەی سوارەکانم لەگەڵ جەنگاوەرانی دوژمنا دەستەو یەخەبوونەوە، بڕێك دڵنیا بووم، چونکە کاریگەریی تیرو کەوان نەما، سەربازەکانم بە شیرو گورزو تەورزین کەوتنە وێزەی دوژمن، لەم لاشەوە بۆ خۆم سەرقاڵی خەریککردنی ناو جەرگەی سوپای دوژمن بووم، سەربازەکانمم ئاگادار کردن کە ئەگەر هاتو سوارانی دوژمن بەرەو ڕوومان هاتن، ئێمە بە نەرمەغار پاشەکشێبکەین‌و پاشەو پاشیش تیر بارانیانبکەین. کە زانیمان جەنگاوەرانی دوژمن بە گوڕ دەنیشنە سەرمان، فەرمانی ڕوو بە ڕوو بوونەوەم دەرکرد، هەموو سوارەکانم تێگەیشتن کە دەبێ جەنگی نەبەردی بکەن. ئاڵادار ئاڵای جەنگی شەکاندەوە، شمشێرو گورزو تەورزین‌و تیرو کەوان ئامادە کران، ئەسپەکانمان تاودان‌و بەرەو ڕووی دوژمن هێرشمانبرد، سوارانی دوژمن دلێرو قارەمان‌و خۆڕاگر بوون‌و لە هێرشی ئێمە نەدەترسان، هەندێکیان زرێپۆشبوون‌و لە چەکی ئێمە سڵیان نەدەکردەوە. سەربازەکانی منیش بێ ئەوەی سڵ لە مردن بکەنەوە، بەو پەڕی تواناییانەوە بە دڵی من دەجەنگان، بۆ خۆیشم شیر لە دەستی ڕاستاو تەورلە دەستی چەپما، بە هەردوو دەست کەوتمە دروێنەی دوژمن، لە هەمان کاتیشا سەرپەرشتیی مەیدانی جەنگم دەکردو چاوم بە هەموو لایەکا دەگێڕا، لەو کاتەدا لە پڕ زریکە لە دەستی ڕاستم هەستا، یەکێك لە سوارانی (قەبچاق) شمشێرێکی سرەواندە دەستم، شمشێرەکەم لە دەستم بەربووەوە، وامزانی دەستم لە لەشم جیا بووەتەوە، لە پڕو بە تووڕەییەکی زۆرەوە وەرچەرخام‌و بە دەستی چەپم تەورێکم کێشا بە تەختی نێوچەوانی سوارەکەداو خەڵتانی خوێنمکرد.

دەستی ڕاستم لە کارکەوت، بەڵام بە دەستی چەپم بەردەوامبووم، لەوکاتەدا یادی مامۆستاو ڕاهێنەری شیربازی‌و تیر ئەندازی‌و تەور وەشاندن‌و

ڕەهاویشتنی خۆمم كردەوە، وتم: خالۆ (سەمەر طەرخان) ڕەوانت شاد بێت، هەموو جارێك دەستی ڕاستمت بە قەدمەوە دەبەستو دەتوت: وا دانێ كە دەستی ڕاستت نییەو دەبێ تەنها بە دەستی چەپ شمشێر بوەشێنی، پیاوێك بە هەردوو دەست بجەنگێ وەكودوو پیاوە!... لەو كاتەدا گەر نەمتوانیایە بە دەستی چەپ بجەنگێم، یان دەكوژرام، یان بە ملكەچی لە گۆڕەپانی جەنگا دەچوومە دەرێ. خوێن لە دەستم دەچۆڕا، لەو كاتەدا لە دوورەوە و بۆ یەكەمین جار (تووك تامیش)م بەدیكرد، لە ژێر ئاڵاكەیدا وەستا بوو، پۆشاكێكی زۆر بە نرخو گرانی جەنگی لەبەردا بوو. ویستم بیدەمە بەرتیر، بەڵام نەمتوانی، داوام لە چەند سەربازێكی خۆم كرد كە تیر بارانیبكەن، وتم: دەبێ ئەو پیاوە بكوژرێ، بگیرێ، لەناوبرێ...!. لە هەمان كاتدا زانیم كە جەنگاوەرەكانم لە هەموو لایەكەوە فشاریان بۆ دوژمن هێناوەو پاشەكشە دەكات، پادشای (قەبچاق)یش لەمن باشتر ئاگاداری بارو دۆخی گۆڕەپانی شەربوو، بۆیە كاتێ ویستم بكوژرێ، یان بگیرێ زوو حاڵی بوو كە ئەگەر پاشەكشە نەكات لە هەموو لایەكەوە ئابلووقە دەدرێت. فەرماندەكانی هەردوو قۆڵی ڕاستو چەپی لەشكرەكەمم ئاگاداركردن كە (تووك تامیش)وا لە ناو جەرگەی سوپاكەیدا، هەر چۆنێبووە دەبێ یان بكوژرێت، یان بە دیلبگیرێ بۆ ئەوەی سەرمان سووكبێ .چەند ئێمە بەرەو پێشتر بچووینایە (تووك تامیش) زیاتر پاشەكشەیدەكرد، تاوای لێهات دەستیكرد بە هەڵاتن، هەرچەند كردمانو كۆشیمان نەمانتوانی پێشی لێبگرین، بە خۆیو سوارانی دەورو پشتیەوە بە هەڵەداوان ئەسپەكانیان تاودانو لە چاو ونبوون، لەبەر ئەوەش نەمانتوانی خۆمان بگەیەننە سەركردەی ناو براو چونكە گەلێك لە سوارەكانی جێی خۆیان بەجێ نەهێشتو زۆر سەرسەختانە دەجەنگان، بە ڕاستی زۆر پێم سەیر بوو؛ كە سەركردە ڕابكات سەربازەكان دەستو دڵیان سارد دەبنەوەو ئیتر ناتوانن بجەنگێن.

لە هەردوو قۆڵەكەوە سەركەوتوو بووین، بەڵام نەمانتوانی لە پشتەوە ئابلووقەی سوارانی دوژمن بدەین، چونكە هێشتا هێزی پیادەی دوژمن لێرەو لەوێ بەرگرییاندەكردو بۆ بەرەو پێشچوونی سوارەكانمان تەگەرەی گەورە بوون. ئەگەر (تووك تامیش) كەم ورەو ترسنۆك نەبوایە نەماندەتوانی سوپای

ئەو ببەزێنین، چونکە بە ڕاستی سەربازەکانی زۆر قارەمان‌و خۆڕاگر بوون، بەڵام فەرماندەیەکی بێ وره، وره‌ی جەنگی سەد هەزار سەربازی قارەمان پووچەڵدەکاتەوە، (تووك تامیش)یش ئەو ڕۆژەی وایکرد.

دەمەو خۆرئاوا هەردوو قۆڵی ڕاست‌و چەپی سوپاکەم لە پشت سوارانی دوژمنەوە گەیشتنە یەك‌و بە ئێجگاری هێزی دوژمن ئابلۆوقە درا. شەوداهات، هەر چەندە جەنگاوەرانی دوژمن دەیانزانی چاك گەمارۆ دراون، کەچی زۆر نەبەردانە دەجەنگان، لەبەر ئەوە چراوگی ڕووناککەرەوەمان بە کار هێنا تاکو دۆست‌و دوژمن جیا بکەینەوە. تا سەرگەرمی جەنگبووم بیرم لە برینی دەستم نەکردەوە، تەنانەت تیریشم پێدەهاوەێشت، دوای گەمارۆدانی دوژمن کەلە شەڕ کردن وەستام، هەرچەندە خوێنەکەی وەستا بوو، هەستم بە ئازارێکی توندو تیژو ناهەموار کرد، دیار بووکە دەستم تووشی زەرەر هاتبوو. (تووك تامیش) لە وڵاتی خۆیدا بوو، دەیتوانی هێزی تر کۆبکاتەوەو هەڵکوتێتە سەرمان‌و گەمارۆ لەسەر سەربازەکانی نەهێڵێ‌و لەناومانبەرێ، بۆیە بە فەرماندەکانی لەشکری خۆمم وت: تا گەمارۆدراوان بەرگریبکەن ئێمە ئاسوودە نیین، نەهێڵن ئەم گەمارۆدانە تا بەیانی بخایەنێ، ئەگەر سەربازانی دوژمن خۆیان بە دەستەوە نەدەن هەر هەموویان بکوژن، لەوانەیە فەرماندەکەیان بە هێزێکی زۆرەوە بگەڕێتەوە بۆ ڕزگار کردنیان...

ئەو شەوە ئازار زۆری بۆ هێنام‌و ئارامم نەما، پزیشکی تایبەتی سوپا دەیویست ئەفیوونم بداتێ تاکو وەنەوزێبکەم، بەڵام چۆن بخەوتمایە، سەرەنجامی شەڕ دیار نەبوو، هەر دەبوایە هەناسە بە هەناسە هەواڵی گۆڕەپانی جەنگ بزانم، کەمێك لەشەو ڕابورد، تا دایگرتم، دوایی لەرزێکی زۆرم لێهات، دایانپۆشیم، پزیشکەکەم خێرا خێرا چای سەوزی دەمدەکردو دەرخواردیدەدام بۆ ئەوەی لەرزەکەم نەمێنێ. لە گۆڕەپانی جەنگەوە هاواری سەربازانی دوژمن جانەوەرانناسا بەرز دەبووەوە، ئەفسەرەکانی منیش بانگیاندەکردە سەربازەکانیان: بکوژن، بکوژن، هیچ کەس دەرنەکەن. زوو زووش لە مەیدانی شەڕەوە هەواڵم بۆ دەهات، خولەك بە خولەك دڵنیا ترو ئاسوودەتر دەبووم. تاکو نیوه شەو جەنگی ترسناك درێژەیکێشا، دوای ئەوە، ورده ورده هاوارو هاتی گۆڕەپانی جەنگ نەما. زانیم کە جەنگ بە ئێگجاری‌و بەسەرکەوتنی ئێمە

کۆتاییهاتووە. ئەوی کوژرا بوو کوژرا بوو، ئەویشی زانیبووی بەرگری بێ سوودە خۆی دابە دەستەوەو لەسەر پەیمانی من گیانی پارێزرا. فەرمانمدا کە بێ یەکو دوو ئوردووگەیەك بۆ حەسانەوەی سەربازەکان دروستبکرێ تاکو بۆ بەیانی ئامادەی بەرەنگاربوونەوەی هەموو ڕووداوێکبن، بریندارەکان چارەسەر بکرێن، چاودێریی ئەسپەکان بکرێتو ئالیکی باشیان بدرێتێ.

گۆڕەپانی جەنگ بە هەزاران لاشەی کوژراوان داپۆشرا بوو؛ پێشبینیشمدەکرد ئەو شەوە جانەوەرانی ئەو ناوە بەر ببنە لاشەی سەربازەکان! بەڵام بۆ بەیانی خۆشبەختانە ئاگادار کرام کە هیچ لاشەیەك نەخوراوە، دوایی زانیم هێشتا سەرماو سۆڵە لە ناودایەو نەکەمتیار هەیەو نەچەقەڵ، لە ترسی سەرمای کوشندە هیچ جانەوەرێ بە دەرەوە نەبوو. دوای ئەوەی بێ خەمبووم قایلبووم کە پزیشکەکەم ئەفیوونم بداتێ بۆ ئەوەی بتوانم بخەوم.

بۆ بەیانی کە خەبەرمبووەوە دەستی ڕاستم ئەوەندەی کوندەیەك ئاوسا بوو، بەڵام ئازارەکەی کەمتر بوو بووەوە، پزیشکەکەم هەتوانی خستە سەر برینەکەو بەستی. هەر ئەو ڕۆژە لاشەی سەربازە کوژراوەکانمان نێژران، ئەوەندە کوژراو زۆر بوو ناچار بووین کە چاڵی پانو قووڵیان بۆ هەڵکەندرێنو بشاررێنەوە! لەو شەڕەدا کە دەمەو نیوەڕۆ تاکو نیوە شەو درێژەیکێشا پتر لە بیستو حەوت هەزار سەربازمان لێکوژرانو بریندار بوون، بەڵام لەشکری سەد هەزار کەسی دوژمنم بە جارێك لەناو برد. لەو کاتەدا کە سەربازەکانم دیلەکان خەریکی ناشتنی مردووەکان بوون، داوامکرد کە هەندێك لە ئەفسەرە دیلکراوەکانی (قەبچاق)م بۆ بێنن تا لێیان بپرسم ئایا (توورك تامیش) بۆ کوێ ڕۆیشتووە، دەکرێ لە ماوەیەکی کەماو بە سوپایەکی ترەوە بگەڕێتەوە؟! وتیان: ئەگەر بەرەو باکوور چووبێ ناتوانێ بەم زووانەو بە سوپایەکی ترەوە بێتەوە، چونکە خێڵو هۆزەکانی ئەو ناوچەیە دۆستی ئێمە نین، بەڵام ئەگەر بەرەو باشوور ڕۆیشتبێو گەیشتبێتە دیواری ئاسن، لەوانەیە لە خێڵەکانی قەفقاس لەشکرێك پێکەوە بنێو بگەڕێتەوە. پرسیم: دیواری ئاسن لە کوێیە؟ وتیان دەکەوێتە نێوان دەریای خەزەرو دەریای ڕەش، چەند دەروازەیەکی گەورەی تێدان بۆ

هاتوچۆ کردن. بۆم دەرکەوت ئەو دیوارە هەمان بەربەستی (یەئجووج و مەئجووجە) کە زووتر باسیم بیستبوو.

پرسیم: ئایا بە ڕاستی ئەو دیوارە لە ئاسن دروستکراوە؟ وتیان: نەخێر، بەڵام نێوان بەردەکان بە گیراوەی قوڕقوشم قایمترو پتەوتر کراوە، لەبەر ئەوە پێی دەوترێت دیواری ئاسن. وتم: ئەی بۆچی پێیان نەوتووە دیواری قوڕقوشم! وتیان: لەباوو باپیرانمانەوە بیستوومانە کە ڕەنگە لە سەردەمی کۆندا بەشێکی لە ئاسن دروستکرابێ. دوایی بۆمیان باسکرد کە لە سەردەمە کۆنەکاندا یەکێك لە پادشاکانی ئێران دروستیکردووە بۆ ئەوەی خەڵکی وڵاتی قەبچاق نەتوانن هێرشبکەنە سەر ئێران.. بڕیارمدا هەر کە دەستم چاکبێتەوە بچم بۆ بینینی ئەو دیوارە. بەخاکسپاردنی کوژراوان سێ ڕۆژی خایاند، لەو ماوەیەدا هیچ هەواڵێکی (تووك تامیش) نەبیسترا. چونکە سوارەکانم لە جەنگدا چاك سەرکەوتبوون، لە سەر پەیمانو بڕیاری خۆم، ڕێمدان کە وڵاتی قەبچاق تالانبکەن، هەرچی شتێکی بە نرخو سووکەڵەیان دەستدەکەوێت بۆ خۆیان، بەو مەرجەی بیبەنەوە بۆ وڵاتی خۆمان، بۆ ئەوەی لەوێ کەڵکی لێوەربگرن، بیکەنە سەرمایەیەك بۆ خۆیانو ژیانی خۆیانو ماڵو منداڵیان دابینبکەن. لە کاتی تالانکردندا بە سەربازەکانم ڕادەگەیاند هەر کەسێ دەست بێنێتە ڕێیان بیکوژن، بەڵام لەسەر تالانو بڕۆ هەرگیز نەچن بەگژ یەکتردا، هەرکەس لە پێشەوە دەستی بە سەر هەرچیدا گرت هی خۆیەتیو بۆ کەس نەهاتووە داوای بەشی لێبکات.

بۆ ماوەی چوار حەفتە سەربازەکانم لە شارو شارۆچکەو گوندەکانی (قەبچاق)دا سەر گەرمی تالانکردنبوون، هەندێك لە خەڵکی ناوچەکە کوژران چونکە بەرەو ڕوویان بوو بوونەوە، هەندێك سەربازی منیش کوژرا بوون. ڕاگوێزانی ئەو هەموو تالانییە بۆ وڵاتی خۆمان کارێکی ئاسان نەبوو، بە تایبەتی لە ڕێی وشکانەوە چونکە لەوانەبوو خاوەنەکانیان ڕێمان پێبگرن، بیرم لە ڕێی دەریا کردەوە، چونکە نزیکتر بوو، دەستی هۆزو خێڵەکانیش نەدەگەیشتە تالانەکە. وەرزی بەهار هاتە پێشەوە، هەموو لایەك سەوز بوو، هەرچی گاگەلو رانە مەڕو رانە بزن هەبوون وەبەردران بۆ سەر دەریا، سەوزە گیا خۆی گرتبوو، لەبەر ئەوە کێشەی ئالیكو لەوەڕ نەهاتە گۆڕێ. بەوەی

باشبوو کە لە کەناری دەریادا کۆمەڵێ جامباز ئامادە بوون، ژمارەیەکی زۆر مەڕو گایان لێکرپین و بەرەو باشووری کێوی قاف و ئێران پێش خۆیان دان و، بەو جۆرە تارادەیەکی زۆر کێشەی راگوێزانی گاو مەڕو ماڵاتمان لە کۆڵبووەوە.

دوای چوار حەفتەی تاڵانی، برینەکەی دەستم پتر هەویکردو ماوەی دە رۆژ بەردەوام تا دایگرتم. بۆ پاراستنی ژیانم شارەزایانی دەورو پشتم وایان بە باشتر دەزانی کە دەستی راستم ببڕدرێتەوە! رۆژێکیان پیاوێکی پیر کە خەڵکی ناوچەکە بوو هات بۆ بینینی برینی دەستم، وایان بۆ باسکرد بووم کە ئەو پیاوە لە پزیشکیدا زۆر شارەزایەو ئەزموونی زۆرە. گەلێك سەرنجی زامەکەیدا، پاشان وتی: ئەگەر(گیای قازیاخی) بخەیتە سەر برینەکەت چاکدەبێتەوە. تا ئەو کاتە ناوی ئەو گیایەم نەبیستبوو. داوامکرد کە زوو ئەو گیایەم بۆ پەیدا بکرێ. هەر چەندە کەمێك وەرز خۆشبووبوو، بەڵام هێشتا ئەو گیایە سەری دەرنەهێنابوو، هەر چۆنێکبوو گیای ناوبراو بە وشکی پەیدا کراو بە پێی رێنمایی پیرەمێردەکە رۆژی دوو جار دەمخستە سەر برینەکەمو دەبەسترا، دوای سێ رۆژ نیشانەی چاکبوونەوە لە دەستمدا دەرکەوت، پاش حەفتەیەك بە تەواوەتی دەستم چاکبووەوە! لە پاداشتی ئەو پیرە مێردەدا هەزار لیرەم پێبەخشی، سەرەڕای ئەوەش ئەو گوندەی ئەوی تێدا بوو پارێزراو فەرمانمدەرکرد کە هیچ سەربازێکم توخنی ئەو دێیە نەکەوێت. منیش لەو رۆژەوە تا ئێستا کە خەریکی نووسینەوەی بیرەوەرییەکانمم ناتوانم بە دەستی راست بنوسم، بەڵام باش شمشێری پێبەکار دێنم!

کە دەستم بە تەواوەتی چاکبووەوە چووم بۆ بینینی دیواری ئاسن، دەگەز بەرزو سێ گەز پانبوو، بە بەردی گەورە گەورەو چاککراو دروستکرا بوو، بۆ یەکگرتنی بەردەکان و چینەکان گیراوەی قورقوشم بەکار هێنراوە، لە هەندێ شوێندا دیوارەکە وێرانبوو بوو، دوای تێپەڕبوونی رۆژگارێکی زۆرو لەبەر باران و بەفرو سەرماو گەرما دەروازە ئاسنەکانی نەما بوون. بە ڕاستی ئەو دیوارە بەربەستێکی زۆر مەزنبووە لە ڕووی خەڵکی زۆر دڕو شەڕانیی قەبچاقدا! پێم سەیر بوو لە جیاتی ئەو دیوارە کە بە پەنجا ساڵ تەواو بووەو پارەیەکی ئێجگار زۆری تیا خەرجکراوەو بەردەوام پێنج سەد هەزار کرێکارو باشوەستای چاك کاریان تیا کردووە، بەڵێ پێم سەیر بوو لە جیاتی ئەو هەموو

ئەرکە دژوارە دەبوایە پادشایانی ئێران ولاتی (قەبچاق) یان خاپوور بکردایەو خێڵەکانیان لە ناوبردنایە بۆ ئەوەی هەتا هەتایە ئێران لە مەترسیی هێرشیان پارێزراو بێت.

بەرە بەرە هەوای بەهاری خۆشتر بوو، بەفرتوایەوە، رێگەی کێوی قاف کرایەوە، (شێخ عومەر)ی کوڕم گەیشتە لامو بە یەکتر شاد بووینەوە. بەر لەوەی دژ بە لەشکری قەبچاق بکەومە جەنگەوە، لە دڵی خۆمدا گلەییم لە کوڕەکەم دەکردو سەرزەنشتمدەکرد، بەڵام کە بە چاوی خۆم سەرسەختیو خۆڕاگریی ئەوانم بینی، زانیم شەڕکردن لەگەڵ ئەوانەدا ئاسان نییەو شێخ عومەریش ناچار بووە کە لە (بابولئەبواب) بمێنێتەوەو گیر بخوا.

ئەوە بوو وەرزی بەهار هاتە پێشەوەو ئێمەش لە ولاتی دوژمندا بووین، ترسی ئەوەمان هەبوو کە (تووك تامیش) بە لەشکرێکی بەهێزەوە یەخەمان بگرێتو شەڕێکی ترمان پێبفرۆشێت. بریارمدا کێشەی هەموو دیلەکان جێبەجێبکەم، ئنجا بەرەو (ماوەرائەننەهر) بکەومەڕێ. پێیانم وت: ئەوەی دەتوانێ باسەرانەی خۆی بقەبلێنێ، ئەوەیشی ناتوانێ سەرانەبدات دەبێت بێتە ناو لەشکری منەوە، ئەگینا دەکوژرێت!... هەندێك لە ئەفسەرەکان سەرانەی خۆیان داو ئازاد کران، هەندێکی تریان هاتنە ناو لەشکرەکەم، بەڵام هەندێکیان قایل نەبوون ببنە سەربازی من، منیش فەرمانمدا کەلە ملیان بدرێت. دوای پرسو رایەکی زۆرو لێکۆڵینەوەو توێژینەوەی قووڵ، وامان بە چاکزانی کەلە رێگەی باکووری دەریای خەزەرەوە خۆمان بگەیەنینەوە ولاتی خۆمان.

# پازدەیەمین بەش

## گەڕانەوە بۆ ماوەرائەننەهرو بەلای کوللە!

پێش ئەوەی لە (قەبچاق) بەڕێبم، تاقمێکم پێشخستن بۆ کۆکردنەوەو ئامادە کردنی خۆراکو ئالیك، دوو تاقمیشم کردنە پێشڕەو بۆ وەرگرتنی هەر هەواڵێکو زوو گەیاندنی بە من. لە دواوە هیچ ترسێکم نەبوو چونکە لە باتی غار باڵماندەگرتو لە توانای هیچ سوارێکدا نەبوو بە تۆزی وڵاخەکانیشماندا بگاتەوە، لەهەمان کاتدا بۆ چاودێریی ئەم لاو ئەو لامان چاوێکمان کردبوو بە هەزار چاو. تا گەیشتینە ڕووباری (طەرخان) هیچ ڕووداوێك نەهاتە کایەوە کە شیاوی باسبێ. لەوێ هەواڵدەرانم ئاگاداریانکردم کەلە سەرکەناری ڕووباری ناوبراو بازارێکی گەورە کراوەتەوە بۆ بەکرێدانی ئەسپو ئێسترو حوشتر، کارگێڕانو خاوەنانی بازاڕەکە بە نزیکبوونەوەی منیان زانیبوو، داوای ئامانیان کردبوو، هەواڵیان بۆ ناردم کە ئامادەن باجێکی بە جێو شایستە بدەن بەو مەرجەی هێرشنەکەنە سەر ئەو بازاڕە!... منیش وەڵامم بۆ ناردنەوە کە ئێمە ڕێبوارین ولاقەی کەس ناکەین، بەڵام ئەگەر هەست بە فڕوفێڵ و تەڵەکەو داوێك بکەین بازاڕەکە تەختدەکەین.

دوای ئەوەی گەیشتینە بازاڕی ناو براو بۆمان باسکرا کە هەموو ساڵێ دوای توانەوەی بەفرو بەستەڵەك ئەو بازاڕە گەورەیە دەکرێتەوەو لە هەموو لایەکی ئەو ناوچەیەوە زیاتر لە سەد هەزار کەس ڕووی تێدەکەنو هەموویان خەریکی کڕینو فرۆشتنی کاڵای هەمەچەشنن. سەربازەکانم ئاگادار کرد بوون کە بە هیچ جۆرێك دەسدرێژی نەکەن، ئەگینا سزای سەخت دەدرێن، باشبوو ڕووداوێکی ئەوتۆ ڕووی نەدا. لەسەر ڕووباری (طەرخان) پردێك دروستکراو بوو هەموو پایەکانی بەلەمبوون، دوای ئەوەی پردەکەمان تاقیکردەوەو بۆمان دەرکەوت زۆر قایمو بەهێزە، بوارمدا لەشکرەکەم بەسەریا بپەڕێتەوە. ڕووباری ناو براو زۆر گەورە نەبوو، ڕووباری (جەیحوون)ی ئێمە پێنج ئەوەندەی ئەو دەبێ.

دوای پەڕینەوەمان هەستمکرد کە ئیتر مەترسیی گەورەمان لەسەر نییە، بە کەناری دەریای خەزەردا بەرەو ڕۆژهەڵات، پاشان بەرەو باشوور ڕۆیشتم تا گەیشتمە ڕێگەیەکی سەرەکی کە بۆ سەمەرقەند دەڕۆیشت، دوای ئەوە هێواشتر

دەڕۆیشتین چونکە گەیشتبووینە تورکمانستان و دەمزانی ڕێگەیەکی بێ ترسە، لەگەڵ ئەوەشدا زۆر ئاگاداری خۆمانبووین و چاودێریی هەموو لایەکمان دەکرد.

لەسێیەمین ڕۆژی مانگی (ثەور)دا، لەو کاتەدا کە بەڕێوە بووین، لەباشوورەوە هەورێك دەرکەوت،کەم کەم نزیکبووەوەو ئاسمانی داپۆشی، تیشکی خۆر نەما، نیوەڕۆی ڕۆشنی کرد بە شەوە زەنگی نووتەك، کە سەرم بەرز کردەوە سەرنجمدا هەور نییە، بە هەزارەها جانەوەری باڵدار بەری ئاسمانیان گرتبوو، لە باکوورەوە بەرەو باشوور دەڕۆیشتن. تا ئەو ڕۆژە هێرشی کوللەم نەدیبوو، پەنا بە خوا ئەوەندە زۆرو پڕ بوون تۆسقاڵێ تیشکی ڕۆژ نەدەکەوتە سەر زەوی، ئەسپەکانمان ترس دایگرتن و دەیانحیلاند، لە ترسا گیاندارانی بیابان هەڵدەهاتن، ترسی ئێمەش لە هی ئەوان کەمتر نەبوو. یەکێ لە ئەفسەرەکانم وتی: ئەی ئەمیر ئەگەر ئەم کوللەیە هێرشبکاتە سەر کشتوکاڵ و باخەکانی (ماوەرائەننەهر) ئەمساڵ قاتی و گرانی دەبێت! وتم: کاری دەستی مرۆڤ چارەسەری هەیە، بەڵام لەگەڵ کاری خوادا هیچ ناکرێت.

ئەو ڕۆژە تا خۆر ئاوا بوون شەپۆلی کوللە بەردەوامبوو،شەویش هەمیان ڕەوی درێژەیکێشاو گوێمان لە فڕەی باڵەکانیان بوو، بۆ ڕۆژی دواییش تاکو ئێوارە بە هەزاران هەزار کوللە لە ڕەودابوون، بۆ شەوێش تاکو بەیانی بێ پشوو هورووژمیان بەردەوامبوو، بۆ بەیانیی ڕۆژی سێیەم ڕەوی کوللە کۆتاییهات. کە گەیشتمە یەکەم لانەی کۆتری نامەبەر هەواڵم زانی کوللە بەربووەتە هەموو کێڵگەو باخاتی وڵاتەکەم، بۆم نووسرا بوو: کوللەکان لە ژمارەی لمی بیابان زۆرترن! بێ گومان خۆم و هەموو ئەفسەران و سەربازەکانم خەم دایگرتین. کە گەیشتینەوە (ماوەرائەننەهر) سەیرمانکرد لە هیچ لایەکەوە سەوزایی نەماوە، تەنانەت دەشت و دەرو هەموو لەوەڕگەکان کەلە ساڵێکدا سێ وەرز ئەسپ و ئاژەڵمان تێدا دەلەوەڕاندن ئەوەندە ڕووتەنیبوون دەتوت هەرگیز لەو ناوچانەدا گیا سەوز نەبووە!

کە گەیشتمە سەمەرقەند، نەنانەواخانەیەك هەبوو، نەدەنکێك گەنم لە بازاڕدا دەستدەکەوت، هەموو خەڵکەکە مات و سەرگەردانبوون، ئەژنۆی خەمبارییان گرتبووە باوەش، بارودۆخی شارەکانی تریش لە هی سەمەرقەند خراپتر بوو، بەهیچ جۆرێ نان دەست نەدەکەوت. من دەمزانی گەنمی پاشەکەوتکراو تا

کۆتایی چوارەمین مانگی ساڵ بەشدەکات، بەڵام ئەوانەی گەنمیان هەبوو لە ترسی گیانی خۆیان نەیاندەوێرا بیفرۆشن. هەموو خواردەمەنییەك لە بازاڕی سەمەرقەندا دەگمەنبووبوو، بە هیچ جۆرێ ئالیکو لەوەڕ دەست نەدەکەوت، ناچار خاوەن ئاژەڵو مەڕو ماڵاتەکان گا گەلو ڕانەکانییان بەرەو ناوچە دوورەکان بردن بەو هیوایەی بگەنە لەوەڕگەو دەشتی سەوز، لە بازاڕی سەمەرقەندا بە هیچ جۆرێ گۆشت دەست نەدەکەوت. فەرمانمدا هەموو ئەسپو ئێسترەکانی لەشکر بگەیەنرێنە لەوەڕگەکانی کابولستان بۆ ئەوەی لە برسانا نەمرن. ئنجا بڕیارمدا بە پێی توانا، لە رووباری (سەیحوونو جەیحوون)دا، ڕاوەماسی بکرێت تاکو خەڵکی لە برسانا نەمرن. فەرمانمدا کە هەموو زەوییە وەردەکانی بەر ئەو دوو رووبارە بکرێن بە گەنمو جۆو بە ئاوی رووبارەکان ئاو بدرێن، ئومێدم زۆر بوو کە بەرو بوومی باشمان هەبێتو کای گەنمو جۆکەش بۆ ئەسپو گاو ئاژەڵەکانمان دابینبکەین. لە سەمەرقەندو هەموو شارەکانی تریشا جاڕدرا کە دەوڵەت گەنمو جۆ دەکڕێ، بۆ نرخی سەدمەن گەنم، بە مەنی وڵاتی (ماوەرائەننەهر) سێ مسقاڵ ئاڵتوون، بۆ نرخی سەد مەن(جۆ)ش یەك مسقاڵو نیو ئاڵتوون دانرا، ئەو کەسەی دانەوێڵەی هەیە دەتوانێ تەنها سی مەن بۆ خۆراکی خۆیو ماڵو منالی بهێڵێتەوە، هەر چیشی زیادە دەبێ بەو نرخە زۆرە دیاریکراوە بیفرۆشێ بە دەوڵەت، ئەگینا خوێنی بە فیڕۆ دەچێتو ماڵیشی حەڵاڵدەبێ! پێشنوێژەکانی مزگەوتەکان ئاگادار کران کە بڕیارو بانگەوازی من بە ئایەتی قورئانو فەرموودەی پێغەمبەرەوە (د.خ)بە جەماوەری مزگەوتەکان ڕاگەیەنرێن.

لە وڵاتەکانی دەورو بەرمان تەنها هەر خوراسان دەیتوانی یارمەتیمانبدات، بۆ ئەو مەبەستەش دەستەیەکی شارەزام ناردنە ئەوێ بۆ کڕینی دانەوێڵەو ناردنەوەی، داوامکرد کە بە ئەسپو حوشتر بیگەیەننە سنووری وڵاتی خۆمان، پاشان بە گالیسکە بگەیەنرێنە شارەکان. لە هەمان کاتدا سەرپەرشتیی کێڵگەکانی گەنمو جۆم دەرکردو دەبوایە دڵنیابم کە جۆگەی تەواو لە ڕووبارەکانەوە لێدراون بۆ ئاودانیان، هەروەها هانی هەمووجووتیارانم دەدا کە هەمەچەشن بەرهەمی هاوینە داچێنن، چونکە دەمزانی هەر بەرهەمێك کە بخورێت لە تینی نەبوونیو قاتی کەمدەکاتەوە. دوای کەمبوونەوەی ئاوی

رووبارەکان، سۆزی خوای مەزن پتر کەوتەکار، لە مانگی (سەرەطان)و مانگی (ئەسەد)دا چەند جارێك بارانی باش باری، هەموو بێستانەکان گەشانەوە، دانەوێڵە لە خەم رەخسا. لە مانگی (سونبولە)دا گەنمو جۆ پێگەیشتن‌و گوڵەکانیان پڕپڕ بوون. جووتیاران زوو بە زوو دروێنەی خۆیان کرد. ئەوەندە دانەوێڵە زۆر بوو کە نرخی سەد مەن دابەزی بۆ تاقە یەك دینار، ئیتر پێویستی نەکرد دانەوێڵەی خوراسان بکڕم. ڕەوە ئەسپو ئێسترەکان، گاگەلو ڕانەمەڕو ڕانەبزنەکان هێنرانەوە بۆ لەوەڕگەو دەشتە شینەوبووەکان، سوپاس بۆ خوا، دووبارە هەرزانی کەوتەوە ناومان‌و دڵنیاو بێ خەمبووین، بەرهەمی ئەو ساڵەمان زۆر لەبەر چاوو دیار بوو.

لە پاییزو زستانی ئەو ساڵەدا هەموو کاتی خۆم تەرخانکرد بۆ بەهێز کردنی لەشکر، ژمارە ولانەی کوتری نامەبەرم لە سەرانسەری وڵاتدا فراوانکردن، لە بارەی ئەو وڵاتانەوە کە کەوتبوونە باشووری دەریای خەزەرەوە چەند کتێبێکم خوێندنەوەو داوام لە پسپۆڕان کرد لێکۆڵینەوەو توژینەوەی زۆرترم بۆ ئامادە بکەن. ئەو کتێبانەی خوێندنمەوە هەموو زانیارییەکیان تێدا نەبوو، هەر بۆ نموونە، من بیستبووم لە (طەبەرستان) کە دەکەوێتە باشووری دەریای خەزەر، گەلێك دەژی پێستی بەورو پڵنگو گاکێوی لەبەر دەکەن، لە دارستاندا دەژین، خواردنیان گیانلەبەری دارستان‌و میوەی بێشەیەو لە هیچ کەس ناترسن‌و کەس نەیتوانیوە وڵاتیان داگیر بکات؛ دێوی سپی، کە لە شانامەی فیردەوسیدا باسکراوە، لەو میللەتە بووە. هەروەها بیستبوووم لە وڵاتی (گەیلان)دا گەلێك دەژی کە خۆراکیان برنجێکی زۆر خۆشبۆیە، جوانترین‌و شۆخترین ژنانی سەرزەمین لەو وڵاتەدا دەژین، چونکە ئەو جۆرە برنجە خۆشبۆیە دەخۆن. بیستبووشم لە باشووری دەریای خەزەردا وڵاتی (طالش) هەیە، پیاوانی ئەو وڵاتە هەموو کەڵەگەتو زەلام، قژو ریشیان تا بەر ئەژنۆیان بەربوونەتەوە، پێستی گیانداران دەپۆشن، سواری گاکێویی گەورەو شاخدار دەبن، کە هەر شاخێکیان چەندان لقوپەلی لێدەبێتەوە، یان گالیسکەیان لێدەبەستن‌و بۆ کاروباری خۆیان بەکاریدێنن، هەمیشە لەگەڵ سەگی دڕندەدا دەژین کە هەریەکەیان هێندەی وڵاخێك دەبێ، هیچ کەس نەیتوانیوە ئەو پیاوانە بخاتە ژێر ڕکێفی خۆیەوە. بە ڕاستی زۆر مەراقمبوو بچم بۆ ئەو وڵاتانەو لەو

زانیارییانە دڵنیابم كە بۆم باسكرا بوون، دەشمویست بزانم دەتوانم بیانخەمە سەر قەڵەمڕەوی خۆم!

شەوانی زستان لەگەڵ راوێژكارەكانمدا باسی لەشكركێشیو هەنگاوی پێویستی داهاتووم دەكرد. بڕیارمدا لەبەرەوپێشچوونما قۆناخ بە قۆناخ كۆتری نامەبەرم پێبێو زۆر تر راگرم بۆ ئەوەی لە كاتی تەنگانەو لێقەوماندا داوای یارمەتی لە سەمەرقەند بكەم، ئەمە سەرەڕای ئەوەی كە بۆ كاروبارو پێویستیی خۆم بەكارمدەهێنا. دەمویست لە بەهاری ساڵی ئایندەدا بەرەو وڵاتەكانی باشووری دەریای خەزەر بكشێمو هەموویان داگیر بكەم، پاشان خۆم بگەیەنمە ئازربایجان. نەمدەزانی دوای ئەوە چی بكەم، ئایا بەرەو رۆژئاوا بڕۆمو خۆم بگەیەنمە دیجلەو بەغداد داگیر بكەم، یان بەرەو باشوور بڕۆمو بە جۆرێك (شا مەنصور موظەففەر)ی فارس تەمێبكەم كە هەرگیز نەوێرێ قسەی ناشیرین بەكەس بڵێت.

# شازدەیەمین بەش

## لەکەنارەکانی دەریای خەزەردا

لـە سـەرەتای وەرزی بـەهاردا (شـێخ عومـەر)م لـە جێـی خـۆم دانـاو بـە لەشکرێکی سەد هەزار سوارەوە بە کەناری رووباری جەیحووندا بەرەو دەریای خەزەر کەوتمەڕێ. لەو وەرزەدا بەویستو فەرمانی خوای گەورە ئەو رووبارە مەزنە ئاوەڕۆی خۆی گۆڕی، لـە جیاتی ئـەوەی بـەرەو رۆژئـاوا بـڕوات، رێـی رۆژهـەڵاتی گرتـە بـەرو هاتـە نـاو (ماوەڕائەننـەهر)، ئەگـەر وا نەبوایـە نیـوەی وڵاتمـان بیابـانی وشـلو برنگدەبـوو. (کـەمناویی دەریـای خـەزەر لـەو رۆژەوە دەستی پێکردووە کە رووبـاری جـەیحوون ئـاوەڕۆی خـۆی گـۆڕی _ مارسـیل بریـۆن).کـە لـە دەریـای خـەزەر نزیکبووینـەوە رووبـارێکی زۆر گـەورەمان لێدەرکەوت ئەویش (رووباری تورکان)بوو؛ ئەوەندە ئاو هەستا بوو کە بە هیچ جـۆرێ نـەمانتوانی لێیدەیـن. هـەندێك لـە دانیشـتووانی ئـەو ناوچەیـە ئاگاداریانکردین کە بواری پەڕینەوە سێ فرسەنگ لە خوارترەوەیە، دەبوایـە دوو حەفتـە چاوەڕوانبووینایـە تـا ئـاو بنیشـێتەوە ئەوسا دەمـانتوانی لـە رووبارەکە بدەین. ئەگەر بەلەمی تەواومان دەستکەوتنایە، یان دارستانی گەورە هەبوایە بۆ ئەوەی بەلەم دروستبکەین، بە پردی بەلـەم کارمـان جێبـەجێدەبوو. بیستبووم لەو شوێنەدا کە رووباری ناو براو دەڕژێتە دەریای خەزەرەوە دەبێت بە دە، تا پازدە لقی بچووك، لەو ئاستەدا پەڕینەوە ئاسانە. چەند رێگەوانێکی شارەزامان لەتەك خۆماندا بردن تاگەیشتینە شوێنی باسکراو، وەك باسیانکرد وابوو، دوای پەڕینەوە بەرەو باشوور رۆیشتین تا گەیشتینە دەشتێکی سەوزو بەرین، گیای سەوزو جوان دەگەیشتە ژێر سکی ئەسپەکان، ئەو ناوچەیە لە باشترین لەوەڕگەکانی وڵاتەکەم سەوزتر بـوو، ئەگـەر سـەرقاڵی بـەرەو جـەنگ نەبوومایـە دەستوورمدەدا کە چەند رۆژێ بمێنینـەوەو خۆمـانو ئەسـپەکانمان چـاك چـاك بحەسێینەوە. پێنج رۆژ لەسـەر یـەك بـەو دەشـتەدا رۆیشـتین کـە سەرانسەر دانیشتووانی تورکمانبوون، جار بە جاریش هەندێ لە سەرەك خێڵو تیرەکـان بـە چـەند بەرخێکـەوە دەهاتنـە لام، منیـش خـەڵاتمدەکردنو دڵنیامدەکردن کە ئازادنو کەس لاقەیان ناکات. دوای دەشتایی سەوزو بەرین گەیشـینە دارسـتانێکی زۆر بەرینو فراوان، خـەڵکی ناوچەکـە دەیـانگوت: ئـەو

دارستانە ئەوەندە گەورەو بەرینە کەئەو سەری دەگاتە ئەو پەڕی دنیا! دارستانەکە زۆر چڕو ترسناکبوو، پاسەوانی باش باشم ناردنە سەر دارە بەرزەکان بۆ ئەوەی ئاگامان لە دەورو بەربێ‌و دڵنیابین کە هیچ لەشکرێك لە پڕ پەلامارمان نادات. جارجار دەنگی سەیرو سامناك بەرگوێمان دەکەوت، وامانزانی کە پەنجا هەنگاوێك لێمانەوە دوورە، دوایی بۆمان دەرکەوت ئەو جۆرە دەنگانە هی دەنگدانەوەی خودی دارستانەکەیەو بە لایەنی کەمەوە فرسەنگێك لێمانەوە دوورە. ڕۆژێکیان گەیشتمە بەرزترین شوێنی دارستانەکە، لەپڕ دەریای (خەزەر)م لێدەرکەوت، تا ئەو کاتە دیمەنی وا سەیرو سەمەرەو جوان‌و ڕەنگینم نەدیبوو، بە هەموو لایەکی ئاسۆدا دەریاو ئاسمان لێکیاندابوو، ڕەنگی ئاوی هەموو لایەکی گرتبووەوە، ئەوەندە سەرسامی ئەو دیمەنە بێ وێنەیە بووم‌و کاری تێکردم نەمتوانی درێژە بە ڕۆیین بدەم، ماوەی یەك سەعاتی تەواو بە وردی سەرنجی ئەو دیمەنە ڕەنگینەمدا. بە ڕاستی هەر کەس دەیەوێ دیمەنێکی وا ببینێ کە هەرگیز لە یادی نەچێت با بچێتە (ئەستەرئاباد)و لەوێوە بە وردی بڕوانێتە دەریای خەزەرەوە!.. ئەو ڕۆژە بۆ یەکەم جار کە دیم ئاسمان وەکو گومەزێکی گەورەو ئاوی بە دە ریاوە نووساوە، بۆم دەرکەوت کە ئەم زەوییەی ئێمە خڕە! پاش ماوەیەك لە بڕین گەیشینە شوێنێك وتیان: هەر کاتێ بتەوێ بەرەو (عیراقی عەجەم) بکەویتە ڕێ، لێرەوە بەرەو باشوور بڕۆ. لەو کاتەدا من نەمدەویست ڕووبکەمە عیراقی عەجەم، وام پێباشتر بوو بەرەو ڕۆژئاوا بڕۆم.

باران دەستی پێکرد، بە جۆرێك دەباری دەتگوت لافاوەکەی نووحە، خۆمان‌و ئەسپەکانمان لە ژێر درەختەکاندا پەنامانگرت. چوارشەوو چوار ڕۆژ لە سەریەك بارانباری، وامان لێهات هێزمان لەبەر بڕا، ئەگەر لەو ماوەیەدا لەشکرێك پەلاماریبداینایە لە ماوەیەکی کەمدا لە ناویدەبردین. دوای چوار ڕۆژ باران وەستایەوەو خۆرهەڵات‌و هەوا گەرمیکرد، سروشتی ئەو ناوچەیە وایە، کە بباریێ زۆر ساردە، کە هەتاویش بکەوێ زۆر گەرمە. دوای ئەوەی خۆشیکردەوە، ڕێمانگرتەبەر، تاکو گەیشتینە ناوچەی (طەبەرستان) پیاوانی ئەو ناوچەیە هەموویان کەڵەگەت‌و زەبەلاحن، هەموو گاکانیشیان زۆر زەلام‌و بەهێزن، هەموو دانیشتووانی لەناو جەنگەڵی بەریندا ئەژین، پیاوەکان پێستی گیانلەبەران لەبەردەکەن‌و تووکە سەرو ریشی درێژیان بەرداوەتەوە، هەریەکە تەورێکی لەسەرشانە بۆ پاراستنی خۆی لە دوژمن‌و گیانداری درندە، هەروەها

بۆ داربڕین و ڕێکردنەوە لە ناوچە زۆر پڕوچڕەکاندا. هەندێکیشیان لە باتی تەور کوتەکێکی سامناکو گەورە دەخەنە سەر شانیان، دەتوانن بە یەك کوتەك بەورێك بکوژن. لە (طەبەرستان)دا شێرو بەورو پڵنگ زۆرن، تێکڕا ژمارەی شێرەکان زۆرترە، لە هەندێك شوێنیشا ژمارەی بەورەکان لە ژمارەی پشیلەکانی (سەمەرقەند)زۆرترە.

ژنانی ئەو ناوچەیە وەکو پیاوەکان باڵا بەرزو بە هەیکەلن، سواری گا دەبوون و لە گەڵیشیا دەدوان. لە (طەبەرستان) لە جیاتی ئەسپ گا بەکار دەبرێت. ئەو ژنانە زمانی باڵندەو گیاندارانی دارستانیان دەزانی، لە مەشدا توانای حەزرەتی (سلێمان د.خ) هاتەوە یادم. خەڵکی ئەو ناوچەیە لەو باوەڕەدان کە ڕەچەڵەکیان دێوەو دەچنەوە سەر دێوی سپی! هەموو میرەکانیان بە ناوی دێوەوە ناونراون. کە گەیشتمە ئەو ناوچەیە سەرنجمدا بە هیچ جۆرێك سڵمان لێناکەن و هیچ نرخێك بۆ لەشکرەکەم دانانێن! وام بە باشزانی لەگەڵیانا دۆستبم، هەر ناکۆکییەك لە نێوانماندا سەری هەڵدایە بۆ ئێمە مەترسییەکی گەورە دەبوو. ئەمیرەکانی ناوچەکەم تێگەیاندن کە دۆستی ئەوانم، ڕێبوارەو گوزەر دەکەم، بێجگە لە خۆراکو ئالیك پێویستم بە هیچ نییە، ئەوانیش هەر چەندێکمان بویستایە دەیانخستە بەردەستمان، بەڵام لە جیاتی گەنم برنجیان دایێ چونکە ئەوان هەر برنج دەچێنن و برنج دەخۆن، هەروەها شەکری زۆریشمان کۆکردەوە، چونکە لەو ناوچەیەدا قامیشی شەکر ئێجگار زۆرە.

سەیر لەوەدایە کە پیاوانی (طەبەرستان) ناتوانن سواری گا زەلامەو سامناکەکانیانبن، چونکە هەر پیاوێك لە هەر گایەك نزیکبێتەوە، گاکە خراپ پەلاماریدەدات، گەر بیگاتێ دەیکوژێ! تەنها ژنانیان بە هێمنی و لەسەرخۆ سواریاندەبن. زۆر جار خەڵکەکە بۆ سەیر کردنی شەڕەگا کۆمەڵدەبەستن، ژنان گاکان دەرازێننەوەو دەیانبەنە گۆڕەپانی شەڕ، هەر جارەی دوو گا بە شەڕ دەدرێن، هێرشی سەختو ناهەموارو ترسناك دەکەنە سەر یەکتر، دوای چەند خولەکێك یەکێکیان لە پەلوپۆ دەکەوێت و ئیتر هەڵناسێتەوە، جاری واش هەیە هەردووکیان تیا دەچن.

ڕۆژێکیان، کە بەکەناری دەریادا دەڕۆیشتین، کۆمایەکی گەورە ئیسقانی سپیمان بینی،دانیشتووانیئەوێ وتیان: چوار ساڵ لەمەوبەر جەردەی دەریا بە بیست کەشتییەوە لە باکووری دەریای خەزەرەوە هاتنە سەرمان، هەموو بە شیرو تیرو کەوان دەجەنگان، ئێمەش بە تەورو کوتەك کەوتینە ویزەیان،

گەلێکمان لێکوشتن، ئەویشی خۆی گەیاندە کەشتییەکان بۆی دەرچوو، ئیتر لەو رۆژەوە هیچ جەردەیەکی دەریا نەیوێراوە توخنی ئەم ناوچەیە بکەوێ، ئەو ئیسکو پرۆسکەش شوێنەواری جەردە کوژراوەکانە.

لە (طەبەرستان)دا بەرادەیەك بەرهەمی نارنجو پرتەقاڵ زۆرە کە پیاناگەن بیرنن، بە نرخێکی زۆر هەرزانیش دەفرۆشرێ، بەلام لە ولاتی ئێمەدا کەمەو زۆر گرانیشە. لەوێ خاوەنی باخاتی نارنجو پرتەقاڵ داوا لە خەڵك دەکەن کە بە ئارەزووی خۆیان لێبکەنەوەو بخۆن. لەبەر نەبوونی کڕیارو زۆریی نارنج، دانیشتووانی بەبار دەیهێنن، ئاوەکەی دەگرن، لە قازانو مەنجەڵی گەورەدا ئەوەندەی دەکوڵێنن تا دەبێتە خەستەیەکی رەش، ئەوەندە ترشە هیچ کەس ناتوانێ تۆسقاڵێکی بخاتە سەر زمانی، زستانان بۆ تامی چێشت بەکار دەبرێ.
طەبەرستان ولاتی گژوگیای پزیشکییە، وەك دەوترا نزیکەی بیست هەزار جۆر لەو گژوگیایانەی لێیە، تەنانەت ئەگەر هەزار جۆریشی لێبڕۆێت دەشێ بە ناوەندی دەرمانی جیهان دابنرێت. زۆربەی دەرمانەکانیان دەناردن بۆ عیراقی عەجەمو لەوێ دەفرۆشران.

گەیشتینە ناوچەیەك پێیان دەوت (چل دەرە)، رێگەوانە شارەزاکان وتیان: ئەی میر، هەر کاتێ ئارەزوو بکەی دەتوانی لە رێی باشوورەوە بڕۆی بۆ بینینی قەلای (قەسری خان) کە یەکێکە لە قەلا گەورەکانی سەر بە رێبازی (ئیسماعیلیە)و سێ سەد ساڵ لەمەوبەر دروستکراوە، ئەو قەلایە ئەوەندە سەختو گیرە کە پێش سەد ساڵ (هۆلاکۆ) دوای دە، یانزە ساڵ گەمارۆدانو برسیکردن جا توانی دانیشتووانی ناچار بکات خۆیان بە دەستەوە بدەن، ئەویش لە ملی هەموویانیدا، بەلام لەبەر قایمیی شوورەو دیوارەکانی نەیتوانی بیرووخێنێ!.. مەخابن لەبەر مەترسیی دانیشتووە دڕونە بەردەکانی ئەو ناوچەیەو سەختیی رێگاو چەمو دۆڵی زۆر قووڵو ناهەمواری، هەر چەند کردم کۆشام نەموێرا رێی ئەو قەلایە بگرمە بەر، لەبەر ئەوە ئەو بیرۆکەیەم لەسەرما دەرکردو بەرەو رۆژئاوا درێژەم بە رێدا. هەروا بە ناو دارستانی بێ کۆتاییدا رۆیشتینو رۆیشتین تا گەیشتینە ولاتی (گەیلان) خەڵکی ئەو ولاتە وەکو هی (طەبەرستان) کەڵەگەتو زەلام نەبوون، هەر چەندە موسڵمانن، بەلام (رووباری سپی)، کە رووبارێکی زۆر گەورەی ئەوێیە، بە خوای خۆیان دەزانن، کاتێ گەیشتینە رووباری ناوبراو هێشتا لافاوی نەنیشتبووەوە، ئەو رووبارە کە نزیك دەریای خەزەر دەبێتەوە دەبێ بە ١٠-١٥ لقو جا دەرژێتە دەریاوە. شاری

رەشت گەورەترین شاری گەیلانە، ناوەندی ولاتەکەش شاری (لاهیجان)ە، لەو شارە شەوە بەرەو دەریا برۆی دەگەیتە بەندەری (گوتم) کە گەرەترین بەندەری دەریای خەزەرە، کە گەیشتمە ئەویْ پتر لە دوو سەد کەشتی تێدا بوون، هەر یەکە لە ولاتێکەوە هاتبوو، کالای ولاتی گەیلانیان دەبرد بۆ ولاتانی تر. گرنگترین بەرهەمی ئەو ولاتە ئاوریشمە، ئەو بەرهەمە ئەوەندە زۆرو نایابە بەشی خەرجی هەموو جیهان دەکات! دوای ئاوریشم برنجی عەنبەری گەیلان زۆر ناودارە، ئەوەندە بۆنەکەیم پێ خۆشبوو، دەستوورمدا کە بەکەشتی برێکی زۆر لە چەلتووکی گەیلان ببرێت بۆ ولاتی خۆم تاکو لەویْ بچێنرێت.

ئەی ئەو کەسەی کە بەسەر هاتی من دەخوێنێتەوە، بزانە کە من (تەیموور)م، نەوەی جەنگیزم، بە ناو هێنانی من خەلکی هەلدەلەرزن!.. من لە ولاتی گەیلان رامکرد! ژنە جوانەکانی گەیلان ناچاریانکردم کە هەلێم!.. لە هیچ لایەکی ئەم سەر زەمینەدا ژنانی واجوان نابینرێن، ئەگەر بلێم گەیلان بە هەشتی پڕ لە فریشتەو حۆریە، لێم مەگرن! هەر هەموویان روخسار سپی، سپی پێستو چاوو برۆ رەش، یان چاو شینو قەلەوو خرینن، وتیان هۆی ئەوەیە کە خواردنیان برنجو ماسییە. وتم: ئەی بۆچی پیاوەکان وەکو ئەوان جوان نین! خۆ ئەوانیش هەمان خواردن دەخۆن!.. من وای بۆ دەچم شتێك هەر هەیە کە ئەو ژنانە لە ژنانی دیکە جوانترن. جا بۆ ئەوەی ئەو ژنە نایابو دانسقانە خۆمو سەربازەکانم لە خشتەنەبەن، دوورلە شارە گەورەکانی گەیلانەوە ئوردووگەم هەلدا.

بێجگەلە شاری لاهیجان، شارێکی تری گەورە هەیە کە ناوی (ئەسپو هبودان)ە، هەر هەموو دانیشتووانی سپیپۆشبوون، وتیان: کە لە دایکدەبن تا رۆژی مردن هەر بەرگی سپی لەبەردەکەن، نوێنو راخەریشیان سپین. ئەگەر گەیلان ولاتی حۆریو فریشتە بێ، وا شاری (ئەسپو هبودان) جوانترینو رازاوەترین ژووری ئەوێیە!... پیاوەکانیش بە هەمان شێوە قۆزو جوانن. هەموو خەلکی شار چاویان شینبوو. وتیان کە ژن نادەن بە بێگانە، تەنیا لەناو خۆیانا ژنخواستنو ژنهێنان هەیە،بۆیە رەگەزی خۆیان پاراستووەو هەموو چاوشینن. هەروەها وتیان: شارەکە بە ناوی میرێکی دێرینەوە ناونراوە. پیشەی گەورەو بچووکی خەلکی شار پەروەردە کردنی کرمی ئاوریشمو ئاوریشمچنینبوو. چەند جاریْ سەرم لە کارگەکانی چنینی ئاوریشمدا، هەموو جارێکیش وتەکەی (مەولەوی)، خاوەنی (مەثنەوی)دەکەوتەوە یادم کە دەلێت: (دروستکراو لە

دروستکەر جوانترە!) ئەگەر خاوەنی (مەثنەوی) زیندوو بوایە لە (قوونیـە)وە دەمناردە (ئەسپو هبودان) تا لە کارگەکانی چینیی ئەو شارەدا بە چاوی خۆی بیبینایەکە ( دروستکەر لە دروستکراو جوانترە)و ئەوەی لە نێوان پەنجەکانی ژنانی ئەوێوە دەردەچیٚ، گەرچی زۆر نەرمو سفتو جوانە، بەلاٚم گیانی تیانییە، چاوی نییە تا سەیری مرۆڤ بکات، بەلاٚم ئەو فریشتانەی ئەو پارچە ئاوریشمانە دروستدەکەن گیانیان هەیە، چاوی شینیان هەیە، نابیٚ پیاوی جەنگاوەر چاویان تێبڕیٚ، چونکە وردو خاشیدەکەنو ڕێی جەنگی لێدەگرن!..

لەو شارەشدا تەنها دوو ڕۆژ مامەوە، بەخۆمو لەشکرمەوە لە ژنە جوانەکانی شار دوورکەوتینەوەو بەرەو ولاٚتی (طالش) یان (طەلشان) کەوتمە ڕێ بۆ ئەوەی ئەو پیاوانە ببینم کە دەیانگوت بەهێزترین پیاوانی ولاٚتانی دەورو بەرو کەنارەکانی دەریای خەزەرن، هەروەها بزانم ئایا دەتوانن لەگەلٚما پەنجە بپێکن یان نا!..کەگەیشتمە ئەویٚ ولاٚتێکی جیاوازترم بینی، پیاوانو ژنان هەموو بالاٚ بەرزو بەهێز بوون، لەو وەرزەدا تەنها هەر عەیبی خۆیان داپۆشیبوو، ئیتر هیچیان لەبەردا نەبوو، وتیان لەوەرزی زستاندا چەرمو پێست دەپۆشن. دەنگی پیاوانیان ئەوەندە گەورەو بەهێز بوو لە دامێنی کێوێکەوە بۆ دامێنی کێوێکی تر لەگەلٚ یەکتردا دەدوان. سەگی ئەو ولاٚتە هێندەی ئەسپێك گەورەو بەهێز بوو، گالیسکەیان لێدەبەست. گا کێویی زۆریان هەبوون، لە وەرزی زستاندا گالیسکەیان لێدەبەستنو باریان پێدەکێشن، بەلاٚم لە بەهارو هاویندا بەرەلاٚیان دەکەنە ناو دارستانە بەرینەکان. چوومە شارێك کە پێیان دەگوت (خەشم)، میرەکەی ناوی (داعی)بوو، پێشوازی لێمکردو بەر لەوەی بگەمە شار لەبەر پێمدا گای سەربڕی، بۆ نانخواردنیش گۆشتی گا کێویی برژاویان بۆ دانام. دوای نانخواردن بە داعیم وت: کە چەند پیاوێکی بەهێزی طالش بانگبکات تا لە گەلٚیاندا پەنجە شکاندنەوە بکەم. (داعی) وتی: خالٚۆمیران ئەم کارە مەکە، چونکە ئەگەر تۆ پەنجەی ئەوان بشکێنیتەوە شتێك لە گەورەیی تۆ زیاد ناکات، ئەگەر ئەوانیش لێت بەرنەوە بۆمن شوورەییە، گوایە چۆن دەکریٚ میوانی مەزنو خۆشەویستمان ببەزێنریٚ! وتم: ئەی پیاوی چاك، مەبەستم ئەوەیە کە شانو باهووی خۆم تاقیبکەمەوەو بزانم هێزی جارانم ماوە یا نا!.. ئنجا فەرمانیدا کە دووپیاوی بەهێز بهێنن، هەردووکیان شانپانو سنگدەر پەرپوو بازوو زلبوون،یەکێکیان ڕێکی خۆم کەلٚەگەتبوو، ئەویتر یان کورتتر بوو. ئاماژەم بۆ یەکەمیان کرد کە لێم نزیکبێتەوە، بەشێوە زاری طالش کە بەشێکە لە زمانی

فارسی، پێم وت: تۆ وابزانە لەگەڵ پیاوێکی لە خۆت کەمترا پەنجە دەپێکی، تا زۆرو هێزت تێدایە هەوڵبدە کە بمبەزێنی! هەردوو قاچم راستو چەپکردنو هەر پێنج پەنجەم درێژ کردنو لەگەڵ پەنجەکانی پیاوەکەدا یەکانگیر بوون. پیاوەکە زۆریدایەو بەرخۆیو نەبەردیی زۆری کرد، بەلام دەرەقەتم نەهات، پاشان وردە وردە زۆرم بۆ هێناو تا سەر ئەژنۆی دەستیم لارکردەوە، هاواری خۆشی لە کۆڕا بەرز بووەوە. پاشان پیاوەکە وتی: ئەی ئەمیر، تۆ زۆر بەهێزی!... منیش چەند لیرەیەکم پێبەخشیو زۆر پێی خۆشبوو. ئەویتریان وتی: هاوەڵەکەم لەمن زۆر بەدەستو بەهێزترە، گومانی تیا نییە منیش دەبەزێنی، لەبەر ئەوە لەگەڵتا پەنجە ناپێکم!... ئەویشم خەڵاتکرد. شتێکی تر کە سەرنجمی راکێشا جۆرە درەختێکبوو چەند گەڵایەکی درێژو پانی هەبوون! هەندێکیان چەند هێشوویەکی گەورە گەورەیان پێدا شۆڕ بووبوونەوە هەر هێشوویەك دوو سەد تا سێ سەد میوەی سەوزی وەك خەیاری باریکی پێوە بوون، وتیان: ئەوانە دار مۆزن، درەختی مۆز تەمەنی هەر یەك ساڵەو ئەو ساڵەش بەر دەدات، ئیتر وشکدەبێت، بۆ بەردەوامیی داری مۆز، بە ئەندازەی لەپی دەست توێکڵی لاسکی دارەمۆزەکە دەبڕنو لە زەویدا دەینێژن...

# حەڤدەیەمین بەش

## چۆن بەغدادم داگیر کرد؟!

له ولاتی (طالش)دا زۆر نەمامەوە، ویستم بەرەو (بەغداد) بەرێبموئەو شارە داگیر بکەم کە (هۆلاکۆ) داگیریکردبوو، بە (داعی)م وت: هەر کاتێ ویستت داوای یارمەتیم لێبکەو زوو فریاتدەکەوم، ئەگەر خۆیشم پێم نەکرا بێم یەکێ لە فەرماندەکانم لەگەڵ هەندێك سەربازدا دەنێرم. هەر چەندە طالش راستەوخۆ لەسەر رێی (ماوەرائەننەهر)نەبوو، لەگەڵ ئەوەشدا لەوێ دوو قولەم بۆ هێلانەی کۆتری نامەبەر دروستکردن بۆ ئەوەی بەهۆی ئەو کۆترانەوە پەیوەندیم بە (داعی)یەوە هەبێ.

بەدرێژایی لێواری دەریای خەزەر رێگەی رۆژهەلاتی باشوورم گرتەبەر، بە ناوچەی (شیفت)دا تێپەریم بۆ (قەزوێن) لەوێشەوە بۆ (کرماشان) تا کەناری رووباری (دیجلە) بەردەوامبووم بێ ئەوەی رووداوێکی ئەوتۆ بێتەکایەوە. بە چەندان شاردا گوزەرمانکرد، هەموو میرو فەرمانڕەواو دانیشتوانیان پێشوازییان لێدەکردین‌و خۆڵکیاندەکرین، بەلام لەبەر ئەوەی ئەوەندە دەستیان نەدەرۆیشت ئەرکم نەدەخستە سەریان، هەر چیمان بویستایە بە پارە دەمانکڕی. تەنها داواکاریم لێیان هەر ئەوە بوو کە لە ولاتەکانیانا قولەی لانەی نامەبەر دروستکەن‌و سەرپەرشتیکەریان بۆ دابنێم.

پێش ئەوەی بگەمە رووباری (دیجلە)، سێ رۆژ لەوەو بەر دوو دەستە پێشڕەوم ناردبوونە پێشتر، یەکەمیان ئاگاداریکردم کە سوپایەکیان دیوە، بۆم دەرکەوت (بەغداد) لە هاتنم ئاگادارە بۆیە لەشکر هاتووە بۆ پێشگرتنم. نەمتوانی بزانم ژمارەی سوپای دوژمن چەندە، لەبەر ئەوە بە جیا جیا میوانداریی دوو کەسی خەڵکی ناوچەکەم کرد کە هەر دووکیان عەرەببوون، هەر یەکەیان پێنج سەد دینارم دایە تاکو برۆن دەربارەی ژمارەو چەشنی چەك‌و پۆشاك‌و فەرماندەی سوپای دوژمن هەموو زانیارییەکم بۆ بێنن. پەیمانیشم دانێ دوای تەواو کردنی کارەکەیان هەر یەکە پێنج سەد دیناری تریان بدەمێ. بێ ئەوەی بە یەکتر بزانن‌و لە ئیشی پێسپێرراوی یەکتر ئاگادار بن هەر دووکیانم بەرێکردن. لەهەمان کاتیشا دووەمین دەستەی پێشڕەوانم راسپاردن کە هەر چۆنێکبووە. خۆیان بگەیەننە سوپای دوژمن‌و چەند ئەفسەرێکیان لێ

بەدیلبگرن بۆ ئەوەی زانیارییان لێوەرگرین، بە تایبەتی دەربارەی چۆنییەتی زەویی ناوچەکەو ژمارەی رووبارەکانو ئاستی ئاویانو بوارەکانیان. ئەوە بوو نۆ ساڵ دواتر لە شاری (دیمەشق)دا بە (ئیبن خەلدوون)م وت کە خەڵکی وڵاتی رۆژئاوا بوو، دەربارەی سروشتو زەویی وڵاتەکانی باکووری ئەفەریقا کتێبێك بنوسێت، تیایدا بە فراوانی باسی هەموو شاخو گردو رووبارو دارستانو شارو شارۆچکەو دێهاتەکان بکات، کتێبەکە بە جۆرێکبێت کە بیخوێنمەوە وا هەستبکەم خۆم لەو وڵاتانەی رۆژئاوادام.

سەربازانی دووەمین دەستەی پێشڕەوان دووجار خۆیان گەیاندە سوپای دوژمن، بێ ئەوەی هیچ بە هیچ بکەن، ئەوانەی دەسپێشخەرییانکردبوو کوژران. بۆم دەرکەوت کە فەرماندەی سوپاو سەربازانی دوژمن لە هەموو روویەکەوە زۆر بە توانان. دوای چوار رۆژ (ئەبو سەعادە)، کە یەکێکبوو لەو دوو سیخوڕانەی ناردمن بۆ زانیاری، گەڕایەوە، وتی: سوپای بەغداد دوو سەد گالیسکەو دوو سەد مەنجەلیقی هەن، ژمارەی سەربازانی سەدو بیست هەزارە، پازدە هەزاریان سوارەن، فەرماندەی سوپاکەش میری بەغدایە، چەکیشیان بریتییە لە شمشێرو تیرکەوانو فووتەك. پرسیم فووتەك چییە؟! وتی: لوولەیەکی درێژو بۆشە تیرێکی ژەهراوی لە زارەکەی دەبەسترێت، کە بەهێز فووی پێدا بکرێت تیرەکە زۆر بەگوڕ دەردەچێتو دوژمن دەپێکێ، دوای چەند رۆژێك سستو ئیفلیجیدەکات. بۆ یەکەمین جار بوو کە ناوی (فووتەك) ببیستمو روو بە رووی دوژمنێك ببمەوە کە گالیسکەی جەنگ بەکاربێنێ. لە (ئەبو سەعادە)م پرسی: ژەهری ئەو تیرە ژەهراوییە چییە؟ وتی: لە گۆماوەکانی هەر دوو بەری دیجلەدا هێلکەشەیتانۆکەی زۆر کۆ دەکرێنەوەو دەکوترێن، لینجاوەکەیان جیا دەکرێتەوە دەخرێتە بەر هەتاو تا کەمێك خەستدەبێتەوە پاش سورکردنەوەی، ئینجا نووکی تیرەکە لەو لینجاوە خەستەدا ڕادەدرێتو ژەهراویدەبێت. پاشان سیخوڕەکەی تریش کە ناوی (وەجیهوددین) بوو گەڕایەوەو هەمان زانیاریی بۆهێنام، بەم جۆرە لە هەموو زانیارییەکان دڵنیابووم. دیسانەوە پێشڕەوانی خۆم بە تەواوی هەمان زانیارییان بۆ هێنام.

بۆئەوەی هێزی سوپای بەغداد تاقیبکەمەوە، بڕیارمدا سەربازەکانم واخۆیان پیشانبدەن کە هێرشدەکەنە سەر دوژمن، بۆ ئەو مەبەستەش سێ بەشم جیا کردنەوە، هەریەکەیان پێنج هەزار سوار بوون، قۆڵی راستو چەپو ناوەڕاست، چوونە پێشەوە. لەناو جەرگەی گۆڕەپانی سوپای دوژمنەوە درانە بەر

مەنجەنیق، ئەوەندە بەرد بەسەر سوارەکانما باری کە ناچار بوون بوەستن. لە پشت هەر مەنجەنیقێکەوە تەپۆڵکەیەك بەردی گەورەو گران هەڵدرابووەوە، سەربازانی دوژمن خێرا خێرا مەنجەنیقیان پڕ لە بەرد دەکردو بەسەر سوارەکانما دەبارین، هەر بەردەی سوارێکی دەکوشت، ئەگەر نەشیکوشتایە لە پەلو پۆی دەخست. لە قۆڵی راستەوە گالیسکەکان هێرشیانکردە سەرمان، بە راستی چەکێکی ترسناکبوون، هەر گالیسکەیەك چوار ئەسپی زەبەلاحی لێبەسترا بوون، لە پێش ئەسپەکانەوە دوو تیرەکی زۆر قاییم چەسپکرا بوونو رمی زۆر تیژو بە برشتیان لێقاییمکرا بوون، لە نێوان ئەسپەکانو رمەکاندا دیوارێکی دارین هەبوو نەیدەهێشت تیرو رم بگاتە ئەسپەکانو بکوژرێن. کاتێك گالیسکەکان بە گوڕ هێرشیاندەهێنا رمە چەسپکراوەکان ئەسپەکانو سەربازەکانی ئێمەیان کونـاو دەردەکـردنو دەیانکوشتن. بە راستی گالیسکەکانی لەشکری بەغداد زۆر ترسناکبوون، لەگەڵ ئەوەشا ناتەواوییەکیان هەبوو، ئەویش ئەوە بوو کە زوو زوو دەوەستان، چونکە هەر کاتێ رمەکان دەچەقینە سەربازو ئەسپەکان لاشەوکەلاك بە رمەکانەوە دەمانەوەو دەبوونە بەر بەستێك لە رێی گالیسکەکانداو نەیاندەتوانی پتر بەرەو پێشی بڕۆن، جا ئاژووەرانی گالیسکەکان ناچار دەبوون پشتاو پشت گالیسکەکان بەرەو دواوە بەرن بۆ ئەوەی لاشەی کوژراوانو کەلاکی ئەسپەکان لە رمەکان دەربێننەوە، ئەوسا جارێکی تر هێرشبکەنەوە. کاتێ گالیسکەکان دەوەستان ئێمە دەمانتوانی لەم لاو لەو لاوە هێرشبەرینە سەر ئەسپەکانو لەناویانبەرین، دەبوو لەو پێناوەشا ژمارەیەکی زۆر لە سەربازەکانمان بکەینە قوربانی، لەبەر ئەوەی لە سەرەنجامی ئەو جەنگەش دڵنیا نەبووم، نەمدەویست ئەو قوربانییە بدەم.

کاتێ سوارەکانم لە قۆڵی چەپەوە هێرشی نەبەردیان کردە سەر سوپای دوژمن، ئەوەندە تیر بارانکراین کە هەندێك سوارو ئەسپمان لەناو چوون! بۆم دەرکەوت دوژمن زۆر بەهێزەو چاك خۆی ئامادە کردووە، ئەگەر رووبەروو، یەکەو راست هێرشمبکردایە، لەوانە بوو لەشکرەکەم بفەوتایە، بۆیە دوا بڕیارم ئەوە بوو کە دەوراندەوری سوپای دوژمن بگرم، بۆ ئەوەش بە پێویستم زانی رێی باکوور بگرمە بەر تاکو دوژمن واتێبگات لە هێرشکردندا بۆ سەر بەغداد پاشگەز بوومەتەوەو گەڕاومەتەوە. لە کەناری رووباری دیجلە دوور کەوتمەوە بۆ ئەوەی دوژمن چاوی لێمان نەبێت پاشان رێی دوورو درێژی باکوورم

گرتەبەر پێنج شەو پێنج ڕۆژ لەسەر یەك ڕێمان بڕی تا گەیشتینە شوورەی (بابل)، ئەو شوورەیە سەرێکی لەسەر دیجلەیەو سەرێکیشی لەسەر فوراتە، پادشای ناوداری بابل (بەختەننەسر) دروستیکردووە بۆ ئەوەی خێڵەکانی باکووری میزۆپۆتامیا نەتوانن پەلاماری ولاتەکەی بدەن. کاتێ گەیشتمە شوورەی بابل وێرانبوو، لە هەندێ شوێندا شوێنەواری مابوو. لەو ناوچەیەدا گیرساینەوەو کەمێك پشووماندا، پاشان فەرمانمدا لەسەر رووباری دیجلە بە بەلەم پرد دروستبکرێت. سەربازەکانم هەموو بەلەمەکانی ناوچەکەیان کۆکردنەوەو بە تەختەی باشو قایمو ئەستوور پێکەوە بەستران، سوارەکان بەڕێز رەشۆی ئەسپەکانیان گرتبوونو پەڕینەوە. دوای پەڕینەوەی دوا سوار، فەرمانمدەرکرد کە پردەکە تێکبدرێت تاکو لەو شوێنەدا شوێنەواری پەڕینەوەمان نەمێنێ. پاشان بە پەلە ڕێی باشوورمان گرتە بەر، ئەوەندە خێرا دەڕۆیشتین کەس نەیدەتوانی پێشمانبکەوێتو فەرماندەی سوپای بەغداد ئاگاداركات، چونکە دەمویست لە ناکاو بدەم بەسەر میری ئەو ولاتەدا. پێنج فرسەنگمان مابوو بگەینە بەغداد وەستام تاکو سەربازەکانو ئەسپەکان بڕێك ماندوویەتیان دەرچێت. کە سەربازەکان خەوتبوون، دەستەی پێشڕەوان هەواڵیان بۆ هێنام لەکەناری رۆژهەلاتی دیجلەوە لەشکرێك دەپەڕێتەوە بۆ کەناری رۆژئاوا. هەر خێرا هەموو سەربازەکان لەخەو هەڵسێندران بۆ ئەوەی بەر لە پەڕینەوەی هەموو سوپای بەغداد بە خۆیو هەموو جبەو جبەخانەی گەورەیەوە رێی لێبگرینو پەلاماریبدەین، ئەگەر درەنگیبکردایە نەماندەتوانی بچینە ناو بەغداوە. دەستوورمدا بە ئەفسەرەکانم جەنگاوەرانی دوژمن لەناو بەرن، شاری بەغداد بگرن، دەست بە تالانکردن نەکەن تا فەرمانیاندەدەمێ، دەبێ چوار جۆر دووکان لە چەپاو کردن بپارێزرێن، یەکەم زەڕنگەر، دووەم شیرگەر، سێیەم دووکانی ئاوریشمەرستنو چنینو ئاوریشمفرۆش، چوارەم سەڕاجی.

من بیستبووم کە چاکترین جەواهر سازانی ولاتی ئێران لە بەغدادان، کالای ئاوریشمینی بەغداد جوانو نایابەو سەڕاجەکانی ئەو شارە بێ هاوتان، لەسەر رێبازو رەوشی خۆم کە رێزم لە پیشەسازان دەگرت، بڕیارمدا ئەوانە تالان نەکرێنو بپارێزرێن.

ئەوەندە هەڵمەتی سوارەکانم گورجو بەهێزو نەبەرد بوو بە سەعاتێ کەمتر ئەو هەموو هێزەی دوژمنیان لەناو برد کە پەڕیبووەوە ئەم بەری کەناری دیجلە،

بەم جۆرە ڕێگەی بەغدادمان بۆ کرایەوە. بەشێك لە هێزەکانم لە کەناری رووبارە کەدا هێشتەوەو بەهێزەکانی ترەوە ڕێی شارم گرتە بەر. ئەو ڕۆژەی پێم خستە ناو شاری بەغداد (٦٤١) ساڵی تەواو بوو خەلیفە مەنصووری عەبباسی دروستیکردبوو. شارەکە بێ شوورەو بێ دیوار بوو، (هۆلاکۆ) لە ساڵی (٦٥٦)دا شوورەکانی رووخاندنو دوا خەلیفەی عەبباسیشی کوشت.

بەغداد بە شاری کۆشکو تەلاران ناسرا بوو، چوومە سەر بەرزاییەك تا چاو بڕیدەکرد لە هەر دووبەری دیجلە کۆشکی لە ژمارە بەدەر دیار بوون کەلەسەر دەمی خەلیفایەتیی عەبباسییەکاندا دروستکرا بوون. ئەو شارە بۆ ماوەی (٥١١) ساڵ پایتەختی هەموو وڵاتی ئیسلامبووە، ماوەیەکیش پایتەخت گوێزراوەتەوە بۆ (سامەڕا). ڕیزی کۆشك ئەوەندە درێژ بوو بووەوە تا گەیشتبووە کەلاوەکانی شاری (مەدائن) کە حەوت فرسەنگ لە بەغداوە دوور بوو، لە دروستکردنی ئەو کۆشکانەدا گەلێك کەرەستەی وێرانەی (مەدائن) بەکار هێنرا بوون. کۆشکەکان هەر یەکەیان ڕەنگێکی جیاوازی هەبوو، لەکاتی خۆرهەڵاتنو خۆرئاوا بووندا وەکو جەواهری ڕەنگاوڕەنگیان دەنواند. مەڕمەڕی سپی، یان خشتی ڕەنگاو ڕەنگ لە دروستکردنی کۆشکی دەسەڵاتدارەکاندا بەکار هێنرا بوون کەلە عیراقی عەجەمو فارسو کرمانو یەزدەوە هێنرا بوون.

کە گەیشتمە ناو شاری بەغداد، داوام لە سەربازەکانم کرد پشوو بدەنو بحەوێنەوە تا بتوانن پێشی ئەو لەشکرە بگرن کەلە کەناری ڕۆژهەڵاتی دیجلەدا بوو. فەرماندەی ئەو هێزەم کەلە کەناری دیجلەدا دامنابوو، ناوی (قەرەگۆز) بوو، پیاوێکی کورتە بالای تێکسمڕاوی چوار شانە بوو، لە سەرەتادا سەربازێکی ئاساییبوو، لەبەر ئەوەی زۆر بە جەرگو لێهاتوو بوو بەرە بەرە پلەیم بەرزکردەوە، ئەوەندە ئەمەکدار بوو، هەمیشە ئامادە بوو لە پێناوما گیانی خۆی بەختبکات. ئەو فەرماندەیەم هەواڵی بۆ ناردم کەلە نێوان هێزی ئەوو سوارانی دوژمندا شەڕێکی سەخت بەرپا بووەو داوای یارمەتییکردبوو. بۆم دەرکەوت کە میری بەغداد بە هەمان شێوەی ئێمە پردی دروستکردووە، سوارەکانی پەڕیونەتەوە، لەوانە بوو پیادەکانیشی سەرگەرمی پەڕینەوە بن بۆ ئەوەی پەلامارمانبدەن.

دوای ئەوەی چوومە ناو بەغداوە گەلێك لە کەسوکارو خزمانی میری بەغدادو ئەفسەرەکانیم بە دیلگرتنو خستمنە زیندانەوە وەکو بارمتەگلمدانەوە. پێش ئەوەی بۆ یارمەتیدانی (قەرەگۆز) بکەومەرێ، پەیامم بۆ نارد کە هەواڵ

بگەیەنێتە ئەمیری بەغداد، ئەگەر هێرش نەوەستێنێ کەسوکاری ئەمیرو ئەفسەرەکانی دەکوژم. دوو کوڕو سێ کچی میری بەغدادو چەندان کوڕو کچی ئەفسەرەکان لەناو بارمتەکاندا بوون، ئەگەر میر درێژەی بەهێرشەکەی بدایە، بەبەرچاوی خۆی‌و ئەفسەرەکانیەوە هەموویانم دەکوشتن. بە گەیشتنی هەواڵی ناوبراو میر سستبوو، ئەفسەرەکانیشی سارد بوونەوە، میری بەغداد نوێنەرێکی نارده لای قەرەگۆز بۆ گفتوگۆو رێککەوتن، من ئەو کارەم بە قەرەگۆز سپاردو بۆ خۆم ئاگام لە شار بوو نەبادا لە ناکاو لە لایەکی ترەوە هێرشبکەنە سەر شار. لە هەمان کاتدا ئەمزانی ناکرێ دوژمن بە شێوەیەك رسواو نائومێد بکرێت لە تاو نائومێدییەکەی دەسبەرداری ماڵو منداڵو هەموو شتێکی بێت‌و دەست بکاتە هێرشبردن. قەرەگۆزم راسپارد بە ئەمیری بەغداد بڵێت بۆ ئەوەی ئاشتی سەر بگرێت دەبێ مۆڵەت بە سەربازەکانی بدات، بڵاوەیان پێبکات، دوای ئەوەی دڵنیا بووم کە سوپای نییە، هەموو بارمتەکان ئازاد دەکەم‌و دەیاننێرمەوە بۆ لای میرو ئەفسەرەکانی، سەبارەت بە مەرجەکانی تریش کە پەیوەندییان بە لایەنی داراییەوە هەیە دواتر گفتوگۆ دەکەین.

میری بەغداد ئامادەیی خۆی پیشاندا بەو مەرجەی دڵنیا بێت سەرو ماڵی دانیشتووانی شار پارێزراون. منیش وەڵامم بۆ نارد: ئەگەر تۆو دانیشتووانی بەغداد ئامادەبن سەرانەم بدەنێ نەك تەنها سەرو ماڵی دانیشتووان پارێزراون، بەڵکو من لەم شارە دەڕۆم، تۆش وەکو جاران هەر میری بەغداد بە. میری بەغداد پرسی: بڕی ئەو باج‌و سەرانەیە چەندە کە داوایدەکەی؟! وتم: نیوەی زێڕو زیو، نیوەکەی تری بۆ خۆتان. میر پرسی: چۆن باوەڕت پێبکەم کە پەیمانەکانت دەبەیتەسەر، وە ئەگەر بڵاوەم بە سوپاکەم کرد چیم لە دەستدێ؟! وتم: بە قورئانی پیرۆز سوێندت بۆ دەخۆم، قورئانیش بەرێزترین شتە کە سوێندی پێبخۆم، ئەگەر بڵاوەت بە سوپاکەت کرد، من بارمتەکان بەردەدەم، ئەگەر نیوەی زێڕو زیوی خۆتان دابەمن لە تاڵانکردنی ئەم شارە چاو پۆشیدەکەم‌و لەگەڵ لەشکری خۆمدا دەڕۆم‌و فەرمانڕەوایی بەغداد بە خۆت دەسپێرم.

من ئەمیری بەغدادم بە پیاوێکی شیاوو بە توانا دەزانی، بۆ کەڵکو سوودی خۆم وام بە باش زانی لەسەر فەرمانڕەوایی بمێنێتەوە. بڕیارمدا دوای باجوەرگرتن، لە بەغدا دەرچم‌و رێگەی فارس بگرمە بەرو سزای سوڵتانی فارس بدەم کە ناپەجێیی بەمن وتبوو. میری بەغداد لەشکری خۆی مۆڵەتداو بڵاوەی پێکرد، بەشێکی لەشکرەکەشی کە لە خێڵو هۆزەکانی باکووری میزۆپۆتامیا

بوون، گەڕانەوە بۆ وڵاتی خۆیان. دوای ئەوەی لەو هەنگاوە دڵنیا بووم، بارمتەکانم ئازاد کردنو چوونەوە لای کەسو کاری خۆیان. دوای ئەوە سەرەی باجو سەرانە هاتە پێشی. جەواهر فرۆش، شیرگەر، ئاوریشمچنو سەڕاجەکانم لەسەرانە بەخشین. بۆ یەکەم جاریش کە ئەمیری بەغدادم بینی، پێم وت: کە دەبێ خۆی لە پێش هەمووندا نیوەی زێڕو زیوی خەزێنەی خۆی بدات، نیوەی زێڕو زیوی دانیشتووانیشم بۆ کۆبکاتەوەو بمداتێ. خەزێنەی میر لە تۆماردا نووسرا بوو، نەیدەتوانی هیچی لێبشارێتەوەو بە تەواوەتی نیوەی خەزێنەکەی خستە بەر دەمم. بۆ کۆکردنەوەی زێڕو زیوی دانیشتووانیش میر پێشنیاریکرد کە پێوە رێك دابنێو خۆی ئەو کارە بکات. منیش ئەو پێشنیارەم پەسەند کرد، چونکە بە راستی بۆمن نەدەکرا بزانم هەر یەکە لە دانیشتووانی بەغدا چەند زێڕو زیوی هەیە، بە زەبرو زەنگیش نەدەگەیشتمە ئەنجامی بەجێ، ماوەیەکی زۆری پێدەچوو تا لەو شارە گەورەیە ئەو هەموو زێڕو زیوە کۆبکەمەوە، من دەمویست هەر ئەو ساڵە بگەمە وڵاتی فارسو بە سوڵتان بسەلمێنم کە ناتوانێ جنێو بە من بدات!

رۆژێکیان میری بەغداد هەواڵی بۆ ناردم کە بە تەواوەتی هەموو باجو سەرانە وەرگیراوەو کەس نەماوە نەیدات. میر پێنج سەدو پەنجا هەزار مسقاڵ زێڕو دوو ملیۆنو دووسەد هەزار مسقاڵ زیوی لەبەر دەمما دانا، هەندێکی دراوی وردە بوو، برێکیشی کەلوپەلی جوانیبوو، وەکو قاپی چێشتخواردنو کەوچك، لەبەر ئەوەی حەرامە، فەرمانمدا هەموویان بتوێنرێننەوەو بکرێن بە دراو. دوای کۆکردنەوەی باجو سەرانە میر میوانداریکردم، دوای نانخواردن هەندێ کەنیزەکی عەرەبی جوان هاتنە ناوەڕاستی کۆڕەوە، لەگەڵ ئاهەنگی عوودو رەبابو چەنگدا کەوتنە سەما. لە میرم پرسی: ئایا بۆ ئاهەنگو رابواردنی خۆت ئەم ژنانە هاتوونەتە ئێرە، یان بۆمن؟! وتی: بۆ ئەوە هاتوون لەگەڵ جەنابتانا خۆش رابوێرن، هەر کامێکیانت بە دڵە هی خۆتە. وتم: من حەز لە چارەی سەماکەرو بیستنی عوودو رەبابو چەنگ ناکەم، پێیان بڵێ با بڕۆن! من تۆبەمکردووە کە لە رابواردنەوە بە دووربم، تا ئەمڕۆش ئەو تۆبەیەم نەشکاندووە، هیوادارم تا دوا هەناسەشم نەیشکێنم. میری بەغداد فەرمانیدا کەنیزەکەکان بڕۆن. دوای سەعاتێك ویستم بڕۆم، لەو کاتەدا قاپێکی زێڕیان هێنا، هەندێك جەواهری تێدا بوو، میر وتی: ئەم جەواهرە دیاریی منەو بۆ یادگار پێشکەشتانیدەکەم، لە خەزێنەی خۆما دەرمهێناوە، هیواردارم لێم

وەرگری، منیش جەواهرەکەم وەرگرتو قاپەکەم دایە دواوە. میرو کورەکانی‌و گەلێك لە خانەدانانی بەغداد بۆ ماوەی پێنج فرسەنگ لەگەڵما هاتن، میر وتی: هەرکاتێ بە میوانی بێیت بۆ بەغداد بەخێر بێیتو رێزت لە سەرسەرمان. کەلە بەغداد گەرامەوە پاییز بوو، دەمویست بە زووترین کات بگەمە ولاتی فارس، بۆ ئەو مەبەستەش دەبوایە پێشتر بگەمە کرماشان. دەبێ ئەوەش بڵێم، لەبەر ئەوەی سەربازەکانم بەغدادیان تالان نەکرد، لەو زێرو زیوەی کە وەرمگرتبوو بەشی هەموو ئەفسەرانو سەربازەکانمدا.

# هەژدەیەمین بەش

## بە دەربەندی پاتاقدا بۆ وڵاتی فارس

کە بەرەو کرماشان دەڕۆیشتم گەیشتینە ناو دەربەندێك کە بە دەربەندی (پاتاق) ناویدەرکردووە، دەستەی پێشڕەوانم ئاگاداریانکردم ژمارەیەکی زۆر لە سوارو پیادە لە دەروبەری ئەو دەربەندەدانو لەوانەیە دوژمنبن. دوای هەواڵزانینو لێکۆڵینەوەی زۆر پێشڕەوان ئاگاداریانکردمەوە کە ئەوانە هەندێك خێڵو هۆزو تیرەی ناوچەی کرماشانن، دەڵێن دەزانین ئەمیر تەیموور بە چەندەها باری زێڕو زیوەوە لە بەغدادەوە گەڕاوەتەوە، ئەگەر دەیەوێ سەری سەلامەتبێ هەمووی دانێ، جا لێرەوە بڕوات!

ئەو زێڕو زیوەی لە بەغداد دەستمکەوتبوو زۆر نەبوو، بەڵام دیار بوو زۆر دەنگیدابووەوە، ئەگەر تەنها یەك مسقاڵیشم بهێنایە نەمدەهێشت لێمبسێننو نەمدەدلێ.

ئەو دەربەندە ئەوەندە سەختە ئەگەر دەوربەری بگیرێتو سوپایەك بیەوێ پیا بڕوات مەگەر دوای زیانێکی زۆر بتوانێ تێپەڕێ، چونکە بێجگە لە تیر باران لە هەر دوو لاوە تاقمێکی کەم دەتوانن لە لاپاڵە سەختەکانەوە بەرد تلۆرکەنەوەو ژمارەیەکی زۆر بکوژن؛ لەبەر ئەوە فەرمانی گەڕانەوەم دا، بەڵام دەستەی دواوەی لەشکرەکەم ئاگاداریانکردم سەرەتای دەربەندەکە، کە لێوەی هاتبووین عەشایرەکان گرتوویانە!.

کاتێك لە مەیدانی جەنگا مرۆڤ ئابڵووقە دراو چارەی نەما، دەبێ بە بێ دواکەوتنو دەمو دەست بە پیر مەرگەوە بڕوات. پیاوی ترسنۆك هەزار جار دەمرێت، بەڵام پیاوی ئازاو قارەمان تەنیا یەك جار دەکوژرێت. خێرا خۆم بۆ مەرگ ئامادە کرد، بە پەلە بەرگی جەنگم پۆشی، بە نۆکەری تایبەتیی خۆمم وت هەر دوو شیمشێرە سووكو پانەکانی خۆم ئامادە بکات کەلە چاکترین شمشێری ئاوداری (چاچ_ تاشکەندی ئێستا) بوون. ئەو سوارانەی زرێپۆشبوونو کڵاوی ئاسنیان هەبوو کردمن بە دوو بەشەوە: بەشێکیانم دانان بۆ سەرەتای دەربەندەکە تاکو بچنە پێشەوەو ڕێگە بۆ سوارەکان بکەنەوە. بۆ خۆیشم فەرماندەیی بەشەکەی ترم گرتە ئەستۆ بۆ کردنەوەی ڕێگەی بەرەوە. مەبەستی من ئەوە بوو لە هەر سەرێکەوە بتوانین درِ بە دوژمن بدەینو ڕێگە

بکەینەوە، لەو سەرەوە لەشکرەکەم تێپەڕ بێت، بەراستی من نەمدەویست سەربازەکانم بە دەستی عەشایرانی کرماشان بەکوشتبدەم. وەسیەتیشمکرد ئەگەر هاتو کوژرام (قەرەگۆن) فەرماندەیی سوپا بگرێتە ئەستۆ، سوپاکەم لەو دەربەندەوە تێپەڕێنێ.

خۆمو سوارەکانم بەرەو دەمی دەربەندەکە، کە روو بە عیراقی عەجەمبوو، گورج و خێرا هێرشمانبرد تا بە زووترین کات لەوێوە دەرچین و بتوانین گەمارۆی دەربەندکە بدەین و جەنگاوەرانی سەربەرزاییەکان دەرپەڕێنین و رێگەی تێپەڕبوونی لەشکرەکەم بکەینەوە. کاتێ بینیم هەندێك لە سوارانی عەشایر دەمی دەربەندەکەیان لێگرتووین، زۆر پێم خۆشبوو، چونکە لەبەر ئەوان بەردمان بەسەردا تلۆر نەدەکرایەوە. رەشۆی ئەسپەکەمم کردە ملمو هەر دوو شمشێرە پان و سووکەڵەکانمم بە دەستمەوە گرتن و ئاوزەنگیم لێدا. سوارەکانم لەم لاو لەو لاوە بوون، بە خێرایی ئەسپەکانمان تاو دەدان تا گەیشتینە لای دوژمن بەراستەو چەپدا شیرم دەوەشاند. سوارانی دوژمن سازو بەرگی جەنگیان نەبوو، کەشیرە تیژەکانم دەچەقینە لەشیان دەتکوت بە ناو ئاودادەچن! چەند شمشێرو رمێکم بەرکەوتن بەڵام کاریگەر نەبوون. عەشایری کرماشان قارەمانانە دەجەنگان، بۆم دەرکەوت تا نەیانکوژین نە توانین دەرچین، لەبەر ئەوە بە پەلەو بەتوندی شمشێرم دەوەشاند، لە هەمان کاتیشدا درووودم بۆ رەوانی مامۆستای شیمشێر بازیم (سەمەرطەرخان) دەنارد. بەیناو بەین کەسەیرێکی دواوەم دەکردو فوارەی خوێنم دەبینی ئەوەندەی تر دەکەوتمە جۆش و خرۆش و هەستمدەکرد بە ئاسماندا دەفڕم، وام دەزانی پێش من هیچ پیاوێك نەبووە هێندەی من بەهێز بووبێ، پاش منیش هیچ پیاوێك هەڵناکەوێ وێنەی من شیمشێر بوەشێنێ. هەموو گیانی خۆمو ئەسپەکەم بە خوێن رەنگین بوو بوو، لەو کاتەدا زۆر شانازیم بە خۆمەوە دەکرد، ئەگەر سەد رۆستەمی پاڵەوانی زابولستان بەرانبەرم بوەستانایە هەر هەموویانم دەکوشتن. ئەوەندە خۆمم بە تواناو بەهێز هاتە بەر چاو پێم وابوو دەتوانم بەناو سەد هەزار سواری دوژمندا دەرچم، لە خۆشی و سەرمەستیدا هاوارمکرد: ئەی خۆری پرشنگدار گەواهیم بۆ بدە لە دنیادا لەمن قارەمانتر نییە! دەمویست ئەو شەڕە درێژە بکێشێ بۆ ئەوەی منیش درێژە بە هونەری جەنگ بدەمو پتر چێژ لە فوارەی خوێن و نەعرەتەی جەنگاوەران و هاوارو ناڵەی زامدارانی شمشێرەکانم وەرگرم.

لە پڕ سەرنجمدا هیچ کەس لەبەر دەمما دیار نییە، هەموو ئەوانەی دژمان دەجەنگان یان کوژران، یان هەلاتن و ڕێگەی دەربەندی پاتاق کرایەوە.

دوای ئەوەی بە زۆری شمشێر ڕێگەمان کردەوە هەواڵم نارد بۆ جەنگاوەرەکانی ئەو سەری دەربەندەکە دەست لە شەڕ بکێشنەوەو بگەنە لامان تاکو لەو دەربەندە دەرچین و بڕۆین، ئەوانیش زوو گەیشتنەوە لامان.

من سەرم لەو مەینۆشانە سڕ دەمێنێ بە خواردنەوەی جامی مەی خۆیان مەستدەکەن! بۆچی دەست نادەنە شمشێرو بێنە مەیدانی شەڕو نەبەردەوەو خوێن برێژن تا تێبگەن کەسەرخۆشیی شەڕ سەد جار لەسەر خۆشیی مەی خۆشترو بەچێژترە! مەی دوای چەند ساتێك مرۆڤ خومارو بێ تواناو سستدەکات، بەلام سەر مەستی گۆڕەپانی نەبەردو خوێنڕشتن هەرگیز بێ وزەو تەمەڵ نابێت، بەڵکو زۆر بە تواناتر دەبێ!..

کەلە دەربەندەکە تێپەڕمانکرد بە داخەوە هەردوو شیرەکانم خستنەوە ناو کێلان. فەرمانم بە هەندێك لە سوارەکانمدا کە پیادە بین و سەرکەونە سەرکێوەکان بۆ دەرپەڕاندنی ئەو برە جەنگاوەرانەی مابوون، بەلام بەر لەوەی بگەنە لایان، بەو دیو کێوەکانا چوونە خوارێ و لە چاو ونبوون، ئیتر بە ئێجگاری دەربەندکە کرایەوەو لەشکر بەڕێبوو. لەو شەڕەدا سەدو شازدە کوژراوو هەندێ بریندارمان هەبوون، ئەوەش زیانێکی کەمبوو.

لە نەبەردو جەنگی دەربەندی (پاتاق) ئەزموونی بە کەڵکم وەرگرت. لە شەرەکانی (ڕۆم)_ تورکیای ئێستا_ و (کابولستان)_ ئەفغانستان_و هندستان و وڵاتی شامدا، گەر بمویستایە لە گەلییەکەوە بڕۆم، یەکەم جار ئەم سەرو ئەو سەری گەلییەکەم داگیر دەکرد، جا لەشکرییایا دەڕۆیشت.

دوای دەربەندی پاتاق بەرەو(قەزوێن) کەوتینە ڕێ و بێ هیچ ڕووداوێك گەیشتینەجێ. هەرکە گەیشتینە ئەوێ هەمان نەخۆشییەکەی (سەبزەوان)م تووشهات و جارێکی کەش لە پێی خستم. پزیشکەکان وتیان کە گەرما کاری تێکردووم و بە ئاوی لیمۆ چاکدەبمەوە. ئەوە بوو لە سەبزەوار ئاوی لیمۆ دەست نەدەکەوت، بەلام لە قەزوێندا زۆر بوو، لە وڵاتی مازندەرانەوە دەیانهێنا، پزیشکەکان ئاوی هەناریشیان دەدامێ، دەیانگوت ئەمیش وەکو ئاوی لیمۆ پلەی گەرمای لەش دادەبەزێنێ.

دوای شەش حەفتە چاکبوومەوە. هەوا ساردیکرد، دوای ڕاوێژ کردن بۆم دەرکەوت کە وڵاتی فارس گەرمیانە، بۆیە بڕیارمدا لەگەڵ سەرمای زستاندا

بەرەو ئەو وڵاتــە بکەوەمــە ڕێ. لــە ڕێـدا تووشــی دژوارییــەکی ئــەوتۆ نــەهاتین، ڕووداوێکـی وەك ڕووداوی (پاتاق) نەهاتـە ڕێمـان، تـا گەیشـتینە بـەرەوە هیـچ کۆسپێکمان نەهاتە پێش.

(شــا مــەنصوور موظەففــەر) لــە چوونــی مــن ئاگــادار بووبــوو، هــەزاران جەنگاوەری لە هۆزی (بویری) نارد بوونە پێشەوە بۆ بەرگری‌و ڕێگرتن لە ئێمە. دەربـارەی ئـەو هـۆزە پرسـیارم لـە دانیشـتووانی ناوچەکـە کـرد، وتیـان: ئـەو خێڵانەلە نەوەی (جەمیشد)ن. من پێشتر ناوی جەمشیدم بیستبوو، باسی ئەوم لـە شانامەدا خوێند بووەوە، دەمزانـی شارەکانی ئـێرانی دروسـتکردوون، بـۆ یەکەم جار یاسای بۆ ئێرانییەکان نووسیوە. هێشتا شوێنەواری کۆشکەکەی مـابوو، دوای بینیـنی ئـەو کۆشـکە، فـەرمانمدا کەلەســەر بــەردێکی نــاوم هەڵکەندرێ بۆ ئەوەی نەوەکانی داهـاتوو بزانن من ئەو وڵاتـەم داگیر کردووە. دانیشـتووانی ناوچەکـە درێژەیـان بــە قسـەکانیاندا، وتیـان ئـەو خێڵانـە لـە گۆڕەپـانی جەنگا هەرگیز پاشەکشـێ ناکـەن، ئەگـەر سوپای دوژمـن هێنـدەی مێروولەی بیابانبێ بەرگری هەر دەکەن، مەگەر دوا جەنگاوەریان بکوژرێت جا سوپای دوژمن تێپەڕبکا . هەروەها ئاگاداریـانکردم کە سوڵتانی فارس هـۆزی زۆر لە ژێر فەرماندەییدان‌و بە هەموو جۆرێ گوێڕایەڵی ئەون، هەموویان ئازان‌و دەتوانن ڕێ لـە دوژمـن بگـرن، وڵاتـی فـارس وڵاتـی هـۆزو خێڵـی زۆرو زەبـەندە، ساڵی دووجار جێگۆڕکێ دەکـەن، بەهاران بە مـەڕو ماڵاتـەوە دەچنـە کوێسـتان، زستانیش دەچنە ناوچە گەرمە سێرەکان. هـەر کـاتێ (سـوڵتان مـەنصوور) ئەو هۆزو خێڵانە بۆ جـەنگ داوا بکـات دوو ملیـۆن جـەنگاوەر پێشـمان لێدەگـرن؟ هەروەها وتیان: وادانێ تۆ هۆزەکانی فارست تێکشکاند، ئەی دژبە (سێ قەڵا) چیت پێدەکرێ؟! دوای لێکۆڵینـەوە بـۆم دەرکـەوت کە لـە کێوەکـانی بـاکووری ڕۆژئـاوای (ئەسـتەخر)دا سـێ قـەڵا هـەن، جەمشـید دروسـتیکردوون، ئەمانـە ناوەکانیـانن (ئەستەخریار، شکسـتە، شـەنکوان)، یەکـەمیان لەسـەر کێوێـك دروستکراوە کە پانتاییەکی بەرینی تێدایە، جێی سەد هەزار جەنگاوەری تیا دەبێتـەوە، لـە وەرزی زستان‌و بەهاردا ئەوەندە بەفرو بارانی زۆرن کـە چـەندان چـۆم دروسـتدەکەن‌و دەرژێنـە ئـەنباراوە گـەورەکانی قـەڵاوە. ئـەو ئەنبارانـە ئەوەندە گەورەن بەشی ساڵێکی دەهەزار جەنگاوەر دەکەن، خۆ ئەگەر دەست بە ئاوەوە بگرن بەشی دووساڵیشیان دەکات. دوو قەڵاکەی تریش بە هەمان شێوە ئەنباراوەکانیان پڕ دەبن، بەڵام هێندەی یەکەم قەڵا گەورە نین. هەرسێ قەڵاکان

هەمیشە پڕن لە خۆراکو ئاو، بۆ ئاگاداریو پاراستنیشیان جەنگاوەری تایبەتیان بۆ تەرخانکراون. هەروەها ئاگادار بووم کە تەنیا یەك توولە ڕێ هەیە بچێتەوە سەر قەڵاکان، ئەگەر چەند کەسێك بۆسە بێننەوە دەتوانن ڕێ لە سەد هەزار جەنگاوەر بگرن، ئەو قەڵایانە ئەوەندە سەختن تەنانەت لەشکری (ئەفراسیاب) نەیتوانیوە داگیریانبکات. فارسەکان وتیان: ئەگەر (شا مەنصوور) لە دەشتیشا بشکێ دەچێتە یەکەمین قەڵاوە، چەندین ساڵ لەم وڵاتەدا بمێنیتەوە دەستت نایگاتێ، لەبەر ئەوە واچاکترە لە کوێوە هاتووی بگەڕێیتەوە بۆ ئەوێ!

لەو کاتەدا کەلە شارۆچکەی (کەڕاد)دا بوومو خەریکی ئەو لێکۆڵینەوانە بووم، نامەیەکی (شامەنصوور)م بۆ هێنرا. لەو نامەیەدا جارێکی تر خراپ دایشۆریبووم! هەروەها نووسیبووی: فارس جێگەی شێرانە، ڕێوییەکی وەك تۆ ناتوانێ ئەم وڵاتە بگرێ. ئەگەر ئەتەوێ بزانی ئەوانەی پێش تۆ ویستوویانە فارس داگیر بکەن چییان بەسەرهاتووە؛ سەیرێکی ئەم لاو ئەو لای ڕێگەی فارس بکە تاببینی چۆن بە ئێسکی کوژراوان سەرانسەر سپیدەکاتەوە!..

بەدەستی چەپم نامەیەکم بۆ نووسی، سەرەتاکەی ئەم هۆنراوەیە بوو:

بزرگش نخوانند اهل خرد        که نام بزرگان به زشتی برد[1]

پاشان نووسیم:یەکەم جار کە نامەم بۆت نووسی، داوای کەمێك ئاوی لیمۆم کرد، ئەگەر داوام لە هەر کاروانییەك بکردایە بۆی دەناردم، کەچی تۆ نابەجێییت بە من وت! ئێستاش هاتوومەتە وڵاتی تۆ، لە جیاتی ئەوەی بە پیرمەوە بێیتو دیاریی نایابم پێشکەشبکەیت کەچی دووبارە نابەجێیتکردو پێم دەڵێی (ئوزبەگی گلاوو شووم!)، من وانیم، من نەوەی (جەنگیز)م، تا ئەمڕۆ هەرچیمکردووە شایستەی پیاوێکە لە نەوەی (جەنگیز)، هیواردارم لەمەو دواش بتوانم کارێکبکەم پێشیاوی نەوەی (جەنگیز) بێت.

دوای ناردنی نامەکە بەرەو شارۆچکەی (خوبدان) کەوتمە ڕێ، تا ئەوێ هیچ ئاسەوارێ لە سوپای فارس نەبینرا. دوای دوو ڕۆژ هەواڵیاندامێ کە سوپایەکی هۆزەکانی فارس لەبەردەم دارستانی چەقالەدا[2] چاوەڕێدەکات.

---

[1] هەر کەسێ ناوی گەورە پیاوان بە خراپ بێنێ، ژیرو دانا نییە.

[2] چەقالە : بادامی کێویی .        وەرگێڕی کوردی

دەمزانی شەڕ لەو دارستانەدا بە زیانی سوارەکانم دەگەڕێ، سوار ناتوانێ لە دارستانی چڕو پڕدا لەگەڵ پیادەدا شەڕ بکات، چونکە پیادەکە لە پشت درەختەکانەوە خۆیان دا دەگرن‌و بۆسە بۆ سوارەکان دەنێنەوە، ئەگەر درەختەکانیش بڵندبن لە سەرەوە خۆیان قاییمدەکەن‌و سوارەکان‌و ئەسپەکانیان تیر باراندەکەن، ناشتوانرێ لەسەر دارەکان بخرێنە خوارێ. ئەگەر شوێنەکە دەشتاییبوایە، بێ دڵەڕاوکێ دژ بە لەشکری فارس دەجەنگام. هەندێك شارەزای باشم بەکرێگرتن کە چاك لێیان دڵنیا بووم بۆ ئەوەی لە ڕێگەیەکەوە بڕۆین لەو دارستانەوە دووربێ. گەیشتینە شوێنێك کە هەر دووبەری ڕێگە بە گیای (ئینگنار) داپۆشرا بوو، وتیان: خونچەی ئەو گیایە خواردنێکی زۆر خۆشە، سوارەکانم هەندێکیان کۆ کردەوەو کوڵاندیان کەلێم خوارد زۆر خۆشبوو. دوای ئەوەی بەو ناوچەیەدا گوزەرمانکرد، دووەمین نامەی سوڵتانی فارسم بەدەست گەیشت‌و خراپتر دایشۆریبووم. باوو باپیرانی خۆی بردبوونەوە سەر هی من، وای زانیبوو کە من نازانم ڕەچەڵەکی ئەو دەچێتەوە سەرکێ!، باپیرەی پیاوێکی لاتو لووت‌و چاو چنۆکبووە، ناوی (پاڵەوان حاجی)یەو خەڵکی شاری (خەوواف)ە لە ناوچەی خوراسان. ئەو پیاوە بۆ ئەوەی لە برسانا نەمرێ یەکەم جار چووەتە (طووس)، ویستوویەتی پاڵەوانبازیبکات‌و پارووێ نانی دەستکەوێ، لەبەر ئەوەی لەوێ پاڵەوان زۆرو بەناوبانگ هەبوون، ئەو جێی نەبووەتەوە، پاشان چووە بۆ (نەیشاپوور)و (ڕەی) بەهەمان شێوە لەوێش نەیتوانیوە بمێنێتەوە. بەناچاری ڕێی (ئەسفەهان)و (فارس)ی گرتۆتە بەر، لەبەرئەوەی لەو سەردەمەدا پاڵەوانی زۆر بەهێز لەو وڵاتەدا نەبووە، پاڵەوانی حاجی جێی بووەتەوەو هەندێك لاویش لە دەوری کۆ بوونەتەوەو ناوبانگی دەرکردووەو دوای مردنی سوڵتانی فارس، کورسیی فەرمانڕەوایی بۆخۆی داگیر کردووەو بووە بە سوڵتانی وڵات. ناوبراو پیاوێکی نەزان‌و نەخوێندەوارو بێ ئاگا بووە، هەمیشە خەریکی خواردن‌و نووستنبووە، دوای خۆی ناوێکی بەجێ نەهێشووە شیاوی یاد کردنەوە بێ. باپیرەی سوڵتان مەنصوور بە زۆر خۆری مردووە، بەڵام جەنگیزخان کە باپیرە گەورەی منە، ئەندازەی خواردنی هەر ئەوەندە بووەکە برسی نەبێ، خوراکی سەرەکیشی ماستی ماین بووە، بۆیە زۆر بەهێز بووەو توانیویەتی سێ شەوو سێ ڕۆژ بە سواری بمێنێتەوە. وەچەی (پاڵەوان حاجی خەووافی)، کە دوای خۆی بوونە فەرمانڕەوا، هەموویان گەمژەو هیچ‌و پووچ‌و ناشایستە بوون، بەڵام پڕو پاگەندەچیبوون‌و توانیویانە

بە درۆو دەلەسە خەڵك دەسخەڕۆ بکەن، تا ئەو کاتەی من چوومە وڵاتی فارس هەشتیان لە (فارس‌و کرمان‌و یەزد)دا فەرمانڕەواییانکردبوو.

جەنگاوەرانی فارس، لە دەوروبەری دارستانی چەقالەدا، نەیانتوانی پێشمان لێبگرن، چونکە ئێمە بە دابو نەریتەکەی خۆمان ئەوەندە خێرا ڕێمانده‌کرد، کە ئەوان کەوتبوونە خۆ ئێمە لە شاری (شیراز) نزیکببوو بووینەوە. وتیان (سوڵتان مەنصوور) لە شیرازدایەو بە تەمایە بڕوات بۆ قەڵا زۆر سەختەکەی (ئەستەخریار). وتم لەم جیهانەدا قەڵانییە نەگیرێ، ئەگەر بچێتە ئەو قەڵایەوە، ڕێگەیەکی فراوانی پێچاوپێچ بە دەوری کێوەکەدا دروستدەکەم‌و خۆم‌و سوپاکەم دەگەینە قەڵاکەو داگیریدەکەم!. پاشان زانیم کە سوڵتانی فارس نەچوو بوو بۆ قەڵاکە، بەڵکو چوو بووە مزگەوتی (عەتیق)ەوە، کە گەورەترین مزگەوتی شیراز بوو، بۆ ئەوەی لە خوا بپارێتەوە بەسەر منا زاڵبێ، بەهەردوو دەستی خۆی هەردووچاوم لە کاسەی سەرما دەربێنێ، پاشان زمانم‌و هەر دوو دەستم ببڕێت، ئینجا لەسەرم بدات.. لە شیرازدا وا دەنگ بڵاو بووبووەوە گوایە هەرکەسێ بچێتە ئەو مزگەوتەو لە خوا بپارێتەوە نزای گیرایەو هەرچی بویێ خێرا خوا بۆی دەکات!.

کەمێك بەرلە خۆرئاوا بوون گەیشتمە ناوچەیەکی فراوان‌و بەرین پێیان دەگوت (باتیلە)، لە دوورەوە ڕەشاییەك بەرچاو دەکەوت، دیار بوو لەشکری دوژمنە. لەوێدا وەستاین‌و بە ئەفسەرەکانم وت: کە پێویستە، ئوردووگەکەمان زۆر قاییمبێ، ئەگەر لەناکاو هێرشکرایە سەرمان دەبێ دوژمن لەناوبەرین. هەروەها وتم: ئێمە لە خاکی دوژمناین‌و هیچ ئاگاداریمان دەربارەی شێوەی زەوی‌و ژمارەی سەربازان‌و هەڵسوکەوتی دوژمن نییە، ئێمە دەبێ سبەینێ زوو پەلامار بدەین، نەکو یارمەتی بگاتە سوڵتانی فارس‌و کارمان دژوارتر بێ. پاشان داوامکرد هەموو لەشکر بخەوێ تاکو بۆ نەبەردی ڕۆژی دوایی ئامادەبن، پاسەوانی باشیش دانران بۆ ئەوەی ئاگایان لە هەموو شتێك بێت‌و هەمیشە ئامادە بن. ئەو شەوە چەند جارێك لەخەو هەستام‌و بەناو ئوردووگەکەما گەڕام، چاك چاك گوێم شلکرد بوو، لەناکاو گوێم لە دەنگی بولبولێك بوو لەناوباخەکانی شیرازدا دەیخوێند، بۆم دەرکەوت بەهار هاتووە، کەوتەوە یادم کە بەهاری شیراز پێش بەهاری ناوچەکانی تر دەکەوی. هەر ئەو شەوە بۆسەکانمان سێ جار ئاگادارمانکردم کە چاویان لە کەمینی دوژمنە، وتم: تا دوژمن بە ڕاستی دەست بە هێرش نەکات سەربازەکان هەڵمەستێنن!

بەیانی زوو نوێژی بەیانیم کردو بەرگی جەنگم پۆشی، دەمویست زوو بە زوو هێرشبەرەو نەهێڵم جەنگاوەرانی جەنگەڵی چەقالە فریای سوڵتانەکەیان بکەون. فەرمانی شەیپوور لێدانم دەرکرد، هەموو سەربازەکان هەستان، بە ماوەیەکی زۆر کەم ئوردووگە پێچرایەوەو لەشکرەکەم ئامادەی جەنگبوو. بۆ ئەوەی سوڵتان مەنصوور بشکێنم دەبوایە لە خۆرئاوەوە بەرەو خۆرهەڵات بڕۆم. ماوەیەك هێرشم دواخست بۆ ئەوەی خۆر بەرزبێتەوەو لە چاوی سەربازەکانم نەدا. بیستبووم کە سوڵتانی فارس دوو فەرماندەی لێهاتووی هەن، هەردووکیان لە بنەماڵەی خۆیبوون، سوڵتان لە هەر دوو کیان دەترسا، لەبەر ئەوەی ژنەکانیو خزمە نزیکەکانی داوایان لێکردبوو کلچێوك بە چاویاندا نەهێنێ، سوڵتان چاوپۆشی لێکردبوون. (لە ڕۆژگاری کۆندا تەلێکی باریکو زۆر گەرمو داخ دەهێنرابە گلێنەی چاوداو بینایی نەدەما، دوای ساڕێژ بوونی زامەکە دەرەژرا، وەکی تر هیچ ناتەواوی نەبوو، بەڵام تا کۆتایی تەمەن هەر نابینا بوو، هەرکەسێ وای پێبکرایە پێی دەوترا چاوەڕەژراو_ وەرگێر بۆ فارسی). لە بنەماڵەی سوڵتانیش هەرکەس دەستی بگەیشتایەتە فەرمانڕەوایی بەو جۆرەی باسکرا، چاوی هەموو خزمانی نێرینەی خۆی دەرەژتن بۆ ئەوەی کەس چاو نەبڕێتە تەختی دەسەڵاتو فەرمانڕەوایی. بەرلە جەنگ بۆم دەرکەوت ئەگەر ئەو دوو فەرماندەیەی سوڵتان لێهاتوویی‌و کارامەییان بەکار بێنن لەبەر ترسو لەرزە، نەك لەبەر دڵسۆزی، دیارە کەسێك هەمیشە بترسێ کە سوڵتان کوێریبکات هەرگیز دڵسۆزی ڕاستەقینەی نابێ.

کەبڕێك خۆر بەرزبووەوە فەرمانی هێرشم دەرکرد. فەرماندەی قۆڵی ڕاستی لەشکرەکەم (میر فەتاح) بوو، لەبەر ڕێزی من نازناوی میری لابرد، منیش ناومنا (فەتاح بەگ) ئەو پیاوە زۆر کارامە بوو، هەموو مەرجەکانی فەرماندەی جەنگی تێدا بوون. فەرماندەی قۆڵی چەپیشم (میران شا)ی کوڕمبوو، یەکەم جاریشبوو کە فەرماندەیی سوپای پێبسپێرم، بەڵام پێشتر لەزۆر جەنگدا بەشداریکرد بوو. پێش دەسپێکردنی جەنگ بە (میران شا)م وت: سوپای تۆ هەمووی سوارە، هی دوژمن پیادەیە، گوڕەپانی شەڕیش ئەوەندە تەختە بە هیچ جۆرێ تووشی کێشە نابن. لە توانای جەنگیی پیادەی دوژمن ئاگادار نیم، بەڵام ئاگادارم کە سوارەکانی تۆ قاڵبووی جەنگن، هەندێکیشیان ماوەی پازدە ساڵە لە مەیدانی جەنگا نەبەرد دەکەن. بۆیە ئاگادارتدەکەم تا بزانیت کە من پاساوی سەرنەکەوتنت پەسەند ناکەم، باکوڕی منیشبی، لە مەیدانی جەنگا مەرگی تۆو

هی سەربازێك بۆ من هەر یەکێکە. ماوەیەکی دوورو درێژە چاوەڕوێی ئەمڕۆم تاکو سزای (سوڵتان موظەففەر)ی‌بخەمە ناو دەستی! لە هەموو روویەکەوە پێداویستییەکانی جەنگ بۆمن لە باران، ئەگەر سەرنەکەوین تاوانی فەرماندەکانمەو بەس، لەگەڵ ئەوەشدا زۆر باوەڕم بە توانای هەموو فەرماندەکانی خۆم هەیە، تۆش لە هەموو شەڕەکاندا سەلماندووتەکە بە تەواوی کارامەو نەبەردی، ئەمڕۆش رۆژێکە کە پێویستە لە ئەزموونی فەرماندەییدا سەرکەوی. پاشان پلانی گۆڕەپانی جەنگم بۆ باسکردو تێمگەیاند کەچیبکات.

(میران شا) سواری ئەسپبوو، رۆیشت بۆ ئەوەی فەرماندەیی قۆڵی چەپ بگرێتە ئەستۆ، لە هەمان کاتدا خۆم ئامادە کردبە نامەیەك هەواڵی مەرگی بنێرم بۆ دایکی، بە راستی حەزم نەکرد کوڕەکەم لەو شەڕەدا بکوژرێ‌و نەشکێین! بە دەستووری جەنگە گەورەکانی تر سوارەکانم جێی خۆیان گرت، جێداری خۆمم بۆ فەرماندەیی گۆڕەپانی جەنگ دیاریکرد، تا ئەگەر کوژرام لەشکرەکەم بێ فەرماندە نەبێ. لە پێشی پێشەوەی ناوجەرگەی سوپادا جێی خۆم گرت، هیچ کەس نەیدەتوانی بە پۆشاکی جەنگدا لە ئەفسەرەکانی خۆم جیامبکاتەوەو بمناسێ. کەلە سوپای دوژمن نزیکبوومەوە، لەیەکەمین چاو گێڕاندا (سوڵتان مەنصووری موظەففەری)م لەناو جەرگەی سوپاکەیا دی، کڵاوە جەنگییەکەی ئاڵتونبوو، ئەو زرێ‌و بەرگە جەنگییەی لەبەریا بوون وەك ئاوێنە ئەدرەوشانەوە، پاشان زانیم ئەوانیش زێری رووتن، پاسەوانی تایبەتی دەوریانگرتبوو، هەموویان کڵاوی ئاسن‌و زرێیان پۆشیبوون. بۆیە لە ریزی پێشەوەی لەشکرەکەمەوە دەڕۆیشتم بۆ ئەوەی زووتر سوڵتانی فارس ببینم، لە هەمان کاتدا غیرەتی زۆرتر بدەمە بەر سەربازەکانم. نزیکەی سەد گەزمان مابوو دەستەو یەخەی دوژمنبین، سەربازانی دوژمن تیر بارانیانکردین، ئێمەش پتر ئەسپەکانمان تاودان بۆ ئەوەی زووتر بگەینە سەریان‌و لە تیر هاویشتنیان بخەین‌و کەمتر زیانمان لێبکەوێ. کە هێرشمان بەرەو پێشێ برد هیچ کۆسپو بەربەستێك نەهاتنە رێمان. خێرا بۆم دەرکەوت کە سوڵتانی ناوبراو هیچ شارەزای هونەری جەنگ نییەو هیچی لێنازانێ، لە هەمان کاتدا وام لێکدایەوە کە فەرماندەکانی کەمترخەمییانکردووە، لەبەر ئەوەی رقیان لە سوڵتانە نەیانویستووە یارمەتییبدەن.

دوای ئەوەی خۆمان گەیاندە دوژمن، تیر بارانی وەستا، بەڵام رووبەڕووی رمو نێزەی پیادەکان بووینەوە، دەبوو رموەشێنەکان تێکبشکێنین جا بتوانین

ریزی پیادەکان تێکوپێکبدەین. رەشوێنی ئەسپەکەمم کردە ملمو بە دەستی راست شمشێرو بە دەستی چەپ تەورم دەوەشاند، ئەو رمانەی بەرەو ئێمە دەهاوێژران بەلای منەوە لە دەرزیی پیرەژنان بێ ترستر بوون. بۆم دەرکەوت سەربازانی دوژمن زۆر سستن. لە دوو قۆڵەوە سەربازەکانم بە شیرو تەور بەربوونە دوژمنو دەچوونە پێشەوە، لەناکاو هەستمکرد ئەسپەکەم سستە، زانیم بریندارە، خێرا رەشوێنکەیم لەملما لابردو لەپێکەوت، زانیم رمێک چەقیوەتە ورگی، خۆم هەڵدایە خواریۆو نەمهێشت لاقم ببێ بە ژێر ئەسپەکەمەوە. دەورو بەرم هەموو سوار بوون، تەنها من پیادە بووم، کە هێرشمدەکردە سەر دوژمن، وەکو قەڵەم رمەکانیانم هەلاهەلا دەکردن. چەند کەسێ لە سوارەکانم ویستیان پیادەبنو ئەسپەکانیان بدەن بەمن، بەلام من بانگم بەرزکردەوە، وتم:درێژە بە شەڕ بدەنو ئیشی خۆتان بکەن. یەکێکیان پێشنیاریکرد لە دوایەوە سواربم، وتم: وازم لێبێنن ئەمەوێ بە پیادەیی بجەنگێم! لەو کاتەدا هەستمدەکرد کە هێزو بازوویەکی لە رادە بەدەرم هەیە، دوای شەڕ بۆم دەرکەوت ئەو توانایەم سەرەڕای ئەوەی هی ئەوە بووکە خوێن لە دەمارەکانما هاتبووە جۆش، لاوازیی سەربازەکانی دوژمنیش کاریگەری هەبوو، هەموویان نەکردەو لە هونەری جەنگ بێ ئاگا بوون.

لەهەر دوو قۆڵەوە سەربازەکانم قارەمانانە دەجەنگان، سەربازانی دوژمن نەیاندەتوانی لە من نزیکبنەوە. سوارەکانم تێکڕا خەریکی پاکسازیی مەیدانی شەڕ بوون، لەناکاو سوارێك هاواریکرد: ئەمیر لە کوێیە؟! ئەمیر لە کوێیە؟! بێ ئەوەی لا بکەمەوە هاوارمکرد: چ ئیشێکت بە ئەمیر هەیە؟! سوارەکە منی ناسییەوە، وتی: ئەی ئەمیر من لە لای (فەتاح بەگ)ەوە دێم، سەرگەرمی دەوردانەوەو دەورگرتنی باڵی چەپی دوژمنەو بە لاشەی کوژراوەکان تەپۆڵکە دروستدەکاتو بەرەو پێشەوە دەچێ. وتم: پێی بڵێ لەسەر گەمارۆدانی دوژمن بەردەوامبێو بەرەو (میران شا)ی کوڕم بڕوات، چونکە لەوانەیە نەتوانێ گورج دەوری باڵی راستی دوژمن بگرێ. من بە تورکی لەگەڵ نێردراوەکەی (فەتاح بەگ)دا دوام، چونکە ئەگەر بە فارسی لەگەڵیا بدوامایە دوژمن تێدەگەیشتو لەوانە بوو بەد ئەنجامبێ. لەو کاتەدا سەر گەرمی نەبەردو پەلامار بووم، دوژمن ئەوەندە بێ هێزو توانا دەهاتە بەر چاوم واهەستمدەکرد دژ بە کۆمەڵێك منداڵ دەجەنگێم. پیادەکانی سوڵتان هەوڵیاندەدا بە شمشێرو رم لە پێم بخەن!..
ئەگەر تۆسقاڵێ لە هونەری شەڕ شارەزا بوونایە دەیانزانی جەنگاوەرێ بەرگی

ئاسنی پۆشیبێ تەنیا هەر بە گورز لە پێدەکەوێ. سەیر ئەوە بوو هەر سەربازێکی دوژمن بریندار بکرایە، ئیتر ورتەی لە خۆی دەبڕی تا ئێمە تێپەڕ بووینایە، ئەوسا تێدەکۆشا خۆی بگەیەنێتە پەنایەك، لەوێدا دەمایەوە تا شەڕ تەواو بێتو چارەنووسی دیار بکرێت! ئەو دیاردەیە بەڵگە بوو بۆ ئەوە کە سوڵتانی فارس شایانی ئەوە نەبوو خاوەن سوپا بێت.

لە گەرمەی نەبەردی جەنگا دەنگێکی ناسراو بەرگوێم کەوت، دەنگی (نیظامووددین)بوو کە رووداو نووسی خۆمبوو، دەیگوت: ئەی ئەمیر، چیدەکەی؟! بۆچی سواری ئەسپ نابی؟! وتم: دەڵێی چی؟! وتی: ئایا دەزانی چیدەکەیتو چۆن خۆت تووشی مەترسی دەکەیت؟! پرسیم: دەڵێی چیبکەم؟! وتی: ئەسپم بۆ هێناوی، سواربە. بێ ئەوەی لای لێبکەمەوە چوومە داوەو روو پۆشو کڵاوە ئاسنەکەمم لادان، نیظامووددین وتی: ئەی ئەمیر، تۆ ئەمرۆ کارێکتکردووە نەئەفراسیابو نەرۆستەم نەیانکردووە. سەیرکە، دەڵێی لە حەوزی خوێن هەڵکێشراوی!.. کە سەیری سەراپا لەشی خۆمم کرد دیم خوێنی رووتە، خوێنی تازە لەسەر خوێنی وشکەوەبوو بوو! نیظامووددین وتی: هەرگیز نەمبیستووەو نەمخوێندۆتەوە قارەمانێکی وەك تۆ هەڵکەوێتو خۆی بە تەنیا بەرانبەر هەزاران جەنگاوەر نەبەرد بکات!.. وتم: دەربارەی قەرمانییەتی من زیادەڕەوی مەکە، من خۆم بە تەنها نەبووم، سوارەکانم هەمیشە لە دەورما بوونو نەیانهێشت دوژمن گەمارۆمبدات. پاشان وتی: ئەی ئەمیر، سواربە تا زووتر سەرکەوتن بە دەستبێنیێ، چونکە هەستدەکەم سەکەوتنت زۆر نزیکە!.

لەبەر ئەوەی شمشێرەکەم خوێنی وشکەو بووی زۆری پێوە بوو نەمتوانی بیخەمەوە کێلانەکەی، دامە دەست نیظامووددین تاکو بیشوات، ئینجا بە تەورە کەمەوە کە بە قاییش بەستبوومە مەچەکم سوار بووم. وتم: نیظامووددین، تۆ مژدەیەکی ئەوەندە خۆشت دامێ کە شایانی پاداشتی چاکی! دەزانم کچە چاوڕەشەکانی شیراز پەسەند دەکەی! کەچووینە ناو شیراز خۆت سەرپشکبە، دەکچی چاوڕەشی شیرازی بۆ خۆت هەڵبژێرە. وتی: ئەی ئەمیر، من بە ساڵا چووم، دەکچی شیرازی بۆمن زۆرن! وتم: زۆرترین ژمارەم وتووە، کەمترین ژمارە بە دەست خۆتە... پاش کەمێك تەتەری (میران شا)ی کوڕم هاتو هەواڵی دامێ کە کوڕەکەم بە سوارەکانیەوە لەگەڵ سوارەکانی (فەتاح بەگ) بەیەك گەیشتوونو گەمارۆی سوپای سوڵتانیان داوە. بە هەمان تەتەردا هەندێك فەرمانم بۆ فەتاح بەگو میران شا ناردن، بەوانیشو بەو هێزەی لەگەڵ خۆمدا

بوو فەرماندا کە نەهێڵن سوڵتان مەنصوور دەرچێت، بەزیندوویی بیگرن. لەهەمان کاتدا رامسپارد لە هێڵی گەمارۆدا چەند کەلەبەرێك دروستبکەن بۆ ئەوەی سەربازە ترسنۆکەکانی رابکەن، بەڵام بەمەرجێ ژمارەیان زۆر نەبێ. جارێکیان بینیم تاقمێکی چل، پەنجا کەسی، کە چەند سوارێکیان تێدا بوون، رادەکەن، دواتر بۆم دەرکەوت یەکێ لە سوارەکان فەرماندەی قۆڵی راستی سوپای سوڵتانی فارسبووە. دوای ئەو فەرماندەی قۆڵی چەپیشی لە جیاتی نەبەردو جوانمەردیو دەماری پیاوانەو شکۆی مەیدانی جەنگ هەڵات، من زۆرم پێخۆش بوو چونکە هەڵاتنو راکردنیان لە سوودی ئێمە بوو، دوای هەڵاتنی ئەوان ئەفسەرانو سەربازانی توانای شەڕیان نەما، رمو شیرەکانیان فڕێدانو خۆیاندا بە دەستەوە.

شمشێرێکم بە دەستمەوە گرتو لەگەڵ هەندێك ئەفسەرو سەربازما بەرەو سوڵتان مەنصوور رۆیشتم، وام زانی پاسەوانە تایبەتییەکانی بەرگری لێدەکەنو لەسەر ئەو خۆیان بە کوشتدەدەنو نایەڵن دیلبکرێت، کەچی هیچ دەستیان نەکردەوە، ئەفسەرانو سەربازەکانمان هەموویانیان دیلکردن، سوڵتان مەنصوورو چەتردارەکەی مانەوە. هێشتا هەتاوی بەهاری فارس ئەوەندە تینی نەبوو، بەڵام لەشی سوڵتان ئەوەندە ناسکبوو کە بەرگەی ئەو نەختە خۆرەی نەدەگرت. سەرنجمدا چەترداری سوڵتان، کە پیاوێکی قولە رەشبوو، لە هەموو فەرماندەکانی سوڵتان پیاوترو چاونەترستر بوو، چونکە دەیتوانی چەترەکەی سوڵتان دانێتو رابکات، بەڵام وای نەکردومایەوە. بەسواری لە سوڵتان چوومە پێشیو شمشێرەکەیم بەناو قەدیەوە دەرهێناو دامەدەست ئەفسەرێکی خۆم، ئینجا وتم: ئایا من دەناسی؟! سوڵتانی پەشێوو سەرگەردان پرسی: ئایا فارسی دەزانی؟ وتم: بەڵێ، وا بزانم لە تۆ چاکتر زمانی فارسی دەزانم، من لە تۆم پرسی: ئایا دەمناسی، یان نا؟! وتی: ناتناسم، بەڵام رەنگە یەکێکبی لە لێپرسراوەکانی ئەمیر تەیموور!... وتم: من خۆم ئەمیر تەیموورم!

ئەو پیاوە کەمنی ناسیو سەیرێکی سەراپای کردم بە خوێنی وشکەو بوو داپۆشرا بوو، رەنگی پەڕی، زانیم کە زیرەیکردووە! وتم: ناپیاو من داوای رەوە ئەسپو خەرباریێ لیرەم لە تۆ نەکردبوو، داوای چەند شووشەیەك ئاوی لیمۆی فارسم کردبوو بۆ چارەسەری نەخۆشی ، بەهەر کاروانییەکم بوتایە بۆی دەهێنام، سەرەڕای ئەوەی بۆت نەناردم ئەو هەموو جنێوو قسە ناشیرینانەت بۆمن نووسیبوون، ئێستاش ئامادەی سزای پێشیاوی خۆتبە. وتی: ئەی

ئەمیر، ئێستا تۆ سەرکەوتووی، دەتەوێ چیم لێبکەی؟! وتم: دەتکوژمو وەچەشت دەبڕمەوە! نابێ دوای تۆی جنێو فرۆش یەك کەسی نێرینەت لە دەستم دەرچێ! وتی: ئەگەر لێمان ببووری کچکی خۆمت دەدەمێو دەتکەم بە زاوای خۆم. وتم: ئەگەر کچێکی تۆم بۆی هی خۆمەو پێویست بە قایلبوونی تۆ ناکات، بەلام من پیاوێك نیم بۆ ژن لە بڕیاری خۆم پەشیمانببمەوە، بە تایبەتی لەم تەمەنەی ئێستامدا. وتی: مەمکوژە نامەیەك بۆ فەرمانڕەوای شیراز دەنووسم کە بەرگری نەکاتو دەروازەکانی شارت بۆ والابکات. وتم: پێویستم بە نامەی تۆ نییە، کە تۆ بە دیلکراوی ببنیێ یەکسەر دەروازەکان دەخاتە سەر پشت، خۆ ئەگەر وەکو فەرماندەکانت رقی لێتبێ ئەوە باشترو زووتر پێشوازیمان لێدەکات.

لەبەر ئەوەی ترسی ئەوەمان هەبوو لەشکری دارستانەکە پەلامارمانبدات، وام بە باش زانی هەر ئەو رۆژە بچینە ناو شاری شیراز. کەمێك دوای نیوەڕۆ بە تەواوی شەڕ کۆتاییهات، بەشێك لەسەربازانی دوژمن هەلاتن، بەشێکی تریانمان گرتن، هەندێك لە شازادەکانیش کەوتنە بەردەستمان. داوامکرد (فەتاح بەگ) لە قۆڵی رۆژهەلاتەوە بچێتە شارەوە، (میران شا)ی کوڕیشم لە قۆڵی باشوورەوە، خۆیشم سوڵتانی دیلکراوم لەگەڵ خۆما بردو رێی باشوورم گرتەبەر. کاتی نوێژی عەسر گەیشتمە شیراز، دەروازەکان داخرا بوون، هەندێ جەنگاوەر لەسەر شوورەکە بوون. بە جارچیم وت: جار بدات و بڵێ: با فەرمانڕەوای شیراز بێتە سەردیوارەکە قسەی لەگەلا دەکەم. کە فەرمانڕەوای شیراز دەرکەوت وتم: سوڵتان مەنصوور شکاوەو فەرماندەکانی بە جێیانهێشتووە، ئێستا دیلی منە، ئینجا سوڵتانم پیشاندا، پاشان باسمکرد چیم بەو شارانە کردووە کە دەروازەیان لێنەکردووتەوەو بەرگرییانکردووە سەرەنجامیان چۆنبووە، باسی ئەوانەشم کرد کە بە پیرمەوە هاتوونو بە گەرمی پێشوازییانکردووم. لە کۆتاییدا وتم: من تەنها بۆ تەمێکردنی پادشای ئێوە هاتووم؛ والەشکرەکەیم تەفرو توونا کردووە خۆیشی دیلە، ئەگەر بە بێ بەرەنگاری دەروازەکان بکەنەوە، زۆر لێرە نامێنمەوە، پاش حەسانەوەی لەشکرەکەم لە شیراز دەردەچمو دەڕۆم. وتی: هەر ئێستاکە دەروازەکان دەکەینەوەو بۆ خۆم بە پیرتانەوە دێم. دوای والا کردنی دەروازەکان، فەرمانڕەوای شار قورئانێکی گەورەی بەدەستەوە بوو، لەگەڵ پیاوە

خانەدانەکانی شاردا بە گەرمی پێشوازییان لێکردمو بە دەنگی بەرز ئەم تاکە هۆنراوەیەی خوێندەوە:

رواق منظر چشم من اشیانه تواست
کرم نماو فرودا که خانه خانه تواست*

وتم: ئەم هۆنراوەیە هی (خواجە حافظ)ە؟! وتی: بەڵێ، ئەی ئەمیر، هی ئەوە. پاشان سەیرێکی بەرگی جەنگیمی کرد، پرسی: سەرتاپات خوێنە، ئایا برینداری؟! وتم: ئەوە خوێنی گوڕەپانی جەنگە، بریندار نیم. ئینجا قورئانەکەی بەرزکردەوە، وتی: ئەی ئەمیر، ئەزانم تۆ سوڵتانێکی مەبەستپاکی، بەم قورئانە سوێندتدەدەم کە کوکوژیو تالانی ئەم شارە نەکەیت!... وتم: ئەگەر لەبەر خاتری ئەم قورئانە نەبوایە لەملم دەدایت چونکە گومانت لە پەیمانی من کردووە! دەبێ بزانی من کە پەیمانمدا پاشگەز نابمەوە. فەرمانڕەوای شیراز داوای لێبوردنیکرد، پێم وت: با جاڕ چیپیانت بە ناوی منەوە دانیشتووانی شار دڵنیا بکەن کە سەروماڵیان پارێزراون، هیچ سەربازێکم دەستدرێژی ناکات، با دەرگایان والابێتو بێ خەمبن، پێشیان رابگەیەنە کە بۆ سبەینێ سەرلە بەیانیو دوای خۆرهەڵاتن، هەموو دانیشتووانی شار لە مەیدانی شاردا ئامادە بن.

فەرمانڕەوای شار پێشنیاریکرد لە (خانەی دەوڵەت) کە شوێنی تایبەتی میوانی شکۆدار بوو، بحەوێمەوەو شەو لەوێبم، بەلام من حسابم بۆ گەماڕۆی دوژمنانو ناحەزان، بۆ لەشکری سوڵتان لە دارستانەکە، بۆ بەرگریی ناوشارو چەندان کێشەی تر کرد، لەبەر ئەوە بە هێزێکی باشەوە ئەو شەوە خۆم لە دەرەوەی شار مامەوە، (میران شا) یشم راسپارد کە ئاگای لە شارو دەروازەکانی بێت.

بەیانی زوو لە خەو هەڵسامو نوێژمکرد، فەرماندەیی ئوردووگەم بە (فەتاح بەگ) سپارد، سوڵتانی دیلم لەگەڵ خۆما بردەوە شار، مەیدانی شار پڕ بوو لە دانیشتووانی شار، سەربازەکانم لە هەموو لایەکەوە جێی خۆیان گرتبوو، چاوێکیان کردبووە هەزار چاو، نەیاندەهێشت کەس بێتە ناوەراستی

* گلێنەی چاوم لانی تۆیە، فەرموو بۆ جێی خۆت، ماڵ ماڵی خۆتە

وەرگێڕی کوردی

مەیدانەکەوە. وەکو رامسپارد بوو شەوی رابوردوو بە کۆڵەکەو دارو تەختە لە ناوەڕاستی مەیدانەکەدا سەکۆیەك دروستکرا بوو. سولْتان مەنصووړو یازدە شازادەی موظەففەری بە زنجیرکراوی برانە سەر سەکۆکە، دوو جەللادیش ئامادەو چاوەڕێی فەرمانبوون. بە شێوەیەك کە هەموو خەڵکی شیراز ببیستن جارچی جاڕیدا، وتی: ئەی شیرازییەکان، ماوەیەك لەمەبەر ئەمیر تەیموری گورگان لە خوراسان نەخۆشکەوت، بۆ چاکبوونەوەی، پزیشکەکان ناوی لیمۆی فارسیان نواند، ئەمیر تەیموریش نامەیەکی دۆستانەی بۆ سولْتان مەنصوور نارد، تکایکرد بوو کەبڕێك ناوی لیمۆی بۆ بنێرێ، بەڵام سولْتانی فارس لە وەڵامی ئەمیر تەیموری گورگاندا نامەیەکی پڕ لە نابەجێیی نووسیبوو، وانامەکەی سولْتانی فارس دەخوێنمەوە... دوای خوێندنەوەی نامەکە، جارچی بەردەوامبوو، وتی: ئەمیر تەیموری گورگێن تەنها بۆ سزادانی ئەم پیاوە ڕێی فارسی گرتۆتەبەر، ئێستا ئێوە بە چاوی خۆتان دەبینن چۆن سولْتانی فارس بە سزای کردەوەی خۆی دەگات!.

دوای ئەوە هاوارو پاڕانەوەی سولْتان مەنصوور بەرزبووەوە، وتی: ئەی ئەمیر تەیموور، من خراپمکرد، تۆ بمبەخشە!... وتم: ناتبەخشم، چونکە لەو ڕۆژەوە نامەکەت بە دەستم گەیشتووە تا دوێنێ کە تۆم لە مەیدانی جەنگا شکاندووە، هەر تلاومەتەوە، لە داخانا هەراسو خەوو خواردنم لێهەڵگیراون، هەمیشە لە دڵی خۆمدا پەیمانم تازە دەکردەوەو دەمگوت هەر کاتێ بکەویتە بەردەستم بە جۆرێ ڕیشەکەندت دەکەمو وەچەت دەبڕمەوە کە هەرگیز لە پشتی تۆ کەسێ هەڵنەکەوێ، نەلەفارسداو نەلە هیچ شوێنێکی ئەم سەرزەمینەدا فەرمانڕەواییبکات. ئەمڕۆش ڕۆژێکە پەیمانی خۆم بەجێبێنم. ئەگەر من ئەو قسانەم بە تۆ بگوتنایەو و بکەوتمایە بەر دەستت دەتخستمە قەفەزێکی ئاسنەوەو لەسەر لێژنەدارێك دەتسووتاندم، یان فەرمانتدەدا بە زیندوویی کەوڵبکرێم، یان پارچەپارچەتدەکردم!! بەڵام من واناکەم، تەنها دەڵێم لە ملتبدەنو سەرت لەلەشت جیا بکەنەوە! سولْتان هاواریکرد: ئەی ئەمیر، ئەگەر من تاوانکارمو دەبێ بکوژرێم، خۆ ئەمانەی گیراون هیچ گوناهێکیان نییەو قسەی نابەجێیان بە تۆ نەوەتووە، تکایە لە کوشتنیان چاو پۆشیبکە. وتم: کەمار کوژرا دەبێ توولە مارەکانیش لەناوبرێن، ئەگینا کە گەورە بوون پێوە دەدەن، لەگەڵ ئەوەشا من هیچ ترسێکم لەمار نییە، بەڵام چاوم بەرایی نادات نەوەی کەسێك ببینم، کە جنێوی بە من دابێ، ببێتە فەرمانڕەوا.

پاشان جەللادەکان دەستبەکار بوون، یەکەم جار لە ملی سوڵتانیان داو سەریان لە لەشی جیا کردەوە، دوای ئەو لە ملی ئەوانی تریش درا؛ بە چاوی خۆم دیمو بە گوێی خۆم بیستم خەڵکەکە شادییان دەردەبڕی، بۆم دەرکەوت خەڵکەکەش وەکو فەرماندەکان لە سوڵتان مەنصوور بێزار بوون. پاشان سەرەکان کران بە دەروازەکانی شاری شیرازدا و لەشەکان بران بۆ گۆڕستانو نێژران.

# نۆزدەیەمین بەش

## پاش داگیر کردنی شیراز

ئەو رۆژە، لە کاتی نوێژی عەسردا (نیظامووددین)م بانگکردو پێم وت: با پەیمانەکەم بەرمە سەر، چەند کچت دەوێن با پێشکەشیانبکەم. وتی: ئەی ئەمیر، یەك کچم بەسە، بەلام تۆ دانیشتووانی شارت بەخشیون چۆن کچێك بە من دەبەخشی؟! وتم: بە فەرمانڕەوای شیرازم وتووە دەمەوێ کچێکی جوانو چاو رەشی شیرازی بکرم بۆ یەکێك لە پیاوە نزیکەکانی خۆم، هەروەها وتوومە با جارچی جاڕ بدا بە شاردا هەر کەس ئارەزووی هەیە کچێکی وا بفرۆشێت دوو هەزار دینار وەردەگرێ.. رۆژی دوایی سەر لە بەیانی هەندێك لە دانیشتووانی شار لەگەڵ کچە جوانەکانیانا هاتنە (خانەی دەوڵەت)، (نیظامووددین) بە دڵی خۆی کچێکی هەڵبژاردو نرخەکەی درا بە باوکی. دوای ئەوە گەر دەرفەتی رازی تایبەتی هەبوایە (نیظامووددین) دەیگوت: ئەی ئەمیر، ئەگەر ئەتەوێ چێژی ژیان بزانی کچێکی شیرازی هەڵبژێرە بۆ دەست لە ملان، لە جیهاندا ژن نییە لە ژنی شیرازی میهرەبانتربێ!.. بەلام ئەو باسە ئارەزوو بزوێنەی نیظامووددین کاری نەردەکردە سەر منو هەرگیز ئەو کارەم نەدەکرد.

بڕیارمدابوو رەچەڵەکی شازادەکانی (موظەففەری) ببڕمەوەو لە ناویانبەرم. زۆر زووئاگادار کرام کە دووانیان هەلاتوون، یەکەمیان (سوڵتان یەحیا موظەففەری) کە خۆی گەیاند بووە شاری (قەمشە)، دووەمیان (سوڵتان موعتەصەم بن زەینولعابدین) کە خۆی گەیاندبووە (شام). سەبارەت بە یەکەمیان، نامەیەکم نارد بۆ فەرمانڕەوای (قەمشە)، لە بڕگەیەکدا نووسیبووم: ئەگەر ئەتەوێ سەرت بە لەشتەوە بمێنێ، سەری (سوڵتان یەحیا موظەففەری)م بۆ بنێرە، لەپاداشیشا ئەسپو ماینی زۆر وەرگرە.

رۆژێکیان ئاگادار کرام کە پیاوێکی سەراپا تۆزاوی لەبەر قاپیدایە، دەڵێ: ناوم (میر عەبدولباقی)یە، فەرمانڕەوای (قەمشە)م، دەمەوێ میر ببینم. وتم: بیکەنە ژوورێ. ئەوەندە تۆزاویبوو، روخساری دیار نەبوو، تور بەیەکی دابوو بە شانیا دایناو سەرێکی دەرهێناو وتی: ئەی ئەمیر، ئەمە ئەو سەرەیە کە داواتکردبوو!... لە (قەمشە)وە تا ئێرە حەوت ئەسپم پڕوو کاندوون بۆ ئەوەی زوو بگەمە بەرەوەو بۆگەن نەکات. فەرمانڕەوای شیرازو چەند ناودارانی شارم

داوا کـردن، ســەرەکەیان بیـنی، دڵنیایـانکردم کـە سـەری (سـوڵتان یـەحیا موظەففەری)یە. دوای ئەوەی میوانەکان رۆیشتن، بە (میر عـەبدولباقی)م وت: بـۆم باسـبکات کـە چـۆن کوشـتوویەتی. وتـی: بـۆ ئـەوەی دڵنیـا بـێ میوارنداریمکـرد، لـە کـاتی نـانخواردندا پیاوەکـانم پـەلاماریانداو دایانـە بـەر خەنجەرو شمشێرو کوشتیان، منیـش بـۆ خـۆم، دوای بڕیـنی چـلو چـوار فرسەنگ، بـە زووترین کـات سـەرەکەیم گەیاندۆتـە بـەرەوە! وتم: مـن هـەگیز دوژمنی خـۆم لەسـەر سـفرە و خـوانم نـاکوژم. (مـیر عـەبدولباقی) وتـی: ئـەی ئەمیری گەورە، من فەرمانی تۆم جێبەجێکردووە، بۆچی خراپمکردووە؟! وتم: خراپت نەکردووە، بەڵام شێوەی کوشتنەکەیم پێباش نییە. دوایی فەرمانمدا کە پێنج هەزار دیناری بدرێتێ. بە شادییەوە کیسە پارەکانی خستنە توربەکەوەو بە نارەحەت بەرزیکردەوە دای بە شانیا. کەویستی بڕوات، وتم: ئەو سەرەش لەگەڵ خۆتـا ببـەرەوە، هیـچ پێویسـتم بـە کەللـە سـەری دوژمـن نییـە. کەللـە سەرەکەشی خستەوە توربەکەوەو ئەوەندەی تر کۆڵەکەی قورسبوو!.

دوای ئـەوەی گەڕامـەوە بـۆ (ماوەرائەننـەهر) پـەیامنێرەکانم پـەیامیاندامێو زانیـم کـە دووەمـین مـیری هـەڵاتوو دەیـەوێ بـە هاوکـاریی پادشـای شـام لەشکرکێشیبکات، فـارس بگرێتـەوەو ببێتـە پادشـای فـارس. نامەیـەکم بـۆ پادشای شام نووسی کە یارمەتیی (سوڵتان موعەتەصەم) نەدات، بیگرێتو بۆم بنێرێ! پادشای شام لەوەڵامدا نووسیبووی: دیـارە تـۆ زۆر لـەخۆباییتو بە خۆتان دەنازی، ئەگینا رێـزی خۆتـت دەگرتو داواکاریی دەسنیشانکراوت لە پادشایەکی وەك من نەدەکرد. سوڵتان موعتەصەم پەنای بۆمن هێنـاوەو هـەموو جۆرە یاریدەیەکی پێشکەشدەکەم.

پاش گەیشتنی نامەی پادشای شام، زۆری پێنەچوو، لەشـەڕێکی روو بـە روو بوونـەوەدا دژبـە یـەکێك لـە فـەرمانڕەکانم، (سـوڵتان موعتەصـەم) کـوژراو سـەرکەیان نـارد بـۆم، بـە کوشـتنی سوڵتانی نـاوبراو بـە تـەواوی زنجـیرەی موظەففەری قەڵاچۆ کرا، هەرچی سامانێکیش کە هەیانبوو زەوتمکرد، نەکو لە دوارۆژدا یەکێك لەو بنەماڵەیە سەر هەڵبداتو بیەوێ ببێتە فەرمانڕەوا.

دوای هێور بوونەوەی باری شاری شیراز، رۆژێکیان داوامکرد کە زانایانی شار لە مزگـەوتی (عـەتیق) کـۆ ببنـەوە. پێش گفتوگـۆ کـردن نۆکـەری تایبـەتیم شـەربەتی گـێڕا، ئینجـا بـواری گفتوگـۆ هاتـە بـەرەوە. پرسـیارم لـە (شـێخ بەهائەددین ئوردوستانی) کرد، کەلە زاناو ناودارەکانبوو، وتم: کە دەسـنوێژ

دەگیریٚ، دەبیٚ دەست بەهەر دوو پیٚدا بهیٚنریٚ، یان بشۆردریٚن؟! وتی: دەبیٚ بشۆردریٚن؟! چونکە خوا داوامان لیٚدەکات پاکژبین. وتم: لە کام ئایەتی قورئاندا خوا ئەم دەستووورەیداوە؟ وتی: دەزانم لە بارەی دەستنویٚژەوە ئایەت لە قورئاندا هەن، بەلاّم ئەو ئایەتانەم لە یاد نین!.. وتم: تۆ پیٚشەوای ئایینیت، چۆن دەکریٚ ئەو ئایەتانەت لەبەر نەبن! ئەمە وەك ئەوە وایە جەنگاوەریٚ بچیٚتە مەیدانی جەنگو چەکەکەی لە بیر بچیٚ؟ دوای ئەوە هەموو ئەو ئایەتانەم لەبەر خویٚندنەوە کە باسی دەستنویٚژ دەکەن. دوای ئەو پرسیارم لە (حاجی مووسا چاە کووتا) کرد، کە زانایەکی بە ناوبانگی دیکەی شیراز بوو، وتم: نویٚژی بەیانیان لە نویٚژەکانی تر لە پیٚشترەو پاداشتی زۆرترە، ئایا بەلگە بۆ ئەمە چییە؟! وتی: چونکە لە سەرەتای رۆژدایە... وتم: چیتر؟ زانای ناوبراو وەستاو نەیتوانی وەلاّمبداتەوە. جا رووەمکردە زاناکانی ترو وتم: کامتان دەتوانیٚ بە بەلگەی ئایەت باسی خیٚرو چاکەی تایبەتی نویٚژی بەیانی بکات؟! یەکیٚکیان، کە کۆستە بوو، وتی: ئەی ئەمیر، نویٚژی سبەینان پلەی بالاّو تایبەتیی خۆی هەیە، ئەمەش بەوەدا دەردەکەویٚ کە خوای گەورە لە سوورەتی (بنی اسرائیل)دا بە (قران الفجر) ناویهیٚناوە، مەبەست لە (قورئانی بەیانی) نویٚژی بەیانییانە هەموو زانایانی ئیسلام لەسەر ئەو باوەڕەن کە لەم ئایەتەدا (قورئان) بە واتای نویٚژ هاتووە، تاکو بایەخی بالاّی بۆ موسلّمانان دەرخاتو تیٚیانبگەیەنیٚ کە نویٚژی بەیانی بە ئەندازەی قورئان نرخو بایەخی هەیە. بیٚ گومان هەموو نویٚژەکان ئەرکی سەرشانی هەموو موسلّمانیٚکنو چاکەو پاداشتیان بە لای خواوە زۆرە، بەلاّم خوا نویٚژی بەیانیانی لە هەموویان پیرۆزترو لە پیٚشتر داناوە... پیرۆزبایی‌و ئافەرینم لەو زانایە کرد، داوام لیٚکرد بیٚتە لای خۆمەوە دانیشیٚ چونکە پیٚشیاوی ئەوە بوو. سەیرمکرد بەرگیٚکی شڕو وڕی لەبەردایە، وتم: ناوت چییە؟ وتی: (شیٚخ حەسەن بن قوربەت)، پرسیم: ژیانت چۆنە؟ وتی: ژیانم زۆر سەختە. فەرمانمدا کە هەزار دیناری زیٚڕی پیٚبدریٚ تاکو خۆشگوزەرانبیٚ. زۆر سوپاسیکردم، پاشان دەمی هیٚنایە پەنا گویٚمەوەو بە گویٚما چرپانی: تکایە لەمە زیاتر بەشدارانی ئەم کۆڕە شەرمەزار مەکە، ئەمانە تەنها بە شیٚوەو سەرو میٚزەرو بەرگو پۆشاك زانان، هەندیٚکیان زمانی عەرەبی نازانن کە مەرجیٚکی سەرەکییە بۆ زانای ئاینو لە واتای قورئان تیٚبگات.. وتم: مەبەستم لە سازدانی ئەم کۆڕە ئەوەیە کەلّك لە زانایانی شیراز وەرگرم، شتیٚکیان لیٚبببیستم کە نەمبیستبیٚ، نەك شەرمەزار

کردنیان. زانای ناوبراو هەروا بە ئەسپایی وتی: ئەی ئەمیر، لە شیرازدا زانایان زۆرن، بەلام زانایانی راستی گۆشەگیرن‌و لە ڕێبازو ڕێزی دانایاندان، زانایانی شیراز ئەوان بەگلاو دەزانن چونکە لە هۆنراوەکانیاندا باسی مەی‌و مەیخانەو خۆشەویستی‌و دەفو عوودو چەنگو نەی دەکەن، زاناکان لەو هێمایانە بێ ئاگان، بەلام بەلای داناکانەوە واتای تایبەتییان هەیە کە تەنها هەر خۆیان تێیدەگەن. ئەی ئەمیر، ئەگەر دەتەوێ شتی تازە بابەت ببیستی، دانایانی شیراز بانگبکەرە مالی خۆت‌و لەگەلیانا گفتوگۆ بکە.

پێشنیاری (شێخ حەسەن بن قوربەت)م پەسەند کرد، هەندێك لە دانایانی شیرازم میوانداریکردن، ناودارترینیان ئەمانە بوون: (زەکەریای فارسی) ناسراو بە (وامق)، (صەباحەددینی سونبولی) ناسراو بە (عارف)، (شەمسەددین موحەممەد شیرازی) ناسراو بە (حافظ)، حافظ لە هەموویان ناودارتر بوو، من هۆنراوەکانیم خوێند بوونەوەو زۆریانم لەبەر بوون، بەلام ناوی ئەوانی دیکەم نەبیستبوو. حافظ زۆر پیر بوو، پشتی کۆما بووەوەو چاوەکانیشی کز بوو بوون. لە (زەکەریای فارسی)م پرسی: تۆ کە موسلمانێکی دانای، چۆن بڕوات وایە نوێژ کردن روو بە (کەعبە)و بتخانە هەر وەك یەکەو جیاوازیی نییە؟! لەوەلاما وتی: ئەوە بوو کەعبە بتخانە بوو، پاشان بوو بە رووگەی موسلمانان، ئێمەی دانایان مەبەستمان لە بتخانە شوێنێکە کە خوا لەوێبێ، وشەی (بت) لای ئێمە هێماو ئاماژەیە بۆ (خوا)، چونکە خوا شوێنی تایبەتی نییەو لە هەموو شوێنێکا هەیە، روو لە هەر شوێنێ بکرێ روو لە خوا دەکرێ، بۆیە هەموو شوێنێك بتخانەیە!. ئافەرینم لێکردو وتم: چاکت وت، خوا لە هەموو شوێنێکا هەیەو جێ‌و شوێنی بۆ نییە، بەلام خوا فەرمانیداوە، روو بە کەعبە نوێژ بکەین، واتە روو بە بتخانە نوێژ حەرامە!!وتی: ئەگەر کەسێك کردەوەکانی باش‌و پەسەند بن، ئەرکی خۆی بەجێبێنێ، رۆژی پێنج جار روو بکاتە کەعبەو نوێژ بکات، سەرەرای ئەوەش رووبکاتە رۆژهەلات‌و رۆژئاوا و باکوورو باشوورو ناوی خوا بیات، ئەمە دژی ئیسلام نییە. ئەی ئەمیر، بەلایەنی کەمەوە پێنج فەرزەی نوێژ ئەرکی هەموو موسلمانێکە، ئەگەر لێم نەگری دەلێم ئەمە هێندەی ژەمی منالێکی شیرە خۆرە، منالێکی شیرە خۆر، بێجگەلە شیر ناتوانێ هیچی تر بخوات، بەلام ئایا پیاوێك تەنها بە شیر هەلدەکات‌و پێیدا دەکەوێ؟! بێ گومان نا. لە سەرەتای ئیسلامەوە موسلمانان ئەوەندە زانا نەبوون، ئەو ئەرکەی بۆیان دەسنیشانکراوە سادەو ئاسانبووە. نەگەیشتبوونە ئەو رادەیە پەی بە

(حیکمەتی خوایی) ببەن، خوا بۆ خۆی ئاگادار بوو، یاسای زۆر سادەی بۆ دانان تاکو بتوانن پەیڕەوییبکەن. ئەمڕۆ نزیکەی هەشت سەدە بەسەر (کۆچ)دا تێپەڕیوە، لە بواری زانستەکانی ئیسلامدا هەزارەها کتێب نووسراونەتەوە کە هیچیان لە سەرەتای (کۆچ)دا نەبوون، لەگەڵ ئەوەشا هێشتا ئەرکی موسڵمانێکی سادە هەمان ئەرکی سەرەتای ئیسلامەو خوا شتێکی زیاتری لەو ناوێت، بەڵام کەسێك کە زانستی هەبێتو کتێب بخوێنێتەوە دەبێ پتر تێبکۆشێتو لە موسڵمانێکی سادە خوا ناستر بێت، دانایانیش لەم جۆرە کەسانەن!

روومکردە (صەباحەددین سونبولی)و لێم پرسی: ئایا تۆ لەگەڵ بۆچوونەکانی (وامق) دای؟! وتی بەڵێ، ئەی ئەمیر. وتم:ئەی بۆچی ئێوەی دانایان ئەم بابەتە بە سادەیی‌و بە روونی بۆ زانایان باس ناکەن تاکو ئەوان لە موسڵمانانی سادە باشتر خوا پەرستیبکەن، وەبۆچی ئێوە خۆتان بە وشەی (بتخانە)وە بەستۆتەوە؟! (صەباحەددین) وتی: ئەی ئەمیر، دوو هۆی سەرەکی هەن! یەکەم، نەزان ناتوانێ لە مەبەستی دانایان بگات، دووەم، بۆ ئەوەی بازاڕی زانایان کزنەبێ، لەگەڵ دانایاندا دوژمنایەتیدەکەن، چونکە دەزانن هەر کاتێ خەڵك بە شێوەیەکی راستو دروست خوایان ناسی ئیتر تۆزوگەرد مۆمی بوونیان دادەگرێت، بازاڕیان کەساس دەبێتو ناچار دەبن دووکانەکانیان داخەن! (مەنصووری هەلاج)و (عەینولقاضات)ی هەمەدانی لەبەر ئەوە کوژران چونکە دەیانویست بەزمانی سادەو روون چاوی خەڵك بکەنەوە. (مەنصوور) دەیگوت (انا الحق _ من حەقم) روونیدەکردەوە کە خوا لە هەموو شوێنێکا هەیەو جێیەك نییە کە خوای لێنەبێت، وە دەیگوت: کەواتە خوا لە خودی منیشدا هەیە! لە ئەنجامدا بەوە تاوانکار کرا، کە داوای خوایەتی دەکات!! کەچی هیچیان داوای خوایەتیان نەدەکرد. ئەمڕۆ گەر کەسێك بڵێ (انا الحق) یان بڵێت خوا لە توێی مندا هەیە، بێ یەکو دوو بە تاوانی کفر دەیکوژن، تا ئەو رۆژەی زانستی تەواو دەگاتە هەموو کونو قوژبنێکی ئەم سەر زەمینەو هەمووان تێدەگەن، ئەم بارو دۆخە دژوارە هەروا دەبێتو دانایان ناتوانن بە زمانی روونو سادە مەبەستی خۆیان دەربڕن.

بۆم دەرکەوت کە (شێخ حەسەن بن قوربەت) راستە، دانایانی شیراز لە زانایانی ئایینی بلیمەتترنو زانیارییان پترەو ئەو شتەی دەیڵێن ئاوەز پەسەندی

دەکاتو چاك شارەزای قورئانن، لە گفتوگۆدا پشت بە ئایەتەکانی دەبەستن.
پاشان رووی دەمکردە (حافظ)، وتم: ئایا ئەم تاکە هی تۆیە؟:

ساکنان حرم سترو عفاف ملکوت
با من راەنشین بادە مستانە زدند

وتی: ئەی ئەمیر، بینایم کز بووە، لەبەر ئەوە چاك ناتبینم، بەلام چاك گوێم لێتە، بەڵێ، ئەو تاکە هۆنراوەیە هی منە. وتم: تۆ لەم تاکەدا کفرتکردووە، وتووتە: ژنەکانی خوا لە حەرەمخانەی خوادا دەرچوون، لە کەناری رێدا پێمگەیشتن، پێکەوە مەیمان نۆشیو سەرخۆشبووین!
لەوەلامدا (حافظ) وتی: ئەی ئەمیر، من کفرم نەکردووەو سووکایەتیم بە خوا نەکردووە. لە نیوەی یەکەمی ئەم تاکەدا وتوومە (ساکنان حرم سترو عفاف ملکوت) هەردوو وشەی (سترو عفاف) دەیسەلمێنن کە مەبەست لە حەرەمخانەی خوا حەرەمخانەیەکی ئاسایی نییەو بە هێما ناوی هێنراوە، رازی ئەو بۆ خەڵك ئاشکرا نییە، لەوێدا داوێنپاکی فەرمانرەوایە. من نەمگوتووە لە حەرەمخانەی خوادا ژن هەیەو ناوی ژن لەم تاکەی مندا نییە، وتوومە (ساکنان حرم) نەمگوتووە (زنهای حرم) واتە (دانیشتووانی حەرەم) نەك (ژنانی حەرەم)، واتە شوێنێك ئەوەندە پیرۆزە کە جێی بێگانە نابێتەوە... من ئەم تاکەم لەبەرە بەیانێکی بەهاردا وتووە، هەواکەی ئارەزوومەندانە بوو، بۆنی گوڵانی شیرازی دەدا بەدەماخما، هەستم بە شادیدەکرد، گوێم لە ئاوازی بولبولانبوو، ئەوەندە خۆشیمبوو هەستمدەکرد لە هەموو بوونەوەرێکی خواییدا هاوبەشمو فریشتەکان لەتوێی بوونمانو منیش چوومەتە ناو دەقی بوونیانەوە؛ لە گەرمەی جۆشو خرۆشدا ئەم هۆنراوەیەم چڕاند!
پرسیم: لە نیوەی دووەمدا وتووتە: (فریشتەکان لەگەڵما مەیان نۆشیو سەرخۆشبوون. ئەی نازانی مەی حەرامە؟! حافظ وتی: ئەی ئەمیر، مەیخواردنەوە زاراوەیەکی خواناسییە، بە واتای خواردنەوەی شەراب نایەت، بەڵکو واتاکەی وەرگرتنی زانینە لەو کەسانەی کە خاوەن تێگەشتنن. هەرچۆن شەرابی ئاسایی حەرامەو مرۆڤ سەرخۆشدەکات، هەروا کەسێکیش ئەو زانستو زانینە وەرگرێت سەرخۆشدەبێت. لەلای دانایان وشەی مەیخانە شوێنێکە کە زانستی تیا وەردەگرن. لەو بەرەبەیانەدا ئەوەندە کەیفو خۆشیمبوو، هەستمدەکرد فریشتەکان بە گەرمی دەمدوێنن، باسو رازی بوونم

بۆ ئاشکرا دەکەن، لەبەرئەوەیە وتوومە لەگەڵما شەراب دەخۆنەوە!.. پرسیم: ئەو باس و رازە چیبوو؟! حافظ وتی: ئەی ئەمیر، لەو بەرەبەیانەدا هەستمدەکرد فریشتەکان نهێنیی بوونم بۆ ئاشکرا دەکەن، هەستم بە خەیاڵێکی قووڵ دەکردو بۆم نەدەهاتە سەر زارم، ئەگینا دەمخستە چوارچێوەی هۆنراوەیەکەوە. هەر دانایەك کە نوقمی ئەندێشەیەکی قووڵە هەست بە کۆمەڵێ شت دەکات کە ناتوانێ بە زمان دەریانبڕێ، چونکە بەشێکیان هی وتن نییەو ناتوانرێ لە چوارچێوەی هۆنراوە، یان پەخشاندا دابڕێژرێ؛ ئێمە ناتوانین هەستپێکراو، وەك ساردی و گەرمی، نەرمی و زبری بڵێین و بنووسین و هەر کەس ببیستێ بە ئاسانی تێدەگات، بەلام ناتوانین بە ئاسانی و بە سادەیی هەست پێکراوە مەعنەوییەکان بخەینە بەرچاو، چونکە بیسەر لە مەبەستمان ناگات. من وا هەستدەکەم مرۆڤ، ئەگەر داناش نەبێ، لە بەرەبەیانێکی بەهاریدا کە بۆنی گوڵان هەڵدەمژێت و بولبولەکان دەخوێنن و هەوا زۆر خۆشەو بانگی بەیانی بەر گوێیی دەکەوێ هەست بە شتێك دەکات کە بە هیچ جۆرێ دەرنابڕدرێ. لەبەرئەمەیە کە ناتوانم بڵێم بەپێی بۆچوونی من فریشتەکان چییان پێ وتم، ئەو باس و رازانەی بوون کە لە نێوانمانا هاتنە کایەوە چۆنبوون، ئەگینا بە گوێرەی بۆچوونی خۆم هەرچیم لەوان ببیستایە دەمخستە چوارچێوەی هۆنراوەوە!

وتم: ئەی پیاوی قسەخۆش، چاك وەلامی منت دایەوەو قایلتکردم ئایا راستە تۆ قورئانت لەبەرە؟ وتی: بەڵێ، ئەی ئەمیر. وتم: لە کۆتاییییەوە بۆ سەرەتا، ئایەت بە ئایەت سورەتی (الأعراف) بخوێنە. وتی: ئەی ئەمیر، ناتوانم. وتم: ئەگەر تۆ قورئانت لەبەربێ دەشێ بتوانی. پاشان وتم: ئێستا تۆ من تاقیبکەرەوە، کام سوورەت دەڵێی با لە کۆتاییییەوە بۆ سەرەتاکەی ئایەت بە ئایەت بیخوێنم! وتی: ئەی ئەمیر، من ئەم بێ ڕەوشتییە ناکەم کە پیاوێکی وەك جەنابت تاقیبکەمەوە! وتم: خۆم مۆڵەتتدەدەم، تاقیمبکەرەوە. حافظ سووڕەتی (البقرة)ی دەستنیشانکرد، منیش لە کۆتاییییەوە دەستمپێکرد، دوای خوێندنی حەوت ئایەت حافظو داناکانی تر بانگی ئافەرینیان بڵند بوو، حافظ وتی: ئەی ئەمیر، پێدێم کە بەرانبەر بە دانشمەندێکی وەك تۆ خۆم بە (حافظ القرآن) نازانم.

# بیستەمین بەش

## گەشتێك بە وڵاتی لوڕستاندا

زۆر حەزمدەکرد کە پتر دانایانی شیراز ببینمو لەگەڵیانا دانیشمو گوێ لە وتەی بەپێزو بەچێژیان بگرم، بەلام هەواڵم پێگەیشت کە سوڵتانی لوڕستان (ئەتابەگ ئەفراسیاب کوڕی یوسف شا) لەکاتی تێپەڕبوونی سەدو پەنجا سواری منا بە ناوچەی ئەودا، داوای سەرانەی لێکردوون، لەبەرئەوەی سەرانەیان نەداوە هەموویانی کوشتوون. دوای بیستنی ئەو رووداوە، هەریەکە لەو داناییانەی میوانمبوون هەزار دیناری زێڕم پێبەخشیو (شێخ حەسەن)یش کە هەزار دیناری وەرگرتبوو، پێنج سەد دیناری دیکەم دایە. (میران شا)م کرد بە فەرمانڕەوای فارس، داوامکرد کە هیچ کاریەدەستێ لانەبات بۆئەوەی هەموویان بە ئەمەکداری بمێننەوەو پەنا نەبەنە بەر پیلانو گێرەشێوێنی. پاشان سوپامکرد بە سێ بەش، بەشێکم بۆ میران شای کوڕم بەجێهێشتو بە دوو بەشەکەی ترەوە بەرەو لوڕستان کەوتمەڕێ.

لە هەر هەوارگەو مەڵبەندێکدا کە دەربارەی لوڕستان لێکۆڵینەوەمدەکرد، دانیشتووان دەیانگوت وا باشترە کە روو نەکەمە ئەو وڵاتە چونکە ناوەندی تایبەتی (ئەفراسیاب) لە پشتکۆیە، هەر لەشکرێ بچێتە ئەوێ لەناودەبرێ لوتکەی کێوەکانی گەیشتوونەتە ئاسمان، چەمو دۆڵەکانیشی ئەوەندە قووڵن کە مرۆڤ سەرسامدەکەن. هەروەها وتیان: ئەگەر بتەوێ لەو چەمو دۆڵانە بدەیت دەبێ ئەوە بزانی کە تەنها سەد سەربازی (ئەتابەگ) دەتوانن سەد هەزار سەربازی تۆ لەناوبەرن! رووباری وا گەورەی لێیە کە هیچ لەشکرێ ناتوانێ لێیبدات. زوربەی پیاوانی لوڕستان بالایان دوو گەز دەبێت، کە لە کێوەکان هاوار دەکەن بەردی گەورە گەورە بەردەبنەوە؛ سەدو پەنجا ساڵ دەژین، ژنانی لوڕستان لە پشتکۆ تا تەمەنی هەشتا ساڵیش منداڵیان دەبێت. خەڵکی ئەو ناوچانە وتیان: ئەی ئەمیر، چاکتر وایە لە خوێنی ئەو سەربازانە چاوپۆشیبکەیتو خۆت تووشی سەخڵەتی نەکەیت! ئەگەر سوڵتانی لوڕستان لە (حوسێن ئاباد) بێت، کە پایتەختی وڵاتە، دەستت نایگاتێ، چونکە ناتوانی لە کێوەکانو چۆمەکانو رووبارەکان بدەیت، لە هەندێ ناوچەدا لەبەر زۆریی

جەنگەڵی چڕوپڕ ئەوەندە تاریکەو نووتەکە دەبێ بە ڕۆژی نیوەڕۆ چرا داگیرسێنی.. زۆر شتی تریان بۆ باسکردم، تەنانەت وتیان ئەسکەندەر نەیتوانیوە بچێتە لوڕستان، تۆ چۆن دەتەوێ بڕۆیتو لەگەڵ (ئەتابەگ)دا بجەنگی؟!

ئەوانەی ئامۆژگارییان پێشکەشکرد لە مێژوو بێئاگا بوون، نەیاندەزانی کە ئەسکەندەر هیچ کارێکی بە لوڕستان نەبووە.. ئاگادار بووم کە لە ڕۆژئاوای لوڕستانا زنجیرە شاخێکی بڵند هەیە، بۆ ماوەی شەش فرسەنگ درێژدەبێتەوە، لەبەرئەوە هەرگیز لەوێوە لەشکر نەچۆتە ناو لوڕستانەوە، بەڵام لەلای ڕۆژهەڵاتەوە دەتوانرێ هێرشببرێتو (حسێن ئاباد)یش بگیرێت. کە پێمنایە خاکی لوڕستانەوە لەشکرەکەم بە شێوەی جەنگو ئامادەبوونەوە کەوتەخۆو ڕێی دەبڕیو بەرەو پێشەوە دەچوو. ڕۆژێکیان دەمەو ئێوارە گەیشتینە ناوچەیەکی نزیك بە دەربەرندێك کە دەمزانی تێپەڕبوون پیایدا ئاسان نییە. چەند خانووچکەیەکو ئاشێك دەبینران، لەسەر تەپۆڵکەیەك پیرەمێردێکی باڵابەرزو چوارشانەی ریشسپی بە تەپلەیەکی گەورەوە بەدیار برێك مەڕو بزنەوە دەبینرا، داوامکرد ئەو پیرەمێردە بێنن بۆ لام. پیرەمێرد بە باڵایەکی وەك تیری ڕاست، بێئەوەی هیچ سڵێکم لێبکاتەوەو لە سەرو شێوەم بترسێ هاتە پێشێو پرسی: چ کارێکت بە من هەیە؟! وتم: ئەم ئاواییە ناوی چییە؟ وتی: ناوی (ئاشی ئیزە)یە. پرسیم: چ کارێ دەکەی؟ وتی: ئاشەوانم. پرسیم: چەند ساڵە؟ وتی: پەنجا ساڵە. پرسیم: تەمەنت چەندە؟ وتی: تەمەنم سەدو بیست ساڵە! داوام لێکرد کە نزیکتربێتەوە بۆئەوەی سەیری ددانەکانی بکەم، کەچی تووڕە بوو، وتی: بۆچی ئەسپم تا سەیری ددانەکانم بکەی؟! وتم: نا، دەمەوێ بزانم چەند ددان لەدەمتان. کە پیرەمێرد دەمی داپچڕی، دوو ریز ددانی سپیو سەدەفیم بینین بریسکەیان دەهاتو هیچ کەل نەبووبوون. پرسیارمکرد: پێش ئاشەوانی چیتدەکرد؟ ئاماژەی بۆ کێوەکان کردو وتی: لەوێدا ژیاوم، لەنێوان ئێمەو خێڵی (پیران وەند)! دوژمنایەتی پەیدا بوو، ئیتر نەمتوانی لەوێدا بژیم. پرسیم: ئەی تۆ لە کام هۆزی؟ وتی: لە هۆزی (راوەند)م. پرسیم: پاشای لوڕستان (ئەتابەگ ئەفراسیاب) دەناسی؟ لە سەرو چاویا نیشانەی رقێك دەرکەوت، پاشان وتی: بەڵێ، ئەو بێگانەیە دەناسم! وتم: لە باووباپیرانیەوە، سەدو شەست ساڵ دەبێ فەرمانڕەواییەکەن، چۆن بە بێگانەیان دەزانی؟! وتی: ئەفراسیاب خەڵکی لوڕستان نییە، باپیرەی ناوی (ئەتا بەگ ئەبو طاهر)ە،

لـە وڵاتـی (خوزسـتان)ەوە هاتووەتـە ئـێرەو بۆتـە فـەرمانڕەوای ئـەم وڵاتـە، پشتاوپشت وەچەکەی بوونەتە فەرمانڕەوا. بـاوکم چـاوی بـە (ئەتابـەگ ئـەبو طـاهر) کـەوتووە، دەڵێت: پیاوێکی بچکۆلە بوو، کە پیاو دەیبینی وایدەزانـی منداڵە. بەداخەوە باوکم ماوەیەکە لە جێگادا کەوتووە، ئەگینا دەمهێنایە ئێرە تاکو بۆ خۆی هەموو سەرگوزشتەکانت بۆ بگێڕێتەوە. پرسیم: تەمەنی باوکت چەند ساڵە؟! وتی: سەدو حەفتا ساڵە! وتم: دەبێ باوکت ببینم. لەگەڵ هەندێ ئەفسـەردا پیرەمێردەکـە بردمـی بـۆ خانوویـەکی بچکۆلانـە، پـیرەمێردێکی زۆر پیرمـان بینـی، پاڵیدابوو بە دیـوارەوە هـەردوو پێـی لێدرێـژ کردبـوون، سـەری رووتبوو، تووکی پێوە نەمابوو، ریشێکی سپیو درێژی بەردابووەوە، پیرەمێردە رابەرەکـە بـە زمـانی لـوڕی منـی بـە باوکـە زۆر پیرەکـەی ناسـاند. کـە کەوتـە قسـەکردن بـۆم دەرکـەوت ددان لـە زاریـدا نـەماوە. بـە درێـژی باسـی هـەموو سەرگوزشتەو رووداوەکانی بۆ کردم. پاشان لێم پرسـی: مامە پیرە، تەمـەنت چەندە؟ وتی: تەمەنم سەدو حەفتا ساڵە! وتم: ئەی پیاوی دنیادیدە، کاری زۆر پێویستم هەیەو دەبێ بڕۆم، ئەگەر وانەبوایە لێرە دەمامەوەو تا هـەرچیت دیـوە بۆمی بگێڕیتەوە! پیرەمێردە زۆر پیرە وتی: خۆت دوامەخەو بڕۆ بەسەر کاری خۆتەوە، چونکە چاوەکانی من بێجگە لە کێوو چەمو دۆڵو دارستانو جەنگەڵی بەرِوو، رەوەمەڕە کێوی شتێکی تریان نەدیوە.

دوای ئـەوەی لـە مـاڵی پـیرەمێردە بەتەمەنەکـە هاتینـە دەرێ لـە کوڕەکـەیم پرسی: ناوت چییە؟ وتی: ناوم (گیـو)ە. وتم: دەمـەوێ بچم بۆ (حسێن ئاباد)، ئایا ئامادەی وەك شارەزاو رێگـەوان لەگـەڵما بێیـت؟ (گیـو) وتـی: ئەگـەر لـەم دەربەندەوە بڕۆی مەگـەر ئەسپ نەبەیت چونکە رێگەکە زۆر تەسكو باریکـەو ئەسپەکان دەخلیسکێنو بەردەبنەوە، بەڵام رێیـەکێ تر هەیـە پـازدە رۆژ درێـژە دەکێشێت، تـەنیا هـەر رووبـاری (سـێمەڕە) دێتـەڕێت، ئـەویش بـواری هەیـەو دەتوانی لێیبدەیـت.. بـۆ شـەوێ بەشـێك لـە دەسـتەی رێگاوانـانو پێشـەنگان ئاگاداریانکردم کـە رێـی دەربەندەکە زۆر ترسـناکە، بۆچوونـەکانیان دەقـاودەق وەك قسـەکانی (گیـو) بـوون. بـەیانیی رۆژی دوایـی (گیـو) سەرپەشـتیکردنی باوکی بە خزمێکی خۆی سپاردو ئامادەبوو لەگـەڵما بێت. داوامکـرد ئەسپێکی باشـی بـۆ ئامـادە بکرێـت، کـەچی ئـەو پیـاوە بەتەمەنـە ئامـاژەی بـۆ هـەردوو پێیکردو وتـی: ئەسپی من ئەمانەن کە سـواریاندەبم چـاك رێدەبـڕن!.. (گیـو) راستی وت، بەبێ ئـەوەی هەسـت بـە ماندوویـەتی بکـات پێبەپێی ئەسـپەکان

رێیدەکرد. ئەو ناوچەیەی پێیدا دەڕۆیشتین کوێستانبوو، بەلاّم سوارەکان نەیانتوانی پیادا بڕۆن.

رۆژێکیان دەمەو عەسر دەنگێکی تێکەڵو پێکەڵو بەهێز هاتە بەر گوێم، (گیو) وتی: ئەوە دەنگی تاڤگەی (سێ‌مەرە)یە. تا بەرەو پێشتر بڕۆیشتینایە دەنگەکە ئاشکراترو زۆرترو گەورەتر دەبوو. کە شەو داهات گەیشتینە شوێنێ، بەقسەی (گیو)، نیو فرسەنگمان مابوو بۆ تاڤگەکە، ئەسپەکانمان لە هیچ شتێ سڵیان نەدەکردەوە، چونکە لەگەڵ دەنگی گوڕەپانی شەڕدا راهاتبوون، تەنانەت لە تەقینەوەی بارووتیش نەدەسڵەمینەوە، کەچی لەو شوێنەدا کە لە کێوو دۆڵو شاخەکاندا نالەی تاڤگەکە دەنگی دەدایەوە، چونکە بۆ ئەسپەکان تازە بوو، زۆر سڵیانکردەوە، ماوەیەك ئالیکیان نەدەخوارد، پاشان وردە وردە لەگەڵ دەنگەکەدا راهاتنو دەستیانکرد بە لەوەڕان. بۆ رۆژی دوایی، بەیانی زوو بەرێبووین، کە گەیشتینە تاڤگەکە دابەزیم بۆ ئەوەی باشتر ببینم، هەستمکرد کە زەویی دەوروبەر دەلەرێتەوە. (گیو)، بۆ ئەوەی گوێم لێبێ بە دەنگی بەرز هاواریکردو وتی: ئێستا ئاوی چەمەکە کەمە، بەهاران کە زۆر دەبێ بە دەنگو هاژەو هاڕەی تاڤگەکە بەرد لە کێوەکانە بەردەبێتەوە. هەروەها وتی: ئەم رووبارە چەند تاڤگەیەکی تری لەسەرن، بەلاّم ئەمە لە هەموویان مەزنترە. من بۆ خۆم بەرزیی تاڤگەکەم بە سی گەز خەملاّند.

دوای سەیربکردنی تاڤگەکە (گیو) پێشمانکەوت تا گەیشتینە بواری پەڕینەوە، لەو شوێنەدا رووبارەکە نزیکەی چوار سەد گەز پان بوو. دوای ئەوەی دڵنیا بووین کە گۆمو چەپەکی قووڵی تیا نییە، بە بێ ترس لەگەورەترین رووباری لوڕستان پەڕیینەوەو بەرەو پێشەوە بەردەوامبووین. رۆژێکیان سوارە پێشەنگەکان هەواڵیاندامێ کە گەیشتوونەتە ناوچەیەك رێی سوار نییە پیادا بڕوات . (گیو) وتی: جەنگەڵێکی داربەڕووی چڕوپڕ لە پێشمانەوەیە، بۆ ئەوەی لەوێوە سەرکەوینو لەو دیوەوە داگەڕێین دەبێ سوارەکان دابەزنو رەشۆی ولاّخەکانیان ڕاکێشن. کە گەیشتنە دارستانی ناوبراو، سەرنجمدا کە لەدارستانەکانی (ئاستەر ئاباد و مازندەران و گەیلان) چڕترو پڕتر بوو، سەراپای دارستانەکە داربەڕووبوو.(گیو) هەندێ داربەڕووی پیشاندەدام و دەیگوت : تەمەنی ئەو دارانە هەزار ساڵ دەبێ!... وا دیاربوو کە ئێمە یەکەمین کۆمەڵە رێبوار بین لەوێوە بڕۆین .

دەمەو نوێژی نیوەڕۆ گەیشتینە سەر کێوەکە، کە داگەڕانمان دەستی پێکرد، بەودیویشا سەراپای کێوەکە دارستانی چڕبوو.کێوەکە ئەوەندە لێژ بوو ترسام

ئەسپەکانمان تلبینەوە، لەبەر ئەوە داوامکرد گوریس لە ئەسپەکان ببەستریٚ و سەربازەکان ئەسپەکان پێش خۆیان بدەن و توند گوریسەکان بگرن و خۆشیان بدەنە پاڵ دارەکان تا بتوانن زۆرتر ئاگاداری ئەسپەکانبن. کە ڕۆژ ئاوا بوو هێشتا نیوەی سوارەکانمان دانەگەڕابوون، بەوەی باشبوو تریفەی مانگەشەوی چواردە یاریدەی زۆری داین، لەگەڵ ئەوەشا زۆر بە ئاگاو وریا بووین، بەلاّم نزیکەی پەنجا ئەسپمان، یان تیا چوو ن یان شەل و سەقەتبوون، نزیکەی سەد سەربازیشمان زامدار بوون، باشبوو برینەکانیان زۆر سەخت نەبوون. کەمێك دوای نیوەشەو گەیشتینە دامێنی کێوەکە، هەرچەندە زۆریش ماندوو بووم، بەلاّم نەخەوتم، تابەیانی بەناو لەشکرەکەما دەهاتم و دەچووم و سەرپەرشتیمدەکردن. دوای نوێژی بەیانی کەمێك پشوومدا. (گیو) وتی: بەرۆژێك کەمتر دەگەینە(حسێنئاباد) ، بەلاّم دەبیٚ بە جۆریٚ بڕۆین کە سەر لەبەیانی ڕۆژی دوایی بگەینە ئەویٚ . دوای ئەوەی لەبارودۆخی ئوردووگەکەم دڵنیا بووم خەوم لێکەوت. زۆری پیٚ نەچوو بەدەنگی شەیپوور خەبەرمبووەوە، وتم چ باسە ؟! وتیان دەستەی پێشەنگ هەواڵیداوە کە لەشکرێکی پیادە بەرەو ئێمە دێت و ئاشکراشە کە لە(حسێنئاباد)ەوە هاتووە. لە(گیو)م پرسی: (ئەتابەك ئەفراسیاب) چۆن بەم لەشکرکێشییەی منی زانیبیٚ؟! وتی: لە ئاشی (ئیزە) خەڵك لەشکری تۆیان بینی، بیٚگومان وای بۆ چوون کە تۆ نیازی (حسێنئاباد)ت هەیە، کە ڕێگەشت گۆڕی بۆیان دەرکەوتووە کە دەتەویٚ لە لایەکی ترەوە بڕۆی. نێوان ئاشی(ئیزە) و(حسێنئاباد)یش زۆر نییە ، بۆیە (ئەتابەك)ی لوڕستانیش بە لەشکرەکەیەوە بەڕێبووە تا ڕێت لێبگرێت .

هێشتا تارمایی لەشکری لوڕستان دەرنەکەوتبوو ، ئێمە ئوردووگەمان پێچایەوەو هەموو سوارەکانم ئامادەی نەبەردی جەنگبوون. لەشکرەکەممکرد بە چوار بەشەوە: سیٚ بەش بۆ قۆڵەکان و ناوجەرگەی سوپا، بەشێکیشی بۆ یەدەك. ئینجا لەشکری (ئەتابەك) لە دەربەندێکەوە دەرکەوت، کە کەوتبووە لای خوارەوەی کێوەکە. ئەوەندەی بینایم بڕیدەکرد ڕم و نێزەم بەدەست سەربازی دوژمنەوە نەدی، دیاربوو هەموویان چەکی کورتیان پیٚبوو، بەلاّم ژمارەیان زۆربوو، بەبۆچوونی من هەشتاهەزار سەرباز دەبوون. کە لەیەکتر نزیکبووینەوە سەرنجمدا پێداویستییەکی ئەوتۆی جەنگیان پیٚنەبوو ، هەموویان کەڵەگەت و زەلام و ڕیشداربوون، دیاربوو هەندێکیشیان ڕیشسپیبوون، بەبیٚ ترس و لەرز هەنگاویان بەرەو پێشەوە دەنا، کە نزیکتر بوونەوە بە قۆچەقانی بەرد

بارانیانکردین. دەمودەست فەرمانی هێرشی گشتیم دەرکردو داوام لە(گیو) کرد بەشداری لە جەنگدا نەکات و لەدواوە بێ بۆ ئەوەی نەکوژرێت. تەورەدەسکدرێژەکەم بەدەستی چەپمەوە گرت و جڵەوی ئەسپەکەشم بەدەستی ڕاست گرت و بەرەو ڕووی دوژمن هێرشم کرد. هەموومان خۆمان نووساندبوو بە پشتی ئەسپەکانمانەوە، جاربەجارێك سەرمان ڕاستدەکردەوە بۆئەوەی بەردەمی خۆمان ببینین. بۆ خۆم لەیەکەمین ڕیزدا بووم، ئەسپەکەم تاوداو پێشترکەوتم، جارێکی تریش بەسەربازەکانی خۆمم سەلماند کە لەجەنگدا گیانی خۆم لەگیانی ئەوان بەزیاتر نازانم. کە دەستمان گەیشتە دوژمن بە نەعرەتەو بەدەنگی بڵندەوە کەوتینە شمشێرو تەوروەشاندن. ڕەشۆڵی ئەسپەکەمم کردە ملم و بەدەستی ڕاستم شمشێرم هەڵکێشا . سەربازانی دوژمن بەتەور گورزو شیر دەجەنگان و هیچ سڵیان نەدەکردەوە، لە لای چەپمەوە یەکێك لە لوڕەکان بەیەك گورز ئەسپێکی لەپێ‌خست، پێش ئەوەی بگەمە سەری، بەگورزێکی کە سوارەکەشی کوشت، تەورێکم بۆ تەوقەسەری داهێنایەوە، کەللەسەریم یەکالاکردەوە، هاوارێکی کردو گورزەکە لەدەستی بەربۆوە، پاش ساتێ ئەسپەکانمان دایانشێلا . لەلای ڕاستیشمەوە شمشێرێکم بۆ داهێنرایەوە خێرا دەستبەکاربووم، شیرێکم کێشا بەقوڵی سەربازە لوڕەکەداو لەکار کەوت و بوو بە ژێر شەپۆلی سوارەکانمەوە .

فەرماندە بالاکانم ئەرکی خۆیانیان دەزانی و لێیان دڵنیا بووم، لەگەڵ ئەوەشدا لەناوجەرگەی جەنگەوە دوو تەتەرم ناردن تا ئاگاداریانبکەن کە دوژمن زۆرسەرسەختانە دەجەنگێ، هەوڵبدەن کە دەوریان بگرن و لەپشتەوە هێرشبەرنە سەر هێزەکانی(ئەتابەك). لەهەمان کاتدا هەرچاوەو چاو بووم سابەڵکو سوڵتانی لوڕستان دەسنیشانبکەم، بەڵام دیار نەبوو. هەموو سەربازەکانی دوژمن تەپلەیەکی گەورەیان لەسەردابوو هێندەی مەنجەڵێکدەبوو، ڕەنگی ڕەش، یان خورماییبوو، لەلباد دروستکرا بوو. هەرچەندە لوڕەکان زۆر نەبەردانە دەجەنگان، لەگەڵ ئەوەشدا سوپای من توانی گەمارۆیانبدات، بەزووترین کات ئاگادار کرام و لەناوجەرگەی سوپاوە هێرشی توندترمان کرد و لەقوڵەکانی تریشەوە سەربازەکانم هێرشیانکردە سەر دوژمن. لەناکاو سوارێك کەڕدێنێکی ڕەش و درێژی بەردابۆوەوە، گورزێکی گەورە بەدەستەوەو تەپلە لبادێکی ڕەش و گەورەی کردبووە سەری، بەدەورەی تەپلەکەدا شاڵی بەستبوو، هاواریکرد:( تەیموورشا) کێیە؟! بانگمکرد: ع

کارێکت بە (تەیموورشا) هەیە ؟! وتـی: دەمـەوێت لەگـەڵیا بجـەنگم! پرسـیم: تۆکێیت ؟ وەڵامیدایەوە: من (ئەفراسیاب ئەتابەکی لوڕستانم)!لەسەرو سیمایدا دیاربوو کەئـەوە، چونکـە جگەلـەوەی لوڕەکـان ڕێزیـان لێدەگـرت، پۆشـاکی بەنرخی پۆشیبوو، خەنجەرێکی پڕلەگەوهەری کردبووبە بەردا. بانگمکرد: من بۆ نەبەرد ئامادەم، بەسەربازەکانت بڵێ کە مەیدان چۆڵبکەن!... سەربازەکانی کشانە دواوەو مەیدان چۆڵبوو، سەربازەکانی منیش کشانە دواوەو گۆڕەپانمان بـۆ ئامـادەکرا. لەهـەمان کـاتدا لەهـەموو قۆڵەکانـەوە سـەربازەکانم فشـاریان بۆسـوپای دوژمـن هێنـا بـوو، دەیانویسـت کـەلێن بخەنـە ناویـان و بـەش بەشیانبکەن، لێکیـان دابـڕن، یـان لەناویانبـەرن، یـان ناچاریانبکـەن خۆیـان بەدەستەوە بـدەن، بـەڵام لـەو شـوێنەدا کـەمن و ئەفراسـیاب بەرانبـەر بەیـەکتر وەستا بووین بەشێوەیەکی کاتی بارودۆخەکە هێور بوو. کە سەرنجی سوڵتانی لوڕەکانمدا بۆم دەرکەوت وەك لوڕەکان کەڵەگەت و زەلام نییە! هاواریکرد: ئەی تەیموورشا تۆ بەهەردوو دەست چەکت هەڵگرتووەو من بەدەستێکم، چەکێکیان لابـە تـاکو هاوتـایین. وتم : خـوا بۆیـە دوودەسـتی بـەمرۆڤ بەخشـیون تـا هـەردووکیان بەکاربـهێنێ، ئـەگینا هەریـەك دەسـتی ئەدایـە، لەگـەڵ ئەوەشـدا ئامادەم چەکێکم وەلاخـەم، تۆ خۆت بڵێ کامیـان لابەم؟! وتی: چەکی دەسـتی ڕاسـتت! دیـارە بۆیـە وای وت وای دەزانـی ڕاسـتەم و دەسـتی چـەپم بـاش بەکارناهێنم. پاش ئەوەی شیرم خستەوە کێلان (ئەتا بەك) ئاوزەنگی لێـداو بەشێوەی کەوانەیی هێرشیکردە سەرم. بێدەنگییـەکی سـامناك باڵیکێشـابوو بەسـەر سـەربازانی هـەردووکمانا، هـەموویان چـاوەڕێی ئـەنجامی جـەنگی هەردوولامانبوون. منیش ئەسپی خۆمم تاوداو بەپێچەوانەی ڕێڕەوی (ئەتابەك) هێرشمکرد، کـە گەیشـتە ئاسـتم گورزێکـی بـۆ داوەشـاندم، منیـش لغـاوی ئەسپەکەمم تونـد کـردەوەو لەسـەر هـەردوو پاشـووی ڕاسـتبووەوە، گورزەکـە بەرسەرم نەکەوت، ڕێکی لەشم هاتە خواری‌و بەرپێی چەپم کەوت، بەهـەموو هێزێکمەوە تـەورێکم بـۆ داهێنایـەوە، لەگـەڵ داهێنانـەوەی هـەردوو چـەپۆکی ئەسپەکەما، تەورەکەم دا لەڕانی، ئەوەندە لێدانەکەم کاریگەر بوو ئێسقانی ڕانی هەلاهەلا کرد ، (ئەفراسیابی یوسف شا) سەری بەسـەر زینەکـەدا شـۆڕبووەو گورزەکەی لەدەست بەربووەوە!... دوای ئەوە زانیم کە لوڕەکان دەست بەهێرش دەکـەن، شمشـێرم هەڵکێشـاو فـەرمانی هێرشـی بـەرەنگاریم دەرکـرد. لـەنێوان هـەردوولادا لەسـەر لاشـەی بەپووکـەش بێگیـانی (ئەتابـەك) شـەڕێکی ترسـناك

ڕوویدا، لەئەنجاما سەربازەکانم توانیان سوڵتانی لوڕستان دیلبکەن، بە چەند سەربازێکم وت کە بیبەنە دواوەی گۆڕەپانی جەنگ و بیدەنە دەست هێزی یەدەکمان، چارەسەری سەرەتایی بۆ بکرێت‌و چاك برینەکەی ببەستن . دوای ئەوە فەرمانمدەرکرد لەهەموو قۆڵەکانەوە بەبانگی بەرز لوڕەکان ئاگادار بکەن کەمن تەنها بۆ سزادانی (ئەتابەك_ ئەفراسیابی یوسف شا) هاتووم کەسەدو پەنجا سواری منی کوشتووون، من نەمویستوە لەگەڵ لوڕەکاندا شەڕبکەم ئێستاش من ئەوم بریندارو دیلکردووە، ئەوانیش چەکەکانیان دابنێن و خۆیان بەدەستەوە بدەن، دڵنیا بن کە هیچیان زیانیان پێناگات بەڵام لوڕەکان بەقسەی جارچییەکانمان قایل نەبوون و هەرشەڕیاندەکرد. وای بۆچووم کە لەزمانی جارچییەکان نەگەیشتن بۆیە داوام لە(گیو)کرد بەلوڕی ئەو قسانەیان بۆ دووبارە بکاتەوە. (گیو) سواری ئەسپێك بوو، مەبەستی منی لە لوڕەکان گەیاند کەچی لەسەر شەڕکردن سوور بوون، دەیانگوت ئەتابەکتان بەدیلی بردووە، بماندەنەوە! بە(گیو)م وت تێیانگەیەنێ کە (ئەتابەك) دیلی منەو نایدەمەوەو ناشتوانن بەشەڕ لێم بسێننەوە، ئەگەر زۆریان بۆ هێنام، ئەوسا دەیکوژم و لاشەکەیان دەدەمەوە. سوودیان لەوەدایە چەك دانێن و بڕۆن، ئەوسا نەدەیانگرم و نەسەرانەو باجیان لێدەسێنم، بەڵام ئەگەر بەرگریبکەن و سەربازی ترم لێبکوژرێن، دوای سەرکەوتنمان بەپێی دەستووری ڕەوشی جەنگ لەگەڵیانا ڕەفتار دەکەم!

دوای ئەوەی (گیو) بۆیان دوا، لەنێو خۆیانا کەوتنە ڕاپرسی، دەرکەوت کە وتەکانمان کاری تێکردوون. پیاوێکی ڕیشسپییان لەگەڵ هەندێکیانا وتووێژێکی کورتی کرد، پاشان شتێکی بەمن وت تێنەگەیشتم، (گیو) وتی: ئەم پیاوەو نۆکەسی تر ئامادەن لەجیاتی (ئەفراسیاب) دیلبن، بەومەرجەی بەریبدەی. بەگیوم وت تێیانبگەیەنێ لەبری دەکەس هەزار کەسیشبن من ئەفراسیاب بەرنادەم،ئەو زامدارە ، ئەگەر بەو برینە مرد، وا لاشەکەی دەدەمەوە دەستیان، خۆ ئەگەر بمێنێ دەیبەمە ئەو شوێنەی کەسەدو پەنجاسوارەکەمی تیا کوشتوون، لەوێ لەپاڵ ئەوانا دەینێژم تا ڕەوانی سوارەکانم ئاسوودەو ئارامبێ ، پاشان بەگیوم وت: بزانە ئامادەن چەك دانێن و بڕۆن بەسەرکاری خۆیانەوە ، یان دەبێ تادوا کەسیان بکوژم و دیلبکەم!

سەرنجمدا هێشتا دڵەڕاوکێیانبوو، بەڵام لەبەر ئەوەی لەهەموو قوڵێکەوە گەمارۆ درا بوون ڕێی هەڵاتنیان نەبوو ، تێگەیشتن بەرگریکردنیان بێ ئەنجام و

بێکەڵکە ، ناچار چەکیان داناو خۆیان بەدەستەوەدا . داوام لە ئەفسەرەکانم کرد رێیانبدەن بچنەوە ماڵی خۆیان، ئەوانیش رێی کێویان گرتەبەرو بەرەو ماڵەوە-بوونەوەو بەتەواوەتی شەڕ کۆتاییهات.

کە خۆرئاوا بوو شنەیەکی خۆش لە کێوەکانەوە هەڵیکرد . هەرچەندە پێی چەپم لەشەڕی ئەو رۆژەدا کوترا بوو ، لەگەڵ ئەوەشا شا لە چادرەکەم هاتمە دەرێ بۆ ئەوەی ئەو شنەیە لێمبدات. برێك لەشەو تێپەڕی، مانگی پانزەشەوە دەرکەوت، مەیدانی جەنگی رووناککردەوە، بەهەزاران کوژراو و لاکی ئەسپی تێدا بوون، بەیناوبەین لەو دەشتەبەرینەدا تارماییەك دەجوڵا، چوارپەلی ئەسپێکی بریندار بوو.

بۆ رۆژی دوایی کوژراوەکانی خۆمانمان ناشتن، دوای ئێمەش لوڕەکان هاتن و کوژراوەکانی خۆیانیان ناشتن. لاکی ئەسپەکان هەروا مانەوە . دوای دەساڵ هەرکەس لەوێوە بڕۆیشتایە ئێسکوپروسکی ئەسپەکانی دەبینی و دەیزانی رۆژێك لەرۆژان لەو دەشتەدا جەنگێکی گەورە روویداوە.

ئەو شەوە کە سەرنجی تریفەی مانگم دەداو بەشنەی فێنك و خۆش شاد بووم، شەماڵ دەنگێکی بە گوێمدادا، لە لوورەی کۆمەڵێك گورگی زۆر دەچوو، (گیو)م بانگکردو پێم وت هێشتا هەوا ساردی نەکردووە تاگەلە گورگ بلوورێنن، ئەوە دەنگی چییە؟! گیو وتی: دەنگی شین و زاریی لوڕەکانە، لەو بنارکێوە کۆبوونەتەوە، لەروویان نایە بگەڕێنەوە ماڵەوە، چونکە نازانن چۆن وەڵامی ئەو خەڵکە بدەنەوەو دەربارەی سەرەنجامی (ئەتابەك)یش دۆش داماون، لەبەر ئەوە لەتاو نائومێدی شین و زاریدەکەن: وتم ئەوان جەنگاوەری نەبەردن، چۆنە وا دەگرین؟! وتی پیاوانی لوڕ هەرگیز ناگرین ، سامەگەر گەورەکەیان لەدەستبدەن. وتم: بڕۆ بزانە ئەتابەك چۆنە! .. پاش ماوەیەك گەڕایەوەو، وتی: باری تەندروستیی زۆر خراپە، هەرچەند هەوڵدەدەن خوێنەکەی ناوەستێتەوە، ئەگەر هەر وابێ زۆری پێناچێ دەمرێ. وتم: خۆی بەرپرسیاری مەرگی خۆیەتی، سوارەکانمی نەکوشتنایە با وای بەسەر نەهاتایە

بۆ دوا نیوەڕۆی رۆژی دوایی ئاگادار کرام کە (ئەتابەك) لەگیانەلادایە، کاتێ چووم سەیرمکرد راستە؛ دەمەو ئێوارە لەدنیا دەرچوو. هەندێك سوارم

لەگەڵ گیودا بەرەو لای لوڕەکان ناردن، بۆ ئەوەی گیو تێیانبگەیەنێ کە (ئەتابەك) مردووەو دەتوانن بێن و لاشەکەی ببەنەوە. لوڕەکان بەو هەواڵە ئەوەندە خۆشییانبوو، دەتگوت مژدەی سەرکەوتنی گەورەیان دراوەتێ، پاش وەرگرتنەوەی لاشەی (ئەتابەك) هەموویان گەڕانەوە.

لەجەنگی لوڕستاندا سەربازەکانم دەستکەوتیان نەبوو چونکە سامانی سەرەکی لوڕەکان هەر ڕانە مەڕ بوو، سەربازەکانیشم نەیاندەتوانی ئەو ڕانەمەڕانە بەو هەموو ڕێگە سەختانەدا دەرکەن و لەشارەکاندا بیانفرۆشن، لەسەرێکی کەشەوە لەناوچەی پشتکۆدا بێجگە لە (حسێنئاباد) کە شارۆچکەیەکی بچووکبوو، هیچ شارێك نەبوو تاکو تالانبکرێت، وەرزی پاییزیش بەسەرچووبوو، ئەگەر لەوەرزی زستاندا بمامایەوە لەشکرەکەم دەفەوتا.

لەبەرە بەیانی ڕۆژی شازدەی مانگدا بەڕێبووین، لە کوێوە هاتبووین هەر لەوێوە گەڕاینەوە. لەسەرەو ژوورکەی کێوی جەنگەڵ داربەڕووەکانداو سەرەو خوارکەکەیدا تووشی چەرمەسەرێی زۆرهاتین، ناچاربووین کە توولەرێی پێچاوپیچ بۆ سەرکەوتنی ئەسپەکانمان دروستبکەین، لەگەڵ ئەوەشدا لە گەلێك شوێندا بەگوریسی قاییم و بەهێز هەڵماندەکێشان و داماندەگەڕاندن، لەو کارە دژوارەماندا نزیکەی دووسەد سەربازم لەو کێوە کەوتنە خواری، زوربەی زۆریان مردن و ئەوانی تر زامدار بوون، بڕێك ئەسپیشمان فەوتان. دوای ئەوەی لەبواری ڕووباری (سیمەرە)ماندا، بارانی پاییز دایگرتین، سێ شەووسێ ڕۆژلەسەریەك نەوەستایەوە، کە گەیشتینەوە ئاشی(ئیزە) جا خۆشیکردەوە. بەو بارانە زۆر لەسەربازەکانم نەخۆشکەوتن، لەبەر ئەوە چەند ڕۆژێ لەوێ مامەوە تاکو چاکبنەوە. پێش ئەوەی بەرەو (فارس) بەڕێبم بە (گیو)م وت: ئەگەر شارەزایی و یارمەتیدانی تۆ نەبوایە لەم لەشکرکێشییەما سەرنەدەکەوتم، ئێستا خۆت بڵێ، چ پاداشتێکت دەوێ، ئامادەم. دوای کەمێك ڕامان وتی: ئەی ئەمیر: تیرەی (پیرانوەند) بە چاوی خۆیان منیان دی کە ڕابەرو ڕێگەوانی تۆ بووم، دوای ڕۆیشتنی تۆ خۆم و هەموو بنەماڵەکەم دەکوژن! وتم کەواتە هەمووتان دەبەم بۆ فارس. وتی ئەی ئاشەکەم کە لەپێناویدا زەحمەتێکی زۆرم کێشاوە! وتم: بیفرۆشە. وتی: کڕیاری چاك دەست ناکەوێ.

وتم ئاش بەجێبهێڵە ، لەوێ خانوو ، زەوی ، کێڵگە، ئاش و هەموو کەلوپەل و پێداویستیت دەدەمێ . هەموویان لەگەڵماهاتن بۆ ولاتی فارس، سەرەڕای ئەو شتانەی کە پەیمانم پێدابوو ، دوو هەزار دیناری زێڕیشم پێبەخشی.

پاش چەند ڕۆژێك شێخ عومەری کوڕم بە کۆتری نامەبەردا نامەیەکی بۆ ناردم، تیایدا نووسیبوی: دەستەیەك نوێنەرانی بالأی ولاتی چین بە دیاریی زۆر بەنرخەوە هاتوون، سەرۆکەکەیان پێی ڕاگەیاندووم کە پادشای چین دەیەوێ لەگەڵ ئەمیر تەیموردا پەیوەندیی دۆستانەی هەبێ ...... لەوەلأمدا بۆم نووسی کە چاك میواندارییانبکەن و منیش بەزووترین کات دەگەڕێمەوە بۆ سەمەرقەند. بەرلەوەی بەڕێبم، ماڵئاواییەکی زۆرگەرمم لە(گیو) کرد، (گیو)وتی: ئەی پیاوی مەردو ئازا، پێش جیابوونەوە داواکارییەکم هەیە!پرسیم چییە؟ وتی دەمەوێ ئەم لاوئەولات ماچ بکەم! وتم فەرموو. ئەو پیاوە پیرە زۆر بەتاسەوە ئەم لاوئەولا تەوێڵی ماچکردن و لەیەکتری جیا بووینەوە و ئیتر چاومان بەیەکتر نەکەوتەوە.

ئەگەر بمویستایە ڕێی (ئەسفەهان) و(ڕەی) بگرمەبەر ماوەیەکی ئێجگار زۆرم پێدەچوو، بۆیە لەڕێی (بیابانی کەویر)ەوە بەرەو خوراسان بوومەوە. دەشێ ئەوەش بڵێم هاوینان تێپەڕ بوونی لەشکربەوبیابانەدا کارێکی شێتانەیە، لەوکاتەدا وەرزی پاییز بوو ، هەوا فێنکبوو، بۆیە وێرام لەوێوە بڕۆم، بەبێ هیچ ڕووداوێ بەخۆم و لەشکرمەوە گەیشتینە (بیرجەند).

# بیست و یەکەمین بەش

## ئەبدال کەلزائی کێ بوو، لەکوێ فەرمانڕەوایی دەکرد؟

پاش ئەوەی لە (بیرجەند) بەڕێبووم، لەیەکەم قۆناغدا چاوەڕێی گەیشتنی هەواڵی دەستەی پێشەنگان بووم، بەڵام هیچ دیار نەبوو. وتم نەك ڕووداوێ قەومابێ، لەبەر ئەوە دەستەیەکی ترم ناردن، بەزووترین کات ئاگاداریانکردم کە هەموو سەربازەپێشەنگەکان کوژراون و هەموو شتێکیشیان بەتاڵانبراوە! خێرا ناردم بە دوای فەرمانڕەوای (بیرجەند)دا ، کە هات دەربارەی ئەو ڕووداوە لێکۆڵینەوەم لەگەڵدا کرد. وتی: ئەی ئەمیر لەم سنوورەدا کەس ناوێرێ توخنی سەربازی پیاوی وەك تۆ بکەوێ، ئەوانەی ئەم کارەیانکردووە خەڵکی ئەم وڵاتە نین و خوراسانیش نین. مۆڵەتمبدە تا بچم کوژراوەکان ببینم، ئەوسا دەتوانم بکوژەکانیان دەسنیشانبکەم. لەگەڵ چەند ئەفسەرێکما چوون بۆ شوێنی ڕووداوەکە و زوو گەڕانەوە، وتی: ئەی ئەمیر، سەربازەکانت بەدەستی هەندێ (کەلزائی) کوژراون. پرسیم: (کەلزائی) کێن؟! وتی: لەوڵاتی (غوور) دەژین، وڵاتێکی فراوانە، لە(هەرات)ەوە تا نزیك(کابول) دەبێتەوە، پادشاکەیان ناوی(ئەبدال کەلزائی)یە. وتم دیارە بکوژەکان لە ڕێگەیەکی نزیکەوە هاتوون، ئەگەر بچم بۆ (غوور) دەبێ کام ڕێگە هەڵبژێرم؟ وتی ئەی ئەمیر، دەتوانی لێرەوە یەکەو ڕاست بچی بۆ (ئەسکەندەر_قەندەهاری ئێستا)، لەوێشەوە ڕێی باشوور دەگریتەبەرو دەگەیتە (غوور). پاشان فەرمانڕەوای (بیرجەند) وتی: بەڵام واز لەم گوزارەت بێنە، چونکە (کەلزائی)یەکان خەڵکێکی دلێرو بێباکن. لێم پرسی: تۆچۆن زانیت سەربازەکانم بەدەستی (کەلزائی)یەکان کوژراون؟! وتی: لەوشوێنەدا کە سەربازەکان کوژرا بوون (تەلوار)ێك بەجێمابوو، کەچەکی تایبەتی (کەلزائی)یەکانە، شمشێرێکی گەورەو قورسە وەکو قیمەکێشێکی گەورەیە!پرسیم: نێوان ئێرەو ئەسکەندەر، وە لەوێوە تا (غوور) چەند دەبێ؟وتی: لێرەوە تا ئەسکەندەر حەفتاودوو فرسەنگە، لەوێشەوە تا(فەیروز ئاباد) کە پایتەختی(ئەبدال کەلزائی)یە شەست فرسەنگە.

پاشان بۆی باسکردم کە (فەیروز ئاباد) شارێکی گەورەیە و باپیرانی (ئەبدال کەلزائی) شوورەیەکی گەورەی بەردیان بە دەوریدا دروستکردووە،

هەروەها وتی: ئەگەر دەساڵ گەمارۆی ئەو شارە بدەیت بۆت ناگیرێ! پرسیم: کەلزائییەکان چۆن خەڵکێکن؟!وتی کەڵەگەت و جەنگاوەرو بێ باکن، کە دەکەونە جەنگ تا دوا سەربازی دوژمن نەکوژن دەستبەردار نابن، هەربەو جۆرەش سەربازەکانی تۆیان کوشتوون! دوای ئەوە بۆی باسکردم کە لە وڵاتی (غوور)دا کێوی زۆر هەن کە زێڕو زیویان لێدەردێنن.

پاشان چووم بۆ شوێنی ڕووداوەکە تا بەچاوی خۆم هەموو شتێ ببینم. دووسەدو پەنجا سەربازم کوژرا بوون، ئەسپەکان و هەموو شتێکیان برا بوون. دیار بوو هەموویان کەوتبوونە بۆسەوەو لەپڕا لێیان درا بوو، لەوە سەرم سڕمابوو کە چۆن کەلزائییەکان توانیبوویان ئەوکارە بکەن و تا کوشتنی دوا سەربازیش وازیان نەهێنا بوو!! داوام لە فەرمانڕەوای (بیرجەند) کرد چەند شوێنهەڵکەرێکی چاك و شارەزام بداتێ ، تا ماوەی بیست و پێنج فرسەنگ شوێن نالی ئەسپی کەلزائییانیان هەڵگرت، بۆیان دەرکەوت بەرەو شاری ئەسکەندەر نەڕۆیشتوون، بەڵکو یەکەوڕاست ڕێی (فەیروز ئاباد) یان گرتۆتە بەر، ڕێگەیان ئاودارەو تینوێتی زۆریان بۆ ناهێنێ . دوای ئەو زانیارییانە جارێکی دی لەگەڵ فەرمانڕەوای بیرجەندا ڕاوێژمکرد، وتی بکوژانی سەربازەکانت (ئەبدال کەلزائی) ناردوونی، دووریش نییە خۆی فەرماندەیانبوو بێ!هەروەها وتی: کەلزائییەکان بۆ ڕووتکردنەوەی کاروان هاتوون، بەڵام چونکە بەسرووشت دڵڕەق و شەڕانیو بێ باکن، کە سوارەکانی تۆیان دیون پەلاماریانداون بۆ ئەوەی ئەسپ و چەك و پۆشاك و شتەکانیان ببەن ! دوای ڕاوێژو وردبوونەوەیەکی زۆر بڕیارمدا بەرەو وڵاتی (ئەبدال کەلزائی) بکەومەڕێ و ئەو سەرە ڕۆیە تەمێبکەم.کە گەیشتمە شاری ئەسکەندەر هەموو کاتێ چاوەڕێی هێرشی دوژمنبووم.

لەوێ ڕێگەوانی تازەمان پەیداکردن، هەندێکیانمان پێشخستن بۆ ئەوەی خۆراك و ئالیك ئامادە بکەن، هەروەها ڕاشمسپارد کە بەرگی ئەستوور و لەچەرمدروستکراوولەبادی زۆر بکڕدرێن، چونکە ئەو شتانە لەو ناوچەیەدا زۆر بوون و دەبوایە خۆمان بۆ زستان ئامادە بکردایە و تووشی سەخڵەتی زۆر نەبین. دوای ئەوەی لەشاری ئەسکەندەر دەرچووم، هیواشو لەسەرخۆ ڕێمدەکرد بۆ ئەوەی سوپای (شێخ عومەر)یش بگاتە بەرەوە، ئەوڕێیەم گرتەبەر کە (سوڵتان مەحموودی غەزنەوی) پیادا ڕۆیشتبوو بۆ داگیرکردنی هندستان. لەهەر فرسەنگێکا یادگارێکی ئەو سوڵتانەو جەنگیزخانی باپیرم بەرچاو

دەکەوت. ڕۆژێکیان گەیشتینە جێیەك پێی دەوترا(بامیان)، شارەزاکان وتیان لەسەردەمە کۆنەکاندا ((گەورەترین بتخانەی جیهان بووە، هێشتا شوێنەواری بتەگەورەکان مابوو))کە بەچەکوشکاری لەلاپاڵی کێوەکان هەڵکەنرا بوون. دوای (بامیان) گەیشتینە ناوچەیەکی زۆر سارد، هەموو بەرگی ئەستووری چەرممان لەبەر کرد، تەویلەی ئەسپەکانمان لەدیوی ناوەوە بەلباد داپۆشین، لەبارەی خۆراك و ئالیکەوە زۆر بیٚ خەمبووین.

بۆیە وتم چاوەڕێی سوپای شێخ عومەرم دەکرد، چونکە بەر لەبەرێبوونم بۆ وڵاتی (غوور) نامەم بۆ شێخ عومەر نووسی داوای لێبوردن لە نوێنەرانی پادشای چین بکات کە دوای چەند مانگیٚ دەگەڕێمەوەو دەیانبینم، داواشمکرد کەلە ڕادەبەدەر ڕێزیان لێبگیرێت، هەروەها داوامکرد کە بەزوووترین کات سوپایەکم بۆ بگەیەنێتە وڵاتی(غوور) لەبیست هەزار سوار کەمتر نەبیٚ و ڕێی (بەدەخشان) بگرێتە بەر، چونکە پادشای ئەو وڵاتە دۆست و یاوەری خۆمبوو .

کە شاری (فەیروز ئاباد) دەرکەوت، هەوا زۆر ساردبوو، بەڵام بە فردیار نەبوو، شارەکە لەسەر گردێکی بەرز دروستکرابوو، شوورەیەکی بەردی بڵند دەورەیدابوو. زۆر وردبوومەوەو بیرمکردەوە ، زانیم گەمارۆدانی ئەو شارە زۆر درێژە دەکێشیٚ و ناشتوانم شوورەی شار بڕووخێنم! بۆیشم دەرکەوت کە سەرکەوتن بەگردەکەدا کێشەیەکی زۆر سەختە؛ کە سەرنجی داوێنی گردەکەمدا لەشکرێکم بینی، دیاربوو (ئەبداڵ کەلزائی)ئامادەی جەنگبوو، هەموو سەربازەکانی پیادە بوون. بۆ ئەوەی بتوانین بەرانبەر شمشێرە قیمەکێشناساکانیان بوەستین، فەرمانمدا کە هەموو سەربازەکانم ڕم بەکاربێنن و هەرچۆنیٚ بووە دەبیٚ هەر ئەوڕۆژە شەڕ یەك لابکەینەوە، چونکە ئەگەر دوژمن بکشایەوە بۆ ناوشار، دەبوایە چەند ساڵیٚ گەمارۆی شار بدەین ئەوجا سەرکەوین. لەسەر پلانی خۆم سوپام کرد بەسیٚ بەشەوە، قۆڵی ڕاست و چەپ و ناوجەرگەی سوپا. منیش ڕمم گرت بەدەستەوەو فەرمانی هێرشمدەرکردو بەرەو پێشیٚ غارماندا. کەلزائییەکان لە شێوەی بازنەدا ڕیزیان بەستبوو، بۆیە لەهەر لایەکەوە هێرشماندەکرد ڕوویان لێمان بوو، نەمانده‌توانی پشتەوەیان لێبگرین، بەوەی باشبوو پەیان بەکەڵکی تیرو قۆچەقانیٚ و مەنجەنیق نەبردبوو. ئەوە بوو نزیکەی پەنجا هەنگاوێکمان مابوو بگەینە سەریان، ئاوزەنگیمان لێداو ئەسپەکان نیشتنە باڵ، لەو گوڕە بەتینەدا ڕممان بەرهەر جەنگاوەرێکی دوژمن بکەوتایەکو ناودەریدەکرد، بەم جۆرە ژمارەیەکی زۆرمان لێخستن. لە

کاتێکا ویستم ڕمەکەم بچەقێنمە سنگی سەربازێکی دوژمن شتێکی تێگرتم، بەر بەرگە ئاسنەکەم کەوت، زرنگەیەکی کردو خلیسکاو کەوتە خوارێ ، کەڕمەکەم دەرهێنایەوە ویستم جارێکی تر بیچەقێنمە سەربازێکی تر، سەرنجمدا هەندێ لە سەربازەکانم بەسەر ئەسپەکانیانەوە سەرنگووندەبن !پاشان بۆم دەرکەوت دوژمن قولاپ بەکاردێنێ. قولاپەکان وەکو داسبوون، هەر قولاپێك بەزنجیرێکی باریکەوە بەسترا بوو ، کە بەدەست سەربازێکی کەلزائییەوە بوو.ئەوەندە کارامەو شارەزا بوون، کەدەیانهاویشت نووکی قولاپەکە دەچەقیە لەشی سەربازەکانم و نەشیاندەتوانی خۆیانی لێ ڕزگار بکەن، لەسەر زینەکە دەکەوتنە خوارێ و بە (تەلوار)تێیانبەردەبوون و هەلا هەلایاندەکرد. لەوێدا بۆم دەرکەوت کە دووسەدو پەنجا سوارم لەناوچەی بیرجەند بەوشێوەیە کوژراون، منیش ئەگەر بەرگە ئاسنەکەم نەبوایە تیاچوو بووم.چارم ناچار بوو، بۆیە بڕیارمدا پاشەکشێیەك بکەین. بەدەنگی شەیپوورو شەکاندنەوەی ئالاکانمان سوارەکانم تێگەیشتن کە دەبێ پاشەکشێ بکەن. هەمووماں بە شێوەی جەنگ پاشەکشێمانکرد. جارێکی تر و بێ دڵەڕاوکێ بڕیارمدا کە بەرگی ئاسن بۆ هەموو سەربازەکانم ئامادە بکەم، سەرەڕای هەموو کەڵکەکانی، قولاپی کەلزائییەکان نایبڕێ .

هەر سەربازێکم دەست کەلزائییەکان کەوتبوو کوژرا، باوایان وابوو کە دەبێ دوژمن دیل نەکرێ، بەڵکو بێ دواکەوتن بکوژرێ. لەسا رانسەری ولاتی غوورو کابولستان و هەراتا پەندێك هەیە کە دەڵێ: سەری بڕدراو قسە ناکات!.. واتە کەس لە دوژمنی مردوو ناترسێ، بەلام من دیلم نەکوشتووەو نایکوژم، مەگەر کاتێ بێ‌ئەدەبییکردبێ و بیکات. دوای ئەوە پاشەکشێمانکرد، سوپای کەلزائی بازنەی خۆی تێك نەدا سەربازەکان لە جێی خۆیاندا جووڵەیان نەکرد، هاواریاندەکرد: ئەگەر دووبارە نیازی هێرشتان هەیە، بێن، ئێمە لە خزمەتتاندایں.

هەموو ئەفسەرەکانم کۆکردنەوە بۆ ڕاوێژ کردن و دۆزینەوەی ڕێگەی بەرگریکردن لە قولاپی کەلزائییەکان. ئەفسەرێکم هەبوو ناوی(لەتیف‌چولاق) بوو، وتی: ئەی ئەمیر، بۆچی بە باروت چاری نەکەین؟ وتم ئێمە باروتمان بۆ ڕووخاندنی شوورەی شارو قەلا بەکارهێناوە، ئێستا چۆن دەتوانین سەربازە قولاپ بەدەستەکان لەناو بەرین؟!وتی ئەی ئەمیر، ئەگەر لەجێی تۆدابم، لەژێر پێی سەربازانی کەلزائیدا باروت دەتەقێنمەوە !.. وتم: قسەی منالانە مەکە،

خۆ ناتوانین خەندەق لێبدەین بۆ ژێر پێی سەربازەکانی پادشای (غوور)!وتی: ئەی ئەمیر، من باسی خەندەق و تونێل ناکەم ئەتوانین گۆزەڵەی بچکۆلەو مەشکۆڵەو کیسەی بچووک پڕبکەین لە باروت، پلیتەیان بۆ بکەین و دایانگرسێنین و فڕێیانبدەینە ژێر پێی دوژمن!

قسەکانی (لەتیف چولاق) سەرنجیان ڕاکێشام، لەدڵی خۆمدا وتم تاقیکردنەوە ئەگەر سوودی نەبێ زیانی نییە! کیسە چەرمێکم پڕکرد لە باروت و پەستامەوەو پلیتەیەکم پێوەبەست، (لەتیف چولاق) ئاگریداو کیسەکەی هەڵدایە لایەکەوە و وتی: باوادانێین کە سەربازە کەلزائییەکان لەوێدان. کە کیسەکە کەوتە سەر زەوی تەقیەوەو دەنگێکی لێهەستا. (لەتیف) وتی ئەگەر بتوانین ژمارەیەکی زۆر کیسە بۆ کەلزائییەکان بهاوین لەناویاندەبەین، چونکە کە هەندێکیان کوژران و بڕێکیان برینداربوون و ئەوانی تریش ترسان ڕیزەکانیان تێکدەچن و سەرگەردان و سەرلێشێواو دەبن، ئێمەش لەو کاتەدا هێرشدەکەین و لەناویاندەبەین!

فەرمانمدا کە ژمارەیەکی زۆر کیسەچەرم دروستبکرێن و پێش تەواوبوونی ئەو ڕۆژە هێرشبکەینەوە سەر دوژمن و کەڵک لە باروتەکە وەربگرین. کاتێ ئامادەبووین دووبارە هێرشی نەبەردمان دەست پێکرد. تەقاندنەوەی باروت بەجۆرێك کەلزائییەکانی تۆقاند کە بەتاریێ بارنەکەیان تێکچوو، هەریەکە بە لایەکدا هەڵدەهات، خێرا فەرمانی هێرشی گشتیم دەرکردو نیشتینە سەریان. داوامکرد بەر لەوەی دنیا تاریکدابێ، دەبێ کۆتایی بەشەڕ بێنین و بچینە ناو شارەوە. دوای چەواشەبوونی دوژمن بۆم دەرکەوت تەنیا دەستەوتاقمێکی تایبەت قولاپهاوێژن، ئەوانیش کە بەیناوبەین لایاندەکردەوە قولاپ بهاوێژن. فریا نەدەکەوتن ڕمێك،یان شیرێك سەر سنگیانی دەسمی.

بۆ ئەوەی شەوێ بەسەرماوسۆڵە حاڵی سوارەکانم شڕ نەبێ، بڕیارمدا پێش تاریکبوون خۆم بگەیەنمە شار، لەگەرمەی درێژەپێدانی شەڕدا، لەگەڵ هەندێ لەسوارەکانما کەتوورەکەی باروتیان پێبوو ڕێگەی شارم گرتەبەر، لە بیابانەوە بەرێیەکی هەورازدا بەغارسەرکەوتین، ئەوەندە ئاوزەنگیمان لە ئەسپەکانماندا، کە گەیشتینەسەرگردەکە بە تەواوی شەکەتبووبوون، کەس بەرگری لەشار نەدەکرد، بەلام هەر کەدانیشتوانی شار ئێمەیان دی، دەروازەکانیان کلۆمکرد. بڕیارمدا بە باروت دەروازەکان بسووتێنم و ڕێگەی

شار بۆ خۆمان بکەمەوە. سەربازەکانم کردن بەسێ بەشەوە: دەستەیەکیانم ڕاسپاردن بەپەلە دابەزن و لەژێر دەروازەی شاردا چەند چاڵێ هەڵکەنن، دەستەیەکی تریشم دانان کە ئاگایان لەسەر دیوارەکان بێ، ئەگەر کەسێ ویستی بەردبارانمانبکا، بەتیر لێیبدەن، تاقمێکی دیکەشم دانان بۆ پاسەوانیی دواوە نەکو (ئەبدالکەلزائی) برێک سەرباز بنێرێتە سەرمان. یەکێ لە ئەفسەرەکانم نارده لای (لەتیف چولاق) تاکو ئاگاداریبکات هەر کە گوێی لەزرمەی باروت بوو دووهەزارسەربازم بۆ بنێرێ بۆ ئەوەی کە دەچمە ناو شارەوە هێزێکی باشم پێبێ. بەسەربازەکانم ڕاگەیاند هەر کەچووینە ناو شارەوە بەدەنگیبەرز بانگبدەن، چونکە بانگ لای کەلزائییەکان نیشانەی ڕێککەوتنو ئاشتییە. برێك سەربازم ڕاسپاردن بەناو شاردا جاڕ بدەن کە گیانو نامووس و سامانی دانیشتووانی شار پارێزراون...سەربازانی لێپرسراوی باروت توورەکە باروتەکانیان لەژێر دەروازەی شاردا ئاگردان، بەدەم زرمەو دەنگی زۆر قاییمەوە کە گردەکەی هێنایە لەرزە، دەروازە هەلا هەلا بوو. سەربازانی بانگدەر و جاڕچییەکان خۆیان کرد بەناو شاردا، دەبوو بانگبدەن کە شاری(فەیروز ئاباد) بێلایەن و بێوەیە، لەبەر ئەوەی دانیشتووانی شار بەر گرییان نەکردووەو زیانیان نەگەیاندووە کەس لاقەیان ناکات، وە ئەگەر بەرگری نەکەن سەرو ماڵیان پارێزراون. بانگ و هاواری جاڕچییەکان کاری خۆیان کرد،ئەوانەی کە (تەلوار)یان بەدەستەوە بوو بۆ ئەوەی بەرەنگاری نەکەن، تەلوارەکانیان خستنەوە ناو بەرگی خۆیان. دەبوو سەربازەکانم دەست بەسەر کۆشکەکانو ئۆردووگەکان و دەزگا گەورەکانی دەوڵەتدا بگرن . من بۆ خۆم نەچووبە ناو شارەوە، چونکە هێشتا لە دامێنی گردەکەدا جەنگ درێژەی هەبوو.خولەك بە خولەك ژمارەی سەربازانی کەلزائی لە کەمبوونەوەدا بوو؛ بەڕاستی زۆر نەبەرد بوون و نەیاندەویست خۆیان بەدەستەوە بدەن.کە دنیا تاریکداهات لە دامێنی گردەکەدا جەنگ کۆتاییهات، لەڕادەبەدەر کەلزائییەکان کوژراویان هەبوو، تەنیا چوارسەد سەربازمان لێ بەدیلگرتن. کە دڵنیا بووم شەڕ تەواو بووە چوومە ناو شارەوە، چوومە کۆشکەکەی(ئەبدال کەلزائی)، ژن و منداڵەکانیم گواستنەوە بۆ یەکێك لە خانووەکانی ناوشارو کەس لاقەی نەکردن، چۆن پەیمانمدابوو بەو جۆرەش بردمە سەر. پاش ئەوەی سەیرێکی کۆشکەکەم کرد، وتم:چرا هەڵکەن. لەکۆشك هاتمە دەرێ و چووم بۆ پشکنینی نیشتەجێبوونی سەربازەکانم. مزگەوتی شار، کە زۆر گەورەبوو، لەگەڵ هەندێ

خانووی گەورەدا، کردمنە شوێنی حەوانەی سەربازەکانم، کە بەشێکی زۆریان زامدار بوون. دوای ئەوەی لەهەموو ڕوویەکەوە لەبارودۆخی هەموویان دڵنیا بووم و سەرم لە تەویلەکان داو ئەسپەکانم بەسەرکردنەوەو لەوانیش بێ خەمبووم، گەڕامەوە بۆ کۆشکی(ئەبدال کەلزائی)، کە لە هۆڵی تایبەتی خۆیدا دانیشتم هێنایان بۆ لام. دەستی چەپ و ڕوومەتی بریندار بوون، لەشیشیان بەستبوو، وتیان نێزەیەك لەشی سمیوە، کەچی بەو هەموو برینانەوە بە تووڕەیی وتی: بۆچی فەرمانتداوە من بهێننە ئێرە؟!

وتم: ویستم بتبینم و بزانم ئەو پیاوە کێیە کە لە (بیرجەند) دوسەدو پەنجا سوارەی منی کوشتوون؟!بە تووڕەییەوە وتی: ئەو پیاوە منم!ئەگەر ئەمرۆ ئاگرت بەکارنەهێنایە هەموو سەربازەکانتم دەکوشتن و ئێستا سەری بڕدراوی تۆش لەبەردەمما دەبوو!وتم: ئەی پیاو، تۆ چاو نەترسی، دڵێکی شێر ئاسات هەیە، بەڵام زۆر گەمژەی، ئەگەر هۆشت لای خۆت بوایە نەدەبوو بەرانبەر بەمن ئەم قسانە بکەی، چونکە بەیەك ئاماژە لەناوتدەبەم! وتی: بۆیە ئەم قسانەم بە تۆ وتن تاکو بزانیت هەرچەندە شکاوو برینداروو دیلم بەڵام لێت ناترسم، ئەگەر باوەڕیش ناکەیت دوو کەس بانگبکە، گەر بەتەلوار پارچە پارچەمبکەن داوای لێبووردنت لێ ناکەم!وتم: ئەگەر تۆ ئەو پیاوانەی منت نەکوشتنایە من ناچار نەدەبووم کە ماوەی سەدو سی فرسەنگ ڕێ ببڕم بۆ ئەوەی تەمێتبکەم، ڕاستم پێ بڵێ بۆ ئەو سەربازانەی منت کوشتن!؟ئەوان ڕێبواری بێوەیبوون، هەڵبەتە تۆ دووپشکی کوشندەی هەرلەخۆتەوە بەخەڵکەوە دەدەی!... بە پێکەنینەوە وتی: دەمویست بزانم چێژی کوشتنی سەربازانی پیاوێك کە دەڵێن (ئەمیر تەیمورە) چۆنە!... وتم: تۆ بەهەموو یاساو دەستوورو داب و نەریتێك تاوانکاری و دەبێ بکوژرێیت، بەڵام چونکە ئەوەندە چاو نەترسی، چاوپۆشی لە کوشتنت دەکەم بەو مەرجەی کە سەرانە بدەیت و لەمەودوا گوێڕایەڵی من بیت و داوا لەسەربازەکانت بکەیت بێنە ناو سوپای منەوە چونکە پێم خۆشە(غوورییە) قارەمانەکان سەربازی منبن. ئەگەر مەرجی من پەسەند بکەی بە زیندوویی دەمێنیتەوەو هەر پاشای وڵاتی خۆت دەبیت و دوای خۆیشت کوڕەکەت لەجێی خۆت دادەنیشێ. وتی: زووتر بمکوژە، پاشای کەلزائی هەرگیز سەرانە نادات !وتم: تا سبەینێ بەیانی بوارتدەدەم. وتی: هەزار ساڵ بوارمبدەی (بەڵێ) لەمن نابیستی، وڵاتی من هەر (فەیروزئاباد)نییە، خێڵ و هۆزی وای تێدان کە خۆت و لەشکرەکەت بە پێوە دەخۆن و تۆڵەی منت

لێدەکەنەوە. ئەو شەوە ئەوەندە سارد بوو هەموو لایەك یەخ و بەستەڵەکی ڕووتبوو، داوامکرد کە شوێنێکی گەرم بۆ پاشای کەلزائی تەرخانبکرێت. بۆ سبەینێ ناردم بە دوایدا، لێم پرسی: شەوێ باش بیرتکردۆتەوە؟ وتی: بەڵێ، هەر لەسەروتەو بڕیاری خۆمم اوتم: ئەی پیاو، حەیفم لێدێ پیاوێکی وەك تۆ بکوژم چونکە خۆت و سەربازەکانت قارەمانن! من پاش ساڵێ،یان دوو ساڵی تر دەمەوێ بەرەو هندستان بڕۆم، ڕێم بەسەر وڵاتی تۆدا دەبێ، ئەگەر تۆ پەیمانبدەی لەگەڵما دۆستبی و لەوڕۆیشتنەدا یارمەتیمبدەیت لە کوشتنت چاوپۆشیدەکەم، دوای سەرکەوتنیش تۆیش لەدەستکەوتەکانی جەنگدا بەشدار دەبی.(ئەبدال) وتی: من باج و سەرانەت نادەمێ و ژێر دەستەشت نابم، بەڵام دەتوانم دۆستتبم. وتم: مەرجی دۆستایەتی ئەوەیە کە هەرگیز پەلاماری خۆم و سەربازەکانم نەدەیت و لەکاتی پێویستدا یارمەتیمبدەیت و درێغی نەکەی. وتی: باشە ئەم کارە ئەکەم. وتم: من ئەوەندە باوەڕم پێتە کە داوای بەڵگەنامەت لێناکەم، ئەگەر یەکێکی تر بوایە کوڕەکانیم بەبارمتە دەبردن، تاکو ئەگەر پەشیمانبێتەوە کوڕەکانی بکوژم!بەڵام دیارە تۆ پیاوێکی ڕاست و دروستی قسەی خۆت دەبەیتە سەر.... وتی: کە بووینە دۆست سەربازە دیلەکانم ئازاد بکە. وتم: هەر ئێستا دیلەکان ئازاد دەکەم. پاشان لێم پرسی: باشترین ڕێ بۆ سەمەرقەند کامەیە؟ پاشای(غوور) وتی: هەموو دەربەندەکانی ڕێی کابولستان و غوور بۆ بەدەخشان سەهۆڵبەندانن، ئەگەر پەلەتە لێرەوە بڕۆ بۆ هەرات، دوایی لە خۆراسانەوە خۆت بگەیەنە سەمەرقەند.وتم: مادام بووین بە دۆست، داوا لە سەربازەکانت بکە هونەری قولاپهاویشتن فێری سەربازەکانم بکەن. (کەلزائی) وتی: ئەگەر ئێوە هونەری بەکارهێنانی ئاگرمان فێر بکەن، وا ئامادەین: وتم:ئەوە ناتوانم، لەبری ئەوە داوا لە پزیشکەکانم دەکەم چارەسەری برینەکانت بکەن. وتی:پێویستمان بە پزیشکی ئێوە نییە، ئەوانی خۆمان باشترن ....

لەوکاتەدا تەتەرێك گەیشتە (فەیروز ئاباد)ئاگادار کرام کە کەوشی لە تەختە دروستکراوی لەپێ بەستوون و بە ئاسانی و بەگورجی بەسەر بەفرو سەهۆڵدا دەڕوا.(کەوشی تەختە : کەمانە، ). کە چاوم بەتەتەرەکە کەوت و ئەو کەوشەپانو گەورانەیم بینین جا باوەڕمکرد. ئەوپیاوە نامەیەکی لە فەرمانڕەوای ناوچەکەی خۆیانەوەهێنا بوو بۆ(ئەبدال) تیایا ئاگاداریکردبوو کە(شێخ عومەری)کوڕم بە بیست هەزار سوارەوە لەناوچەیەکی شاخاوی غووردا بەفر

ڕێی لێگرتووە. (ئەبدال)م تێگەیاند کە ئەوە کوڕی منەو خۆم داوامکردووە بێ بۆ یارمەتیم، جا ئێستە لەناوچەیەکا گیریخواردووە، دانیشتووەکان بە بێگانەو دوژمنی ئەزانن، تۆ ئەگەر ئارەزوو بکەیت و دۆستی منبی، لەم کاتەدا نەریت و دابی دۆستایەتی بەجێبێنەو کوڕەکەم و سوپاکەی ڕزگار بکە! وتی وەك ئەبینی برینـدارم و نـاتوانم بڕۆم بەسـەردەمیانەوە، بەڵام نامەیـەکی بـاش دەنووسـم بـۆ فـەرمانڕەوای ئـەو ناوچەیەکـە ئەوپـەڕی توانـای بخاتـە گـەڕ بـۆ ڕزگارکردنیـان.منیـش نامەیـەکم بـۆ(شـێخ عومـەر) نووسـی، بـەدرێژایی باسـی هەموو ڕووداوەکانم کرد، باسی ئەوەشمکرد کە لەگەڵ پاشای غووردا دۆست و یاوەرین، داوام لێکرد لەگەڵ خەڵکی ئەو ناوچەیەدا دۆستبێت و ئەگەر بواری هـەبێ خۆی بگەیەنێتە وڵاتـی هـەرات... هـەمان تەتەر نامـەکانی بـردن و کەوتـە ڕێ. پادشای غوور وتی: لەماوەی چوار،پێنج ڕۆژدا نامەکان دەگەیەنێ.

دوای ئەوەی (ئەبدال کەلزائی) بوو بە دۆستم، میوانداریکردم،بۆ نیشانەی خۆشەویستی و ڕێزو دۆستایەتی شمشێرێکی نایابی پێشکەشکردم.

من نـەمدە توانـی لـە(فـەیروز ئابـاد)دا بمێنمـەوە چونکـە بەشـی خـۆم و لەشکرەکەم ئازووقەو بەشی ئەسپەکانیشمان ئالیك دەست نەدەکەوتن. پـاش پێنج ڕۆژ کە ڕێژەی سەرماکەمتر بووەوە، دوو ڕێگەوانی شارەزام لەگەڵ خۆمـا بـردن و بەرەو(هـەرات) بـەڕێبووم، کـاتێ گەیشـتمە سـنووری ناوچـەی هـەرات نامەیـەکم بۆ پادشـای ئەوێ نـارد، تیایا نوسـیبووم کە دەمـەوێ ماوەیـەك لـەم شـارەدا بمێنمـەوە تابەشـێکی تـری لەشـکرەکەم، کـە لـە دواوەیـە، بگاتـە لام، هیوادارم لەماوەی مانەوەمدا پادشای هەرات بەنرخی ڕۆژ ئازووقەو ئالیکمان بۆ دابینبکات. ماوەیەك چاوەڕێبووم، بەڵام تەتەرەکەم دیار نەبوو، نامەیەکی ترم بە تەتەرێکی تردا نارد، دووبارە نەوەڵام هەبوو، نەتەتەرەکەشم دیاربوو! دوای لێکۆڵینـەوە زانیـم کـە پادشـای هـەرات زۆر نامەردانـە هـەردوو تەتـەرە بـێ تاوانەکانی کوشتوون. دوای ئەوە بۆم دەرکەوت ئەو پیاوە دوژمنایەتیم لەگەڵا دەکـات، بـە لەشـکرەکەمەوە بەڕێکـەوتم تـا بـزانم لـە دەرەوەی شـاردا بـەرەنگاریمدەکات یـان دەکشـێتەوە بـۆ نـاو شـارو پشـت بـە شـوورەی شـار دەبەستێ، دوایـی دەرکـەوت هـەنگاوی دووەمـی ڕەچاوکردووە. لە دەوروبـەری شوورەی شاردا چاوەڕوانی (شێخعومەر)ی کوڕمبووم تا بگاتە لام. لەبەر ئەوە لە جەنگی (فەیروز ئاباد)دا ژمارەیەکی زۆر لەسەربازەکانم کوژران، نەمدەتوانی یەکەو ڕاست هێرشبکەمە سەر هەرات. ویستم ئاوەڕۆی ئەو ڕووبارە بگۆڕم کە

دەچێتە ناو شارەوە، ماوەیەکیش ئیشی تیاکرا، بەڵام کە زانیم لەناو شاردا ئەنباراوی گەورەو زۆر هەن و بەشی ماوەیەکی زۆر دوورو درێژیان دەکەن،وازم لەو پرۆژەیە هێنا.

کاتیٚ(شێخ عومەر) بە لەشکرەکەیەوە گەیشتە لام شازدە هەزار سواری مابوون، چوارهەزاریان بەسەرماو نەخۆشی مردبوون،هەندێکشیان لە (فەیروز ئاباد) بەجێمابوون. شێخ عومەر وتی: بەنامەو ڕاسپاردەکانی پادشای (غوور) بۆ فەرمانڕەوای ناوچەکە ئێمە ڕزگارمانبوو، سووتەمەنی و خۆراك و ئالیکی باش و چادرو پۆشاکی چەرم و لبادیان فریاخستین، ئەگەر وا نەبوایە بە خۆمان و ئەسپەکانمانەوە تیادەچووین.

پێش بەرپا بوونی جەنگ بە سیٚ هەزار سەربازەوە(شێخ عومەر)م نارد بۆ شیراز تا لە جێی (میران شا)ی کوڕم. ببێتە سوڵتانی فارس، لەسەرێکەوە شێخ عومەر بەتەمەنتر بوو، خاوەنی ئەزموونی زۆرتربوو، لەسەرێکی تریشەوە دەمویست (میران شا)بگەڕێتەوە بۆ لام و ببیەم بۆ هندستان... بە سیازدە هەزار سواری لەشکری شێخ عومەر هێزم زۆرتر بوو، بڕیارمدا پەلاماری شاری هەرات بدەم. لەبەر ئەوە لە جەنگی فەیروز ئابادا باروتێکی زۆرمان بەکارهێنابوو، ئەوەندە بارووتمان پیٚ نەبوو کە بەشی هەڵتەکاندنی شوورەی شار بکات. لە ڕۆژانی چاوەڕوانیما بۆ شێخ عومەری کوڕم، سەربازەکانم خەریکی دارو درەختبڕینی ئەو دەوروبەرە بوون، مەنجەنیق‌و پەیژەی زۆریان دروستکردن. لە ڕۆژی پەلاماردانماندا فرمانمدا بە دوو دەستە لە سەربازەکانم کە کڵاوی ئاسن‌و بەرگی ئاسنیان پۆشبوون، لە ڕۆژهەڵات‌و ڕۆژئاوای شارەوە هێرشبکەن‌و بەسەر دیوارکاندا سەرکەونە سەریٚ. هەموو تیرهاوێژە باشەکانیشم ئامادە کردن تاکو هەرکەس لەسەر شوورەی شارەوە دەرکەویٚ‌و بەرگریبکات بەر تیری بدەن، مەنجەنیقدارانیشم ئامادەکردن بۆ بەردبارانی بەرگریکارانی شوورەی شار، بۆئەوەی سەربازەکانم بەئاسانی سەرکەونە سەریٚ.

پاشای هەرات کە ناوی (موحەممەد زوشکی) بوو، لە سەرەتای پەلامارەکەماندا بە ڕۆنی داخ ڕووبەڕووی سەربازەکانم بووەوە. بەرگریکەرانی دوژمن لەسەر شوورەکە ئاگریانکردبۆوەو ڕۆنی هەڵقرچاویاندەکرد بەسەر سەربازەکانمدا، ئەوانیش توانای بەرهەڵستییان نەبوو، بەردەبوونەوە، زۆربەیان دەمردن، ئەوانەشیان کە دەمان لەتاو ئازاریان ساتیٚ ئارامیان نەبوو. من بۆ خۆم بە تیر دووجار سەربازی دوژمنم کوشتن کە ئاوگەردانیان بەدەستەوە بوو،

دەیانویست رۆنبکەن بەسەر سەربازەکانما، هەستمدەکرد کە رۆنە هەڵقرچاوەکە رژابێ بەسەر خۆیاندائێمە تێدەکۆشاین جێپێیەکمان دەستکەوێت و ئەوێ بەهێز بکەین، دوای ئەوەی هەزارو پێنج سەدسەربازم کوژران، توانیمان لە قوڵی رۆژهەڵاتەوە جێپێیەك بکەینەوە

خێرا خێرا لەوێوە سەربازەکانم چوونە ناو شارەوە، منیش بەردەوام هێزی پشتگیرم بۆ دەناردن تاکو ورەیان بەرز بێ. بەهەموو ئەفسەرو سەربازەکانم راسپارد تا ئەتوانن خانووەکان بسووتێنن بۆئەوەی نەبنە بنکەی بەرگری. زۆری پێ نەچوو ستوونی دووکەڵ بەرزبووەوە،و زانیم سەربازمکانم خانووەکان دەسوتێنن، گوێم هەڵخست بۆ دەنگی نەعرەتەی جەنگاوەرانو شینو زاریی ژنانو قیژەو گریانی منداڵانو رووخاندنی دیوارەکان، بەراستی چێژی زۆرم وەردەگرت. بەلای منەوە هیچ ئاوازو مۆسیقایەك ناگەنە ئاوازی جەنگ، من هیچ چێژێ لە ئاوازی (چەنگو عوودو قانوون) وەرناگرم، خۆشترینو پیرۆزترین پیشەش پیشەی جەنگاوەرانە! گومانی تێدا نییە سەدەها زاناو داناو فەرماندە گوێرایەڵی جەنگاوەرێکی وەك منن!

لەناو شاردا شەڕ گەرمبوو، زۆرێك لەبەر گرانی شوورەکە ناچار بوون بچنە خوارێ بۆ یاریدەدانی بەرگرانی ناو شار. بۆئەوەی بتوانم بەزۆری هێزی پشتگیری رەوانەی شار بکەم، داوامکرد تا دەتوانن کە لەبەر بکەنە شوورەی شارەوە. تا رۆژ گەیشتە ناوەراستی ئاسمان لە پێنج لاوە کەلەبەرمانکردە شوورەکەوە. لەو کاتەدا چەند کەسێ لە شار هاتنە دەرێو پیاوێکیان خستبووە سەر تەختەیەکی پانو خستبوویانە سەر شانیان، کە نزیکبوونەوە تەماشامکرد (شارۆخ)ی کوڕمە، لە شێوەیدا دیاربوو گیانی تیا ماوە، ئەگەر بشمردایە گوێم نەئەدایە. سەیرمکرد رانی راستی زۆر بریندارە، داوامکرد کە بیبەن بۆ ناو چادرەکەی، تیمار بکرێتو لەوێ بکەوێ تا چاك بێتەوە.

دەمەو نوێژی عەسر لە هەموو لایەکی شارەوە دووکەڵ بەرزبووەوە، دوای نوێژکردن، کە لە مزگەوتەکەم هاتمە دەرێ، هەواڵم پێدرا کە (محەممەد زوشکی)و دوو کوڕی گیراون. هێشتا لە شاردا شەڕ بەردەوامبوو، سەربازانی هەرات نەیاندەویست خۆیان بەدەستەوە بدەن. من نەمدەویست هیچ گفتوگۆیەك لەگەڵ پادشای هەراتدا بکەم، چونکە بووبووە هۆی کوشتنو بریندارکردنی ژمارەیەکی زۆر لە سەربازەکانم، بۆیە داوامکرد لەسەری بدرێو سەرەکەی بکەن بە سەر نێزەوە تا بەرگرەکانی بە چاوی خۆیان ببینن

پادشاکەیان کوژراوەو دەست لە شەڕ هەڵگرن. بەو هەنگاوە هێزی جەنگاوەرانی هەرات کز بوو، بەر لەوەی تاریکیدابێ هەموویان خۆیان دا بەدەستەوە، دیلەکانیان لە شار هێنانە دەرێ، داوامکرد ئیتر خانوو نەسووتێنن‌و نەیانڕووخێنن، لە هەمان کاتدا بە ئەفسەران‌و سەربازانی خۆمم وت کە شار تالآنبکەن بۆ ڕۆژی دوایی دانیشتووانی شار ئاگادار کران کە کوژراوەکان بنێژن، دوای تەواو بوونی ئەو کارە داوامکرد دانیشتووانی ئاواییەکانی دەوروبەری هەرات و دانیشتووانی شار، بەهەموویان شوورەی هەرات بڕووخێنن، لەماوەی پازدە ڕۆژدا ئەو کارەش تەواو بوو. ئنجا داوامکرد کوڕەکانی پادشای کوژراوبێننە لام، گەورەیان ناوی(مەحموود) بوو تەمەنی هەژدە ساڵبوو، بچووکەکەش پازدە ساڵانبوو، پێم وتن: باوکتان بە شێوەیەکی نامەردانە دوو نامەبەری بێ تاوانی منی کوشتن، ئەویش سزای کاری خۆی وەرگرت. لەبەر ئەوەی ئێوە هیچ دوژمنایەتییەکتان بەمن نەکردووە چاوپۆشیتان لێدەکەم. ئەگەر فەرمانبەری منبن دەوڵەتی هەرات بە براگەورە دەسپێرم،بەلآم ئەگەر لەگەڵما سەرپێچیبکەن وەك باوکتان دەکوژرێن!..(مەحموود) وتی:ئەی ئەمیر ئێمە بەرانبەر بە تۆ هیچ سەرپێچییەك ناکەین. وتم: تازە شاروێرانکراوە، ئەوەش ئەنجامی بەدکاری و لە خۆباییبوونی باوکتبوو، تۆ دەستبکە بە ئاوەدانکردنەوەی، بەلآم هەرگیز جارێکی دی شوورەی شار دروست نەکەیتەوە، ئەگینا وای بۆدەچم کە دەتەوێ ملهوڕیبکەیت!(مەحموود) وتی: ئەی ئەمیر پەیمانتدەدەمێ کە هەرگیز بەرانبەر بە تۆ ملهوڕی نەکەم. پاشان پێم وت:چونکە باوکتم کوشتووە بە تەمانیم ڕۆژی لە ڕۆژان بەدڵسۆزی خزمەتمبکەیت، بەلآم دەتوانی بەجۆرێ هەڵسوکەوتبکەیت کە سەرو ماڵت پارێزراوبن، دوای خۆیشت منداڵەکانت فەرمانڕەواییەکەن،لەبەرئەوەی تۆ دەسنیشانکراوی منی، هەرکاتێ هێرشکرایە سەرت دەتوانی داوای یارمەتیم لێبکەیت، منیش بە هاناتەوە دێم .

لەجەنگی فەیروز ئابادو هەراتدا ئەوەندە سوپاکەم لاواز بوو بوو،نەمدەتوانی پتر لەو ناوچەیەدا بمێنمەوە، بەڕاستی لەوە دەترسام ئەگەر دوژمنان بەوەیان بزانیایە پەلامارمبدەن و لەناوومانبەرن! ئەوە بوو تەنیا چاوەڕێی ئەوە بووم کە (میران شا)لە وڵاتی فارسەوە بگاتە لام. لەگەڵ پاشماوەی لەشکرەکەما بەرەو (طووس)بەڕێبووم. بۆ ئەوەی پشوویەك بدەین دوو ڕۆژ لەوێ ماینەوە. دووەم ڕۆژ چووم بۆ سەر گۆڕی (فیردەوسی) تا بزانم چاکیانکردووە!کە بینیم

باخەکەی دەروبەری هەمووی گوڵزاری ڕەنگاوڕەنگە زۆر شاد بووم. پاشان بەرەو(قوچان) کەوتمە ڕێ،جارێکی تر ژنان و پیاوانی قوچانیم بینینەوە کە هەموو قژوموزەردو چاوشینبوون، دووبارە داوام لە پیاوەکان کرد کە ببنە سەربازی من، بەلاّم هەر قایل نەبوون. پێش ئەوەی بگەمەوە سەمەرقەند، ڕێگەی شاری(کیش)م گرتە بەر،کە شوێنی لەدایکبوونمە، هەر زووتر فەرمانمدا بوو بکرێ بە جوانترین شاری سەر زەمین، ویستم بزانم چی کراوە. ئەوە بوو لەوولاّتانەوە کە داگیرمکردن باشوەستای زۆر باشی هەموو پیشەکانم ناردبوون بۆ(کیش) تاکو لەبەردی بەدەخشان و بەردی پەشمی ڕەنگاوڕەنگ جوانترین کۆشکم لە(کیش)دا بۆ دروستبکەن، بە تاق و کەوانەی ڕۆمی بیڕازێننەوە کە زیاتر لەهەزار ساڵ هەڵدەکات. لە(شیراز)یش سەرنجمدا کە هەردوو بەری شەقامەکان بە درەختی بەرزو جوان ڕازێنراونەتەوە، فەرمانمدا شەقامەکانی(کیش)یش وایان لێبکرێت. شارم ئەوەندە ڕازاندەوە و جوانمکرد، کە بە پێی بۆچوونی خۆم، لەم جیهانەدا شار نییە هێندەی شارەکەی خۆم جوان و پێکەوتووبێ، کۆشکەکەشم جوانترین و نایابترین کۆشکی سەرزەمینە. شەقامەکانی شاری کیش پەنجا گەز پانن، جێی بیست و پێنج سوار دەبێتەوە کە بەتەنیشت یەکەوە بڕۆن.هەر لەو شارەدا منداڵانی مامۆستای سەردەمی منداڵیی خۆم، خوالێخۆشبوو(مەلا عەلی بەگ)، بەسەرکردنەوە، خانوویەکی زۆر باشم بۆ دروستکردن‌و مووچەی مانگانەم بۆ بڕینەوە. لەهەمان کاتدا مووچەم بڕییەوە بۆ هەموو هەژاران و بێ دەسەلاّتەکان، دەمویست هەژاری بنەبڕبکەم و کەس دۆش دانەمێنێ .

لەشاری (کیش)دا حەفتەیەك مامەوە،لەسەر پەیمان و بڕیاری خۆم، نەمدەویست بە پشوودان و حەسانەوە تەمەڵی دامگرێ، لەبەر ئەوە ڕوومکردە بیابان ولەناو ئەفسەرو سەربازەکانما مامەوەو سەرگەرمی سەفەری هندستان بووم. دوای لێکدانەوەو ڕاوێژی زۆر ڕێگەی (کابولستان)و(غوور)م بەپەسەند زانی،چونکە لەوێوە ئاو زۆرەو نیازیشمبوو کە گەیشتمە(غوور) (ئەبدال کەلزائی) و هەندێك لە پیاوەکانی لەگەڵ خۆمدا ببەم بۆ هندستان.

# بیست و دووەمین بەش

## کوژرانی شێخ عومەر لە فارس

دوو ڕۆژم مابوو بەرەو هندستان بەڕێبم، لەپڕبەکۆتری نامەبەردا نامەیەکم لە ولاَتی فارسەوە بۆ هات تیادا نووسرا بوو کە(شێخ عومەر)کوژراوە! لەنامەکەدا باسکرا بوو، کاتێ شێخ عومەر لەدەشتی نێرگزی نزیک شیرازدا خەریکی ڕاوبووە، کۆمەڵێك پەلاماریانداوە و خۆیو هاوڕێکانی کوژراون، بکوژەکانیش سەر بە خێڵێك لە خێڵەکانی فارسبوون. بەلاَم ڕوون نەکرابووەوە کام خێڵە.

کۆمیسەری شیراز نامەکەی نووسیبوو، من ئەوم چاك دەناسی، خەڵکی تاشکەند بوو. نووسیبووی کە بارودۆخی شیراز شێواوە، لەوانەیە خێڵ و هۆزەکانی فارس پەلاماری شیراز بدەن، بۆیە داوای هێزی فریاکەوتنی کرد بوو. بۆ مەرگی کوڕەکەم خەمبار نەبووم چونکە مەرگ، ئەگەر چی هی کوڕی خۆیشم بێ شتێکی ئاساییە، بەلاَم لەوە سەرم سڕما کەچۆن و بەو شێوەیە کوڕی من دەکوژرێ! بەلەشکرێکی حەفتا هەزار سوارەوە لە ڕێی خۆراسان و یەزدەو بەرەو فارس بەڕێبووم. کە گەیشتمە شاری(بەشرویە) حەزمدەکرد ماوەیەك بمێنمەوە لەگەڵ دانایانی شاردا گفتوگۆ بکەم، بەلاَم ئەوە بوو کە زۆر پەلەمبوو تا خۆم بگەیەنمە فارس و تۆڵەی(شێخعومەر) بسێنم و ئاگری ئاشووب و ئاژاوە بکوژێنمەوە. خێرا ڕۆیشتین تا گەیشتینە(ڕەباگخان) کە دوا شوێنبوو ئاوی تیا دەستبکەوێ. لەوێ لەگەڵ کوێخاو چەند بەتەمەنێکی ئاواییدا دەربارەی ڕێگە ڕاوێژمکرد. کوێخا کەوتی: بیابانێکی وشك و برنگ و بێ ئاو لەپێشتەوەیە، ماوەی شەست فرسەنگە، ئەگەر لێیبدەی دوای دوو ڕۆژ خۆت و لەشکرو ئەسپەکانت لەناو دەچن، ئەو بیابانەیە کە وەکو دەڵێن، لەشکری(سەلم و طوور)ی تیا سەرنگوونبوو. پاشان دەستی بەرەو ڕۆژهەلاَت درێژ کردو وتی: ئەگەر لەوێوە بڕۆیت دوای دوو ڕۆژ دەگەیتە بناری کێوێك؛ ئیتر لەوێ بەدواوە خەمی ئاوت نابێ. وتم: ئایا قایلی کە ڕێ نیشاندەریم بکەیت؟ وتی: خۆم و کوڕەکەم چاك شارەزاین و ئامادەین ڕێگەوانیتانبکەین. وتم : زۆر باشە، منیش بەدڵی خۆتان پاداشتاندەدەمەوە.

پیرەمێردەکەو کوڕەکەی سواری ئەسپبوون و لەگەڵماندا هاتن کە گەیشتینەبناری ئەو کێوەی باسیکرد، پرسیم: ئایا هەرکاتێ بتانەوێ بچن بۆ

فارس، لێرەوە دەڕۆن؟! وتی: ئەی ئەمیر ئێمە ناوێرین بە تەنها لێرەوە هاتوچۆبکەین، چونکە ئەم ناوچەیە مەڵبەندی جەردەیە! ئێستا کەس ناوێرێ بە تیلەی چاویش سەیری لەشکری تۆ بکات، بەڵام بێ یەك و دوو پەلاماری کاروان و کۆمەڵی بچووك دەدەن، تالآنیاندەکەن و دەشیانکوژن!وتم: باشە، ئەی ئەم ناوچەیە فەرمانڕەوای نییە کە جەردەکان تەمێبکا!؟ وتی: لەوەتەی لە یادمبێ لەو بارەوە هیچ نەکراوە، بەشی خوارەوەی ئەم کێوە هی زابولستانە، بەشی سەرەوەشی وا بەستەی(غوور)و(ئەفغانستان)ە، ئەم ناوەڕاستەشی بێ خاوەنە، هەر کەس پیایدا بڕوات دەکوژرێ. وتم: ئەی چۆنە تۆ ئەمەندە شارەزای ئەم ناوەیت؟ وتی: ئەی ئەمیر، لەسەردەمی منالّی و لاویما شوانبووم و لەداوێنی ئەو کێوانەدا مەڕەکانم دەلەوەڕاندن. وتم: ئایا لەو سەردەمەدا ئەم ناوچەیە وەکو ئێستا ترسناکبوو؟ وتی: لەو ڕۆژانەدا فەرمانڕەوای(قائین و بیرجەند) بەرانبەر بە جەردەو دزەکان زۆر توندو تیژ بوو، هەموویانی ترساند بوون، نەشیاندەوێرا دەست بۆ مەڕەکانم درێژ بکەن چونکە دەیانزانی سەر بە فەرمانڕەوان.

ڕۆژێکیان، دەمەو نیوەڕۆ گەیشتینە چەمێك کە لە کێوەکەوە دەهاتە خوارێ، کەمێك دوور لە چەمەکە چادریان بۆ هەڵدام، کە چوومە ناو چا..رەکەوە مارێکی گەورە پەلاماریدام و نووسابە پووزی چەپما، بە پێ لەقە ە ارەکەم شلکرد، پاشان سەربازەکانم کوشتیان . کوێخام بانگکردو وتم: ئەم ە ارە گەستوومی، ئایا ترسی هەیە؟یان، نا؟! بەسەرسامییەوە وتی: ئەی ئ.ەمیر، ئەم مارە جۆری(کەپچە)یە، ئەگەر جێ گازەکەی برینداز نەکرێ و نەدڕژێ ئەو کەسە دەمرێ! وتم: کەوابێ لێرەدا من دەمرم!... پیرە مێردەکە خێرا داوای پەتێکی کرد، لەناوەڕاستا ڕانی چەپمی شەتەکدا بۆ ئەوەی ژەهرەکە زۆرتر هەڵنەکشێ بۆ ناو لەشم، پاشان بە خەنجەرەکەی خۆی جێگازی مارەکەی بریندارکردو دەستیکرد بە مژینی، خێرا خێرا پڕ بەدەمی ژەهرو خوێنی دەڕژاندە سەر زەوی، بەم جۆرە تا دەمەو عەسر خەریکی ئەم کارە بوو. لەو کاتەدا تا دایگرتم، پرسیم:ئایا مارانگاز تا دایدەگرێ؟وتی: بەڵێ، ئەی ئەمیر، لەکاتی (تا)شدا دەمرێ!وتم: من لە مردن ناترسم، هەمیشە بە پیر مەرگ..وە ڕۆیشتووم. وتی:چاك چاك ڕانتم بەستووە، خوێن ناچێتە دڵتەوە، لەبەر ئەوە نامرێ!

ماوەی سێ ڕۆژ لەسەر یەك لەناوجێدا کەوتم. لە دووا ڕۆژدا تا بەریدام، بەڵام لاقم هێندەی کوندەیەکی پڕ لەئاو، ئاوسابوو. دوای ئەوەی ئاوساویم نەما،

سواری ئەسپبووم و بەڕێبووم. دوای ئەوە هەرکاتێ بچوومایەتە ناو چادرەوە چاك ورد دەبوومەوە بۆ ئەوەی لەمار دڵنیا بم! پیرەمێردەو کوڕەکەی بە بناری ڕیزە شاخێکی دوورو درێژی بێ دارو درەخت و پڕ لە کانیاودا بردیانین، تاکو گەیشتینە بیابانێکی وشکوبرنگ، تا چاو برکات چۆڵ و هۆڵ، هیچ کەس لەو ناوە ئاموشۆی نەدەکرد. پیرەوتی: ئەی ئەمیر، دەتوانی لێرەوەبڕۆی بۆ فارس، نە ئەسپەکانتان و نەخۆتان تینوێتی زۆرتان بۆ ناهێنێ. پرسیم: بەهەمان ڕێگەدا دەگەڕێنەوە؟وتی: ئەی ئەمیر ناوێرین لەوێوە بگەڕێینەوە، ئەگەر یارمەتیمانبدەی بەڕێی بیاباندا دەگەڕێینەوە. چەند حوشترێك و بڕێك پارەم دانێ و پاشان بەرەو فارس کەوتمە ڕێ.

به بێ هیچ گیروگرفتێك گەیشتمە بەرەوە. کاربەدەستی سەرەکی ئەوێ بۆی باسکردم کە چۆن(شێخ عومەر) کوژراوەو بکوژەکانیش لە ئێڵی (بویر)ن کە زۆر نەبەردو دڕو جەنگاوەرن،و کەم وێنەن، وڵاتەکەیان سەراپا جەنگەڵی چڕوپڕو سەختەو کەس ناتوانێ چاریانبکات. پاشان چووم بۆ شیراز، لەوێش لێکۆڵینەوەی چاکمکرد، بۆم دەرکەوت قسەکانی کاربەدەستەکە هەموویان ڕاستن.

دانایان و هەڵکەوتووانی شیراز سەریاندام و منیش خەڵاتمکردن، بەڵام بە داخەوە کات و دەرفەتم نەبوو تاکو وەك جاری پێشوو گفتوگۆیان لەگەڵ بکەم.

لەشیراز خۆم ئامادە کرد تاکو هێرشبکەمە سەر وڵاتی(بویر). ئاگادار کرام کە ئەو وڵاتە لە کۆمەڵە شاخ و کێوێکی بەر فراوانی پڕ لە دارستانی چڕە، کە هەتاو ناکەوێتە سەر زەوی، پێکهاتووە، دانیشتووانی هەر بە جەردەیی و تاڵان و پەلاماردانی کاروان و ڕێبوار ژیانیان دابیندەکەن. ئەوانەی کە ڕاوێژم پێکردن وتیان تەنیا دوورێی زۆر باریك و تەنگەلان هەیە بۆ ئەو وڵاتە، ئەگەر هەندێ جەنگاوەری ئەو ئێڵە ئەو دوو ڕێیە بگرن هیچ لەشکرێ ناتوانێ خۆی بگەیەنەتە ئەوێ، لەهەمان کاتیشا بە دڵسۆزییەوە ئامۆژگارییانکردم کە باشتر وایە هێرش نەکەمە سەر بویرییەکان.

منیش بڕیارمدا کە پیاوانی ئێڵی ناوبراو هەڵخەڵەتێنم.سەربازەکانم ڕاسپاردن بەناو شیرازدا پڕو پاگندە بڵاو بکەنەوە کە دەمەوێ پارەو جەواهێرەکانم بگوێزمەوە بۆ ئەسفەهان و خۆم لە فارسدا بمێنمەوە، بە جۆرێکی وا دەنگەکە بڵاوبوەوە ، تەنانەت سەربازەکانی خۆم بڕوای تەواویان کردبوو. پاشان کاروانێکم بەڕێکرد کە لە پێنج سەد حوشترو ئەسپو بڕێك

سەرباز پێکهاتبوو، ڕێگەیەکیشم بۆ دەستنیشانکردن کە نزیك بە ولاتی (بویر) بێت و پیاوانی ئەو ولاتە بتوانن دەستیانبیگاتێ. لەهەمان کاتا کۆمەڵێك لە جەنگاوەرە چالاکەکانی خۆم ڕاسپاردن کە چاك ئاگایان لەو کاروانە بێت و ئەگەر بویرییەکان پەلاماریاندا، ئەوان دەوریانبگرن و بەزیندوویی بیانگرن، تاکو بۆ داگیرکردنی ولاتەکەیان کەڵکیان لێوەرگرم. چۆن نەخشەکەم داڕشتبوو ، واکرا، لە ئەنجامی پەلاماری جەردەکانی بویردا بۆ سەر کاروانەکە ، هەر هەموویان کە نزیکەی هەزار کەس دەبوون، گیران و کاروانەکەش گەڕایەوە.لە ئەنجامی لێکۆڵینەوەدا لەگەڵ دیلەکاندا دەرکەوت کە ڕێگەی تر زۆرن بۆ چوونە ناو ولاتەکەیانەوە، بەلام هەموویان ڕێی بزنە کێوین و بۆ مرۆڤ ناشێن. جارێکی تر فەرمانمدەرکرد کە باروتێکی زۆر دروستبکرێ و لە دیلەکانیش زانیاریی زیاتر وەربگیرێ، بە بۆچوونی من جەنگاوەرانی بویر لەوانەی ولاتی(غوور) قارەمانتر نەبوون کە بە بارووت لەپەلوپۆمان خستن. ژمارەیەکی زۆر توورەکەلەی چەرمین دروستکران و بە بارووت داگیران و پلیتەیان بۆ دروستکرا. بەشێك لە سوارەکانم لە دەرەوەی سنوری بویر هێشتەوە، بەشێکیشیانم بە پیادەیی بەڕێکرد و بڕیارمدا، وەکو تاقیکردنەوەیەك، لەیەك ڕێگەوە هێرشبەرین، ئەگەر وا باشبوو، وا بەردەوامدەبین، ئەگەر باش نەبوو لەڕێگەکەی ترەوە هێرشدەکەین . یەکەم دەستە کە دەستیا ێکرد بە هێرش، هەموویان کلاوی ئاسن و بەرگی ئاسنینیان پۆشیبوو تاکو بتوانن بەرەنگاری تیربارانی دوژمن ببینەوە، هەر کە هەوراز بووینەوە و بەرەو پیشتر چووین، لەسەر درەختەکانەوە، لە نێوان لق و پۆپە بەیەکا چووەکانیانەوە تیر بارانی بێ ئەندازە کراین ، بەبێ بەزەیی(بویرییە) هاولاتییەکانی خۆیانیشیان دەکوشت کە ئێمە پێش خۆمانمان خستبوون ، بەلام خۆم و سەربازەکانم هەر بەرەو پێشتر دەچووین. زۆرم پێ سەیر بوو، لەبەر چڕی و پڕیی درەختەکان وخۆقاییمکردنی

جەنگاوەرانی دوژمن بە هیچ جۆرێ چاوم لە هیچ تیرهاوێژێ نەبوو. بیرم لەوە کردەوە کە دارو درەخت و جەنگەڵ لە دیوارو شوورەی شارەکان بەهێز ترو قاییمتر نین. بە بارووتهاوێژەکانم وت کە پلیتەکان ئاگردەن و توورەکەلەکان بەرەو ڕووی درەختەکان هەڵدەن. هەرتوورەکە بارووتبوو، یەك بەدوای یەکا دەتەقینەوە، ئاگرێکی دۆزەخئاسایی بەربووەجەنگەڵەکە، هەر جەنگاوەری دوژمنبوو خۆی هەڵدەدایە خوارێ و هەڵدەهات، ئەوەندە تەقینەوەکان زۆر بوون، ئەگەربای شەماڵ نەبوایە هەناسەمان بە تەواوەتی سوارده بوو، ئاگرەکەش

ئەوەندە بەتینبوو ناچار بووین ماوەیەك بەرەو دواوە بکشێینەوە. بەری ڕۆژ بەدووکەڵی دارستان گیرا، لەناوەڕاستی ئەو جەنگەڵەدا ئاگرەکە نزیکەی سێ گەز بەرز بووەوەو بەهیچ جۆرێ نەدەکوژایەوە، دیار بوو کە درەختەکان چەور بوون بۆیە چاك دەگڕان. ماوەی دەڕۆژ ئەو ئاگرە بەرینە بەردەوامبوو، دوای ئەوەی هیچ دارێ بەپێوە نەما، دامرکایەوە، دوای ئەوەش تا دەڕۆژی تر سەرانسەری ئەو ناوچەیە کۆمای پشکۆی سوور بوو، بەوەی باشبوو باران باریو زەوی ساردبووەوەو ئێمەش بەناو خۆڵەمێشێکی زۆردا گوزەرمانکرد بێ ئەوەی هیچ کەسێ ڕێمان لێبگرێ. بەوردی سەرنجی هەموو لایەکی ئەو وڵاتەمدا، بەڕاستی وەك دەیانگوت، بەهەشتی سەر زەویبوو.

(قەرەخان) یەکێبوو لە فەرماندە قارەمانەکانم، داوام لێکرد بچێ هەموو ئەسپەکانم بهێنێ کە لەدواوە بەجێمانهێشتبوون، لەبەر ئەوەی جەنگەڵەکە نەمابوو، دەمانتوانی بە ئاسانی بە سواری بڕۆینو جەنگبکەین. دوای دوو ڕۆژ گەیشتینە ڕووبارێ، کە لێماندا ئاو دەیدا لەژێرسکی ئەسپەکان. پاش سەعاتێك لە پەڕینەوەمان، ڕێگەوداناني پێشەوە ئاگاداریانکردم بەلای ڕۆژهەڵاتی کێوەکەی بەرەوەماندا ڕێگەیەك هەیە، بەڵام جەنگاوەرانی دوژمن گرتوویانەو لەبەرزاییەکانیشەوە خۆیان قاییمکردووەو ترسی بەرد گلۆر کردنەوەش هەیە. دوای ڕاوبۆچوونو ڕاوێژکردنی زۆر لە نێوان منو (قەرەخان)داو سووربوونی ئەولەسەر خۆبەختکردنی، بەخۆیو بیست جەنگاوەری خۆبەختکەرو قارەمانەوە بەرەو گوزەرگەو دەربەندە سەختەکە بەڕێبوون تا بزانن بویرییەکان بەرد تلدەکەنەوە، یان نا. (قەرەخان) کە لەپێشی پێشەوادابوو توانی تێپەڕێ، سەربازەکان چوار چوار ئەسپیان تاودەدا، شانزە سواریش لەوان تێپەڕینو هیچ نەبوو، کەچوار سوارەکەی کۆتاییو ویستیان تێپەڕن، ناڵەی تاوێرە بەرد لەناو دەربەندەکەدا دەنگیدایەوەو هەموو لایەکی گرتەوە، بەداخەوە هەر چواریان بە خۆیان و ئەسپەکانیانەوە بوون بەژێر تاشە بەردەکانەوەو کوژران.لەهەمان کاتدا بۆمان دەرکەوت کە تەنها لەو خاڵەدا دوژمن دەتوانێ بەردمان بەسەردا ببارێنێ. دە سواری خۆبەختکەر چوونە پێشەوە بۆ ڕزگار کردنی تەرمی چوار کوژراوەکانمان، بەڵام هەر کە گەیشتنە لایان ئەوانیش تاوێر بارانکران، لەگەرمەی بیرکردنەوەی قووڵدابووم کە بەچ شێوەیەك ڕێگە بکەینەوەو در بەدوژمن بدەین و لە تاوێر باران خۆمان لادەین، لەناکاو لەسەر شاخەکەو لە خاڵێکی ڕێك بەرانبەرمدا پیاوێك ئاماژەیکرد،

بەسەر سرمانەوە سەرنجمدا، زانیم (قەرەخان)ە، کە زانی پێم زانیوەو چام لێیەتی بەدەست ئاماژەی بۆ لای ڕاست دەکردو دەستی لەسەر لێوانیدا دەناو لایدەبرد. زانیم مەبەستی ئەوەیە کە دوژمن لای ڕاستیەوەیەتی‌و ناتوانێت بانگمانبکات نەوەکو دوژمن پێی بزانێ. پاشان ئاماژەی بۆ لای چەپی خۆی کرد، مەبەستی ئەوە بوو لەوێوە بڕۆین. لەو کاتەدا داوام لەهەموو ئەفسەران و سەربازان کرد کەسەیری سەر شاخەکە نەکەن‌و بەهیچ جۆرێ هیچ ئاماژەیەك نەکەن، نەکو دوژمن بەمەبەستمان بزانێ. لەبەر ئەوەی دوژمن چاوی لەهەموو جموجوولێکمان بوو، داوام لەیەکێ لە فەرماندەکانم کرد کە بە دزەك خۆی بگەیەنێتە قەرەخان تابزانین چی دەڵێ، وە ئەگەر لەمەبەستمان تێنەگەیشت، داوام لێکرد کە تاڵەبەنێکی باریك بە تیرێکەوە ببەستێ‌و، کۆتاییەکەی کەمێ ئەستوورترو زۆر قاییم، بیهاوێ بۆ قەرەخان، ئەوسا ئەو تێدەگات کە دەمانەوێ ئەو تاڵەبەنە ڕابەر بێ بۆ ئەوەی کەسێك بنێرین بۆ لای‌و بە تەواوەتی بزانین چی دەڵێت! بەهۆی ئەو تاڵە بەنەوە پەیوەندی پەیدابوو، هەندێ لە پیاوەکانم بە تەناف قاییم سەرکەوتنە سەر شاخەکەو خۆیان گەیاندە لای قەرەخان و پیاوەکانی. فەرمانمدەرکرد سوارەکانم وا خۆیان پیشانبدەن کە دەیانەوێ لای ڕۆژهەڵاتەوە تێپەڕبن، ئەوەش بۆ ئەوە بوو کە جەنگاوەرانی دوژمن لەسەر شاخەکەوە لە(قەرەخان) بێ ئاگا بن. لەو دەرفەتەدا پێنج سەد جەنگاوەرم بە تەناف گەیشتنە لای قەرەخان و لەگەڵ خۆیاندا تیری زۆرو خرکە بەردیان بردن بۆ قۆچەقانیەکانیان، چونکە ترسی ئەوەم هەبوو بەردی سەر شاخەکە سەختبێ و هەڵنەکەندرێ.داوام لە قەرەخان کرد کە پەلاماری جەنگاوەرانی سەر شاخەکە بدات ولەناویانبەرێت. لەبەر پێچو پەناو تاوێری گەورەو چاڵو چۆڵی زۆر، چاوم لە جەنگی نێوان هەردوو لا نەبوو، بەڵام دەنگ و هاوارو نەعرەتەی جەنگاوەران بەرگوێم دەکەوت، جارجاریش بە هاواری ترسناکەوە هاواری ئەوانە دەبیسترا کە لەسەر شاخەکەوە بەردە بوونەوەو هەپروون بە هەپرووندەبوون.

دوای نەمانی هەراو هوریا و کۆتاییهاتنی جەنگ لەسەر شاخەکە، (قەرەخان) هاواریکرد: ئەی ئەمیر، لێرەدا کەس نەماوە دەتوانی تێپەڕ بیت. فەرمانمدا کە بەردەکان‌و لاشەکانی ناو دەربەندەکە لابەرن، پێشڕەوانم پێشخستن، دوای دڵنیابوون بە گوزەرگەکەدا ڕۆیشتین تا گەیشتینە سەر چەمێك، هەندێ گردو تەپۆڵکە لە پێشمانەوە بوون، کە سەیری خۆرم کرد بینیم کەمێك ڕۆژی ماوە. هەر

لەو شوێنەدا لەشکر هەڵیداو دەمودەست سێ ڕیز پاسەوانم یەك لە دوای یەك دانا، چونکە لەوا نەبوو لەو شەوەدا دوژمن لەناکاو پەلامارمانبدات. ئەو ئێوارەیە(قەرەخان) بەدرێژی باسی جەنگی سەر شاخەکەی بۆ گێڕامەوە، کە چۆن ئەمان لەنەدینیدا بوونو لەپڕ بە تیرو کەوانو بەردە قۆچەقانێ پەلاماریانداون، دوایی هەردوو لا تێکڕژاون. باسی دڕی و سەرسەختیی جەگاوەرانی دوژمنیشی گێڕایەوە، وتی: کە بەسەختی بریندار دەبوون بە پاڵەوە هەوڵیاندەدا بە خەنجەر لاقی سەربازەکانمان ببڕنەوە. ئەو ڕۆژە دووسەدو چل و یەك جەنگاوەرمان کوژرابوونو بڕێکیشمان لێبریندار بوو بوون، هەموو بریندارەکانیش هێنرا بوونەوە خوارەوە .

کە(قەرەخان) لە قسەکانی بوووەوە، باسی نەبەردیو چاونەترسی و خۆبەختکردنو داهێنانو زیرەکی و بلیمەتیم کرد، دووجار وتم: لە پاداشتی ئەم هەموو خۆبەخشینو خزمەتدا چیت دەوێ بۆت جێبەجێدەکەم! لەوەڵاما هەر دەیگوت: ئەی ئەمیر، ئەرکی سەر شانمە کە لەپێناوی تۆدا قوربانی بدەم. دوایی وتم: ئەی پیاوی قارەمان و داهێنەر دە هەزار دینارم بۆ دانـاوی، کە گەڕاینەوە سەمەرقەندو کاتێ شووکردنی(زوبەیدە)ی کچم هاتە بەرەوە لێتی مارە دەکەم! قەرخان وتی: ئەی ئەمیر من بەندەی تۆمو پێشیاوی ئەوە نیم ببمە زاوات! وتم ئەمڕۆ سەلماندت کە شایستەی ئەوەیت ببیتە زاوام. کاتێ کە پارەکەیاندەهێنا، لەسەر شاخەکەوە ڕووناکییەکم بینی، بۆ یەکەم جار ڕاچڵەکیم و هەڵلەرزیم چونکە بۆم دەرکەوت کە هەڵەیەکی زۆر گەورەم کردووەو بە درێژایی تەمەنم هەرگیز هەڵەی وام نەکردووە، دوای ئەو هەموو سەخڵەتییە کە گوزەرگەکەم کردەوە، بەبێ پاسەوان بەجێمهێشت بوو تا دووبارە دوژمن بیگرێتەوەو بواری گەڕانەوەم نەبێ!(ڕێگەی تر هەبوو)؛ بەڵام نەمدەزانی ئەوێش دەربەندی سەختو شاخی بڵندی هەیە، یان نا! باسی هەڵەکەی خۆمم بۆ قەرەخان کردولێم پرسی: وەکو بزانیت بۆ پاسکردنو پاراستنی ئەو گوزەرگەیە پێویستمان بە چەند سەرباز هەیە؟ وتی: پێنج سەد کەس بەسن. وتم: هەزار سەرباز ببەو بڕۆ . وتی: ئەی ئەمیر فەرمانت بەسەر سەرم، بەڵام وەکو وتم بڕێك جەنگاوەرمان لە شاخەکە بەدیلگرتوون، بەباشی دەزانم بەر لەوەی بڕۆین لێکۆڵینەوەیان لەگەڵا بکەین. داوامکرد یەکە یەکە دیلەکان بێنین، لە یەکەمینیانم پرسی: هاو وڵاتیەکانت بەم شەوە لەوسەر شاخە چی دەکەن؟وتی: تەرمەکان کۆ دەکەنەوەو فریای بریندارەکانیش دەکەون. بۆ دڵنیایی پتر لە

یەکێکی تریانم پرسی: بۆچی بەم شەوە نووتەکە تەرمەکان کۆدەکەنەوە، بۆچی چاوەڕێ ناکەن بەیانی ئەم کارە بکەن؟ وتی: ئەی ئەمیر، ئەم ناوچەیە پڕە لە گوڕەوکەن، لاشەی مردووەکان دەخۆن، بریندارەکانیش چاوەڕوانی یارمەتین‌و دەبێ بەزوویی فریایانبکەوین. مەبەستی ئەو پیاوە لە گوڕەوکەن کەمتیار بوو. لە دیلێکی ترم پرسی، کە دیار بوو پلەی لەوانی تر بەرزتربوو: ئایا ئەو دەربەندە کە ئێمە گرتمان، دووبارە نایگرنەوە؟ وتی: جاگرتنەوەی چ کەڵکێکی هەیە، وتم: ڕێگەی گەڕانەوەمان لێدەگیرێ! وتی: لەو باوەڕەدانیم ناچاربی بگەڕێیتەوە، وا هەستدەکەم هەر کاتێ خۆت بتەوێ بگەڕێیتەوە دەگەڕێیتەوە.

بە قەرەخانم وت: درەنگە، هەستە زوو برۆ دەربەندەکە بگرەو لەوێ بخەوە. بەهەزار سوارەوە بەڕێبوو ، برێکی تریشی لەگەڵ خۆیان برد تالەو سەرەوە ئەسپەکان بهێننەوە. پێویستی نەدەکرد هیچ ڕێنمایی‌و ئامۆژگارییەك پێشکەش بە قەرەخان بکەم، چونکە بە تەواوەتی دڵنیا بووم لێی. لەکاتێکا سەرگەرمی سەرنجدانی شاخەکەو ڕووناکییەکەی بووم، دووراو دوور گوێم لە دەنگێ بوولە لورە لوور دەچوو، لەدیلێکم پرسی: دەبێ ئەو دەنگە چی بێ؟ وتی: ژنن، دەگرین. پرسیم: ئایا ژنانیش بۆ کۆکردنەوەی تەرمەکان چوونەتە سەر شاخەکان؟ وتی: ئەوان لە دامێنی چیاکەدان، کە تەرمەکان دەهێنرێنە خوارێ دەست بە شین دەکەن. دوای ئەوەی دیلەکان برانەوە جێی خۆیان، وردە وردە دەنگی شین و شەپۆر کز بوو، پاشان نەما. زۆری پێنەچوو تەتەرێکی قەرەخان هات و دڵنیا بووم کە لە هەموو لایەکەوە دەربەندەکە چۆڵەو دامێن‌و سەر چیا هەمووی بەدەست سەربازەکانمانەوەیە. دوای ئەوەی بەناو ئۆدوگەکەمدا گەڕام و ڕێنمایی‌و ئاگاداریم بەهەموو ئەفسەرەکاندا، تاکو بەیانی نووستم، بەیانی زۆر زوو هەستام، لەمزگەوتەکەمدا نوێژمکرد.

بەر لەوەی فەرمانی بەڕێکەوتنی لەشکر دەرکەم، یەکێ لە فەرماندە بە تواناکانی خۆم کە ناوی (میر حسێن) بوو بە هەزار سوارەوە لەو خاڵەدا هێشتەوە بۆ ئەوەی پەیوەندیم لەگەڵ قەرەخاندا نەپچڕێت. دەستەی پێشڕەوانم بەڕاستو چەپاو بۆپێشەوە دابەشکرد، لەهەمان کاتا بۆ ڕێنمایی کەڵکمان لە دیلەکان وەردەگرت. بەناوچەیەکی پان‌و بەرینی تەپۆلکاویدا ڕۆیشتین بێ ئەوەی کەسێ، خانووچکەیەك، شوێنەوارێکی مرۆڤێ دەرکەوێ، گرد بە گرد چاوەڕێبووین سەربازانی دوژمن پەلامارمانبدەن. لەناکاو پێشڕەوانی پێشەوە هەواڵیاندامێ کە دوژمن لەو دەوروبەرەدایە، ئێمەش لە شوێنی خۆماندا بە

ئامادەبوونى تەواوەوە، وەستاين، بەلام هەوالى تر نەبوو. پاش كەمێك دەستەيەكى ترم ناردنە بەرەوە تا هەوالى ئەوانى تربزانن، زۆرى پێنەچوو لە پشت گردەكانەوە هاوار بەرپا بوو، پاشان بێدەنگى بالى بەسەر ئەو ناوەدا كێشا. ويستم تاقمێكى تر بنێرم، دەرفەتم نەبوو، چونكە لەهەموو لايەكەوە وەكو تاوى بەهار تير بەسەرمانا بارى، ئەوەندە تير بارانەكە چڕو خەست و بەهێز بوو بەباشم زانى پاشەكشێبكەين. من بۆ خۆم دوو تيرم بەركەوتن، بەلام بەرگە ئاسنينەكەم پاراستمى، بەو تيرانەدا بۆم دەركەوت كە بازووى تيرهاوێژانى دوژمن زۆر بەهێزە. كە جێمان بەخۆگرت، لەديلەكان زۆر بە گومان بووم كە ئێمەيان لەوێوە برد، بەلام سوێنديان خوارد كە ئاگادار نەبوون، گردەكان زۆر فراوان و بەرينبوون، بەرەو هەر لايەك ڕووماننبنايە لەوانەبوو بويرەكان بۆسەيان دانابێ. پاشان بۆم دەركەوت كە هەموو پێشڕەوانى لەشكرەكەم كوژراون. هەردوو هێزەكەى دواوەم لە بارودۆخى خۆمان ئاگادار كرد تاكو چاكتر وريا بن.

ديلەكان بۆيان باسكردم كە دانيشتووانى ئەو ناوچەيە هەر لەمنداڵييەوە مەشقى تير هاويشتن دەكەن، كە گەورەشبوون بۆ خۆيان كەوان دروستدەكەن، ژێى كەوانەكەش لەڕيخۆڵەى بزنەكێوى دروستدەكرێ، نووكى تيرەكانيشيان بەردە ! لەو شوێنەدا كە تيا وەستاين بە خشتى كاڵ دوو بوورجى بەرينو بەرزمان بە باشى دروستكرد، داواشمكرد كە دوو هێزەكەى دواوەشمان هەروا بكەن تاكو بتوانن خۆيان بپارێزنو بەرگريى دوژمن بكەن. دواى ئەوە بەڕابەريى ديلەكان بەرەو باكوور بووينەوە بۆ ئەوەى بتوانين دەورانەوەرى گردەكان بگرين، ئەم جارەيان لە ديلەكان بێ خەمبووم، چونكە ئەگەر شتێك لەژێر سەريانا بوايە دەكوژران. بەڕێگەيەكى تەختوداكەوتوودا دوو ڕۆژ لەسەر يەك غارماندا، پاشان گەيشتينە شوێنى مەبەست. لەبەر ئەوەى پێشبينيدەكرا تووشى شەڕ بين، داوامكرد سەربازەكان پشوويەكى باش بدەن. ئەو سەربازانەى زرێپۆشبوونو سازو بەرگى جەنگيان لەبەردا بوو جيامكردنەوەو داوام لێكردن هەر هەموويان پيادە بن، چونكە نەماندەتوانى ئەسپەكانمان لە تيرى دوژمن بپارێزين. بە ناوچەيەكى سەوزو فراواندا بەرێبووين، بەرەو ڕۆژهەلات وەرچەرخاين، ئەو سەربازانەى زرێپۆشبوون پێشكەوتن، ئەو سوارانەش كە بەرگى ئاسنيان لەبەردابوو بەدوايانا، خۆيشم لەگەڵيانا بووم. دەمەو نيوەڕۆ دەستەى پێشڕەوى لەشكر ئاگاداريانكردم، كە دوژمن دەبينرێت.

فەرماندا کە پیادەکان هێرشبکەن، سەربازانی دوژمن زۆر بە سەختی تیر بارانیانکردین. بەشێکم لە هێزەکەی خۆم لەدواوە دانا بۆکاتی تەنگانە، خۆیشم بەهەموو هێزەکەی ترمەوە لە پشتەوە دەستمکرد بە هێرش، خۆم لە پێشی پێشەوەدا بووم، ویستم پیشانی بویریەکان بدەم کە پیاوێك بەناوبانگە بە(تەیموور گورگین) دەستو بازووی چۆنەو چی لەباردایە. لەناکاو تیرهاوێژانی دوژمن زانیان کە ئێمە لە پشتەوە پەلاماریاندەدەین، پێش ئەوەی بتوانن تیرێکمان تێبگرن سوارەکانم وەکو لافاو نیشتنە سەریانو بەشێکی زۆریشیان بوون بەژێرەوە. بە تەورەکەم کەوتمە وێزەی دوژمن، هەر تەورێکم دادەهێنایەوە جەنگاوەرێکم لە پەلوپۆ دەخست، لەو بەریشەوە سەربازە پیادەکانم لە تیرهاویشتن وەستانەوەو شیریان لە کێلان دەرهێناو هێرشیانکرد. سەربازانی دوژمن ڕوویان لە هەر لایەك دەنا لەناو دەچوون، ڕێگەی دەرچوونو گەڕانەوەیان لەهەموو لایەکەوە لێگیرا بوو. شەڕ تاکو نوێژی عەسردرێژەیکێشا، لەوکاتەدا دوا بەرگریی جەنگاوەرانی دوژمن کۆتاییهات، ئەوانەی بە زیندوویی مانەوە خۆیاندا بەدەستەوە. دوای ئەوە دڵنیا بووم کە هێرش نەکراوەتە سەر هێزەکانی میر حسێنو قەرەخان، بەرەو شارکشاین کە لەسەر گرد دروستکرابوو. لەسەر یەکێ لە گردەکانەوە ستوونی دووکەڵ بەرز دەبوونەوەوە؛ لە دیلەکانم پرسی: ئەو دووکەڵە چییە؟ وتیان هی(ئاتەشگە)ی شارە. من تا ئەو ڕۆژە ئاگرگەی ئاگر پەرستەکانم نەدیبوو. پاشان دیلەکان باسیانکرد کە هەموو ساڵێ بەشی خۆی دار دەبات بۆ ئەو ئاگرگەیە، سەرپەرشتیاری تایبەتی هەیەو ڕۆژانە دووکەس ئێشکی ئاگر دەگرن تا نەکوژێتەوە. بۆ دابینکردنی بژێوی سەرپەرشتیارو نۆکەران و دەستو پیوەندانی ئاگرەگەکەش، هەموو ساڵێ حەوت ڕۆژجەژندەکەن کە ناوی جەژنی حەوت فریشتەیە!، فریشتەکانی نزیك بەخوان، ڕۆژەکانی حەفتەش بە ناوی ئەوانەوەن یەکەمین ڕۆژی جەژنەکەشیان جەژنی نەورۆزە، لەو حەوت ڕۆژەدا دانیشتووان دێنە ناو ئاگرگەکە، هەر یەکە زەکاتی خۆی دادەنێ. پاشان باسی نوێژی خۆیانیان کرد کە ڕوو نەکەنە ڕۆژو چەند جارێ دەست بەرز دەکەنەوەو شتێ دەڵێن. خۆر ئاوابوو، شەو بەسەرا هات، هێشتا ماوەیەکمان مابوو بگەینە شار. هەر لەو شوێنەدا کە تەپۆلکەو کەمێك بەرز بوو ئۆردووگەمان سازکرد، بەهەر چوار دەورا پاسەوانی چاکم دانان و بۆسەی گەڕۆکم دەستنیشانکردن. ئەو شەوە هیچم نەخوارد بۆ ئەوەی خەوم لێ نەکەوێ، لەگەڵ ئەوەشدا بەیناو بەین وەنەوزێکی چەند خولەکیم دەکرد. لەگەڵ سپێدەی بەیانا سەربازەکان

لەخەو هەستانو ئۆردووگەیان پێچایەوەو بەرەو شاری(بویر) کەوتینە ڕێ. لە دوورەوە شار بە گەورەیی و فراوانی دەبیـنرا، سەرنجمدا کە لە سەمەرقەند گەورەترە، بەڵام دیلەکان ڕوونیانکردەوە کە خانووەکان لەیەکترەوە دوورن بۆیە وا دەزانرێ کە شارەکە زۆر گەورەیە، ڕاستییەکەی ژمارەی خانووەکان لە هەزار تێپەڕ ناکات. لەناکاو پێشڕەوانی لەشکر هەواڵیاندا، کەوا دوژمن دەرکەوت! بە فەرماندەکانی هەموو قۆڵەکانم وت کە چاك ئاگادارو ئامادە بن. لە پڕێکا لە پێشەوە، لەدواوە، لەڕاستو چەپەوە هێرشی دوژمن دەستی پێکرد، ئەوەندە جەنگاوەری ژنو پیاو دەرکەوتن دەتگوت لەژێر زەوییەوە هەڵدەقوڵێن! لەهەموو قۆڵەکانەوە، بەو پەڕی هێزو توانامانەوە کەوتینە پەلاماردانی دوژمن، ژنێکی کۆڵ بە کۆڵ شمشێرێکی بۆ داوەشاندم، بەڵام پێش دەستیمکردو بە تەورێ پشتیم شەقار کرد، کە ژنەکە کەوت گوێم لە گریانی ساوایەك بوو، زۆر سەرسامبووم، تمەزە منالە شیرەخۆرەکەی بەکۆڵیەوەیە! یەك لەدوای یەك هێرشەکانی دوژمنمان تێکشکاندن، بەشێکی زۆریشیان بوون بەژێر ئەسپەکانمانەوە، زۆربەی زۆریان بەر پلاری شیروتەورەکانمان کەوتن، بڕێك بەدیلگیرانو هەندێکیشیان بەو
دەشتو دەرەدا بلاوبوونەوە، داوام لە سەربازەکانم کرد کە دوایان نەکەون بۆ ئەوەی زووتر شار بگرین. دەمویست ئەوە دوایین جەنگمبێ دژ بە بویریەکان...ڕێی شار کرایەوەو سوارەکانم چوونە ناو شارەوە. فەرماندەکانم ئاگادار کرد کە دەست لە کارمەندانی ئاگرگەی شار نەدرێت، بەرگران بکوژنو شار تالانبکەن و هەموو خانووەکان بڕووخێنن. کە چووینە ناو شارەوە لە هیچ لایەکەوەهیچ دەنگێ نەبیسترا، کە سوارەکانم چوونە ناو خانووەکانەوەو هاتنەوە دەرێ وتیان کەسیان تێدا نییە. بۆمان دەرکەوت کە هەموو دانیشتووان شاریان بەجێهێشتووە، لەبەر ئەوە بەبێ بەرگریو پێکادان شارم گرتو بەرەو ئاگرگەی شار ڕۆیشتم. لەبەر دەرگای ئاگرگەکەداچەند کەسێك کە بەرگی خۆڵەمێشییان لەبەردا بوو، وەستابوون، پرسیم: ئێوە چینو چ کارەن؟! پیاوێکی ڕیشسپی وتی: ئێمە زیرگەوانی ئەم ئاگرگەیەین. وتم: دانیشتووانی ئەم شارە ماڵ و سامانی خۆیان بەجێهێشتووەو ڕۆیشتوون، ئێوە بۆ نەڕۆیشتوون؟وتی: ئێمە ناتوانین ئاگری پیرۆز بەجێبهێڵین و بکوژێتەوە! وتم ئەگەر ئەم ئاگرەتان بکوژێنمەوە چی دەکەن؟ وتی: تۆ کەسەرو ماڵی بەندەکانی خوا لەبەردەستتان، تکایە ئەم کارە مەکە! ئەی ئەمیری گەورە، عەرەبەکان ئەم ئاگرەی ئێمەیان نەکوژاندۆتەوە، ئەوان نزیکەی هەشت سەد ساڵ لەمەوبە ئەم

ولاتەیان گرتو دینی ئیسلامیان بلاوکردەوە ، بەلام ئەم ئاگرەیان نەکوژاندەوە! بۆم دەرکەوت پیرەی ریشسپی پیاوێکی دانایە، وتم دەمەوێ ئاگرەکەتان ببینم وتی: فەرموو، بەلام زۆر لێی نزیك مەبەرەوە تا هەناسەت سوار نەبێ، ئێمەش بۆ خۆمان ئەوەندە لێی نزیك نەبوینەوە. ئاگرگەکە خانووچکەیەکبوو گومەزێکی بچووکی هەبوو، کونێکی تیابوو بۆ دەرچوونی دووکەڵ، لە ئاستی گومەزەکەدا مەقەڵییەکی گەورەی کونکونی ئاسن دانرابوو پڕبوو لە ئاگر، پیاوێك کەبەرگی

خۆڵەمێشیی لەبەردا بوو لای مەقەڵییەکەوە وەستابوو، جار جار چڵەدارێکی دەخستە سەر ئاگرەکە بۆ ئەوەی نەکوژێتەوە. من وام زانی شتێکی مەزنو سەیر دەبینم، بەلام لە ئاگردانەکانی کەبابخانەو چێشتخانەکانی سەمەرقەند بچووکتربوو. کە هاتمە دەرێ لە پیرەم پرسی: ئایا خۆتو زیرگەوانەکان موسڵمانن؟! وتی: بەڵێ! وتم: ئەی چۆن ئاگردەکەنەوەو دەیپەرستن؟! وتی: ئاخر ناتوانین واز لە دابو نەریتی باوباپیرانمان بێنین! وتم: ئەوان بتپەرستبوون، ئاگرکردنەوەو پەرستنی رەویەی بتپەرستانە، موسڵمان نابێ ئاگر بپەرستێ!... پاشان باسی هەندێ بیروباوەڕو بۆچوونی پووچەڵی بۆ کردم!، وتم: من بڕیارمداوە کە لاقەی زانایانی ئایینو شاعیران و دانایان و وەستایان نەکرێ، ئەگینا هەر ئێستاکە لە ملتانمدەدا، چونکە ئێوە لە دین هەڵگەڕاونەتەوەو لاتانداوە پێویستە بکوژرێن! پیرە سەری هێنایە پێشەوەو وتی: ئەی ئەمیر ئەمە ملی منو ئەوەش شمشێری تۆ! وتم: ئەگەر بمەوێت لە ملی تۆو زیرگەوانەکان بدەم پێویستم بە قایلبوونی ئێوە نییە، ئێوە بەخشراون، بەلام چونکە گەورەو بچووکو ژنو پیاوی ئەم شارە بەرەنگارییانکردووەو (شێخ عومەر)یان کوشتووە، کە کوڕی منە، دەبێ هەر هەموویان سزا بدرێن.پاشان فەرمانمدەرکرد کە هەموو خانووەکانی شار برووخێنرێن، بەم جۆرە تاقە یەك خانووچییە بەپێوە نەما، تا ئەو ڕۆژەش کە ئەو شارەمان بەجێهێشت هەر کەسمان بدیایە دەمانکوشت. دوای ئەوەی دڵنیا بووین کە پاشماوەی دانیشتووانی ئەو ناوچەیە ناتوانن ڕێمان پێبگرن، بڕیاری گەڕانەوەمدا، لەکاتی گەڕانەوەمانا لەولاتی(بویر) کەلاوەی (تەختی سلێمان)م بینی کە دەیانگوت بە هێزی با جوولاوە، زۆرم پێ سەیر بوو، چونکە هیچ بەردێکی لەچەند تەنێك کەمتر نەبوو! دوای چەند ساڵێك بیستم ئەو شوێنە تەختی سلێمان نەبووە، بەڵکو پایتەختی سوڵتانێکی فارسبووەو ئەسکەندەری مەکەدۆنی سووتاندوویەتیو وێرانیکردووە.

# بیستو سێیەمین بەش

## تاعـــــوون

جارێکی تر نیازم هەبوو لەرێی خوراسانەوە بگەرێمەوە بۆ سەمەرقەند. کە لە تەختی سلێمان بەرێبووین، دوای دوو رۆژ پێشەنگانی لەشکرەکەم هەولیاندامێ برێك خەڵکانی بێچەك بەراکردنەوە بەرەو رومان هاتوون و دەڵێن: لە نەخۆشیی(تاعوون) رادەکەین! داوای هەندێکیانیانم کرد، لێیانم پرسی: نەخۆشیی تاعوون لەکوێ بڵاوبۆتەوە؟! وتیان لەشاری(هورمز، سوورو، سەیف، عەمارە، مانەندوسیراف)ە وە هاتووەو لەهەموو شارۆچکەکانی باشووری فارسدا خەڵك بە تاعوون دەمرن. ئەو شارانە هەموویان لەسەر بەندەرەکانی وڵاتی فارسبوون. رۆژانە خەڵکانی هەڵهاتوومان دەدی و پرسیارمان لێدەکردن، بۆم دەرکەوت لەو ناوچانەدا کە ئێمە پیایاندا دەرۆین تا خوراسان دەردی تاعوون بڵاونەبۆتەوە. لەبەر ترسی ئەو نەخۆشییە تا توانیمان پتر ئەسپەکانمان تاودا بۆ ئەوەی بێوەی بگەینە جێ. کاتێ گەیشتمە(دارابوجورد) بریارمدا دوو رۆژ بحەوێینەوە. یەکەم رۆژ ئاگادار کرام کە هەندێ سەربازم نەخۆشکەوتوون، هەموو هاواری سەریان دەکەن‌و تا دایگرتوون. لە پزیشکی لەشکرم پرسی: ئایا تووشی تاعوون هاتوون؟! وتی: جارێ نازانم چونکە نیشانەکانی نەخۆشی تاعوون بەرچاو ناکەون. بۆ دووەم رۆژ برێکی زۆرتر دوچاری هەمان نەخۆشیبوون، ئەوانی رۆژی پێشتر هاواری بن قوڵو بن رانیان بوو. پزیشکەکەمان وتی: گومانی تیا نییە کە سەربازەکان تووشی تاعوون هاتوون! پرسیم ئەی چار چییە؟! وتی: نەخۆشیی تاعوون چارەسەرو دەرمانی نییە، نەخۆشەکە، یان دەمرێت، یان خۆی چاکدەبێتەوە! بۆ نوێژی عەسر ئەفسەرەکانم کۆکردنەوەو پێمراگەیاندن کە بۆ بەیانی زوو دەبێ سەربازە نەخۆشەکان بەجێبهێڵین‌و لە تاعوون رابکەین، چونکە ئەگەر بەدیار نەخۆشەکانەوە بمێنینەوە سوپاکەم تیادەچێ. پاش خۆرئاوا بوون‌و نوێژ کردن، ویستیان سفرەی نانخواردنم بۆ دانێن، لەپر لەرز دایگرتم داوام لە نۆکەرەکەم کرد کەداپۆشێ پاش نیو سەعاتێ هەستم بە گەرمبوونەوە کردو تا دایگرتم، سەرئێشەیەکی توندم تووشهات. بۆ ئەوەی عارەقبکەمەوە پزیشکی لەشکر چای گوڵی زمانەگای بۆدەمکردم و خواردمەوە، پاشان داوایکرد

بەردێکی زۆر بخەنە ناو ئاگرەوە، کە بەردەکان سوور سوور بوونەوە خستنیە ناو تەشتێکی گەورەو ئاوی کرد بەسەر بەردەکاندا داوای لێکردم سەرم بەسەر تەشتەکەدا شۆڕکەمەوە، پارچە قوماشێکی گەورەیاندا بەسەرماو بە هالاوێکی زۆر گەرم عارەقێکی زۆرم کردەوە، دوای ئەوە سەرئێشەو تاکەم باشبوون‌و بۆ ماوەی سەعاتێ خەوتم. پاشان سەرئێشەو تا زۆریان بۆ هێنام، ئیتر نە چای گوڵی زمانە گاو نە هالاوی بەرد هیچ کەڵکێکیان نەبوو. بۆ سبەینێ کە سپێدەی بەیان دەرکەوت لە تاو ئێش‌وئازار ئەوەندە بێ‌هێز بووبوم نەمتوانی نوێژ بکەم. لە پزیشکەکەم پرسی: ئایا تووشی تاعوون هاتووم؟! پزیشکەکە بێدەنگبوو! وتم: بۆ وەڵام نادەیتەوە؟! من تەیمورم‌و لە مردن باکم نییە، دەبێ هەموو کەسێ بمرێ، پێغەمبەری ئێمە(د.خ) بەو مەزنی‌وخۆشەویستییەوە لەدنیا دەرچوو، منیش هەردەبێ ڕۆژێ بمرم، بەلام پێم خۆشبوو لە مەیدانی جەنگدا بکوژرامایە، نەك لەناو جێدا بمرم. پزیشکەکە وتی: ئەی ئەمیر، هەمان نەخۆشی سەربازەکانت گرتووە!وتم: تا دەستم قەڵەم دەگرێ، قەڵەمو کاغەزم بۆ بێنن تا ڕاسپاردەی خۆم بنووسم. نووسیم:ئەگەر بەتاعوون مردم(قەرەخان) فەرماندەی لەشکر دەبێ‌و ئەبێ لەشکرەکەم بباتەوە بۆ سەمەرقەندو بیداتە دەست کوڕە گەورەکەم، کە لەدوای من پادشای ولاتەکانی من دەبێ، وام پێ باشە کە کوڕەکەم قەرەخان بکات بە فەرماندەی لەشکر. وە بەگەیشتنی قەرەخان بۆ سەمەرقەند پێویستە کوڕەکانم(زوبەیدە)ی خوشکیانی لێ‌مارە بکەن. هەروەها نووسیم: ئەگەر هاتوو قەرەخان مرد(ئەمیر حسێن) دەبێتە فەرماندەی لەشکرو دەبێ سوپاکەم بگەیەنێتەوە سەمەرقەندو بیداتەوە دەست کوڕەجێنشینەکەم. هەرچی پارەو سامانم هەیە بە پێی یاساو دەستوورو شەرعی ئیسلام دابەشبکرێ بەسەر کوڕەکانم‌وکچەکانمدا. هەروەها نووسیم کە دەبێ فەرماندەی لەشکرەکەم تەرمەکەم بباتەوە بۆ سەمەرقەندو لەوێ بنێژرێم! دوای تەواو بوونی وەسیەتنامەکەم داوای قەرەخان‌و ئەمیر حسێن‌و هەموو ئەفسەرەکانم کردو لە ناوەڕۆکی وەسیەتنامەکەم ئاگادارمکردن، لەو کاتەدا قەرەخان دەستیکرد بە گریان! وتم: قەرەخان دڵنیابە کە (زوبەیدە)ت لێ‌مارە دەکرێ، پێویست ناکات بگری! قەرەخان وتی: ئەی ئەمیر من بۆ(زوبەیدە) ناگریم من بۆیە دەگریم، ئەگەر تۆ بڕۆیت ئێمە لە سایەی کێدا پەروەردە بین!...وتم: فرمێسکەکانت بسڕەو ئامادە بە بۆ ڕاپەڕاندنی ئەرکی سەرشانت، ئاگاداری کە نیازمبوو زوو بۆی دەرچین‌و لەشکرەکەمان لە تاعوون بپارێزین،

کەچی ئەوەتا بۆ خۆیشم گیرۆدەی ئەم نەخۆشییە بووم! قەرەخان تۆ دەبێ ئەم نیازەی من بەجێبێنیتو بەیانی زوو خۆت و لەشکر بۆی دەرچن، با من لێرە بمێنمەوە، تەنها برێك ئەفسەر بهێڵەرەوە بۆ ئەوەی ئەگەر مردم تەرمەکەم بگەیەننە ئێوەو بیبەنەوە بۆ سەمەرقەند.

قەرەخان وتی: ئەی ئەمیر، تۆ دەفەرمووی لێرەدا بەجێتبهێڵمو بەلەشکرەوە بڕۆم!؟ وتم: وا پێویستدەکات! وتی: هەرگیز ئەم کارە ناکەم! وتم: ئەگەر وانەکەی هەموو ئەفسەرەکانو سەربازەکانو خۆیشت بەم نەخۆشییە ئەمرن! وتی: گیانی هەر هەموومان لەگیانی تۆ خۆشەویستترنییە، تۆ لەلایەكو گیانی هەموو دنیا لەلایەك. وتم: قەرەخان، فەرماندە دەبێ پێش هەموو شتێ سوودی لەشکرەکەی ڕەچاو بکات! وتی: ئەگەر ئەفسەرێکی ئاسایی بوویتایە لێرەدا بەجێمدەهێشتی، بەڵام تۆ(ئەمیرتەیموورگورگێن)ی، ئەوەندە بە نرخی ئەگەر هەموو دانیشتوانی ئەم سەر زەمینە ببنە قوربانت هێشتا کەمە!چۆن بەجێتدەهێڵم! هەموو دوژمنەکانت لەبۆسەدان ئەوانەی کوڕەکەتیان کوشت تۆش دەکوژن!من لێرەدا دەمێنمەوە تا چاکدەبیتەوە، ئەوسا هەموومان پێکەوە دەڕۆین، وەکو لە وەسیەتنامەکەتا نووسیوتە، ئەگەر مردی تەرمەکەت دەبەمەوە بۆ سەمەرقەند. وتم: تۆ بمێنەرەوە، بەڵام با ئەفسەرەکان و لەشکر بڕۆن. قەرەخان وتی: بۆنی تاعوون بەناو لەشکردا بڵاوبۆتەوە، ئەگەر بڕۆن لەڕێگەدا سەربازەکان نەخۆشدەکەونو دەمرن سەرەڕای ئەمەش دوژمنان پەلامارمان دەدەن و دەمانکوژن، واباشترە لەم شوێنەدا بمێنینەوە.

لەبەر ئەوەی نەمدەتوانی پتر گفتوگۆ بکەم، قەرەخانو ئەفسەرەکانم مۆڵەتدانو سەرم خستە سەر سەرین. بۆ ڕۆژی دوایی ئازارم زۆرتر بوو کە دەستمدەبرد بۆ بن باڵم هەستم بە گرێیەکی گەورەو ئازارێکی زۆرتر دەکرد، ئێشی ئەو گرێیە ئەوەندە زۆر بوو ئارامی لێهەڵگرتبووم . بۆسێیەمین ڕۆژ ڕەنگی گرێکە بوو بەشینێکی تۆخ،لەوەودوا تووشی وڕێنەکردن هاتم .ئەوندە تاکەم قورسبووهەرکەسێ لێم نزیکدەبووەوە هەستیدە کرد لەمەقەڵییەکی پڕلەئاگر نزیکدەبێتەوە ، دوای ئەوە ئاگام لەدەوروبەری خۆم نەماو نەمدەزانی لەکوێم!هەرچی ڕووداووکارەساتومەترسی وجەنگێك کە هاتبوونە ڕێم دەهاتنەوە بەرچاوم وسەرگردانو سەرلێشێواو بووم. دەنگێك هاتە گوێم دەیگوت: دەریبوو، دەریبوو! لەهەمان کاتیشا هەستمدەکرد کە ئازارم کەمترە. بۆ ڕۆژی دوایی زانیم ئەوانەی دەوروبەرم کە بینیویانە وا

گرێکەی بن  باڵم دەرپبووە، هاواریانکردووە دەرپبوو. تا هەوی گرێکە زۆرتر بهاتایە دەرێ من باشتر دەبووم. ئەوەندە لاوازو بێهێز بووبووم نەمدەتوانی بە دانیشتنیشەوە خۆمبگرم. بۆیان باسکردم ئەوی توانای هەڵاتنی هەبووە لەشار دەرچووە، تەنیا پیرو پەککەوتەکان مابوونەوە. ڕۆژێکیان پیاوێکی زۆر پیرو چەماوەیان هێنایە لام، وتیان: ئەمە (دەستوور)ە واتە پێشەوای ئاگر پەرستەکان. پیرە وتی: ئەی ئەمیر، هەنگوینم بۆ هێناوی، بیخۆ تاکو بەهێز بیتەوە. وتم: تۆ چۆنە وا لە تاعوون هەڵنەهاتووی؟! وتی: ئەی ئەمیر، من ڕۆژانە بڕێك هەنگوین دەخۆمو لە تاعوون ناترسم، هەر کەسێ هەنگوین بخوات تووشی تاعوون نابێ. پرسیم :کێ دەڵێ هەنگوین دژی تاعوونە؟! وتی: لە کتێبی ئێمەدا نووسراوە، (گایو مەرت) یەکەمین کەسبووە وای وتووە. پرسیارمکرد(گایو- مەرت) کێیە؟ وتی(گایو - مەرت) لە شانامەدا بە(کەیومەرپ) نووسراوە، (گایو- مەرت) واتە پیاوی دانا. وتم: تۆ لەدانەری شانامە ڕەخنە دەگری، گوایە لە فیردەوسی داناتری؟! وتی بەڵێ ئەی ئەمیر، من نازانم هۆنراوە دانێم، بەڵام لەو داناترمو بە تەواوەتی ناوو نەژادی هەموو پادشاکانی ئێران دەزانم، هەموویان لە کتێبی ئێمەدا نووسراون، فیردەوسی نەیتوانیوە، یان نەیویستووە فارسیی کۆن بخوێنێتەوە. پاشان دەربارەی هەنگوینەکەی وتی: ئەم هەنگوینە هی دووبەری خۆمەو دڵنیابە ئەگەر لێی بخۆی زۆر زوو هێزت بەبەردا دێتەوە!

بڕێك لێرەم دایە، بەڵام وەری نەگرت و وتی: ئەی ئەمیر، نەهاتووم هەنگوینت پێبفرۆشم، هاتووم خزمەتتبکەم. دوای ئەوەی پیرەمێردە چەماوەکە ڕۆی، بڕیارمدا لە شار دەرچم، چونکە تاعوون بەربوو بووە لەشکرەکەم و سەربازەکانمی لاڵ و پاڵ خست بوو. هەندێکیانم دانا بۆ سەرپەرشتی و ئاگاداریی نەخۆشەکان.

ئەو ڕۆژەی ویستم لەشار دەرچم(دەستوور)هات بۆ لام و وتی: ئەی ئەمیر، ئەگەر بگەڕێیتەوە بۆ وڵاتی خۆت، بێجگە لە هەنگوینخۆرەکان، هەموویان تووشی تاعوون دەبن! وتم: وا نییە، خەڵکی (خەوارزم) بەرێکەوت هەنگوین دەخۆن! وتی: کەوای لێهات بەر لەوەی بگەیتە بەرەوە هەموو سەربازەکانت دوو بدە(دووکەڵبدە) بۆ ئەوەی بۆنی تاعوون لەناویانا نەمێنێ. پرسیم: چۆن چۆنی لەشکرەکەم دوو بدەم؟! وتی: تاقم تاقم بیانخەنە ژووری گەورە گەورەوە، لەهەر ژوورێکدا بڕێك بنجە دڕکی بیابان، کە باش ناو ڕشێنکرا بن، بەم جۆرە بۆ

ماوەی دە ڕۆژو هەر ڕۆژەی یەك سەعات دوویانبدەن! وتم: خەفەدەبن! وتی: دەبێ دەرگای ژوورەکان کراوەبن، لەو ماوەیەدا بە تەواوی بۆنی تاعوون لەناو سەربازەکانتا نامێنێ و بێ خەم بچۆرەوە بۆ ولاتی خۆت، ئەگەر وانەکەی تاعوون بلاو دەبێتەوەو سەدان هەزار خەلك دەکوژێت!

جارێکی تر ویستم ئەو پیاوە خەلاتبکەم، بەلام هیچی لێ وەرنەگرتم، وتی: بە ڕەنجی بازووم و بەرهەمی باخەکەم دەژیم و زیاترم ناوێ. ئنجا بەڕێبووین. هەوا فێنكو خۆشبوو، دەمانتوانی بە ئاسانی بە بیاباندا بڕۆین، بەلام نەخۆشی لە کۆلمان نەدەبووەوە، ناچار لە شارۆچکەی(کارێز عەرەب) وەستام بۆ ئەوەی سەربازەکان دووکەلبدەم. قەلایەك لەو ناوە دابوو، کە دوو تەویلەی گەورەی تیا بوو، فەرمانمدا لەو تەویلانەدا سەربازەکانم بە نۆرە دووکەلبدرێن. (دەستوور)چی وتبوو، وامانکرد.دوای تەواوبوونی دە ڕۆژەکە بەڕێکەوتین، لەوێ بەدواوە تاگەیشتمەوە سەمەرقەند هیچ سەربازێکم نەخۆش نەکەوت. کە گەیشتمە بەرەوە نامەیەکم نووسی بۆ فەرمانڕەوای شیراز بە(دەستوور) بلێ لە پاداشتی ئەو خزمەتەیا بڕیارمدا بۆ ماوەی پێنج سال هەموو ئاگرپەرستەکانی ولاتی فارس باج و سەرانە نەدەن.

فەرمانڕەوتای فارس بە کۆتری نامەبەردا ئاگاداریکردم کە ئەو پیرە بە سالاچووە مردووە. داوامکرد بە هەموو ئاگرپەرستەکان ڕاگەیەنێ بە بۆنەی ئەو دوو خزمەتە مەزنەی(دەستوور)ەوە کە پێشکەشی(تەیموور گورگین)ی کردووە بۆ ماوەی پێنج سال لە سەرانەو باج بەخشراون.

پاش ماوەیەك چووم بۆ شاری(کش) تا دلنیا بم و بزانم ئیشەکان بە کوێ گەیشتوون. بەناو شەقامە پان و بەرینەکانا گەڕام کە لە هەردوو لاوە داری بەرزو جوان سەریان یەکانگیر بوو. لە دەرگای گەلێك مالدا، سەیری فەرش و ناومالیانمکرد، بە زیادەوە هەموو شتێکیان تەواو بوو، زۆر لە ژیانی خۆیان ڕازیبوون.

بەشێك لە کۆشکەکان هێشتا تەواو نەبوو بوون، هەموو شارەزاو باشوەستاو ئەندازیارو کارمەندەکان، کە لەهەموو گۆشەیەکی جیهانەوە هێنابووم، سەرگەرمی دروستکردنی کۆشك و تەلارەکانبوون، وا چاوەڕوانبووم کە دوای گەڕانەوەم لە هندستان هەموویان تەواو بکرێن، ئنجا هەموو پادشاو سولتانەکانی سەر زەمین میواندارییکەم و بۆ ماوەی مانگێك لە جوانترین شاری جیهاندا، لەشاری(کەش)دا خۆشتریت کات بەسەر بەرن!

دە ڕۆژ لە(کەش)دا مامەوە، پاشان ڕوومکردەوە بیابان تاکو ڕۆژانە لەگەڵ ئەفسەرو سەربازەکانمدا سەرگەرمی مەشق و ڕاهێنانی جەنگبین و خۆم بۆ سەفەری هندستان ئامادەم بکەم. بەرەو هندستان دوو ڕێگەم لەبەرا بوون،، یەکەمیان ڕێی خۆراسان، زابولستان، مەکران،توووران، دووەمیان ڕێی کابولستان، غوور، شاری ئەسکەندەر(قەندەهار). دوای ڕاوێژو ورد بونەوەیەکی زۆر ڕێگەی دووەمم هەڵبژارد. نامەیەکم بۆ (ئەبدال کەلزائی) نووسی، تیایدا داوام لێکرد بیست هەزار سەربازم بۆ کۆبکاتەوە، پێشەکی نیوەی مووچەی ساڵانەیان بۆ ماڵ و منداڵەکانیان دابیندەکەم، ئەگەر سەرکەوتیشم دەوڵەمەندترین وڵاتی سەرزەمین لەبەر دەستما دەبێت، ئەوسا پیاوەکانی بە ئارەزووی خۆیان چەپاو بکەن، پاداشتی سوڵتانی غووریش گەلێك مەزندەبێ! پەیمانم دایە ئەوەندە گەوهەرو لیرەی دەدەمێ بەشی پشتاوپشتی بکات. سوڵتانی غەووریش بە دڵی خۆم وەڵامی دامەوەو ئامادەیی خۆی پیشاندا بوو. منیش بەهەموو پێداویستییەکەوە ئامادە بووم، دەمویست کاتێ دەگەمە هندستان وەرزی بارانی ئەو وڵاتە نەبێ..

# بیست و چوارەمین بەش

## وڵاتی سەیرو سەمەرە، یان هندستان

ئەمتوانی داوای لەشکر لە سوڵتانەکان و فەرمانڕەکانی قەڵەمڕەوی خۆم بکەم و بە سووپایەکی چەند سەد هەزار سەربازەوە بەرەو هندستان بکەومە ڕێ، بەڵام ئەرك و بەڕێوە بردن و دابینکردنی هەموو پێویستییەکانی لەشکرێکی وا گەورە کارێکی زۆر دژوار بوو، لەبەر ئەوە وام بە باش زانی کە بەلەشکرێکی سەدو بیست هەزار سەر بازەوە بەڕێبم، سەد هەزاری هی خۆم، بیست هەزاریشی هی(ئەبدال کەلزائی).

بە لەشکری خۆمەوە لە سەمەرقەند کەوتمە ڕێ، هەر لەیەکەم هەنگاودا سەرم بۆ ئاسمان بەرز کردەوە، وتم: خوایە خۆت دەزانی من لەشیرو تیرو ڕم و مەرگ ناترسم، ئەگەر لەم سەفەرەم گەڕامەوە بۆ سەمەرقەند، پەیمانبێ لەم شارەدا مزگەوتێکی زۆر گەورە دروستبکەم بۆ پەرستنی تۆ. بێجگە لە قەرەخان، هەموو فەرماندەکانم لەگەڵما بوون. داب و نەریتی ئێمە وایە. ئەگەر پیاوێ ژن بێنی بۆ ماوەی سێ مانگ پشووی دەدرێتێ بۆ ئەوەی ئەو ماوەیە لەگەڵ ژنەکەیا بەسەر بەرێ، ئەوە بوو کە گەڕاینەوە سەمەرقەند(زوبەیدە)م لە قەرەخان مارە کرد و گواستیەوە.

گەیشتینە کابولستان و لەوێشەوە بەرەو غوور ڕۆیشتین، (ئەبدال کەلزائی)پێشوازییەکی زۆر گەرمی لێکردین و لەگەڵیشما هات. پاشان بەرەو شاری(ئەسکەندەر)کەوتمە ڕێ. ئەمیری(ئەسکەندەر) دە فرسەنگ بە پیرمەوە هات و هەزار لیرەشی بە دیاری بۆ هێنا بووم، لەبەر ئەوەی دەستکورتبوو، وە ناکرێ دیاری بدرێتە داوە، یەك دانەیانم وەرگرت، وتم: خەرجییکە بۆ منداڵ و نۆکەرەکانت. تەنیا ڕۆژێکیش میوانیبووم، بڕێك برژانی مەڕم خوارد. دەربارەی ڕێگە پرسیارم لێکرد، وتی: ئەی ئەمیری مەزن، هەرکەسێ لێرەوە بڕوات بۆ(پەنجاب) دەبێ بە دەربەندی (خەیبەر)ا تێپەڕێ، کە زۆر ترسناکەا وتم: بۆ؟! وتی: چونکە هەمیشە لەهەردووبەری ئەو دەربەندەدا ژمارەیەکی زۆر جەردەو ڕێگر خۆیان ماتداوەو ئامادەن بۆ ڕووتکردنەوەو کوشتنی ڕێبوارو کاروان، هەمیشە بۆسەیان ناوەتەوە ئامادەی پەلامارن.

پرسیم: درێژییەکەی چەندە؟ وتی: پانزە فرسەنگە. ئەمیری شاری(ئەسکەندەر) دوازدە ڕێگەوانی باشی دامێ، لەبەر ئەوەی لەشکرم کردبوو بە شەش دەستەوە، هەردوو ڕێگەوانم لەگەڵ دەستەیەکا بەڕێکردن و دوو دەستەی پێشڕەویشم بەم بەرو بەو بەری دەربەندەکەدا بەڕێکردن، لەگەڵ ئەوەشا لەو باوەڕەدا نەبووم چەتەکات بوێرن بێنە سەر ڕێی لەشکرێکی وا مەزن. شاخەکانی هەردووبەری دەربەندەکە زۆر بەرز نەبوون، پێشڕەوەکان زۆر بە ئاسانی پیایانا سەرکەوتن و ئاگایان لەهەموو لایەکبوو. شەومان بەسەردا هات هێشتا هەر لەو دەربەندەدا بووین، لەبەر ئەوەی ڕێگاکە سەختبوو نەماندەتوانی خێرا بڕۆین. ڕێگەوانان وتیان: دەبێ شەوێ لەم دەربەندەدا بمێنیتەوەو بۆ سبەینێ بەڕێبین.

پێشنیارەکەم وەرگرت و بەو مەرجەی شوێنێ دەستبکەوێ بۆ ئوردووگە بشێ. وتیان: لەم نزیکانەداو لەبناری دەربەندەکەدا پانتاییەکی باش هەیە. هەندێ سەربازم لەگەڵ شارەزاکاندا ناردن تاکو بزانن ئەو شوێنە چۆنە، کاتێ گەڕانەوە وتیان: زۆر باشەو ئاویشی زۆرە. کە گەیشتینە بەرەوە سەیرمکرد زنجیرە شاخێکی سەخت و ڕەش و بەرز، کە لە سەرەوە بەرەو پێشێ چەمابوونەوە، دەورانەوری ئەو تەختانییەیان داوە. وەکو پێویست هەموو شتێ جێبەجێکرا، منیش داوامکرد کە چادرەکەم لە بناری شاخەکەو لە شوێنێکی بەرزا هەڵدرێ بۆ ئەوەی چاوم لەهەموو لایەك بێ. کە چوومە ناوچادرەکەمەوە جارێکی تر سەیری لوتکەی شاخەکانم کرد، بە جۆرێ هەڵکەوتبوون دەتگوت ها ئێستە، یان ساتێکی تر دەڕمێن و لەگەڵ زەویدا تەختماندەکات.

هەروەکو وتم، خەوم زۆر سووکە. ئەوەندەم زانی دەنگی هەورە تریشقە هات، خێرا لە چادرەکەم هاتمە دەرێ، کە سەیری ئاسمانم کرد، لەهەموو لایەکەوە هەوری چڕو پڕو ڕەش دابووی بەیەکا، برووسکەو گرمەی سامناکی نەبڕاوەی هەور دەنگدانەوەی شاخە بڵندەکان و کێوەکان کۆتاییان نەدەهات. زانیم چەندان تاوە بارانی بەهاریدا دەکەن، ئەگەر فریای خۆمان نەکەوین خۆمان و ئەسپەکانمان تیا دەچین. داوام لە سەربازەکان کرد کە شەیپوور لێبدەن و هەموو لەشکر بە خۆیان و ئەسپ و کەلوپەلەوە بەرەو کێوەکان بکشێن. هەر ئەوەندەمان زانی لەهەموو لایەکەوە دایکرد، دەنگی سامناکی لافاو هاتە گوێمان، لەهەمو لایەکەوە لافاوی نووحناسا هەستا، ئەو ناوە

بەجارێ بوو بەژێر لافاوەوە، وردە وردە زۆری هێناو ئاو بەرز بووەوە، ئەوەی باشبوو هەموو سەربازو ئەسپەکانمان گەیشتبوونە شوێنە بەرزەکان و رزگاریانبوو. ئەگەر باران بەو جۆرە درێژەیبکێشایە ئەو ولاتە دەبوو بەدەریاو هەموومان دەخنکاین.

باشبوو باران وەستا، هەور پچڕ پچڕبوو، ئەستێرەکان جارێکی تر درەوشانەوەو تریفەی مانگ دای لە پانتاییەکە، کە بوو بوو بە دەریاچەیەك. بەهەر لایەکا چاومدەگێڕا هەر ئاوێکی ڕەشبوو، زانیم خاك و بەردی ناوچەکە، کە لافاو ڕاپێچیکردوون، ڕەشن. فەرماندەکان سەر ژمێرییەکی باشیان کرد، باشبوو کەس تیا نەچوو بوو، بەلام کەلوپەل و ئازووخەیەکی زۆرو مزگەوتەکەی منیش بوو بوون بەژێر ئاوەوە، بەلام پێداویستیی جەنگمان پارێزرابوو.

بۆ بەیانی کە دنیا ڕونبوو، سەیرمکرد ئاوەکە نیشتۆتەوەو هەندێ چادریش بەدەرەوە بوون، ئاوەکە کە بواریدەدا دەرچین، برێك سەربازم لەوێ هێشتنەوە بۆ دەرهێنانەوەی شتە زۆر پێویستەکان و بەلەشکرەکەوە بەڕێبووم تا بە زووترین کات لە دەربەندی(خەیبەر) دەرچین.

لەو شوێنەدا ئەزموونێکم وەرگرت کە نابێ هەرگیز لەوەرزی باراندا لە شوێنی تەختان و نزمدا ئوردووگە هەڵبدرێت.

هەر لەهەمان ڕۆژدا لە دەربەندی خەیبەر، دەرچووین، لەوسەری دەربەندەکەوە گەیشتینە گوندێ، کۆمەڵێ پیاوی بالا بەرزو سنگپان، سەرو ڕیش و سمێڵزەردو چاو شینمان بینین، ژنەکانیشیان بالا بەرزو جوانبوون، پرچی زەردو درێژیان بەسەر شانا پەخشانکردبوون، ڕوخساریان دانەپۆشیبوو، هیچ ترسێکیان لە ئێمە نەبوو. هەر پیاوێك شمشێرێکی بەبەر پشتوێنەکەیا شۆڕ کردبووەوە، دەیانگوت لە کاتی جەنگدا ژنانی ئەو گوندە شان بەشانی پیاوەکانیان دەجەنگن، ئەو دانیشتووانە لەوانەی ناوچەی دەوروبەری خۆیان نەدەچوون. یەکێك لە ئەفسەرەکانی خۆم ڕاسپارد لێکۆڵینەوەیەك لەسەرنەژادیان بکات، خەڵکەکە دەستیان بۆ ئاسمان بەرز کردەوەو وتیان ئێمە خەڵکی ئاسمانین و لەوێوە هاتووینەتە ئەم سەر زەمینە! دوای ئەوەی ئەو گوندەمان بەجێهێشت گەیشتینە سنووری ولاتی هندستان.

هەموو ئاگاداری و وریایی و هەنگاوی پێویستمان ڕەچاوکردن. دوای چەند ڕۆژێك ڕێبڕین بۆم دەرکەوت کەس بەرگری ناکات و ڕێمان پێ ناگرێ چونکە

بەجارێ بوو بەژێر لافاوەوە، وردە وردە زۆری هێناو ئاو بەرز بووەوە، ئەوەی باشبوو هەموو سەربازو ئەسپەکانمان گەیشتبوونە شوێنە بەرزەکان و رزگاریانبوو. ئەگەر باران بەو جۆرە درێژەیبکێشایە ئەو ولاتە دەبوو بەدەریاو هەموومان دەخنکاین.

باشبوو باران وەستا، هەور پچڕ پچڕبوو، ئەستێرەکان جارێکی تر درەوشانەوەو تریفەی مانگ دای لە پانتاییەکە، کە بوو بوو بە دەریاچەیەك. بەهەر لایەکا چاومدەگێڕا هەر ئاوێکی ڕەشبوو، زانیم خاك و بەردی ناوچەکە، کە لافاو ڕاپێچیکردوون، ڕەشن. فەرماندەکان سەر ژمێرییەکی باشیان کرد، باشبوو کەس تیا نەچوو بوو، بەلام کەلوپەل و ئازووخەیەکی زۆرو مزگەوتەکەی منیش بوو بوون بەژێر ئاوەوە، بەلام پێداویستیی جەنگمان پارێزرابوو.

بۆ بەیانی کە دنیا ڕونبوو، سەیرمکرد ئاوەکە نیشتۆتەوەو هەندێ چادریش بەدەرەوە بوون، ئاوەکە کە بواریدەدا دەرچین، برێك سەربازم لەوێ هێشتنەوە بۆ دەرهێنانەوەی شتە زۆر پێویستەکان و بەلەشکرەکەوە بەڕێبووم تا بە زووترین کات لە دەربەندی(خەیبەر) دەرچین.

لەو شوێنەدا ئەزموونێکم وەرگرت کە نابێ هەرگیز لەوەرزی باراندا لە شوێنی تەختان و نزمدا ئوردووگە هەڵبدرێت.

هەر لەهەمان ڕۆژدا لە دەربەندی خەیبەر، دەرچووین، لەوسەری دەربەندەکەوە گەیشتینە گوندێ، کۆمەڵێ پیاوی بالا بەرزو سنگپان، سەرو ریش و سمێڵزەردو چاو شینمان بینین، ژنەکانیشیان بالا بەرزو جوانبوون، پرچی زەردو درێژیان بەسەر شانا پەخشانکردبوون، ڕوخساریان دانەپۆشیبوو، هیچ ترسێکیان لە ئێمە نەبوو. هەر پیاوێك شمشێرێکی بەبەر پشتوێنەکەیا شۆڕ کردبووەوە، دەیانگوت لە کاتی جەنگدا ژنانی ئەو گوندە شان بەشانی پیاوەکانیان دەجەنگن، ئەو دانیشتووانە لەوانەی ناوچەی دەوروبەری خۆیان نەدەچوون. یەکێك لە ئەفسەرەکانی خۆم ڕاسپارد لێکۆڵینەوەیەك لەسەرنەژادیان بکات، خەڵکەکە دەستیان بۆ ئاسمان بەرز کردەوەو وتیان ئێمە خەڵکی ئاسمانین و لەوێوە هاتووینەتە ئەم سەر زەمینە! دوای ئەوەی ئەو گوندەمان بەجێهێشت گەیشتینە سنووری ولاتی هندستان.

هەموو ئاگاداری و وریایی و هەنگاوی پێویستمان ڕەچاوکردن. دوای چەند ڕۆژێك ڕێبڕین بۆم دەرکەوت کەس بەرگری ناکات و ڕێمان پێ ناگرێ چونکە

خەڵکی ئەو ناوچانە ئیسلامبوون، ئەفسەرەکان و سەربازەکانم زۆریان پێ سەیر بوو کە خەڵکەکە بە زمانی هندی نوێژیان دەخوێند! داوای فتوایان لێکردم کە ئێمەش بە زمانی خۆمان نوێژ بخوێنین! وتم: پەندو یەکێتی ئیسلام لەوەدایە کە بە یەك زمان نوێژ بخوێنین و لە جیاوازیی ناوچەیی و زمانەوە بەدوور بین، بەڵام ئەگەر میللەتێك نەتوانن بە عەرەبی نوێژ بخوێنن و بۆیان نەیەت و وشەکان لەسەر زمانیان زۆر ناڕەحەت و قورسبن، دەتوانن بە زمانی خۆیان نوێژ بخوێنین، لەگەڵ ئەوەشا دەبێ هەوڵبدەن بە زمانی عەرەبی نوێژ بخوێنین.

کە بۆم دەرکەوت بە ناوچەیەکا دەڕۆین هەموو دانیشتووانەکەی موسڵمانە،دەستوورمدا ئاڵای سەوز هەڵکرێ، لە هەموو شوێنێ بە دەنگی بەرز بانگبدرێ، تامیرو فەرمانڕەوایانی ناوچەکە بزانن لەشکرێکی ئیسلام چووەتە وڵاتیان. ئەم بیرۆکەیەم ئەوەندە بەکەڵکبوو بێ کۆسپ و تەگەرەو شەڕ ڕێگەیەکی دوورو درێژمان بڕی تا گەیشتینە(کەویتە-کویتە)، سوڵتانی ئەوێ کە ناوی(عەبدوڵلاوالیملووك)بوو بە پیرمەوە هات و منی برد بۆ کۆشکەکەی خۆی و بووم بە میوانی. دوای نانی نیوەڕۆ، دۆستانە لێی پرسیم: ئەی ئەمیری گەورە ئەتەوێ بۆ کوێ بڕۆیت و بە تەمای چی بکەی؟! وتم: ئەمەوێ هندستان داگیر بکەم و بیخەمە سەر وڵاتەکەم. وتی: ئەی ئەمیر، لەم بیرو خەیاڵە گەڕێ! پرسیم: بۆچی!؟ وتی: هندستان دوو هەزار پادشای هەن، هەریەکەیان ناوناوی(ڕاج)ە ، ئەگەر خوا سەد ساڵ تەمەنت بداتێ و بە درێژایی ئەو تەمەنەت خەریکی شەڕکردن بی ناتوانی هندستان بگری! وتم: باشە، ئەی چۆن مەحموودی غەزنەوی هندستانی گرت؟! وتی ئەو تەنیا گۆشەیەکی هندستانی گرت، پێش ئەویش جیهانگیرانی تر تەنیا هەر گۆشەیەکی هندستانیان داگیر کردووە. ئەی ئەمیری گەورە، تۆ نازانی هندستان چەندە بەربڵاوو بەرینەو چەند نەتەوەی جۆراوجۆرو ئایین جیاوازو داب و نەریت سەیر سەیری تێدا دەژین!

وتم: ئەگەر لە ڕێگەیەکی نزیکترەوە بڕۆیشتمایەولەوانە بوو ڕۆژانە توشی شەڕ بهاتمایەو زۆر دوا دەکەوتم. بۆ چوونەکەی پەسەند کرد، پاشان وتی: لێرەوە تا(موڵتان) هیچ تەگەرەیەك نایەتە ڕێت، چونکە دانیشتووانی ئەو ناوچانەی پیایانا دەڕۆی هەموویان موسڵمانن، دوای ئەوە دەگەیتە ناوچەی هندووەکان و ڕێت پێدەگرن، تیرهاوێژەکانیان سواری فیلن و لەناو کەژاوەی تایبەتیدان کە زۆر ترسناکن. وتم: لەوانیش ترسم نییە! لە وەڵامی چەند پرسیارێکما بۆی باسکردم کە پادشای دەهلی دەتوانێ بە ملیۆن جەنگاوەر

کۆبکاتەوە، دیوارو شوورەی شار لەبەرد دروستکراوەو خەندەقیشی هەیە. ئەو پادشایە تا بڵێی دەوڵەمەندو خاوەنی خەزێنەیەکی بێئەندازەیە. پاشان لە (والیمولك)م پرسی: ئایا (سوڵتان مەحمود خەلج) کە پادشای (دەهلی) یە، دیوتە؟ بەسەر سرمانێکەوە سەیرێکیکردمو وتی: ئەو سوڵتانە تا سەرەتای ئەمساڵ پادشای (دەهلی)بوو، بەڵام فەرماندەیەکی خۆی بەناوی (مەلو ئیقباڵ)، لێی هەڵگەڕایەوەو هێرشیکردە سەریو لەسەر تەخت لایبرد، وەکو ئاگادارم هێشتا لە زینداندایە. دواتر بۆی باسکردم کە تەمەنی سوڵتان(٤٥-٤٦) ساڵ دەبێت و هی(مەلو ئیقباڵ)یش (٣٤-٣٥)ساڵە.

کات ئەوەندەی بەبەرەوە نەمابوو، نەمدەتوانی زیاتر دواکەوم، بەرەو (موڵتان) لەشکرم خستە ڕێ. بێ تەقەو ڕەقە گەیشتمە بەرەوە. سوڵتانی موڵتان هندوییبوو، ناوی (پن شن ـ جەنگ)بوو، پێشوازییەکی باشی لێکردین، بردمیەوە ماڵی خۆیان، خانووەکەی لەگەڵ خانووی دانیشتووان‌دا جیاوازییەکی ئەوتۆی نەبوو، بەڵام گەورەتر بوو. شاری (موڵتان)وەکو شاری(بوین) دەهاتە بەر چاو، خانووەکان لەیەکەوە دوور بوون، جیاوازیان هەر ئەوە بوو ئەم لەناو دارستاناو ئەو لەسەر گرد دروستکرابوو. لەو کاتەدا چوومە ماڵی سوڵتانی موڵتان داوامکرد بەهەر چوار دەوری خانووەکەدا پاسەوانی تایبەتی دابێن بۆ ئەوەی بێ خەمبین. دوای نوێژی ئێوارە نان دانرا، (پن شن ـ جەنگ) وتی: ئەی ئەمیر، بە ئاسوودەیی‌و بەبێ خەم نان بخۆ، خواردنی ئێمە ژەهراوی نییە، ئەگەر دڵنیاش نیت، چەند نۆکەرێك بانگدەکەم تا لەهەموو چێشتەکان بخۆن. هەر کە یەکەم پاروومم خستە دەممەوە، لەبەر توونیی خواردنەکە بە جارێ دەمم سووتاو لەسەر سفرە هەستامو وتم: ناتوانم چێشتی هیندی بخۆم، چونکە ئەوەندە توونە لە لێوەوە تا ناوسك دەسووتێنێ! سوڵتان وتی: خواردنی بێ داوو دەرمان لەماڵمانا نییە! وتم: هەندێك هێلکەم بۆ بکوڵێننو بۆم بێنن.

ئەو شەوە سوڵتان ژووری نووستنەکەی بۆ من بەجێهێشت، لەسەربانەکانیش پاسەوانی تایبەتیم دانانو نووستم. لە گەرمە گەرمی خەودا بووم، لەپڕ بە دەنگێ گە بەدەنگی لقی درەختەکان دەچوو خەبەرمبووەوەو وامەزانی لافاو هەستاوە. سەیرێکی ئاسمانم کرد، ئەستێرەکان دەدرەوشانەوەو درەختەکانیش نەئەلەرانەو، بەڵام هەمان دەنگم هەر بەر گوێ کەوتەوە، شمشێرەکەم لەژێر سەرما دەرهێناو بەرەو دەرگای ژوورەکە ڕۆیشتم، لەسەرخۆ لەیەکێ لە پاسەوانەکانم پرسی: چ باسە؟! پاسەوانەکە بە ترسەوە

ئاماژەی بۆ ناو باخەکە کردو وتی: مار...! مار...! لەبەر جریوەی ئەستێرەکاندا چاوم بەسەدان ماری گەورە گەورە کەوت کە لەیەك ئالاّ بوون و دەیانفیشکاند، دەنگەکەیان هەروەکو دەنگی لقی درەخت بوون کە با دەیانشەکێنێتەوە. هەرگیز بەو جۆرەو لە هیچ شوێنێکا کۆماری مارم نەبینیبوو. سەیرێکی دەوری باخەکەم کرد تا بزانم کەس بەخەبەرە، بەلاّم کەسم نەدی. لە باخەکەوە هەست بە بۆنێکی زۆر تیژ دەکرا وەکو بۆن و بەرامەی بیبەرو بەهارات و دارچینییەکەی چێشتەکانی مالّی سولّتانبوو، تەمزە ئەوە بۆنی مارەکانە، دوای ماوەیەك هاتووچۆی مارەکان هەر درێژەی هەبوو، بەلاّم لەگەلّ شنەی بەیاندا وردە وردە کەمبوونەوە پاشان لەبەرچاو نەمان، ئیتر نەمتوانی بخەومەوە چونکە کاتی نوێژی بەیانیبوو.

پاش نوێژ کردن فەرمانمدا کە(پن شن ـ جەنگ)م بۆ بهێنن، بە خەوالّویی هێنایانە بەردەمم، پرسیارم لێکرد: ئایا شەویّ بە دەنگی مارەکان خەبەرتبووەوە؟! وتی: نەخێر، ئەی ئەمیر، چونکە شەوان مارەکان لە باخەکەدا دەگەڕێن، بەلاّم ناچنە ناوژوورەکانەوە، ئەگەر کەسێك نەچێتە ناو باخەکەوە مار پێوەی نادات. وتم: بۆچی ئێوارە باست نەکرد، ئایا دەتویست بچمە ناو باخەکەو مار پێمەوە بدات؟! وتی: ئەی ئەمیر هەگیز ئەو بۆچوونەم نەبووە، بەڕاستی لەیادم نەبوو پێتبلێم، شەوانە گەڕانی مارەکان لە حەوشەو باخەکاندا لەم شارە شتێکی ئاساییە ، لەبەر ئەوە لەم شارەدا هیچ کەسیّ بەشەو ناچێتە ناو باخ و حەوشەوە. مارەکان بۆقەکان دەخۆن، مارە گەورەکان مارە بچووکەکان قووتدەدەن، هەرگیز ناچن بە لای ئەو کەسانەدا کە لە ژوورەوە نووستوون.

پاشان سەبارەت بە پادشای تازەی(دەهلی) و ڕادەی هێزو توانای داوای زانیاریم لە (پن شن ـ جەنگ) وەرگرت، وتی (مەلو ئیقبالّ) سالّێکە بووەتە سولّتانی دەهلی، لەبەر ئەوە زۆر لە خۆی دەترسیّ، هەمیشە ئاگای لە خۆیەتی. نازانم ژمارەی سەربازەکانی چەندە، بەلاّم خاوەنی دوو هەزار فیلە. پاشان وتی سیّ قەلاّی مەزن لەسەر ڕێگەتن و هەر سێکیشیان سەربازگەن، دەبیّ ئەو قەلاّیانە بگری ئینجا دەگەیتە دەهلی، گرتنی دەهلیش ئاسان نییە! پرسیم کە ئەم هەموو کۆسپانە لەسەر ڕێی دەهلیدان ئەی چۆن (سولّتان مەحمود غەزنەوی) خۆی گەیاندە دەهلی؟ وتی: من لەو باوەڕەدانیم دەهلی گرتبیّ، وەك بزانم ئەو تەنها (پەنجاب)ی گرتووە! وتم: لەکتێبدا خوێندوومەتەوە کە (مەحمود غەزنەوی) گەیشتۆتە دەهلی. وتی: ئەی ئەمیر، مەرج نییە هەرچی لە

کتێبدا نووسرابێ ڕاستبێ. لەدووسەد هەزار بەیتی هۆنراوەی (مەهابراتان) ڕەنگە تەنها سەد هەزاریان هی ئەو بن، ئەوانی تر داستانی هەڵبەستراون! پرسیم: (مەهابراتا)چییە؟! وتی: مەهابراتا کۆکەرەوەی مێژووی هندستانە، هەر لەسەرەتاوە تا هەزار سالّ لەمەوپێش. وتم: دەبێ لەوە ئاگاداربی کە(سوڵتان مەحمود غەزنەوی) مێژوو نووسو شاعیری دەرباری خۆی لەگەڵدا بوون و هەموو شتێکیان تۆمار کردووە، کتێبەکان و دیوانەکانیان ئەفسانە نەبوون. ئینجا پرسیاری لێکردم: (سوڵتان مەحمود غەزنەوی) کەی هاتووە بۆ هندستان؟ وتم: نزیکەی چوار سەدو پەنجا سالّ لەمەوبەر هاتووە. وتی: دەی لەو سەردەمەدا ئەم قەڵایانە نەبوون، چونکە دووسەدو پەنجا ساڵە دروستکراون. لێم پرسی پەیوەندیت لەگەڵ (مەلوئیقبالّ)دا چۆنە؟ وتی: نایناسم و پەیوەندیم لەگەڵیا نییە. پاشان داوای چەند ڕێگەوانێکی شارەزام کرد، چوار شارەزای دامێ و پێش نیوەڕۆ لە (موڵتان) دەرچووم.

کاتی خۆرئاوا بوون لەکەناری ڕووبارێکدا وەستاین، لەشکر بە ئامادە بوون و ئاگاداری تەواوەوە لەو ناوەدا دابەشبوو. بۆ سبەینێ بەیانی زوو، دوای ئەوەی نوێژمکرد گوێم لە دەنگی دەهۆلّ و زوڕناو دەنگی سروودێ بوو. لە چادرەکەم هاتمە دەرێ، کۆمەڵێك خەڵکی گوندێکی ئەو ناوە تەرمی پیاوێکیان هەڵگرتبوو، ژنێکی جوان و سوورو سپیش بەدوایەوە بوو، جار بەجار وەکو ئەوانی تر سرودی دەخوێند، دواتر زانیم ئەوە سروودی بەیانیانی هندییەکانەو لە کتێبی ئاینی خۆیان(ریگ) وەرگیراوە. تەرمەکەیان بردە کەناری ڕووبارەکە، کۆمەڵێك داری زۆریان کۆکردەوەو تەرمەکەیان خستە سەری، پاشان بە زنجیر هەر چوار پەلی ژنەکەیان بەستن کە بەکولّ دەگریاو هاواریدەکردو دەیقیژاند. سروود بێژەکان وەستانو دەنگی دەهۆڵەکەش نەما، بەڵام زوڕنا ژنەکە بە ئاوازێکی تر دەستی پێکرد . هەموو ژن و پیاوەکان شیوەنیان بەرز بووەوە، بۆم دەرکەوت کە شیوەنی ژنە زیندووەکە دەکەن کە دەبوو لەگەڵ مێردە مردووەکەیدا بسوتێنرێ! چاوم لێبوو ژنەکەشیان خستە سەر دارەکان و لە پالّ مێردەکەیدا پاڵیانخست و کڵپە لە دارەکان هەستا!، قیژەی ژنەکە هەموو ئەو ناوەی پڕکردو دەنگیدایەوە، زۆری پێنەچوو بۆنی گۆشتی سووتاو بە هەوادا بلاّبووەوە ! لەبەر ئەوەی کاتی ڕۆیشتنبوو پتر نەوەستام، سواری ئەسپبووم و کەوتمە ڕێ. ئەو ڕۆژە لەبەر سووتاندنی مردوو

و زیندو زۆر پەستبووم، دوای ئەوە تا لە هندستاندا بووم نەچووم بۆ سەیر کردنی ئەو چەشنە سووتاندنە......

دوای پێنج ڕۆژ گەیشتینە دارستانێکی بەرین، شارەزاکان ئامۆژگاریانکردین کە هەرچی خواردەمەنیمان هەیە لەناو چادرەکانماندا قایمبکەین تاکو دەستی مەیموونەکانی ئەو دارستانەیان نەگاتێ! کەلە(مولتان) کەوتینە ڕێ، شارەزاکان زۆر شتیان لەبارەی مەیموونی مرۆڤخۆرەوە بۆ باسکردم، بەلام من باوەڕم نەکرد. بۆ سبەینێ بە هاوارو قیژە قیژێکی زۆر خەبەرمانبووەوە، وا پێدەچوو قیژەقیژی هەزاران ژن بێ. کە دنیا ڕووناکبوو هەزاران مەیموونمان لەسەر درەختەکان بینی، ڕەنگە لەسەد هەزار زیاتر بووبن!، لەو باوەڕەدا بووم کەهەرگیز ئەوەندە مێروولە لەیەك شوێندا نەبینراون. بەڕاستی لەو کاتەدا داستانی مەیموونی مرۆڤخۆرم بیر کەوتەوە، لەدڵی خۆما وتم: ئەگەر ئەو هەموو مەیموونانە برسیانبێ لەوانەیە پەلاماری مرۆڤ بدەن و بیخۆن. لەهەموو ئەو دارستانەدا، کە شارەزاکان دەیانگوت بەرەو باکورو پاشور درێژ دەبێتەوەو مەگەر بە پێنج ڕۆژ لێوەی دەرچووینایە، هیچ گوندێك، یان ئاواییەکی بچکۆلەشی تێدا نەبوو، چونکە مەیموونەکان هەر بە سەوزی هەموو بەروبوومی کێڵگەکانیان هەڵدەلووشی، لەبەر ئەوە بواریان نەدەدا تاقە گوندێك دروستبکرێت. سەیر ئەوەبوو هندووەکان لاقەی ئەو مەیموونانەیان نەدەکرد، چونکە دەستیان بە خوێنی گیاندارەکان سوور ناکەن!!

پێنج ڕۆژ لەسەر یەك بەناو دارستانەکەدا ڕۆیشتین، ڕۆژانە بە هەزاران مەیموون سەخڵەتیاندەکردین، زۆرجار بەناچاری دەماندانە بەر تیر، لێماندەکوشتن‌و ئەوانی تر بۆ ماوەیەك لێماندوور دەکەوتنەوە. دوای جەنگەڵەکە بەناوچەیەکی قوڕاویدا ڕۆیشتین تا گەیشتینە نزیك قەڵای(میرات) کەلەسەر کێوێك دروستکرابوو. ئێمە لەشوێنی خۆمانەوە وەستاین‌و سەربازگەیەکی باشمان دروستکرد، ئینجا لە چادرێکی گەورەدا ئەفسەرەکانم کۆکردنەوەو ڕێنماییمکردن، وتم: تا ئێستا هەر جەنگێکمانکردووە فیلی تیا نەبووە، لەمەودوا لە ولاتێکا دەجەنگین کە(فیل) یەکێکە لە چەکەکانیان، ئێوە لەولاتی ئێراندا فیلتان نەدیوە، دەزانن گیاندارێکی گیاخۆرە، ئەگەر وەکو شێرو بەورو پڵنگبوایە مافی ئەوەم دەدانێ لێی بترسن! بەلام گیاندارێ کە نەقۆچیو لەقە نەهاوێ نابێ لێی بترسن. ئەمە لەسەربازەکانتان بگەیەنن، هەروەها

تێیانبگەیەنن کە هەر لمۆزێکی درێژو لەشێکی گەورەی هەیە، بەیەك شیر لەپێدەکەوێ، شوێنی کاریگەری لمۆزو ورگ و ئەژنۆیەتی، هەر تێسرەواندنێکی بەهێز لەو سێ شوێنەی لە پەلوپۆی دەخا. کاتێ کەژاوەی سەر فیلەکانیشتان بینی، دڵنیا بن هێندەی گالیسکەی جەنگی ترسناك نین، تیروکەوان بەدەستانی زرێپۆش‌و بەرگی ئاسنپۆش دەتوانن لەکاریانبخەن. پاشان ڕوومکردە(ئەبدال کولزائی) و پێم وت: ئەی ئەمیر، بەسەربازەکانت بڵێ خۆیان بۆ لەناوبردنی فیلەکان ئامادە بکەن، قولاپی سەربازەکانت باشترین چەکە.

دوای ڕاسپاردەکانم داوام لە ئەفسەرەکانمکرد کە بچن بەلای سەربازەکانیانەوەو ڕێنمایی و ئامۆژگاریەکانیان پێڕاگەیەنن.

ئەو شەوە لەوێداماینەوە، بۆ سبەینێ بەرەو قەڵای(میرات) کەوتینە ڕێ. دەستەی پێشڕەوان ئاگاداریانکردم کە لە دەوروبەری قەڵاکەدا کەس نابینرێ، بەڵام دەروازەی قەڵا داخراوە. شارەزاکان وتیان فەرماندەی قەڵا ناوی(ئالا شەڕ)ە و پشتاو پشت لە خزمەتی بنەماڵەی(خەلج) دابوون، دوای سوڵتان(مەحموود خەلج) ئەمەکداری(مەلوئیقباڵ)ە. پێش هێرشبردن وام بەباش زانی نوێنەرێکی خۆم بنێرمە لای(ئالا شەڕ) و گفتوگۆی لەگەڵ بکات، وتم پێی بڵێ: من هاتووم کەسەری(مەلوئیقباڵ) پانبکەمەوەو سوڵتان(مەحموود خەلج) بخەمەوە سەر تەختی خۆی، ئەگەر(ئالا شەڕ) یارمەتیمانبدات پلەی باشی پێدەدرێت! لەوەڵاما وتبووی: ناکۆکیی نێوان سوڵتان‌و مەلو ئیقباڵ ناکۆکی نێوان دوو برایە، بۆیە سوڵتان ڕا لە ماڵێکدا دانیشتووەو هەمووو ڕێزێکی لێدەگیرێت، بەڵام ئەمیر تەیموور، دوژمنەو هاتووە هندستان داگیر بکات، نازانێ هندستان وڵاتێکە، هەر کەس بۆ داگیر کردنی هاتبێ یان تیاچووە، یان بەجۆرێ هەڵهاتووە پیانەگەیشتووە ئاوڕ بداتەوە! بۆم دەرکەوت ئەو فەرماندەیە دلێرەو ئامادەی جەنگە. هەر چۆنێ بوایە دەبوایە ئەو قەڵایەم بگرتایە، بە تایبەتی لە گەڕانەوەمانا کۆسپێکی گەورە دەبوو. هەر ئەو ڕۆژە گەمارۆی قەڵاکەماندا.(ئەبدال کەلزائی) وتی: فیل بە بۆنی حوشتر زۆر پەستدەبێ، کە حوشتر لێی نزیکبێتەوە هەڵدێ!. بەڵام لەو دەورو بەرەدا بە هیچ جۆرێ حوشترمان دەست نەکەوت. دڵنیا بووین لەوەی کە لە هیچ لایەکەوە ڕێی ژێر زەمین نییە بۆ ناوەوەو دەرەوەی قەڵاکە. بۆ ئەوەی بتوانین درزێبکەینە قەڵاکە دەبوایە بە گردەکەدا سەرکەوین، بەڵام هەرچەندە کۆشاین‌و هەوڵماندا، بەردە بارانی مەنجەنیقەکانی قەڵاکە پەکیاندەخستین، چونکە بەردەکان زۆر گەورە

بوونو کۆتاییشیان نەدەهات، وا پێدەچوو هەر لەزووەوە خەریکی بەرد کۆکردنەوە بووبن. (ئەبدال کەلزائی) پێشنیاریکرد کە بەشەو کەلوپەلی خانوو دروستکردن سەر خەینە سەر گردەکەو بەدەوری قەڵاکەدا چەند بورجو خانوویەك دروستبکەین، چونکە لە شەوا مەنجەنیق ئەوەندە کاریگەر نییە، جا ئەگەر چەند خانوویەکمان دروستکرد دەتوانین لەیەکدووانێکیانەوە خەندەق لێدەین بۆ ژێر قەڵا کە بێ ئەوەی دوژمن بزانێ لەکوێوە لێدراوە، بورجەکانیش بۆ خەڵەتاندنی دوژمن زۆرباشن، چونکە واتێدەگات کە دەمانەوێ لەوێوە تیربارانیانبکەین.

پێشنیارەکەی( ئەبدال کەلزائی)م زۆر پێ باشبوو. شەوانە سەربازەکان ئیشیاندەکرد، لەگەڵ کازیوەدا دەهاتنەوە خوارێ. هەموورۆژێکیش بورج و خانووەکان بە رمەنجەنیق دەدران، جار بەجار بەردی گەورەیان بەردەکەوتو بەشێکی دەڕووخاند، بۆ شەوێ دروستدەکرانەوە.

ژمارەی سەربازانی دوژمنم لەناو قەڵاکەدا بە هەشت، تا دە هەزار دەخەملاند. بە تەمای ئەوە بووم( ئالا شەڕ) سەربازەکانی بنێرێ بۆ ڕووخاندنی بورجو خانووەکان، ئەوسا ئێمەش لێماندەدان، بەلام وای نەکرد.

ئەندازیارێکی زۆر باشم هەبوو کە باوباپیرانیشی هەر ئەندازیار بوون. بەلام ئەم لەهەمان کاتدا کارێزکەنێکی زۆر کارامەشبوو، ناوی(شێر بەهرام مرووزی)بوو، نەخشەی دارشت بۆ هەڵکەندنی دوو خەندەق. تاکو ئەگەر یەکێکیان گەیشتە بەرد، ئەوی تریان بگاتە ژێر دیوارەکە. بەراستی زۆر پەلەمبوو، چونکە دەترسام وەرزی (بارانی وەرزی) لە هندستاندا دەست پێبکاتو ئیشەکەم زۆرتر دوا کەوێ... ڕۆژێکیان وتم: لەسەر یەکێ لە بورجەکانمان ئالایەکی سپی هەڵکەن. کە ئالاکە هەڵکرا، مەنجەنیقەکان وەستان، منیش چوومە سەر بورجەکەو بانگمکرد: دەمەوێ لەگەڵ(ئالاشەڕ)دا بدوێم. (ئالا شەڕ) بە بەرگی جەنگەوە سەری دەرهێنا، وتی: من (ئالا شەڕ)م ، تۆ کێیت؟! وتم من (ئەمیر تەیموور گورگین)م.ئەمەوێ پێتبڵێم: دەروازەی قەڵاکەمان بۆ بکەنەوەو خۆتان بدەن بەدەستەوە، لەپاداشتدا دەتکەم بە فەرماندەیەکی خۆم، من دڵنیام ئەم قەڵایە دەگرم، دەمەوێ خوێن نەڕێژرێ، ئەگەر هات و خوێن ڕێژراو کەوتیتە بەر دەستم، بەزیندوویی دەتخەمە قەفەزێکی ئاسنەوەو لەسەر لێژە دارێکی زۆر دەتسووتێنم! (ئالا شەڕ)دایە قاقای پێکەنین، وتی: ئەی ئەمیر تەیموور، کەسێك بەزیندوویی بسووتێنرێ

لە(نیروانا) پلەی لە خەڵکانی تر بەرزترە! وتم: تۆ پیاوێکی دلێری، حەیفە بکوژرێی! وتی: چیت لەدەستدێ درێغی مەکە! وتم: کەواتە شمشێر ناوبژیوانمانە! ... پاشان هاتمە خوارێو ئالا سپییەکە لابرا.

ڕۆژێکیان ئەندازیارەکەم ئاگاداریکردم کە یەکێ لە کونەکان گەیشتۆتە ژێر شوورەی قەڵاکە، دوای دوو ڕۆژ ئەوی تریش دەگاتە ژێر هەمان شوورە! ژێر دیوارەکان بە بارووتێکی زۆر پەستراپەوەو سەری پلیتەکان لە دەرگای کونەکانەوە هێنرانە دەرێ. چلو یەك ڕۆژ لەسەر یەك لە دەوروبەری قەڵاکەدا ماینەوە. لەبەرە بەیانی ڕۆژی یازدەی مانگی سەفەری ساڵی هەشت سەدو یەکی کۆچی هەموو سەربازەکانم ئامادەی هێرشبوون لەگەڵ سپێدەی بەیاندا ئامارەمکردکە پلیتەکان ئاگر بدەن. سەربازە زرێپۆشو بەرگ ئاسنەکانی منو قولاپهاوێژەکانی پادشای غوور پێشەنگی لەشکر بوونو بۆ هێرشکردن ئامادە بوون. بەجارێ ئەو دەوروبەرە کەوتە لەرزە، دەنگێ، وەك دەنگی هەزاران هەورە تریشقە بوومە لەرزەیەکی بەرپا کرد! لە دوو لاوە شوورەی قەلای میرات داڕووخا. لە گەرمەی ترسو لەرزو سەر لێشێوانی دوژمندا سەربازانی پێشڕەو هەموو لەشکرەکەم بەیەك تەکان بەگردەکەدا سەرکەوتن، بێ ئەوەی مەنجەنیق کاربکات، یان تیرێ بەرەو ڕوویان بێ، چوونە ژوورێ، لەبەرترسو لەرزی زۆرو شێرزەییو ورەبەردان دەستە بەدەستە خۆیان بە دەستەوە دەدا.

فەرماندەی قەڵاکە بە هەموو جۆرێ هانی سەربازەکانی دەدا کە بەرگرییبکەن، بەڵام هیچ دادێکی نەدا، دەمەوئێوارێ( ئالا شەڕ) گیراو شەڕ کۆتایی هات، هەموو دیلەکان کەوتنە کۆکردنەوەی لاشەی کوژراوەکانو لەناو قەڵاکە بردیاننە دەرەوە. لەناو قەڵاکەدا هەموو کەلوپەلێکی ئاسنگەری و دارتاشی و وەستایی هەبوو، داوامکرد زوو بەزوو قەفەزێکی ئاسنیان دروستکرد، (ئالا شەڕ) خرایە ناوی. لەبەر دەمما لێژنەدارێکی زۆر هەڵچنرا، وتم: ئەی پیاو، من هەموو شتێکم لە تۆ گەیاند تۆ بوویتە هۆی ڕژاندنی خوێنی سەربازەکانم، منیش وا بڕیاری خۆم دەبەمە سەرو بەزیندویی دەتسووتێنم! کەچی لەجیاتی پەشیمانبوونەوەو پاڕانەوەو داوای لێبوردن وتی: ئەی تەیموری گورگین، منیش پێم وتی ئێمە کەمردین دەسووتێنرێن، بەڵام هەرکەس بەزیندوویی بسووتێنرێ دەچێتە(نیروانا)و پلەشی بەرزترە. لەو کاتەدا بایەکی باش هەڵیکرد، ئالاشەڕ خرایە سەر دارەکانو کڵپە بەرز بوەووە. پێش ئەوەی هەموو دارەکان گڕ بگرن، برووسکەو چەخماخە لێکیاندا، گرمەی هەور هات و هەورێکی ڕەش ڕەش

نزیکبووەوە، لەو کاتەدا ئەوەندەی نەمابوو گڕ لە ئاڵا شەڕ بەربێ، باران بە خوڕەم دایکردو ئەوەندەی بڵێی یەکو دوو ئاگرەکەی کوژایەوە. من بۆ خۆم ئەوەندە تەڕ بووم دەتگوت لە ئاو هەڵکێشراوم. وام بە بیردا هات کە خوانەیویستووە ئەو پیاوە بسووتێ، لەبەر ئەوە داوامکرد کە دایگرن‌و زیندانیبکرێ.

هەرچی دیوارێکی قەڵا کە ڕووخێندرابوو، تازەمانکردەوەو قەڵاکەم وەکو جارانی قاییمکرد ژمارەیەك سەربازی چاکم لەوێ هێشتەوەو بەڕێبووم. بەر لە بەڕێوە بوونم(قەرەخان) گەیشتە لام‌و ئاگاداریکردم کە سوڵتان(عەبدوڵلاوالیلمولك)یاریدەیداوەو ڕێگەوانی باشی داوەتێ، ئەگەر ئەو نەبوایە نەیدەتوانی خۆی بگەیەنێتە لام. قەرەخان هەر یەکەم ڕۆژ وتی: بۆچی ئەم دارستانە هەمووی قوڕە، بەلام ئەم ڕێگەیەی ئێمە پیا دەڕۆین، هەرچەندە دارستانە کەچی وشکانییە؟! بەڕاستی نەمن‌و نە ئەفسەرەکانم ئەو سەرنجەمان نەدابوو. هیچ کاممان نەماندەتوانی وەڵامبدەینەوە، وتم با لە خەڵکی ناوچەکە بپرسین. دوو ڕۆژ لەسەریەك بەڕێوە بووین، چاومان بە هیچ کەس نەکەوت، ئەگەیشتینە هەر گوندێ چۆڵکرابوو. دوایی لە ناوچەیەکا کە باشووروو باکووری دارستانێکی قوڕاویبوو، وەستاین‌و ئووردووگەمان هەڵدا بۆ ئەوەی ئەو شەوە بحەوێینەوە، شەو هەڵکشا، منیش ویستم سەر خەوێك بشکێنم، لەگەرمەی خەودا بووم هەستم بە دەنگێکی سەیرکرد. یەکەم جار وامزانی دەنگی هەورەتریشقەو خوڕەی بارانە، پاشان هەستمکرد زەوی دەلەرزێ، پێش ئەوەی لە چادرەکەم وەدەرکەوم، شەپووری ئاگاداری لێدرا، بەڕاستی وامزانی لەناو جەرگەی دارستانە قوڕاوییکەدا لەشکرێکی گەورە هاتۆتە دەریێو پەلامارماندەدات.لەو کاتەدا کە سەرنجی هەموو لایەکم دا تا بزانم لە کوێوە هێرشمانکراوەتە سەر، لەدوورەوە هاواری بەرگوێم کەوت: فیل... فیل... فیل!

(*قەرەخان*)ی زاوام کە فەرماندەی ئوردووگەکەبوو، بە هەڵەداوان‌و هەناسە برکێ خۆی گەیاندە لام‌و وتی: ئەی ئەمیر، ڕەوە فیلێك ویستیان هێرشبکەنە سەرمان، بەلام لە هاوار هاواری پاسەوانەکان‌و ڕووناکیی چراوگەکانمان سڵیانکردەوەو ڕوویان لە شوێنێکی ترنا، سەرنجماندا هیچ کەژاوەیەکیان بەسەرەوە نەبوو. پاشان ڕێگەوان‌و شارەزاکان بۆیان باسکردم ئەو فیلانە کێوین‌و زۆر قەبەن، ڕەوەشیان وایە کەبەرەو ڕووبار دەکشێن‌و هەموو بەیانییەك لە ئاوی ڕووبارەکەدا مەلە دەکەن‌و خۆیان دەشۆن.

بۆ سبەینێ زوو کەوتینەوە ڕێ. دوای دوو فرسەنگ ڕێ گەیشتینە ئاواییەك، باشبوو نەترسابوون‌و هەڵنەهاتبوون. لەوێ باسی فیلەکانیان بۆ کردم، وتیان، شەوانە بەدەوری ئاواییدا ئاگر دەکەنەوە بۆ ئەوەی فیلەکان خۆیان‌و خانووەکانیان دانەشێلن، ئەو فیلانە تەنها لەو شەوانەداکە باران دەبارێ هێرش ناکەن. پاشان پرسیم بۆچی هەموو دارستانەکە قوڕە، بەڵام ئەم ڕێیە وشکانییە؟ یەکێکیان وتی: هاتوچۆی فیلەکان وشکیدەکاتەوە. وتم باوەڕناکەم، چونکە بەر لەوەی بگەینە قەڵای میرات هیچ فیلمان نەدی. (قەرەخان) وتی: هەر دەبێ تێبگەم هۆی ئەمە چییە؟!

دوای ئەوەی گەیشتینە ڕووباری لۆن، چەند سوارێك چوونەناو ڕووبارەکەوەوە بۆ ئەوەی تاقیبکەنەوە، بۆمان دەرکەوت لێدانی زۆر ئاسانە، لەشوێنێکا ڕووبارەکە زۆر پانبوو لەشکر پەڕیەوە ئەو بەر، دوای بڕینی فرسەنگێك شەو بەسەردا هات و ئوردووگەمان هەڵدا، لە دانیشتووانی ناوچەکە ئەزموونمان وەرگرت و ئێمەش بە چواردەوری خۆماندا ئاگرمانکردەوە تاکو لە هێرشی فیلەکان بێ خەمبین.

ئێمە دەبوو خۆمان بگەیەنینە قەڵای(لۆنی) کە دووەمین قەلای سەر ڕێمانبوو بەرەو دەهلی. بۆ سبەینێ(قەرەخان) هاتە لام‌و وتی: ئەگەر بوارمبدەی کە دەمەوێ ئەمشەو بێتەوە دەستەیەك سەرباز تەرخانبکەم بۆ چاودێریکردنی ڕێی هاتووچۆکردنی فیلەکان، تاکو بزانین و بۆمان دەرکەوێ بۆچی ئەو فیلە زەبەلاحانە لەو زەلکاوەدا ناچەقن، بەڵام مرۆڤ تێیدا دەچەقێت! هەروەها دەمەوێ بزانم دوای ئەوەی فیلەکان لەڕووبارەکەدا خۆیان دەشۆن لەچ ڕێگەیەکەوە دەگەڕێنەوە بۆ ناو دارستانەکە، بەمەش وا هەستدەکەم ئەو نهێنیەم بۆ دەردەکەوێ. وتم: جا کەڵکی چییە!؟ وتی: ئەی ئەمیر، ئەگەر بزانی ڕێی هاتوچۆی فیلەکان کامەیە، ئێمەش دەتوانین ئەو ڕێگەیە بگرینە بەر، بەم جۆرە ناچار نابی کە هەردوو قەڵای (لۆنی) و (جومبە) بگرێت بۆ ئەوەی بگەینە دەهلی، بۆ گەڕانەوەش دەتوانی هەر هەمان ڕێگە بگریتە بەر. پێشنیارو وتەکانی(قەرەخان)م زۆر پێ باشبوون، داوام لێکرد لە شارەزایانی ناوچەکە کەڵك وەربگرێت‌و پاداشتیانبداتێ، بۆ ئەو مەبەستەش بڕێکی باش پارەم دایەو بەڕێبووین.

ئەو ڕۆژە بەچەند گوندێکی ئاوەداندا تێپەڕین و، لەبەر ئەوەی پێشەنگانی لەشکرەکەم تێیانگەیاندبوون کە ئێمە ڕێبوارین‌و لاقەی کەس ناکەین‌و هەرچیمان بوێ بە دراو دەیکڕین، دانیشتووانی ئەو گوندانە هیچ ترسێکیان

نەبوو. ئەو ڕۆژە سەبارەت بە فیلەکان پرسیارمکرد تاکو بزانم بۆچی فیل هەرچەندە زۆر قورسە کەچی لەقوڕو لیتەو زۆنگا، ناچەقێ؟! دانیشتووانی ناوچەکە دەیانگوت فیل خوای(ویشنو)یە، لەبەر ئەوە ناچەقێ! هندییەکان خاوەنی سێ خوان(ویشنو) دووەمینیانە، دەتوانێ بەهەرشێوەیەك بیەوێ خۆی بنوێنێ.

دەربارەی بارودۆخی دەهلی هیچ هەواڵێکم نەدەزانی، بەلام لەبەر ئەوەی خێراو بەپەلە بەرەو ئەو شارە دەکشاین دەمزانی لەوێ لە هەواڵی نزیکبوونەوەی ئێمە ئاگادارن. ئەوەی درا بەگوێماو زۆرسەرم پێی سرما ئەوە بوو(مەلو ئیقبال) کە بیستبووی نزیکبوومەتەوە(سوڵتان مەحموودخەلج)ی ئازاد کردبوو، داوای لێکردبوو دژ بەمن یەکبگرن، ئەویش قایلبووبوو.

بیستوومە وتراوە کە من پیاوێکم لەدەشتو بیابانو کەژو کێودا ژین دەبەمە سەر بۆیە ڕقم لە ئاوەدانیو لەشارە، وەهەر کەدەگەمە هەر شارێ وێرانیدەکەم! ئەوانەی ئەم قسەلۆکانە دەکەن، ئەگەر شاری(کش) ببینن چۆنم ڕازاندۆتەوە ئەو بۆچوونەیان دەگۆڕێتو تێدەگەن کە من بەبێ هۆ هیچ شارێك وێران ناکەم، یان هەر شارێ بەرەنگاریم بکاتو خوێنی سەربازەکانم برێژێ. ناچار دەبم هەرچۆنێ بووە ئەوپەڕی دەستەلاتم بخەمەکار بۆ تێکشکاندنی دەروازەو شوورەکانیو سزادانی دانیشتووانی بەسەختترین شێوە، ئەمە یاسایەکە کە جەنگیزخانی باپیرم دایناوەو منیش پەیڕەویدەکەم.

لە بەیانی ئەو ڕۆژەدا کە دەبوو بگەینە قەلای(لۆنی) قەرەخان هاتە لامو وتی: ڕێی فیلەکانمان زانیوە، بەوشکانییەکی دوورو درێژدا دەڕۆن، بە لای باشووری قەلای (لۆنی)دا تێدەپەڕن و لە ڕۆژهەلاتیەوە سەردەردێنن. ئەگەر تۆ لەوێوە لەشکر ببەیت پێویست ناکات ئەو قەلایە بگریت، دەشتووانی لەهەمان ڕێوە بگەڕێیتەوە. وتم: ئەو ڕێگەیە بەکوێدا دەڕوات؟ وتی: ڕێگەیەکی وشکەو بە ناوەڕاستی زۆنگاوەکەدا درێژ دەبێتەوە، بیستو پێنج، تا سی گەز پانە. وتم: بۆ خۆت دیوتە؟ وتی: من بۆ خۆم نەمدیوە، ئەوانەی ناردوومن دیویانە. وتم: وتەی ئەوانە بەلگەی تەواو نییە، تۆ بۆ خۆت بڕۆو باش ببینەو چاك دلنیابە کە لە هەموو ڕوویەکەوە بێ وەزەندە. قەرەخان ڕۆیشت و منیش بەرەو قەلای(لۆنی) کەوتمە ڕێ، دەبوایە هەرچۆنێ بوایە ئەو قەلایەم بگرتایە تاکو دلنیاو بێ خەمبم. کە خۆر گەیشتە ناوەڕاستی ئاسمان قەلاکەمان لێدەرکەوت، ئەویش وەك قەلای (میرات) لەسەر گردێبوو. بەبێ هیچ پێشگری و بەرگرییەك

گەیشتینە گردەکەی قەڵاکەمان گەمارۆدا. سەرنجمدا کە قەڵای (لۆنی) و قەڵای(میرات) بەیەك شێوە دروستکراون و لەوە دەچوو هەر یەك ئەندازیار نەخشەی هەردووکیانی دارشتبێ. بەرگریکەران دەیانتوانی لە کونەکانی سەر قەڵاکەوە بەرد بارانی هێرشبەران بکەن، دەیانتوانی رۆنی هەڵقرچێنراوو ئاوی گەرم و قیرو زفتی تواوە بکەن بەسەر پەلامار دەراندا. بۆ دوا نیوەرۆ(قەرەخان) گەیشتەوە لام و وتی: ئەی ئەمیر، رێگەکەم بینی، بەناو زۆنگدا دەڕوات و بۆ تێپەڕبوونی لەشکر زۆر باشە، لەوە دەچێ دوژمن لەو رێگەیە بێ ئاگابێ. داوام لە قەرەخان کرد کە بەشێك لە لەشکر ببات لەگەڵ خۆیدا و بەرێیەکدا بڕۆن کە قەرەوڵەکانی قەڵاکە چاویان لێیان نەبێ،تا دەگەنە رۆژهەڵاتی قەڵاکە، لە هەمان کاتدا لە هەموو خاڵێکدا پاسەوان دابنێ بۆ ئەوەی لە پڕێکدا نەدرێ بەسەریاندا. ئەو رۆژە ئەو کارەمان پێ نەکراو قەرەخان لەگەڵمان مایەوە. بۆ شەوێ بە هەمان شێوە فیلەکان گرمەو زرمەیان هاتو لە هاتوچۆکردندا بوون. بۆ بەیانییەکەی قەرەخان و سەربازەکانی رێی فیلەکانیان گرتەبەرو خۆیان گەیاندە رۆژهەڵاتی قەڵاکە. تا کاتی خۆرئاوا بوون دوو لەسەر سێی لەشکرەکەم بە رێگەی فیلەکاندا رۆیشتن. کە شەو بەسەردا هات راپۆرتی قەرەخانم پێگەیشت کە هەموو سوارەکان گەیشتوونەتە جێی خۆیان بڕیارمدا کە هەندێ سەرباز بە دیار چادرەکانەوە بەجێبێڵم تاکو گەمارۆ دراوەکان وا بزانن بە هەموو لەشکرەکەمەوە گەمارۆی قەڵاکەم داوە. (ئەبدال کەلزائی)ش هەندێ سەربازی کارامەی خۆی هەڵبژاردن بۆ پاککردنەوەی رێگەکەمان لە فیلەکان. رەوشی فیلەکان وا بوو کە لە نیوەشەو بەدواوە بەرەو رووبارەکە بکشێن، لەبەر ئەوە ئێمە بوارمان هەبوو تا ئەو کاتە لەو رێیەوە بڕۆین و خۆمان بگەیەنینە رۆژهەڵاتی قەڵاکە.

دوای ئەوەی تاریکیکرد کوڕە بچووکەکەم کە هەژدەساڵانبوو، ناوی(سەعد وەققاص) بوو بانگم کردوو پێم راگەیاند کە فەرماندەی ئەو لەشکرەی دەوری قەڵاکە بێ، بە هیچ جۆرێ شوێنی خۆی بەجێ نەهێڵێ تا هەواڵی بۆ دەنێرم، ئەوسا بکەوێتە رێ و خۆی بگەیەنێتە لام. پێنج بار باروت و دوو شاگردی لێهاتووی ئەندازیارەکەم(شێر بەهرام مرووزی) بۆ بەجێهێشت بۆ رووخاندنی دیواری قەڵاکە، پێیشم وت: ئەگەر نەتتوانی شوورەی قەڵاکە برووخێنی، هیچ زویر نابم و گلەییت لێناکەم، بەڵام ئەگەر دیواری قەڵاکەت رووخاندو نەتتوانی قەڵاکە بگری تا بڵێی نیگەران و خەمبار دەبم. هەروەها ئاگادارمکردەوەکە دەبێ شەوو رۆژ ئاگادار بێ نەوەکو لە ناوەوە و لەدەرەوەی قەڵاکەوە هێرشبکرێتە سەریان. (سەعد وەققاص،

وتی: ئه‌ی ئه‌میر، دڵنیابه بەجۆرێ كرداره‌كه‌م كه پیاوه‌تیی كوڕی تۆ ده‌ركه‌وێ.
ئه‌گه‌ر له ئاسمانیشه‌وه له‌شكر داباریته سه‌ر زه‌وی ئاماده‌م دژیان بوه‌ستم! وتم:
هه‌رچه‌نده له‌شكره‌كه‌ت ئه‌وه‌نده زۆر نییه به‌ڵام دڵنیابه زۆر جه‌نگاوه‌ن، من باشترین
سواری خۆمم بۆ تۆ به‌جێهێشتووه، له‌كاتی جه‌نگدا زۆر كارامه‌ن‌و بۆ هیچ
دانامێنن. كه ئه‌سپه‌كه‌میان هێنا سواربیم، خورپه‌یه‌ك له‌دڵم هه‌ستا، وه‌ك یه‌كێك
پێم بڵێ ئیتر (سه‌عد وه‌ققاص)ی كوڕت نابینیته‌وه !دڵم زۆر ته‌نگبوو،
چونكه(سه‌عد وه‌ققاص) بچووكترین‌و خۆشه‌ویسترین منداڵمبوو، بێ ئه‌وه‌ی كارێ
بكه‌م كه‌س هه‌ست به‌و دڵته‌نگییه‌م بكا، خۆم هاویشته سه‌ر پشتی ئه‌سپه‌كه‌م و
كه‌وتمه‌ڕێ. ئه‌فسه‌ره‌كانم تێگه‌یشتن بۆچی كوڕه‌كه‌م كرده فه‌رمانده‌ی
سه‌ربازه‌كان، زانیان كه ئاماده‌م كوڕی خۆشم بكه‌مه قوربانی، به‌وه‌ش ئه‌وه‌نده‌ی تر
په‌یوه‌ندییان له‌گه‌ڵما باشترو پته‌وتر بوو.

له‌و تاریكه شه‌وه‌دا ڕێمان بڕی، به‌ده‌نگی ناڵی ئه‌سپه‌كاندا له‌وه ده‌چوو ڕێگه‌كه
به‌رده‌ڵانبێ، به‌ڕاستی باوه‌ڕ نه‌ده‌كرا له‌وزۆنگاوه‌دا به هۆی ئاتوچۆی فیله‌وه
ڕێیه‌كی وه‌ها دروستبكرێ. خێراو به‌په‌له ڕێمان بڕی تاكو به‌ر له‌كاتی بزووتنی
فیله‌كان بگه‌ینه شوێنی مه‌به‌ست. به‌وه‌ی باشبوو له‌زۆر خاڵدا قه‌ره‌خان پاسه‌وان و
ڕێگه‌وانی باشی دانابوون بۆ ئه‌وه‌ی كه‌س له‌ڕێ لانه‌دات و له‌ناو زۆنگاوه‌كه‌دا نوقم
نه‌بێ. به‌ر له‌نیوه‌شه‌و هه‌موو له‌شكره‌كه گه‌یشته به‌ره‌وه‌و،به‌ره‌و ناوچه‌ی سێیه‌مین
قه‌ڵا، كه پێی ده‌وترا قه‌ڵای(جومبه) كه‌وتینه ڕێ. هه‌رچه‌نده وا پلانم داڕشتبوو كه
سه‌ربازانی قه‌ڵای لۆنی به جووڵه‌ی له‌شكره‌كه‌م نه‌زانن، ته‌مه‌زه چاویان لێمانبووه كه
به‌ره‌و قه‌ڵای(جومبه) ده‌ڕۆین، من له كاتی گه‌مارۆدانی شاری(ده‌هلی)دا به‌مه‌م
زانی.

(كوتوال)ی قه‌ڵای لۆنی هه‌ستیكردبوو كه گه‌مارۆدان كۆتاییهاتووه‌و من
ده‌مه‌وێ ئه‌و قه‌ڵایه به‌جێبهێڵم و ڕبڕۆم. بۆ ڕۆژی دوایی سه‌یریكردبوو هێشتا بڕێك
له‌شكری ئێمه‌هه‌ر ماوه، بۆ شه‌وێ به دزییه‌وه هێزێكی ناردبووه ناو ئوردووگه‌كه‌م
و دوو كه‌س له پاسه‌وانه‌كانی(سه‌عد وه‌ققاص)ی كوڕمیان ڕفاندبوون بۆ ناو
قه‌ڵاكه، دوای ئه‌شكه‌نجه‌دانێكی زۆر هه‌موو پلانه‌كانی منیان ئاشكرا كردبوون،
ئه‌وه‌شیان دركاندبوو كه كوڕه‌كه‌م خه‌ریكی خه‌نده‌ق لێدانه بۆ ژێر دیواری شووره‌و
قه‌ڵاكه‌و ده‌یه‌وێ بیانته‌قێنێته‌وه.

دوای ئـەوەی(کوتـوال) دڵنیـا بـوو کـە ژمـارەی سـەربازەکانی (سـەعدوەققاص)کەمـە، هێرشـێکی بـەربڵاوی کردبـووە سـەریانو لـەناویبردبوون. (کوتوال)ی قەڵای لۆنی ناوی (کارتار) بوو، بە زمانی هندی واتە جەنگاوەر.

ئەو کاتەی کە ئێمە گەیشتینە قەڵای لۆنی ، بێ ئەوەی من هەستبکەم،(کارتار کوتوال) بە هۆی هێماو نیشانەی تایبەتییەوە لەگەڵ هندییەکانی دەرەوەی قەڵادا پەیوەندی هەبووە و چاك لەیەکتری گەیشتوون. تەمز بەرنامەیەکی تایبەتی داناوە بۆ لەناوبردنی خۆمو لەشکرەکەم، بەڵام بەرێویشتنی ئێمە ئەو پلانە بە سەر ئێمەدا پیـادە نـەکرا، بـەڵکو دوای ئێمـە بەسـەر لەشـکرە بچکۆلەکـەی (سـەعد وەققـاص)دا،پیـادە کرابـوو. دوای یەکـەم پـەلاماری هـێزی نـاو قەڵاکـە بـۆ سـەر لەشکرەکەی(سەعد وەققاص)، بۆ شەوێ (سەعد وەققاص) فەرمانیدا بوو کە ئاگر نەکرێتەوە بۆ ئەوەی دوژمن چاوی لێیان نەبێت و لە جمووجووڵیان ئاگادار نەبێ. بەڕاسـتی ئەگـەر منیـش بوومایـە هـەروامدەکرد، هەرچـەندە ئاواتیشـم ئـەوەبوو لەشەڕدا بکوژرێم نەك بە زیندوویی بکەومە دەست دوژمن.

دوای سێ شەو کە من قەڵای(لۆنی)م بەجێهێشت، لە نیوەشەودا بەدەنگ و زرمە و ناڵەی سامناك سەربازەکانی(سەعد وەققاص) ڕاچڵەکیبوون، وا پێچووبوو کەلـە هـەموو لایەکـەوە دەنگی هـەزاران تـەپڵو دەهـۆڵ ئاسمانیشـی پـڕ کردبـێ، تـەمزە هێرش و ڕەوی فیلەکان لەهەموو لایەکەوە هەموویانی گرتۆتەوەو دابوویان بەسـەر ئوردوگەکەی (سـەعد وەققـاص)دا ، هـەرچی شـتێ هـاتبووە ڕێیـان شێلابوویان، چادر، سەرباز، تەنانەت ئەسپەکانیشیان کردبوو بەژێرەوە، هـەرچی ئەسـپبوو بوو هەوسار یان پچڕاند بوو، بێ سەروبەر بەیەکدا چووبوون و بەسەر کێشی دابوویانە غار. هەر دوای تێپەڕبوونی هێرشی فیلەکان بە ماوەیـەکی زۆر کەم، لـەو سـەرەوە دووبـارە بـە هـەمان شـێوە گەڕابوونـەوە سـەر ئوردووگەکـە، لەهـەمان کاتیشـا ژمارەیەکی لـەڕادە بەدەر ڕەوە فیل بـە پێچەوانـەی ئـەوان هـاتبوون و لـە عاسـتی ئوردوگەکـەدا پێکیانـادابوو، ئیتر ئـەوەندەی تـر حاڵی(سـەعد) و سـەربازەکانی شـڕ بووبوو، هەموو شیرازەیەکیان لەدەستدابوو، هەر لەو کاتـەدا سـەربازەکانی(کارتار) پـەلاماری ئوردووگەکـەی کوڕەکـەمیان دابـوو؛ فیلـەکان ڕەوییبوونـەوە، ئـەوانیش بەربووبوونە گیانی لەشکرەکەی(سەعد وەققاص).دیارە لەکاتی وادا هیچ ئەفسەرێ ناتوانێ سەربازەکانی کۆبکاتەوەو ڕێکیانبخاتەوە، هەر بەهەمان شێوە کوڕەکەشم هیچی بۆ نەکرابوو. (کارتار) لە پاسەوانە ڕفێنراوەکان هەموو زانیارییەکی لەبارەی ئوردووگەکـەوە وەرگرتبـوو، زانیبـووی چـادری تایبـەتیی کوڕەکـەم کامەیـە،

ویستبووی دیلیبکات. (سەعد وەققاص) چەپەبوو، نەیدەتوانی وەك من دەستی ڕاستی بەکاربێنێ، دوای ئەوەی بیست سەربازی دوژمنی کوشتبوون و زۆر نەبەردانە جەنگابوو، لەچەند لایەکەوە بریندار بوو بوو، تەنانەت دەستی چەپیشی لەکار کەوتبوو، سەرەنجام لەپەلوپۆکەوتبوو. دوای ئەوەی بردبوویان بۆ قەڵاکە، جاڕدرابوو بەناو ئوردووگەکەدا کە فەرماندەکەیان بەدیلگیراوە، خۆیان بدەن بە دەستەوە، جەنگ دادیان ناخوا! ... بەڵام لەبەر ئەوەی سەربازەکانی سەعد هندییان نەزانیبوو، هیچ تێ نەگەیشتبوون و لە ئوردووگەی بێ سەروبەردا درێژەیان بە جەنگ دابوو. دوای ئەوە(کارتار)بە هەندێ سەربازی دیلکراوی خۆمانی وتبوو بەزمانی خۆمان ئەو جارە بدەن، ئیتر هەرچی جەنگاوەر بوو بوو سستبوو بوو. ژمارەیەکی زۆریش لەسەربازەکانی سەعد لە نووتەکیی شەوەزەنگا بەرەو زۆنگەکان کشابوون، وەك بۆم باسکرا تا کاتی ڕۆژهەڵاتن لەو زۆنگاوانەدا هاوارو دادی یارمەتییان کردبوو کە دەریان بهێننەوە، بەڵام کەس نەچووبوو بە دەمیانەوە، تا سەرەنجام ڕۆچوو بوونە خوارێ. بەو جۆرە ئەو شەوە زۆربەی زۆری سەربازەکانی سەعد کوژرابوونو بۆ خۆیشی دیلکرا بوو.

بۆ ڕۆژی دوایی(کارتار) داوای لە (سەعد وەققاص) کردبوو، نامەیەك بۆ من بنووسێ کە بگەڕێمەوەو لە وڵاتی هندستان دەرچم، ئەگینا دەکوژرێ. سەعد وتبووی من چەپلەرم و دەستی چەپم لە کار کەوتووەو ناشتوانم بە دەستی ڕاستم بنووسم. (کارتار) وتبووی : درۆ دەکەی! .. سەعد پێی گوتبوو: من کوڕی تەیموور گورگینم، باوکی من پادشای نیوەی سەر زەمینە، من کوڕی پیاوێك نیم کە درۆ بکەم. دوایی داوای ناوو نیشانێکی لێکردبوو کە بە نامەیەکا بینێرێ بۆ من. ئەویش وتبووی : بۆ وا دەزانی باوکی من بەو نامەیە لەشکرەکەی دەکشێنێتەوە!!!؟ کارتار وتبووی: بۆچی باوکت تۆی خۆش ناوێ؟! سەعد وەققاص و تبووی: من یەکەمین کوڕی باوکم نیم کە بکوژرێم، پێش من کوڕی کوژراوە لەمن گەورەتر بووە، هیچ گومانێکم نییە کە باوکم لەبەر پاراستنی گیانی من لەشکرەکەی لە هندستان ناگەڕێنێتە دواوە.

کارتار وتبووی: باشە، من کارێك دەکەم کە باوکت جارێکی دی بۆ پرسەی کوڕێکی تری دانیشێ. (سەعد وەققاص) وتبووی : ئەی کارتار تۆ من مەکوژە، بەزەییت بە خۆتا بێتەوە. وتبووی: چۆن بەزەییم بە خۆمدا بێتەوە؟ وتبووی ئەگەر تۆ من نەکوژی، کاتێ باوکم دەتگرێ خۆت و کەس و کارت دەبەخشێ و پلەو پایەی بەرزیشت دەداتێ. کارتار وتبووی: من لەم قەڵایەدا باش پارێزراوم و باوکت

قسەیان پێدەوتین،سەربازەکانیشم بە زمانی خۆمان بە گاڵتەجاڕی و توانجەوە، لەو جۆرەی کە پیاوان لەگەڵ ژناندا دەمەتەقێدەکەن وەڵامیاندەدانەوە.

سەرنجماندا کە مەنجەنیقیش بەدی ناکرێ. من وای بۆ چووم کە بۆ گرتنی قەڵاکە پێویست ناکات باروت بتەقێنینەوە، بڕیارماندا بە پەیژە سەرکەوینە سەرێ و قەڵاکە بگرین و وێرانیبکەین، ئەفسەرو سەربازەکانیش هەمان بۆچوونیان هەبوو، بە تایبەتی باسی قووڵایی بنچینەی قەڵاکەیان بیستبوو. لەبەر ئەوە پەیژەمان پێ نەبوو، چونکە پەیژەی درێژ هەڵنەدەگیرا، پیاوەکانم دەستوبردیانکردو ژمارەیەکی زۆر پەیژەیان دروستکرد. لە دەوروبەری قەڵاکەدا هیچ کەسێ دیار نەبوو تاکو زانیاریمان دەربارەی قەڵاکە دەستبکەوێ، وا دیارە بوو خەڵکی ناوچەکە هەڵاتبوون.

من وای بۆ چووم کە لە دیواری قەڵاکەوە سەرکەوین ئینجا پیاوانی ناو قەڵاکە خۆیان ئاشکرا دەکەن و پەلامارماندەدەن، چونکە ئەقڵگیر نەبوو قەڵایەکی گەورەو جەنگی، تەنها ژنی تێدابێت. (نەظیروددین عومەر) کە یەکێکە لە بنووسی (کاتب) جەنگەکان و بەسەر هاتەکانی من، دەیگوت ئەمە تەڵەو داوە، پیاوەکان خۆیان حەشار داوە، بۆیە هەر ژنەکان دیارن تاکو هەڵمانخەڵەتێنن، سەربازەکانمان وا هەستبکەن کە گرتنی قەڵاکە زۆر ئاسانە و بکەونە داوەوە... لە بۆچوونەکەیدا منیش لەگەڵیا بووم.

کە ڕۆژئاوا بوو، وردە وردە دەوروبەر تاریکیکرد، ژنانی سەر دیوارەکان دیار نەمان. لەبەر ئەوە دەترساین بۆ شەوێ هێرشبکرێتە سەرمان، بە هەموو جۆرێ ئاگامان لە خۆمانبوو. داوامکرد کە چراوگەکان هەڵنەکرێن تا کاتێ دوژمن هێرشدەکات، ئەوسا هەڵبکرێن بۆ ئەوەی چاومان لە دوژمنبێ. کەمێ لە چادرەکەما پشوومدا و سەرخەوێکیشم شکاند، کە هەستام و یەکەم هەنگاومنایە دەرەوەی چادرەکەم لە گۆشەیەکی ئوردووگەکەمەوە هاوارێکی سامناك بەر گوێم کەوت، هەردوا بەدوای یەکەمین هاوارا لەناوجەرگەی ئوردووگەکەوە هاوارێکی ترم بیست، بۆم دەرکەوت کە دوژمن توانیویەتی خۆی بگەیەنێتە ناو ئوردووگەکەمەوە. پاش کەمێك لە هەموو لایەکەوە هاوار بەرز بووەوە.

پاسەوانە تایبەتییەکانم وتیان: ئەی ئەمیر، ئەم هێرشە ئاسایی نییە، چونکە دەنگی پاسەوانەکانی دەوری ئوردووگە کە نەبیسترا...... لەهەمان کاتیشا گوێم هەڵخست، گوێم لە دەنگی فەرماندەکانمبوو هاواریاندەکرد: چراوگەکان داگیرسێنن. کە دەروبەر ڕووناکبووەوە، گوێم لە دەنگی سەربازەکانمبوو

هاواریاندەکرد: مار، مار!! ... لەگەڵ ئەو سەربازانەی کە لەدەورو بەرمدا بوون چەندمارێکی زەبەلاحمان دی کە بەرەو رووومان دەهاتن، من بە شمشێر مارێکم لەتکرد، مارەکان بە هەموو لایەکا دەجووڵان، ئەوەی باشبوو بەشێکی زۆریان لە چراوگەکان ترسان و گەڕانەوە. بەهەموو فەرماندارەکانم ڕاگەیاند کە لەهەموو لایەکەوە ئاگر بکرێتەوە تاکو مارەکان لە ئۆردووگە دوورکەونەوە.

سەربازەکانم پەلاماری مارەکانیاندا و زۆریان لێکوشتن، مارەکانیش بە هەندێ سەربازیانەوەدا، سەرەنجام مارەکان لە ترسی ئاگرو چراوگەکانمان هەڵاتن، سەربازەکانم بەوە دڵخۆشبوون کە دوژمن هێرشی نەکردبوو، بەڵام ئەو شەوە لەبەر ترسی مار، کەس نەیوێرا بخەوێ، منیش لەبەر ئەوەی مارانگاز بووم ئەو شەوە باش ترسام. ئەو شەوە گەلێ جار گوێم لە ناڵەی سەربازە مارانگازەکانبوو، دەمزانی هەندێکیان دەمرن، چونکە مارەکان لە چەشنی کەپچە بوون.

(نەظیرووددین عومەر) لە پزیشکیشا دەستی هەبوو، بۆ خۆی سەرپەرشتی مارانگازەکانی کرد، جێگازی مارەکانی برینداردەکرد تا خوێنی پیا بێتە خوارێ و کاری ژەهرەکە کەمتر بێتەوە، داواشیدەکرد شوێنگازەکان بمژرێن بۆ هەڵمژینی ژەهری مارەکان. پاشان دەستووریدا سەرەمارەکان کۆبکرێنەوەو بکوترێن و بخرێنە سەر برینەکان.

بۆ دووەمین ڕۆژ تا دەمەو نیوەڕۆ هەر خەریکی دروستکردنی پەیژە بووین. پاشان فەرماندەکانم کۆمکردنەوەو پێم ڕاگەیاندن: کاتێ سەردەکەونە سەر دیواری قەڵاکە دەبێ چاوەڕێبن دژ بەو پیاوانە بجەنگێن کە خۆیان حەشار داوە، لەهەمان کاتیشا ئامادەبن دژ بە مارەکان بجەنگن، بۆ ئەو مەبەستەش ئاگریان پێبێ.(نەظیرووددین) دەیگوت مار بە ڕۆژ لەشەو کەمترە، لەهێرشی بە کۆمەڵی مارەکانا، شەوی ڕابوردوو، وا دەردەکەوێ کە لە قەڵاکەدا هەندێ مارگر هەبن و ئەوان مارەکانیان بەردابنە وێزەی ئۆردووگەکە. دوای نوێژی نیوەڕۆ فەرمانی هێرشبردنم دەرکرد، پەیژەکان بە دیواری قەڵادا هەڵپەسێنران، سەربازەکان سەرکەوتنە سەرەوە، هەر لەهەمان کاتا زانیم کە ژنەکان لەسەر دیوارەکان نەماون و بەودیودا چوونەتە خوارێ.

سەربازەکان لەسەر دیوارەکە وەستان وچاوەڕێبوون ئەو پیاوانەی خۆیان حەشارداوە بۆیان دەربپەڕن، بەڵام هیچ دیار نەبوو. من بۆ خۆم بە پەیژەیەکا سەرکەوتمە سەر دیوارەکەو سەرنجمدا کە خانووەکان کەوتونەتە ناوەڕاستی قەڵاکەوە. لە هەشت لاوە بۆشایی لە نێوان خانووەکان و قەڵاکەدا هەبوو، کە

ڕێگەبوون بۆ ماڵەکان، هەموو بۆشاییەکان پڕ بوون لەمار، لەبەر ئەوەی دیوارەکانی قەلاکە ستوونی ڕێك و سفتبوون مارەکان نەیاندەتوانی پیایاناهەڵگەڕێن. لەو لای مارەکانەوە هەندێ ژن دیاربوون، هەریەکە دارێکی کورتی بەدەستەوە بوو، هەموویان دەیانگوت جومبە، جومبە، جومبە، وا پێدەچوو بپاڕێنەوە کە مارەکان فریایانکەوێ. چاك ورد بوومەوەو سەیرمکرد هیچ پیاوێکم بەرچاو نەکەوت. داوام لە دیلماجەکەم کرد لەو ژنانە بپرسێ پیاوەکانیان لە کوێن؟! لە وەلاما وتیان پیاومان نییە! وتم پێیان بڵێ: چۆن لەم قەلایەدا بەبێ پیاو دەژین؟! وتیان کە لەسەر ڕێبازو ئایینی(براهیما)ن و تا مردن هەر لەو قەلایەدا دەژین و هاوسەر بۆ خۆیان هەڵنابژێرن. وتم لێیان بپرسە بزانە(نەصرانی)ن و تەرکی دنیایان کردووە؟! وتیان: خۆمان تەرخانکردووە بۆ خوای(ویشنو) کە یەکێکە لەسێ خوا مەزنەکانی هندییەکان و هەرگیز شوو ناکەین.

تا ئەو ڕۆژە نەمزانیبوو کە کۆمەڵگەی هندی لە پێنج چین پێکهاتووەو جیاوازی لە نێوان چینەکاندا هەیە و هەر چینێك لە چینێکی تر لە پێشترە. بەرزترین و لەپێشترینیان چینی(براهیما)یە کە زانایانی ئایینی هندۆسەکان لەو چینەن، هەروەها ئەو ژنانەش کە دەستیان لەدنیا هەڵگرتووە لەو چینەن؛ نزمترین چینی هندییەکان پێیان دەوترێ(پاریا)، لەچاو چوار چینەکەی تردا هیچ نرخ و بایەخێکیان بۆ دانەنراوە، تەنانەت بەگلاووپیس سەیر دەکرێن و چینەکانی تر تێکەلاوییان ناکەن، ئەگەر هەر هندییەك لە چوار چینەکەی تر دەستی بەردەستی(پاریا)یەك بکەوێ، دەبێ خۆی بشوات بۆ ئەوەی پیسی و گلاویی خۆی دەرکات.

لە ژنەکانمان پرسی ئایا شەوی ڕابوردوو ئێوە مارەکانتان بەردانە ناو ئوردووگەکەوە؟! وتیان بەڵێ، بۆ ئەوەی بمانپارێزن و دژ بە ئێوە ببنەوەو ببنە کۆسپ و تەگەرەی ئێوە. پێم ڕاگەیاندن کە ئەگەر بێت و مارەکان لابەرن و قەلاکە بەدەستەوە بدەن، لە خوێنی ئەو سەربازانەم خۆشدەبم کە شەوی ڕابوردوو مارەکان پێوەیاندان ومردن، وە بەهیچ جۆرێك دەستیان بۆ نابرێت وبە ئازادی دەمێننەوە، تەنها هەر قەلاکە تەختدەکەم. بەلام ئەگەر مارەکان لانەبەن و بەرەنگاریبکەن، وا حسابی کافری جەنگیان بۆ دەکرێت و دابەشیاندەکەم بەسەر سەربازەکانمدا. ژنەکان گوێیان پێنەداو بڕیاریاندا بەرگریبکەن.

من دەمتوانی کۆمەڵێ سەرباز بە چراوگەوە بنێرمە خوارێ بۆ بەرەنگار بوونەوەی مارەکان، بەلام دەمزانی پێش ئەوەی سەربازەکان چراوگەکان لە مارەکان

نزیکبکەونەوە، مارەکان ئەوەندە خێران دەسپێشخەریدەکەن و بە سەربازەکانەوە دەدەن، بە تایبەتی بەڕۆژ لەبەر تیشکی خۆر چراوگ ئەوەندە شەوق ناداتەوە تا مارەکان بترسن و هەڵێن. ئەگەر بە شیرو ڕم و تیروکەوانیش خەریکی لەناوبردنی مارەکان بووینایە سەربازی زۆرمان تێدا دەچوون. دواجار بڕیارمدا کیسەی چەرمی بە بارووتداگیراو بەکاربێنین.

لەگەڵ یەکەمین تەقینەوەدا لەناو مارەکانا، قیژەو شیوەنی ژنان بەرز بووەوە، مارەکان پەرشوبڵاوبوون و لەبەرچاو ونبوون، سەربازەکانم خێرا چوونە خوارێ و هەموو دەروازەکانی قەڵایان کردەوەو سەرکەوتنمان مسۆگەر بوو. پێش خۆرئاوا بوون هەموو ژنەکانمان گرت و لە قەڵاکە هێنامانە دەرەوە... چەند ژنێکیانم بانگکرد، کە دیار بوو دەسەڵاتدارو لەپێشتر بوون، لێم پرسین : بۆچی هەریەکە دارێکی کورتتان بەدەستەوە بوو، سەری دارەکەش پەڕۆیەکی سووری پێوە بوو؟! وتی: بەو دارو پەڕۆیە مارەکانمان هاندا تاکو هێرشسبکەنە سەرتان، مار دەنگی مرۆڤ نابیسێ، بەڵام کە پەڕۆی سووری بینی تێدەگاو نیشی خۆی دەکات! منیش بۆ یەکەم جار زانیم کە مار دەنگی مرۆڤ نابیستێ. هەروەها پرسیارمکرد: بۆچی مارگری دەکەن؟! وتیان بەو مارانە قەڵاکەمان پاراستووە، هەر لەشکرێ هاتبێتە سەرمان مارەکان تێکیانشکاندووەو هەڵاتوون. پاشان بۆیان باسکردم کە لەناو قەڵاکەدا ماری وا هەیە سێ گەز درێژەو پانز گەز پانە، وە ژمارەیەکی زۆر ماری جۆراوجۆر لە کون و کەلەبەری قەڵاکەدا ماون.

داوام لە ئەفسەرو سەربازەکانم کرد کە هیچ کەس لەناو قەڵاکەدا نەخەوێ، نەبا مارە کوشندەکان پێوەیانبدەن. بە هەموو ژنەکانەوە لە قەڵاکە هاتینە دەرێ، ژنەکانم بەسەر ئەفسەرو سەربازەکاندا دابەشکردن، ئەو شەوەمان لە دەرەوەی قەڵاکە بەبێدەنگی بەسەر برد.

دەوروبەری قەڵای جومبە هیچ ئاوەدانییەکی لێ نەبوو، تاکو بە بێگاری قەڵاکەیان پێبڕوخێنین. فەرمانمدەرکرد کە پاچ و خاکەناز بدرێتە دەست ژنەکان و قەڵاو لانی مارەکان تێکوپێکبدەن. نەمدەتوانی لە جومبە ئەوەندە بمێنمەوە تا قەڵاکە وێرانبکرێت و مارانگازەکان چاکببنەوە. بڕێک سەربازم لەگەڵ ئەو مارانگازانەدا کە جەستەیان زۆر سەخڵەتبوو لەوێ هێشتنەوەو چارەنووسی ژنەکانیشم پێسپاردن‌و ناچار بووم پێش وەرزی باران کە پێی دەڵێن(بەرەسات) بەرەو (دەهلی) بەڕێبم. لە جومبەوە بۆ دەهلی کۆسپ و تەگەرەی ئەوتۆم لەڕێدا نەبوو، لەبەر ئەوە دەمتوانی بە ئاسانی بگەمە ئەو شارە. کاتی خۆی(والیملووك)

هەموو شتێکی دەربارەی قاییمکاریی شوورەی ئەو شارە و دەستەلات و دەولەمەندیی پادشای دەهلی بۆ باسکردبووم. ئەبدال کەلزائی-ش سولتانی ولاتی غوور کە لەگەلما بوو، وتی: لەسەردەمی کۆندا لە غوور دەنگ وابووکە شاری(دەهلی)ی کۆن سێ شوورەی مەزنی هەن، یەکەمیان چل گەز بەرزە، دووەمیان سی گەز، سێیەمیشیان بیست گەز بەرزە، هەر کەس یەکەمیان ببڕێ، لە دووەم و سێیەمدا دەوەستێ و گیر دەخوات، ئێستا هەوالی ڕاست دەربارەی شوورای دەهلی نازانم، هەر ئەوندە هەیە کە دەلێن شوورەکەی شار بەردەو ئەوەندە قاییمە بە دووری نازانم کە بارووتەکەی تۆ کاری تێ‌نەکات.

دوای دوو ڕۆژ، بۆ حەسانەوە ئوردووگەکەمان هەلدا. دوای نوێژی عەسر ئاگادارکرام کە بڕێك هندی هاتوون و دەیانەوێ ببنە سەربازی من! بەڕاستی زۆرم پێ سەیر بوو!! وتم : با نوێنەریان بێتە لام. بەهۆی دیلماجەوە لێم پرسین: چی دەلێن؟! وتیان: ئەی ئەمیر،وەك بزانین تۆ بۆ گرتنی(دەهلی) دەڕۆی، ئێمە ئامادەین بێینە ناو لەشکرەکەتەوەو لەگرتنی دەهلیدا یارمەتیتبدەین، ئەگەر قایلبیت هەرچی بلێی ئامادەین، بەمەرجێ خۆمان و مال و منالمان تێر بکەیت! وتم: ئێوە هندین، چۆن ئامادەن یارمەتیمبدەن و هاوولاتییانی خۆتان بکوژن! وتیان: کۆمەلگەکەمان ئێمە بە گلاوو پیس دەزانێ، بیستوومانە ئەگەر بێینە سەر دینی تۆ بە پیس و گلاومان نازانیت و وەکو سەربازەکانت سەیرماندەکەیت! . پرسیم ئایا ئێوە لەو تیرەیەن کە پێیان دەلێن(پاریا)؟ وتیان : بەلێ وایە، هەمووان بەچاوی سووك تێماندەڕوانن و برسییەتیمان بەسەردا سەپێنراوەو پاشماوەی خەلکانی تر دەخۆین، ناهێلن بێجگە لە حەمالیو گەسکدان و خۆلڕشتن هیچ کارێکی تر بکەین! وتم: ئەگەر بین بەموسلمان هەموو مافێکی ئێمەتان دەبێ. وتیان ئەگەر هاتینە سەر دینی ئێوە ئەبێ بەژن و منالەوە لەگەل خۆتا بمانبەیت و زەویوزارمان بدەیتێ تاکو نیشتەجێبین. وتم: باشە... دوای ئەوە بچوومایەتە هەر ناوچەیەك کە(پاریا)ی تێدا بوونایە بڕێك لە پیاوانی پاریا موسلماندەبوون و دەهاتنە ناو سوپاکەمەوە.

پێش(دەهلی) گەیشتینە شارێ پێی دەگوترا(یەزدا)، وای بۆ چووم کە ناوی(یەزدان) بووبێت و بە گوزەری ڕۆژگار بوبێتە(یەزدا). هەندێ پیاوی بەسالا چوو هاتنە پێشوازیم و بە(پادشای ئێران زەمین) ناویاندەبردم.بۆیان باسکردم کە(مەجووسین)و باوباپیرانیان خەلکی فارس و کرمان و یەزدن، پادشاکانی ئەو ولاتانە ئەوانیان وەدەر ناوە و دوو سەد سال لەوەو پێش ڕێی هندستانیان گرتۆتە بەرو ئێستا بە کشتوکالەوە خەریکن. لە کاتی گفتوگۆدا بۆم دەرکەوت کە قورئانیان

خوێندووەو گەلێکیشیان لەبەرە، وتیان ئێمەش خاوەنی کتێبی زۆر کۆنین کەناوی(زەند)ە، لەبەر ئەوە ئێمە پیس و گلاو نیین. وتم ئێوە ئاگر پەرستن و بتی ئێوە ئاگرە! وتیان کەسمان ئاگر پەرست نییە، ئاگریش یەکێکە لە چوار پێکهاتەکان کە بریتین لە(خاك، ئاو، هەوا، ئاگر) لەبەر ئەوە پاکە.

پاشان پتر باسی خۆیان بۆ کردم، پێم سەیر بوو بەتەواوەتی ئاگاداری مێژووی ئێرانی کۆنبوون، چونکە چاك شانامەیان خوێندبوو، هەروەها باسیانکرد لە کۆندا دانیشتووانی ئێرانیش وەك هندستان لەچەند چینێك پێکهاتووە، چینی(موبدان) واتە زانایانی ئایینی زەردەشت، کە پێشەوای ئایینیبوون،چینی جەنگاوەران، چینی پیشەسازان، چینی جووتیاران... پرسیم: ئایا ئێوە مردووەکانتان دەسووتێنن!؟ وتیان: ئێمە هندی نیین تا مردووە کانمان بسووتێنین، یان فڕێیانبدەینە ناو ڕووبارەوەو ئاوەکان پیسبکەن. دوایی پیرێکی ڕدینسپییان دەستی بەرەو باشوور ڕاکێشاو کێوێکی پیشاندام وتی: مردوومان دەبەینە سەر ئەو کێوە، لەوێ دایدەنێین تاکو بەخۆرو باران داڕزێ و هەر ئێسکەکانی بمێننەوە، دواتر ئێسکەکانیان دەخەینە چاڵێکەوەو دایاندەپۆشین، بەم جۆرە زەویش پیس ناکەین و دەمانەوێ هەروا بە پاکی بمێنێتەوە.

پێشنیارمکرد لەگەڵما بگەڕێنەوە ئێران، کە وڵاتی باووباپیرانیانە، بەڵام زۆر دوور بینیانکردو وتیان: تازە لێرە ڕاهاتووین و بووەتە نیشتمان و وڵاتمان.

شارۆچکەی(یەزدا)م بەجێهێشت و بەرەو (دەهلی) کەوتمەڕێ. ئەگەر لە جێی شا(ئیقبال)، سوڵتانی دەهلیدا بوومایە بێشوازیم لە دوژمنێکی خاوەن سوپاو دەسەڵاتدارێکی وەك خۆم دەکردو پەنام نەدەبردە بەر بەردو خشت و قوڕ، من لەسەردەمی لاویماو تا ئەمڕۆ، کە تەمەنم حەفتا ساڵە پەنام نەبردۆتە بەر ئەو شتانە، پەنابردن بۆ قەڵاو پشت پێبەستنی بە ترسنۆکی دەزانم! . بەسەرهاتی ئەو قەڵایانەی کە گەمارۆمدان و تەختمکردن باشترین بەڵگەی بۆچوونەکەمە.

ئاگادارکرام کە خواردنی سەرەکیی شاری (دەهلی) برنج و زەڕاتەو هندییەکان گۆشت ناخۆن. دڵنیا بووم هەرچەندە هەوڵبدەن ناتوانن بژێویی ئەو هەموو دانیشتووانەی شار دابینبکەن و سەرەنجام لەبرسانا دەمرن. پیاوی ترسنۆك پەنا بۆ قەڵا دەبات و لەمەرگیش ڕزگاری نابێ، بەڵام پیاوی ئازاو بەجەرگ دەستدەداتە شمشێرو لە دەرەوەی قەڵا، لەدەشت و دەرا دەجەنگێ و لەمردن ناترسێ.

کە گەیشتمە(دەهلی) بەیانیبوو، هێشتا لە چارەنووسی(سەعد وەققاص)ی کوڕم ئاگادار نەبووم و نەمدەزانی کوژراوە... شوورەی شار بەوجۆرە بەرز نەبوو کە

بەرگوێمان کەوتبوو، تەنیا هەر دوازە گەز بەرز بوو، خەندەقی دەوراندەوری شار پڕ لە ئاو بوو. لەسەر شوورەکە پیاوانی سمێڵدرێژمان بینی، سمێڵەکانیان بەسەر گوێیاندا چەماندبۆوە، هەموویان ڕم و نێزە بەدەستبوون. خۆم و ئەفسەرو سەربازەکانم بە تاقیکردنەوە بۆمان دەرکەوتبوو قارەمانییەتی بەڕیش و سمێڵ نییە، لەمەیدانی جەنگا دەست و بازوو بەکەڵکدێن...لەگەڵ هەندێ لە ئەفسەرەکانم بە دەوری شاردا دەگەڕام بۆ ئەوەی لە شێوەی خەندەق و باری شوورەی شار ورد ببمەوە، لەپڕ یەکێ لە پاسەوانانی سەر شوورەکە تیرێکی تێگرتم، یەکێ لە ئەفسەرەکانم قەڵغانی دایە بەر سەرو چاوو سنگم، بەڵام تیرەکە بیست گەز کورتیهێناو نەگەیشتەلام. خێرا تیرو کەوانی ئەفسەرێکم بەدەستەوە گرت و تیرێکم گرتە ئەو پیاوەی تیرەکەی تێگرتم، ئەو پیاوە هیچ پەنای نەگرت چونکە وایدەزانی تیرەکەم نایگاتێ، تیرەکەم بەر سنگی کەوت و خستی، ئەگەر زرێپۆش نەبوایە کوناو دەریدەکرد، چاوم لێبوو هەستایەوەو بەسەرسوڕمانێکی زۆرەوەو سەیری تیرەکەی دەکرد کە بەدەستیەوە بوو، پیشانی هاوڕێکانیدا، هەر لەوکاتەدا تیرێکی ترم خستە کەوانەوەو خێرا تێمگرت، ئەم جارەیان بەر سەرو چاوی کەوت، ئەوەندە قایم هاواریکرد گوێم لە دەنگیبوو، کەوت بەودیو شوورەکەداو لەبەر چاوم نەما.

دەمەو خۆرئاوا بوون پیاوێك کە بەرگی ئەرخەوانی لەبەردا بووهاتەسەر شوورەکە، دەستی بەرز کردەوە، وتی: ئەی ئەمیر تەیموور... منیش دەستم بەرزکردەوە، وتم: من ئەمیر تەیموورم، ئەڵێی چی؟! دەرکەوت کە هیچمان لە زمانی یەکتر ناگەین، پاشان بە هۆی دیلماجەوە لە گەڵیادوام، بۆم دەرکەوت کە(بەرهەمەن)ی شاری(دەهلی)یە، واتە گەورەترین پێشەوای ئایینی. داوای لێکردم کە واز لە شار بێنم وبڕۆم ئەگینا(بەرهەما) کە خوای هەموو هندییەکانە تەمەنکۆتام دەکات. بێگومان من گاڵتەم بەوتەکانی هات و دامە قاقای پێکەنین، (بەرهەمەن) وتی: ئەی ئەمیر، ئێستا تۆ تەمەنت شەست و سێ ساڵە، ئەگەر دەست لەم شارە هەڵگری ئەوەدو سێ ساڵ تەمەن بەسەر دەبەیت، بەڵام ئەگەر پەلاماری شار بدەیت و بەکارەساتێك ئەمری، تەنیا حەفتا ساڵ دەژیت. وتم: ئەی پیاوی سوورپۆش، من و مەرگ دوو برادەری دێرینین و پێکەوە هاتووین و خوومان پێکەوە گرتووە، ئەگەر ئەتەوێ بمترسێنیت شتێکی تر بڵێ. وتی: هەرچیم وت هەمووی ڕاستە، ئەگەر نەگەڕێیتەوە هەواڵێکی زۆر ناخۆشت پێدەگات! پرسیم ئەو هەواڵە چییە؟! وتی: هەواڵی مەرگی کوڕەکەتە!... وتم: ئەو سەربازانەی من کە کوژران هەموویان باوکیان هەبووە، ئەگەر هەواڵی مەرگی کوڕەکەم پێمبگات هەڵوێستم وەك هی ئەو

باوکانە دەبیٚ کە هەواڵی مەرگی کوڕەکانیان وەرگرتووە. (بەرهەمەن) وتی: ئیتر هیچ قسەیەکم لەگەڵ تۆدا نییەو دەڕۆم... پاشان تاریکیداهات و یەکەم شەوی گەمارۆدانی دەهلی دەستپێکرد. لە هەموو خاڵێکی گرنگا پاسەوانم دانا. ئەو شەوەو شەوەکانی دواتر لەسەرێکەوە ترسی ئەوەمان هەبوو(مەلو ئیقباڵ و مەحموود خەلج) لە شارەوە هێرشبکەنە سەرمان، لە سەرێکی تریشەوە ترسی ئەوەمان هەبوو لە بیابانیشەوە هێرشێکی تر بکرێتە سەرمان. دوای ئەوەی لەبارودۆخی ئوردووگە دڵنیا بووم، نزیکەی نیوە شەو چوومە چادرەکەم، بەرگی جەنگم داکەندو خەوتم. هەرکە چاوم چووە خەو، گوێم لە چرکە چرکێ بوو لە دەنگی لێکدانی دوو شمشێر دەچوو، وام زانی دوژمن هێرشیکردووەو سەربازەکانم خەریکی نەبەردن ، کە ڕاپەڕیم، سەیر دەکەم ئەو دەنگە دەنگی بەرگە ئاسنینە هەڵواسراوەکەمە لەگەڵ قەڵغانەکەما بەریەکدەکەون، لەهەمان کاتا هەستم بە بوومەلەرزە کرد. سەربازەکانیشم ڕاچڵکین و ترس و لەرز دایگرتن، لەبەر ئەوەی لەناو خانووبەرەدانە بووین ترسی ئەوەمان نەبوو دیوارو سەربان بەسەرمانا بڕووخێت. سەربازەکانم ئاگادار بوون کە(بەهەمەن)ی هندییەکان وتبووی ئەگەر نەڕۆن تووشی کارەسات دەبن، لەبەر ئەوە ئەوەندەی تر بوومەلەرزەکە دڵی داخورپاندبوون. هێورمکردنەوەو دڵنیاشمکردن کە قسەکانی ئەو کابرایە هیچ کاریگەرییەکیان نییەو پەیوەندیشیان بە بوومەلەرزەکەوە نییە. لەهەمان کاتا گوێمان لە هەراو هوریاو قیژەو هاواری شار بوو، زانیمان کە دانیشتووانی شار لە ئێمەزیاتر لە بوومەلەرزەکە دەترسن. دوای ئەوەی لە چادرەکەم هاتمە دەرێ، بەناو ئوردووگەکەدا گەڕام و جارێکی تر لە بارودۆخی هەموو لایەك دڵنیا بووم. سەیری ئەستێرەکانمکرد زانیم نزیکەی سەعاتێ شەوی ماوە، دیسانەوە چوومەوە چادرەکەم و ڕاکشام. پێش ئەوەی وەنەوزێبکەم، هاواری سەربازەکان ڕایچڵەکاندم، کە دەرپەڕیمەوە دەرێ سەیرمکرد بە مەنجەنیق بەردە باراندەکرێن، هەر بەردێ دەکەوتە خوارێ ئوردووگەی دەلەرزان، بەر هەرکەسێ بکەوتایە هەلا هەلایدەکرد. ئەوەندە لەخۆم سەخڵەت و تووڕە بووم جێم بەخۆم نەدەگرت. هەر دەمگوت و دەمگوتەوە: چ ئەقڵێکم بەکارهێناوە لەپاڵ شوورەی شاردا ئوردووگەم هەڵداوە؟! لە هەموو لایەکەوە سەربازو ئەفسەرەکانم شپرزە بوون و دەترسان، من بۆ خۆیشم ترسم لێنیشتبوو، ئێمەی جەنگاوەران بەم برینی شیرو تیرو تەورو ڕم و نێزە ڕاهاتووین، بەڵام مردن بە بەرد باران بۆ ئێمە کارێکی ئاسایی نەبوو. تەنیا چارەیەك هەر ئەوەبوو هەموومان ئوردووگە بەجێبهێڵین و دوور کەوینەوە. لەبەر

چادرەکەما وەستا بووم، سەرنجمدەداو ورد دەبومەوە، هەندێ ئەفسەری پەراگەندەم دی، بانگمکردن و پێم ڕاگەیاندن بە ناوی منەوە فەرمانبدەن بەسەربازەکان بە خۆیان و ئەسپەکانیانەوە لە ئوردووگەکە دووركەونەوە. لەبەر پاراستنی شکۆمەندی و ئابرووی فەرماندەیی نەمتوانی ڕابکەم و ئەو هەستە قاچاکانمی چەقاندبوونە زەوی، بە خۆمم وت: وای لەو کاتەی ئەفسەرو سەربازەکانت چاویان لێبێ لە ترسانا هەڵدێی!! ئابرووی هەزار ساڵەت دەتکێت و سامی(تەیموور گورگین)لەناو دەچێت!.. لەبەر هێرشی مەنجەنیقەکاندا مامەوە تا بە تەواوی هەموو سەربازو ئەسپەکان گەڕانەوەو دوورکەوتنەوە. کەخۆمان گرتەوە داوام لەهەمووان کرد ئامادە بن بۆ بەرنگاری هێرشی دوژمن، بەڵام هیچ هێرشێکمان نەکرایە سەر، بۆم دەرکەوت سوڵتانی دەهلی و دەوروبەرەکەی هیچ کارامەیی و شارەزاییەکی ئەوتۆی جەنگییان نییە، چونکە ئەگەر لە جێی ئەودا بوومایە هێرشمدەرکردە سەر لەشکرێکی شپرزەو پەرەوازە. کە ڕۆژبووەوە، مەنجەنیقەکانی سەر دیوارەکانمان بینی. داوامانکرد کە دەستەی بچووك بچووك بچن بۆ کۆکردنەوەو هێنانەوەی چادرو کەلوپەلەکان .

هەرچەندە (مەلو ئیقبال و مەحمود خەلج) لە پڕێکازرمەیان لێهەستانین و هەندێ سەربازم کوژران و هەندێکیشیان برینداربوون، بەڵام هیچ کەڵکێکیان وەرنەگرت. هەرچەندە هەموو ژیانم لە گۆڕەپانی جەنگا بەسەر بردووە، لەگەڵ ئەوەشا ڕۆژبەڕۆژ وانەوەردەگرم و شتی نوێ فێر دەبم، بەرد بارانی مەنجەنیقەکان بۆ من پەندێکی کاریگەربوو، لە پێستی لە خۆباییبوون هاتمە دەرێ، بریارمدا زۆرتر وریا بم، بچووکترین حساب بۆ دوژمن بکەم، کۆمیتەی ڕاوێژکاریی جەنگم پێکهێناو کۆبووینەوە بۆ ئەوەی لە بیرو بۆچوونی هەموویان کەڵك وەرگیرێ، (شێر بەهرام مرووزی)ی ئەندازیاریشم ئامادەی کۆبونەوەکە بوو. وتم: ئێمە وامان زانی فەرمانڕەوای(دەهلی) ناتوانێ بەرگریبکات، بەڵام ئەوەبوو شەوی ڕابوردوو بە چاوی خۆمان دیمان چەندە وریاو ئامادەیە! خەندەقی پڕ ئاویش بوارنادات بپەڕینەوەو بگەینە بن دیواری شوورەی شارو بە بارووت بیتەقێنینەوە، ئێستا ڕوودەکەمە شێر بەهرام مرووزی، بزانین لەم بارەیەوە چی دەڵێ. وتی: ئەگەر ئەو جۆگەیە ببڕێت کە ئاوەکەی دێتە سەر خەندەقەکە دوایی بەگڵ خەندەقەکە پڕ بکەینەوە، هەڵکەندنی بن دیواری شوورەکەو تەقاندنەوەی ئاسانتدەبێت. وتم: ئەم ئیشە زۆر درێژە دەکێشێ! وتی: بۆ چوونە ناو شار بەڕێگەیەکی تر نازانم. یەکێ لە فەرمانده‌کانم وتی: ئەگەر بەشێکی خەندەقەکە پڕ بکەینەوە، دوژمن واتێدەگات کە

دەمانەوێ لەوێوە هێرشبکەین، ئیتر سەرقاڵی ئێمە دەبێ، لەهەمان کاتا دەتوانین خەریکی لێدانی خەندەقی ژێر زەمین بین بۆ ئەوەی بگەینە بن دیواری شوورەی شار. هەر ئەو ڕۆژە هەموو دانیشتوانی شارۆچکەو گوندەکانی دەوروبەر کۆکرانەوە، لەگەڵ سەربازەکاندا خەریکبوون، بۆ دوای نیوەڕۆ ئاوی جۆگەکە وشککرا. دەمەو عەسر دەستیانکرد بە گڵکێشان بۆ پڕکردنەوەی بەشێکی خەندەقەکە، کە زانیمان گڵەکە دەخزێ و هیچی دیار نییە، بڕیاردرا جارێ بەردبهێنرێ. تا دوای خۆرئاوا بوون هەر بەرد دەکرایە ناو خەندەقەکەوە، هندییەکان واتێگەییبوون کە دەمانەوێ خەندەقەکە وشکبکەین، نەیاندەزانی دەمانەوێ لەژێر ئەو شوێنەوەکە پڕیدەکەینەوە، خەندەق لیدەدەین و خۆمان دەگەیەنینە بن دیواری شوورەی شار. کەزانییان بەو جۆرە سەرگەرمی کارین زیاتر بەرد بارانیانکردین.

شەویش هەر خەریکی بەرد کێشانبووین، بەڵام لەگەڵ بەرد بارانەکەشا پەڕۆو پیتاڵی چەورو قیراویی ئاگردراویان بەسەردا دادەباراندین. دارتاشەکانمان دەستوبردیان لێکردو پێنج مەنجەنیقی باشیان دروستکرد، مەنجەنیقەکانمان لە ئاستی ئیشەکەماندا دامەزراندن و کەوتنە بەرد بارانی بەرانبەر، باشبوو بەم کارە بەرد بارانی دوژمن زۆر سستبوو، کرێکارەکان توانییان بەشێکی خەندەقەکە پڕبکەنەوەو بەری ئاوەکە بگرن. دەبوایە دوژمن بە پلانەکەمان نەزانێ و سەرقاڵیبکەین. لە هەموو لایەکەوە وا خۆمان پیشاندا کە دەمانەوێ سەرکەوینە سەر شوورەکە، بۆ ئەم مەبەستەش تەختە پردمان لەسەر ئەو بەشە دانا کە پڕمانکردبووەوە، پەیژەی گەورە گەورەمان دروستکردن تا واتێبگەن دەمانەوێ بیپەڕینەوەو سەرکەوینە سەر شوورەکە، بەڵام من ئەو هێرشەم نەکرد نەبادا ژمارەیەکی زۆر لە سەربازەکانم بکوژرێن، بە تایبەتی چاوەڕێی ئەوە بووم دیواری شوورەکە بتەقێنینەوە.

(شێر بەهرام مروروزی) شەو ڕۆژ ئیشیدەکرد. ڕۆژێکیان هاتە لام و وتی: ئەی ئەمیر، گەیشتوینەتە بەردیواری شوورەکەو چاڵێکی گەورەشمان ئامادە کردووە، هەرکاتێ بتەوێ پڕ بکرێ لە باروت و ئاگر بدرێ ئامادەیە؛ بەژێر ئەو شوێنەدا خەندەقەکە لێدرابووکە پڕمانکردبووەوە، لەبەر ئەوە هەرکاتێ دیوارەکە داڕووخێنرایە ئێمە بە ئاسانی دەمانتوانی لەوێوە بچینە ناو شارەوە. سەربازانی چەتینم ئامادەکرد بۆ هێرشی سەر شارو هەموویانم زرێپۆشکرد. وەکو زووتر باسمکرد ئێجگار ئازاو نەبەردو چاونەترسن و بە هیچ جۆرێ هەست بە ئازار ناکەن

و لە هیچ شتێ سڵ ناکەنەوە، هەرئەوەندەیە کە دڵیان ڕابگیرێ، ئیتر خاوەنی سەری خۆیشیان نین. سەربازی ترم دەستنیشانکردبوو کەبە دوای ئەوانا خۆیان بکەن بە شاردا، دوای ئەوانیش سەربازەکانی (ئەبدال کەلزائی) کە لەقولاپهاویشتنا پسپۆڕ بوون.

لەو ڕۆژانەدا کە گەمارۆی شاری(دەهلی)مان دابوو گەڵێ چاوەڕێی (سەعد وەققاص)ی کوڕم بووم، ڕۆژێکیان تەترێکم نارد بۆ هەواڵپرسینی، کە گەڕایەوە، هەموو گیانی لە قوڕ گرتبوو، وتم: مەترسە، هەرچی هەواڵێکت پێیە پێمبڵێ! وتی: (کارتارکوتالی) قەلای لۆنی، خۆی و هەموو سەربازەکانی کوشتوون. وتم: خوا بیبەخشێ، کوڕی بچووکمبوو، لەگەڵ ئەوەشا دەیزانی پیاو دەبێ لەمەیدانی جەنگدا بکوژرێ. لێم پرسی: ئایا دەزانی چۆن کوژراوە؟! وتی: ئاگادار نیم، بەڵام دەزانم پیاوانە کوژراوەو هیچ ناڵەو زاریی لێوە نەهاتووە! وتم: ئەمەندەم بەسەو نامەوێ لەوە زیاتر بزانم تا دوایی...

بۆ بەیانییەکەی بارووتی ژێر دیواری شوورەکەمان تەقاندەوە، تەقینەوەکە ئەوەندە بە هێز بوو پەردەی گوێی هەندێ لە سەربازەکانم دڕا!...سەربازەکانی چەتین خۆیانکرد بە شاردا. من وای بۆ چووم کە دوژمن زیرەیکردووەو ناتوانێ بەرگریبکات، بەڵام جارێکی کەش بە هەڵەدا چووبووم. ڕاستە لە سەرەتاوە زۆر ترسابوون و شپرزە بوون، بەڵام زوو کەوتنە خۆ. سەربازە هندییە سمێڵزلەکان بە گورزو تەورەوە بەرەنگاری سەربازەکانم بوونەوە، هندییەکان بەرگی جەنگیی زرێ و ئاسنیان لەبەرا بوو، شمشێری سەربازانی چەتین و قولاپی سەربازانی (ئەبدال کەلزائی)کاری تێ نەدەکردن. کۆمەڵێکی تر سەربازم نارد بۆ یارمەتییان، بەڵام هندییەکان پاشەکشێیان بە هەموویان کرد. نەماندەتوانی لە گۆشەیەکەوە خۆمان بگەیەنینە ناوەندی شار. کە خۆر بەرز بووەوە هندییەکان، فیلە جەنگاوەرەکانیان هێنایە مەیدانی جەنگەوە، هەرچەندە سەربازەکانم لێیان نەدەترسان، لەگەڵ ئەوەشا گەلێکیان بوون بە بەژێر فیلەکانەوەو چەند سەربازێکیشیان کەوتنەبەر شاڵاوی خرتوومەکانیان. بۆ شپرزە کردن و سستکردنی بەرگران فەرمانمدا کە سەربازەکانم بە پەیژە لە چەند لایەکەوە سەرکەونە سەر شوورەکە و خۆیان بگەیەننە ناو شار. بەڵام هندییەکان بە سەختی بەرگرییاندەکردو نەیانهێشت لە هیچ خاڵێکدا سەربازەکانم جێ بەخۆیان بگرن. ئەو کەلەبەرەی کردبوومانە دیوارەکەوە زۆر پان و فراوان نەبوو، ئەگینا هەموو سوپاکەم دەیتوانی بەزووترین کات لەوێوە خۆی بگەیەنێتە شار. بەر لە ڕۆژئاوا بوون ڕامسپاردن کە هەردوو لای

کەلەبەرەکە داڕووخێنن و ڕێ فراوانتر بکەن، بۆ ئەو مەبەستەش چەند چاڵێ لێدرا و باروتیان تێدا تەقێنرایەوە، بەڵام وەکو ئەوەی یەکەم جار زۆر کاریگەر نەبوو، چونکە ئەو شوورە گەورەو قاییمە بە چاڵی بچووك نەدەڕوخێنرا. کە شەو بەسەردا هات ناچاربووین پاشەکشێ بکەین.

بەشێکمان لەو شەوە بە چارەسەرکردنی بریندارەکانەوە بەسەربرد، تەرمی کوژراوەکان کۆکرانەوە بۆ ئەوەی دڕندە نەیانخوات تادوای جەنگ بیانێژین. داوامکرد کە سەربازەکان بحەسێنەوە تاکو بتوانن بۆ ڕۆژی دوایی بجەنگێن. هەموو فەرماندەکانم کۆکردەوە، پێم وتن بە سەربازەکان ڕابگەیەنن کە سبەینێ چەك دەگرم بەدەستەوەو دەچمە گۆڕەپانی جەنگەوە، یان شاری دەهلی دەگرین، یان تەرمەکەم لە کۆڵانێکی شاردا بەجێدەمێنێ. ئەگەر هات و سەرکەوتین هەرچییان بەرچاو دەکەوێ بۆخۆیان، هەر ژن و کچێکیان پێ جوانە بۆخۆیان، هەر لاوێکیشیان ویست ئەویش بۆ خۆیان.

لە گەرمەی کۆبوونەوەدا بووین، وتیان دیسان(بەرهەمەن) هاتووەتە سەر شوورەکە .وتم: چونکە پیاوێکی ئایینیە تیری تێمەگرن. بەوەرگێڕم وت لەگەڵیا بدوێت و بزانێ دەڵێ چی. وەرگێڕەکەم گەڕایەوە، وتی: دەڵێ تەمەنی تەیمور کورتدەبێ چونکە پەلاماری ئەم شارەیدا، بەم زووانەش تووشی بەڵایەك دەبێ!...وتم بڕۆ پێی بڵێ هەڕەشەی دوژمن کارم تێناکات، مرۆڤ هەر یەك جار دەمرێ !... پاشان ئاگادار کرام کە دانیشتووانی شارچراوچراوگیان هەڵکردووە و خەریکی دروستکردنەوەی دیوارە داڕوخێنراوەکەن، لەوانەیە تا سبەینێ ئەو دیوارە تەواوبکەن و ڕێمان نەبێ بچینە ناو شارەوە. فەرمانمدا کە بە مەنجەنیق بەخەستی وچڕی ئەو ئاستە بەردبارانبکەن بۆئەوەی نەتوانن ئەو کارەیان بە ئەنجامبگەیەنن. دوای تەواوبوونی کۆبونەوەکە چوومەوە چادرەکەم بە نۆکەرەکەمم وت کە قورئانەکەم بۆ بێنێ. من سەرانسەر قورئانم لەبەرەو ئاگاداری هەموو ئایەت و سوورەتەکان و جزمەکانم و هەموو دەستووری قورئانم لەبەرە. من قورئان دەگرمەوە تاکو بزانم چیم بەسەر دێ، بەبێ ئەوەی بڕوام بەوە هەبێ کە دەبێژرێ چارەنووس چۆن بێ هەروایە، چونکە ئەگەر وا بوایە خوا ئەقڵ و ئاوەزی بە مرۆڤ نەدەبەخشی، لەبەر ئەوە چارەنووسی مرۆڤ بەدەست خۆیەتی. کە قورئانەکەم کردەوە چاوم بەم ئایەتە کەوت(إنا فتحنا لكَ فتحًا مبينًا) ئەو ئایەتەی مژدەی داگیرکردنی مەککەیدا بە پێغەمبەرمان(د.خ)، ئەوە بوو(بیلال) کە بانگدەری پێغەمبەر(د.خ) بوو چووە سەربانی(کەعبە) و بانگیدا. لە خۆشیانا خەریکبوو لە

چادرەکەم دەرپەڕمە دەرێ و بانگبدەم، بەڵام دەمزانی بانگی ناوەخت دەبێتە هۆی سەرسامی ئەفسەرو سەربازەکانم. هەستمدەکرد ئەوەندە بەهێزم هیچ کۆسپێك ڕێم لێ ناگرێت، ئەوەندە دڵم خۆشبوو هەراو هوریایەك بەرپابوو هیچ گوێم نەدایە!!.
دووان لە ئەفسەرەکانم هاتنەژووری و وتیان: هندییەکان بە فیلەوە لە دەروازەی باشووری شارەوە هاتوونەتە دەرێ و هێرشدەکەنە سەرمان!وتم: بڕۆن، تا ئەتوانن لەسەر ڕێی فیلەکان ئاگر هەڵکەن، فیل لە ئاگر دەترسێ و ناتوانێ بێتە پێشێ.بە(ئەبدال کەلزای)ش بڵێن سەربازە قولاپهاوێژەکانی خۆی بنێرێ بە ڕووی فیلەکانەوە، باشترین بوارهاتۆتە پێشێ بۆ بڕینی شفرەو خەرتوومی فیلەکان، منیش بۆخۆم پاش سەردانی ئوردووگە، دێم بۆ ئەوێ. هەموو ئەفسەرەکانم ئاگادارکردەوە کە ئامادەی هێرشبن بۆ سەر شار، چونکە دەروازەی باشوور کراوەتەوەو ڕەنگە بتوانین لەوێوە بچینە ناو شارەوە. دوای ئەوە بەرەو باشووری شار بەڕێبووم، ئەوەندە ئاگرهەڵکرابوودەتگوت ڕۆژی ڕووناکە... شەڕ لە نێوان سەربازەکان و فیلسوارەکاندا بەردەوامبوو، بەربەستی ئاگریش ڕێی لە فیلەکان گرتبوو، تیرهاوێژەکان فیلەکانیان کردبوونە نیشانەو تیربارانیاندەکردن. هەر لەو کاتەدا بە(قەرەخان)م وت بە فەرماندەکانم بڵێ پێنج سەد سەربازی پێشمەرگەم بۆ هەڵبژێرن، خۆم فەرماندەییاندەکەم و بەرەو ناو شار دەکشێین! وتەی خودای گەورە(انا فتحنا لك فتحاً مبيناً) لەگوێما دەزرنگایەوە، باوەڕم وابوو ئەگەر هەوڵ بدەم ئەو شەوە دەچمە ناوشارەوە. پێنج سەد پێشمەرگەکە بەزرێ و بەرگی ئاسنەوە ئامادەبوون، پێم وتن: خۆم فەرماندەییتاندەکەم، دەمەوێ لەم بوارە ڕەخساوە کەڵك وەربگرم و خۆمان بگەیەنینە دەروازەی شارو دەستی بەسەردا بگرین، ڕێگەی شار بۆ سەربازەکانمان بکەینەوە، ئەگەر سەرنەکەوتین کەسمان بەزیندوویی ناگەڕێتەوە!

بە(قەرەخان)یشم وت، ئەگەر مام، یان کوژرام، لەڕێی دەروازەوە لەشکر بەرەو شار بنێرە، بەرگران لەناو بەرن، بێجگە لەو کەسانەی کە ئاگاداری، بچووکترین سۆزو نەرمی بەرانبەر کەس مەنوێنن، کە شار داگیر کرا ئازادی بدە بەسەربازەکان چی دەکەن با بیکەن!(قەرەخان) لە هەموو شتێ حاڵیبوو، زانی تا خودی خۆم لە جەنگا بەشداری نەکەم ئەنجاممان باش نابێ. دوای ئەوەی کارە پێویستەکانی لەشکرم بەو سپاردن، لەسەر ئەسپەکەم دابەزیم و بەپێ بەڕێبووم، چونکە ئەمزانی ئەسپ لە فیل ئەسڵەمێتەوەو لێی دەترسێ، لەسەرێکی تریشەوە پیادە باشتر بەکووچەو کۆڵانی تەنگەبەری شاردا گوزەر دەکات.

شمشێر بەدەستێکەوە تەوریش بەدەستەکەی ترەوە، پێش سەربازەکانم کەوتم و بەرەو پێشەوە ڕۆیشتین، ڕێگەکەمان پڕ بوو لە کۆسپ و ناڕەحەتی، دەبوو بەناو فیلسوارەکانا، یان بەلایاندا بڕۆیشتینایە تا بگەینە دەروازەی شار. بەڕاست و چەپا شیرو تەورم دەوەشاندن خەرتوومی دوو فیلم بە شیرەکە پەڕاندن و لاربوونەوە، ئەوانەی لەناو کەژاوەکەدا بوون کەوتنە سەر زەوی. کەلە فیلسوارەکان ڕزگارمانبوو نزیکەی بیست گەزمان مابوو بگەینە دەروازەی شار. لەو کاتەدا کۆمەڵێك سەربازی سمێڵزل لە شارەوە بەرەو ڕوومان هاتن و ویستیان ڕێمان پێبگرن، بەدەنگی زۆر بەرز هاوارمکرد. (انا فتحنا لك فتحامبینا)، وە خۆم گەیاندە ناوجەرگەی ئەو سەربازانەوە، ئەوەندە گورج و خێرا شمشێرو تەورم دەوەشاندن سەرم لە هێزو توانای خۆم سڕمابوو، پەیتا پەیتا زرنگەی بەرگە ئاسنینەکەم دەهات، گەلێ شیرو ڕمم تێسرەوێنرا، بەڵام کاریگەری نەبوو. لە ڕادەبەدەر کەوتبوومە جۆش و خرۆش، هاوارمکرد سەربازەکانیشم نەعرەتەیان دەکێشاو بەرەو پێشتر دەڕۆیشتین و سەربازە سمێڵقەوییەکان بەڕاست و چەپداو لەهەموو لایەکەوە دەکەوتن. هەنگاو بەهەنگاو لە دەروازەی شار نزیکدەبووینەوە، لەو کاتەدا هەموو مەراق و هۆشم لای دەروازەی شار بوون، دەترسام پێش ئەوەی دەستمان بیگاتێ هندییەکان پێوەیبدەن و قایمیبکەن، باشبوو پێش ئەوەی دایخەن، ئێمە خۆمان گەیاندە دەروازەکە.

لەناو دەروازەکەدا شەڕێکی ئێجگار ترسناك وسەخت ڕوویدا، توانیمان هەموو سەربازەکانی ئەو خاڵە بکوژین و بچینە ناو شارەوە. هیچ دەرفەتێکم نەبوو پاسەوان دابنێم تاکو دەروازەکەمان لەسەر دانەخرێ، لەسەرێکی کەیشەوە لەوە دڵنیا بووم کە(قەرەخان)ی زاوام بەخۆی و لەشکرەوە بەدوومانەوەیەو ئەو کارە ڕادەپەڕێنێ. چوونی ئێمە بۆ ناوشار وەکو تیرێك وابوو کە بچەقێتە سنگی دوژمن، وەکو هێرشی لافاو بە فەرماندەیی قەرەخان لەشکرمان خۆی کرد بەشاردا. هاواری دانیشتوانی شارو شیوەنی ژنان و زریکەی منداڵان و هەراو هووریای ناسازی سەربازە هندییەکان لەهەموو لایەکەوە بەرز بوونەوە. منیش بەڕاست و چەپا دەستم دەوەشاندو بەرەو پێشتر دەچووم، تا گەیشتمە شوێنێکی چۆڵ، لەپڕ دەسکی تەورەکەم لەدەسما خلیسکاو پەڕی. بەسەرسامی دەستم دایە بەر ڕووناکی، تێگەیشتم لەبەر ئەوە تەورەکە لەدەسماخلیسکاوە هەموو گیانم بە خوێنی خەست داپۆشرابوو، ئەوەندە کوشتارمکردبوو هەموو لەشم خەڵتانی خوێنبووبوو. هەندێ سەربازیش لەدەورروبەرمدا بوون، ئەوانیش وەکو من لە خوێن

هەڵکێشرابوون، وتم: ئەمشەو گەیشتوونەتە باڵاترین پلەی پاکی!، چونکە خۆتان بە خوێن شۆریوە، بۆ پیاوی جەنگاوەر خۆ شۆرین بە خوێن لەهەموو شتێ باشترە.
دەستە دەستە سەربازەکانم گەیشتنە لام، ئەو شوێنە ئارام و بێ دەنگبوو، بەڵام لەدەوروبەردا گەرمەی جەنگبوو. تا ئەو کاتە نەمزانیبوو زامدارم، خوێن لەسەرووی چاوی چەپمەوە دەهاتە خوارێ، هەردوو لاقم لە پێنج لاوە بریندار کرابوون، بەخۆمەوە لەپێنج سەد کەس سەدو سیازدەمان دیار بووین، هەر هەمووشمان بریندار بووین. برینەکەی سەرو چاوم وای لێکردم کە توانای بینینم نەمێنێ و نەمتوانی درێژە بە شەڕکردن بدەم. لەگەڵ حەقدە کەسی تردا کە برینەکەیان کاریگەربوو، کەنارمانگرت و چووین بۆ چارەسەرکردنی زامەکانمان، ئەوانی تر جارێکی تر بەرەو گۆڕەپانی جەنگ کشان. لەبەر ئەوەی هەڵسوڕاندنی کاروباری سوپاو جەنگم بە(قەرەخان) سپاردبوو، لەو بارەیەوە ئاسوودە بووم. من برام بۆ لای پزیشکی خۆمان تەمەزە لەڕێ بووراومەتەوەو هەڵیانگرتبووم و گەیاندبوویانمە جێی خۆم. کاتێ چاومکردەوە بەرگی جەنگم لەبەردا نەبوو، سەرودەست و قاچم پێچرابوون.
ئاسمانی شاری دەهلی ئەرخەوانیبوو، بۆسۆ لەهەموو لایەکەوە هەستابوو، دیار بوو ئاگری گەورە گەورە کەوتبوونەوە.دەمزانی قەرەخان بۆ زیرەپێکردنی دوژمن ئەو ئاگرانە بەرپا دەکات. ویستم هەستمە سەرپێ و بڕۆم بەڵام پزیشکەکەم نەیهێشت، وتی: ئەی ئەمیر، ئەگەر بجووڵێی خوێنت بەردەبێ و ئەوەندەی تر بێ هێز دەبیت و دەمری !.. لەگەڵ ئەوەشدا نەمدەتوانی لەهەواڵی گۆڕەپانی جەنگ بێ ئاگا بم. ئاگادارکرام کە سەربازەکانم هەموو دەروازەکانی شاریان گرتووە. فەرمانمدەرکرد تاکو(مەلو ئیقباڵ و مەحموود خەلج) نەگیرێن نەهێڵن کەس لەشاردا دەرچێ.
شەڕ بەردەوامبوو، لەبەر ئەوەی زۆر لاوازو بێ هێز بوو بووم، شەوانێکی درەنگ خەوم لێکەوتبوو. کە چاومکردەوە ڕۆژبوو بووەوە، ئەوەندە دووکەڵ بەری ئاسمانی گرتبوو خۆر دیار نەبوو. سەیرمکرد برێک قەیماغ لە پاڵما دانراوە، بەنۆکەرەکەی بەردەستمم وت: بەشی برینەدارەکانی تر بدە. وتی: ئەی ئەمیر، تەنیا هەر بەشی تۆ دروستکراوە. وتم: بڕۆ بڵێ بەشی هەر هەموویان ئامادە بکەن و بۆیان بهێنن. لەو کاتەدا قەرەخان هاتەلام و وتی: لەگەڵ کازیوەدا(مەحموود خەلج)دیلکراو هەر ئێستاکەش(مەلو ئیقباڵ)مان گرت!! وتم: بارودۆخی جەنگ چۆنە؟ وتی: هێشتا هەندێ بەرگری هەیە. وتم: با جاڕ بدرێ کە(مەلو ئیقباڵ و

مەحموود خەلج) بەدیلگیراون، ئیتر جەنگ و بەرەنگاری و ڕووبەڕووبونەوە بێ کەڵکن، هەرکەس چەك فڕێ نەدا دەکوژرێ. با سەربازەکانمان بە دەستووری خۆم ئازاد بن، هەرچی دەکەن ڕێیان لێ مەگرن، بەڵام ئاگاتان لە زانایان و پیشەسازان و شاعیران بێ، کەس لاقەیان نەکات.

(قەرەخان) پێنسشیاریکرد بمبەن بۆ کۆشکەکەی(مەلو ئیقبالێ)، وتم: جارێ نا، با بەتەواوی جەنگ کۆتاییبێت. بۆ نیوەڕۆ دوا بەرگریی هندییەکان نەما. خستمیانە سەر قەرەوێڵەیەك و بەناو تەرمی کوژراوان و چڕە دووکەڵدا کەبەری ئاسمانی گرتبوو، بردمیان بۆ کۆشکی سوڵتانی دەهلی. دوای سێ ڕۆژ وردە وردە بەری ئاسمان ڕووناکبووەوە. بۆ بەیانیی ڕۆژی چوارەم، نۆکەرەکەم قاپێك قەیماغی بۆ هێنام، هەر کە داینا یەکسەر ڕشایەوە بەسەریا، وەکو بێ ئاگا هاواریکرد: ئەی ئەمیر، بمبەخشە ئاگام لەخۆم نەبوو! وتم: خەمت نەبێ دڵم تێکەڵ نابێ، قاپەکە لابەو بچۆ قاپێکی تر قەیماغم بۆ بێنە. بەڵام خێراو جارێکی تر ڕشایەوەونەیتوانی هەڵسێتەوە. دەست و پێوەندم بانگ کرد کە بیبەنە دەرەوەو بە پزیشك بڵێن دەرمانی بداتێ.دوای سەعاتێ قەرەخان هاتەژوورێ ، سەرنجمدا زۆر شپرزەیە، لێم، پرسی: چیتە؟! وتی: ئەی ئەمیر، سەربازەکان تووشی ڕشانەوەو سکچوون هاتوون، پزیشك ئەڵێ دەردی ڕشانەوەو چاوەقووڵەیە!! یەکسەر قسەکانی(والیملووك)م وەبیر هاتنەوە کە وتی ئەوانەی چوون بۆ داگیرکردنی دەهلی، بەهۆی نەخۆشیی ڕشانەوەوە بەناچاری گەڕاونەتەوە.

لەو ئەفسەرانەی کە هەواڵیان بۆ دەهێنام پرسیارمکرد : ئایا ئەو دەردە تووشی دانیشتووانی شار و دیلەکان هاتووە؟ ئاگاداریانکردم کە بڕێك لە دانیشتووان و دیلەکان تووشبوون.

پزیشکەکەمان نەیتوانی چارەسەریی نەخۆشەکان بکات. داوام لێکرد کە ڕاوێژ بە هندییەکان بکات،چونکە بیستبووم کە هندییەکان دەڵێن دەرمانی ڕشانەوە تەنیا هەر شیلەی خاشخاشە. بڕێك شارەزا چوون و لەدەوروبەری شاری دەهلی خاشخاشی وشکیان هێنا، دوای کوڵاندنی ئاوەکەی خەستکرایەوەو دەرخواردی نەخۆشەکان درا، بەڵام هیچ کارێکی نەکرد. بۆ ڕۆژی دووەم مردنی سەربازەکان دەستی پێکرد.

ویستم لە شار بچمە دەرەوە بۆ ئوردووگەیەکی نزیك، بەڵام دووبارە پزیشکەکەم نەیهێشت و وتی: ئەگەر بجوڵێیت زامەکانت هەودەکەن و پیسدەبن و ناتوانم چاکتبکەمەوە. ئەفسەرەکانم ئاگادریانکردم کە سەربازەنەخۆشەکان ئەوەندە

سکیانچووەو ڕشاونەتەوە پێستیان بەسەرئێسقانیانا وشکبووەتەوەو چاویان بەقوولا چووەو لێویان وشك و ڕەش هەڵگەڕاوە! قەرەخان وتی: ئەی ئەمیر، ئەگەر لێرە بمێنینەوە دوا سەربازمان دەمرێ، تەنیا چارەسەر هەر ئەوەیە لە دەهلی دەرچین و بڕۆین، ئەگەر ئاوو هەوا بگۆڕین لەوانەیە لەم نەخۆشییە ڕزگاربین.

پێش بڵاوبوونەوەی دەردەکە ، لەشەڕی دەهلیدا بیست و حەوت هەزار کوژراوو بریندارمان هەبوون، بریندارەکان نەیاندەتوانی بڕۆن بەڕێوە، ئەگەر بەجێمبهێشتنایە هەموویان دەکوژران. دەبوو بۆ سەلامەتی بریندارەکانمان و بارمتەو دیلەکان لەگەڵ خۆما ببەم،(مەلو ئیقباڵ و مەحموود خەلج)یش لە ڕیزی دیلەکانا بوون، دەستیشم بەسەر گەنجینەو خەزێنەکانیانا گرتبوو، دەبوو بڕی دووهەزار فیل و ئەسپ و ئێستر بۆ گواستنەوەی ئەو شتە بەنرخانە ئامادە بکرێن. بەشێك لە خەزێنەکەیان زێڕ بوو، بەشێکی تری گەوهەرو ئەڵماس و یاقووتبوو، بڕیارمدا هەموو جەواهیرەکان بۆ خۆم گلبدەمەوە، تاکو دوای خۆیشم بمێنێتەوە بۆ وەچەکانم.

بڕیارمدا هەندێ(بەرهەمەن)یش بە بارمتە لەگەڵ خۆمدا ببەم، یەکێکیان سەرگەورەکەیانبوو کەلەسەر دیوارەکە هەڕەشەو گوڕەشەکانی دەکردن. داوامکرد بیهێننە لام، بەهۆی وەرگێڕەوە لێم پرسی: ناوت چییە؟ وتی: وتی: ناوم(گانیهورتا)یە. وەرگێڕەکە وتی بەزمانی هندی واتە ئاگری پیرۆز. وتم بە خەڵکی شار بڵێ من دەمەوێ لە شار دەرچم، هەندێ بریندارو سەرباز بەجێدێڵم، دەبێ هەموویان بپارێزرێن، هەندێ بارمتە لەگەڵ خۆمدا دەبەم، دوای ڕۆیشتنم ئازار بدرێن هەموو بارمتەکان دەکوژم! (گانیهورتا) پرسی: بارمتەکان بۆ کوێ دەبەی؟! وتم: تا(کەویتە) دەیانبەم، ئەگەر بریندارەکان چاکبوونەوەو گەیشتنەوە لام بارمتەکان ئازاد دەکەم. پرسی: ئەگەر بریندارەکان بمرن، یان چاوەقووڵە بگرن و بمرن، بارمتەکان دەکوژی؟! وتم: نا. وتی: سەرەنجامی(مەلو ئیقباڵ و مەحموود خەلج) چی دەبێ؟! وتم: هەردووکیان بارمتەن و لەگەڵ خۆما دەیانبەم، ئەگەر ئازاری بریندارەکانم بدرێت ئەوانیش دەکوژم، بەڵام ئەگەر زامدارەکانمان سەلامەتبن بەهەندێ مەرج بەریاندەدەم، ئەبێت ئەوەش بڵێم لەبەر ئەوەی بەرەنگارمانبوونەوەو بەرگرییانکرد پێرەوان بکوژرێن، تۆش بە هەمان جۆر پێڕەوای کوشتنی، ئەگەر پیاوێکی ئایینی نەبوویتایە بێ یەکودوو دەمکوشتی!! تۆ بەرامبەریەمن قسەی ناشیرینت کردو توانجت تێگرتم، وتت ئەگەر هێرشبکەمە سەر دەهلی دوای حەوت ساڵ دەمرم!... وتی: ئەی ئەمیر، لەو قسەیەم ترسای؟!

وتم: ئەی پیاو، ئەگەر منت بناسیایە دەتزانی هەرگیز لە مەرگ ناترسم، بە تایبەتی لەگۆڕەپانی جەنگا... پاشان وتی: ئەی ئەمیر، تۆ لە مەیدانی جەنگا نامری... پرسیم: تۆ ئەم هەموو پێشبینییانە لە کوێوە دێنی؟! وتی: ئەی ئەمیر، (بەرهەمەن) نەفسی خۆی دەکوژێ و هەواو هەوەس و ئارەزووی ئاژەڵی وەلا دەنێ، دەتوانێ بەڕوونی سەرەنجام و دواڕۆژ ببینێ! پرسیم: ئایندەی خۆتم پێ بڵێ. وتی: ئەی ئەمیری گەورە، چاو ناتوانێ خۆی ببینێ! وتم: کابرا ئەم نوکتەیەتم پێ خۆشبوو چونکە تازەیە!

لەو کاتەدا گوێم لە دەنگی شیوەن و گریانبوو، پاشان ئاگادار کرام کە شیوەن و زاریی(پاریا) نەو موسڵمانەکانە، داوا دەکەن کە لەگەڵ خۆمانا بیانبەین، چونکە ئەگەر بمێننەوە هەموویان دەکوژرێن! وتم: با هەموویان ڕاگوێزرێن بۆ ناوچە موسڵماننشینەکان و زەویوزارو موڵکیان بەسەردا دابەشکرێن. هەر ئەو ڕۆژە بە کۆتری نامەبەرا نامەیەکم بۆ(عبدوڵلاوالیمولك) نووسی کە پێداویستیی ئەو(پاریا)یانە جێبەجێبکات و نرخی زەویوزارەکەش لەمن بناسێ.

کە کۆترەکە لە شەقەی باڵیدا، قەرەخان هاتە لام و وتی: ئەی ئەمیر، تا زووتر دەرچین باشترە، ئەگەر هندییەکان بزانن لەشکرەکەت وا شەکەتەو بەرەونەمان دەچێ دەزانی چیمان بەسەر دێ! دەبێ هەر ئەمڕۆ بەڕێبین. پرسیم: ئەی نەخۆشەکان چی لێبکەین!؟ وتی: با ئەوانیش لێرە بهێڵینەوە، ئەگەر چاکبوونەوە ئەوانیش دێنەوە لامان... دوای ئەوە جاڕدرا بەشاردا: ئەگەر بە هەر جۆرێ خراپەیەك لەگوڵ برینداراو نەخۆشەکانمانا بکرێت هەموویان دەکوژم.

کاتی نوێژی عەسر لە شاری (دەهلی) دەرچووم و بەڕێی خۆما گەڕامەوە. لەبەر ئەوە هێشتا برینەکانم ساڕێژ نەبووبوون، پزیشکەکەم نەیهێشت سواری ئەسپبم، تەختەیەکیان بۆ چاککردم و هەڵیانگرتم، بارمتەکان و خەزێنەکەو(مەلو ئیقباڵ و مەحموود خەلج)مان پێشی خۆماندان و منیش بەدوایاندا. لەسەر داب و ڕەوشی خۆم دەستەی ئامادە کردنی خۆراك و ئالیکم پێشخست بۆ ئەوەی لەو بارەیەوە ئاسوودە بم. کە گەیشتینە کەلاوەکانی قەڵای جومبە لە ترسی ماری ئەو ناوچەیە لەسەر تەختەکە هەستام و سواری ئەسپبووم. دوای سازدانی ئوردووگە، بەدەورو بەری خۆمانا ئاگرمانکردەوە بۆ ئەوەی لە مار پارێزراو بین. بۆ ڕۆژی دوایی ڕێی قەڵای (لۆنی)مان گرتەبەر و ڕێگەکە مەڵبەندو سەرە ڕێی فیلەکێوییە زیانە ڕۆکانبوو. پێشەنگانی لەشکرەکەم هەواڵیان بۆ هێنام کە قەڵاکە وەکو جاران هێزێکی زۆری تێدایە، یان دەبێ بەلایدا گوزەر بکەین، یان داگیریبکەین.

وتم: ئەی پیاو، ئەگەر منت بناسیایە دەتزانی هەرگیز لە مەرگ ناترسم، بە تایبەتی لەگۆڕەپانی جەنگا... پاشان وتی: ئەی ئەمیر، تۆ لە مەیدانی جەنگا نامری... پرسیم: تۆ ئەم هەموو پێشبینییانە لە کوێوە دێنی؟! وتی: ئەی ئەمیر، (بەرهەمەن) نەفسی خۆی دەکوژێ و هەواو هەوەس و ئارەزووی ئاژەڵی وەلا دەنێ، دەتوانێ بەڕوونی سەرەنجام و دواڕۆژ ببینێ! پرسیم: ئایندەی خۆتم پێ بڵێ. وتی: ئەی ئەمیری گەورە، چاو ناتوانێ خۆی ببینێ! وتم: کابرا ئەم نوکتەیەتم پێ خۆشبوو چونکە تازەیە!

لەو کاتەدا گوێم لە دەنگی شیوەن و گریانبوو، پاشان ئاگادار کرام کە شیوەن و زاریی(پاریا) ئەو موسڵمانەکانە، داوا دەکەن کە لەگەڵ خۆمانا بیانبەین، چونکە ئەگەر بمێننەوە هەموویان دەکوژرێن! وتم: با هەموویان ڕاگوێزرێن بۆ ناوچە موسڵماننشینەکان و زەویوزارو موڵکیان بەسەردا دابەشکرێن. هەر ئەو ڕۆژە بە کۆتری نامەبەرا نامەیەکم بۆ(عبدوڵلاوالیمولک) نووسی کە پێداویستیی ئەو(پاریا)یانە جێبەجێبکات و نرخی زەویوزارەکەش لەمن بناسێ.

کە کۆترەکە لە شەقەی باڵیدا، قەرەخان هاتە لام و وتی: ئەی ئەمیر، تا زووتر دەرچین باشترە، ئەگەر هندییەکان بزانن لەشکرەکەت وا شەکەتەو بەرەونەمان دەچێ دەزانی چیمان بەسەر دێ! دەبێ هەر ئەمرۆ بەڕێبین. پرسیم: ئەی نەخۆشەکان چی لێبکەین!؟ وتی: با ئەوانیش لێرە بهێڵینەوە، ئەگەر چاکبوونەوە ئەوانیش دێنەوە لامان... دوای ئەوە جاڕدرا بەشاردا: ئەگەر بە هەر جۆرێ خراپەیەك لەگوڵ بریندارو نەخۆشەکانمانا بکرێت هەموویان دەکوژم.

کاتی نوێژی عەسر لە شاری (دەهلی) دەرچووم و بەڕێی خۆما گەڕامەوە. لەبەر ئەوە هێشتا برینەکانم ساڕێژ نەبووبوون، پزیشکەکەم نەیهێشت سواری ئەسپبم، تەختەیەکیان بۆ چاککردم و هەڵیانگرتم، بارمتەکان و خەزێنەکەو(مەلو ئیقباڵ و مەحموود خەلج)مان پێشی خۆماندان و منیش بەدوایاندا. لەسەر داب و ڕەوشی خۆم دەستەی ئامادە کردنی خۆراك و ئالیکم پێشخست بۆ ئەوەی لەو بارەیەوە ئاسوودە بم. کە گەیشتینە کەلاوەکانی قەڵای جومبە لە ترسی ماری ئەو ناوچەیە لەسەر تەختەکە هەستام و سواری ئەسپبووم. دوای سازدانی ئوردووگە، بەدەورو بەری خۆمانا ئاگرمانکردەوە بۆ ئەوەی لە مار پارێزراو بین. بۆ ڕۆژی دوایی ڕێی قەڵای (لۆنی)مان گرتەبەر و ڕێگەکە مەڵبەندو سەرە ڕێی فیلەکێوییە زیانە ڕۆکانبوو. پێشەنگانی لەشکرەکەم هەواڵیان بۆ هێنام کە قەڵاکە وەکو جاران هێزێکی زۆری تێدایە، یان دەبێ بەلایدا گوزەر بکەین، یان داگیریبکەین.

کە لە (دەهلی) دەرچووین تا سێ ڕۆژ نەخۆشیی چاوەقووڵە بەردەوامبوو، سەربازەکانمی دەکوشتن، بۆ ڕۆژی چوارەم ژمارەی تووشبووەکان ڕوو لەکەمیبوو. کەلە قەڵای(لۆنی) نزیکبووینەوە شوێنەواری نەخۆشی نەما! بۆم دەرکەوت ناوەندی ڕشانەوەو چاوەقووڵە شاری(دەهلی)یە.

هندییەکان ئاگاداریانکردم کە وەرزی(بارانی وەرزی) نزیکبووەتەوەو ماوەی سی تا چل ڕۆژ بارانی بەخوڕ دەبارێتو هەوای زۆر گەرمی هاوین فێنك کاتەوەو چالاکی دەخاتە بەرجەستە. کاتێ گەیشتینە قەڵای(لۆنی) لەسەر بورجی قەڵاکە سەرو لەشێکی ئاوساوی وەکو هیزەم بینی، زانیم سەرو لەشی کوڕەکەمە. کە ئەو دیمەنەم بینی بەجارێ ئاگرم تێبەر بوو! هەمیشە پێشبینمکردووەو دەیکەم کە کوڕەکانم و خۆیشم لە مەیدانی جەنگا بکوژرێن. بەڵام هەرگیز پێشبینیم نەکردووە کوڕم کەوڵبکرێت و پێستەکەی پڕ بکرێ لە کاو هەڵواسرێت و قەل و داڵ چاوی هەڵکۆڵن و بیخۆن. دەبوایە فەرماندەی قەڵای (لۆنی) ئەوەندە هەستی ببوایە کە شازادەیەکی وەك کوڕەکەم بەڕێزەوە بنێژرێ، نەك بەو جۆرە سوکایەتیی پێبکرێ!

بەر لەوەی دەربارەی کوشتنی(سەعد وەققاص) لێکۆڵینەوە بکەم، داوامکرد کەداری زۆر ببڕن بۆ دروستکردنی پەنا بۆسەربازەکان و تەویلە بۆ ئەسپەکان لەدەوروبەری قەڵای (لۆنی)دا . کە سەربازەکانم خەریکی کارکردنبوون، پیاوێك لەسەر شوورەی قەڵاکەوە بانگیکرد: ئەی ئەمیر، لەم ناوچەیەد مەوەستەو بڕۆ، ئەگینا وەك کوڕەکەت دەکوژرێیت و کەوڵدەکرێیت پێستەکەت پڕ لەکا دەکرێ و لەپاڵ کوڕەکەتا هەڵدەواسرێی!! داوام لە ئەفسەرەکانم کرد کە زووترو خێراتر دەستبەکار بن تاکو بتوانین هێرشبکەینە سەر قەڵاکە، هەروەها ئاگادار بن نەکو لەپڕێکا پەلامار بدرێین، شەوانەش بەدەوروبەری ئوردووگەکەدا ئاگر بکەنەوە بۆ ئەوەی لە هێرشی فیلەکان و مارە سامناکەکان پارێزراو بین. لەو کاتەدا بارانی وەرزی دەستی پێکرد، بەجۆرێ دەباری دەتگوت تۆفانی(نووح) تازە بووەتەوە. چەندە ئێمە لە بارانەکە پەستبووین، فیلە کێوییەکان ئەوەندەیان پێخۆشبوو جاروبار کە باران دەوەستایەوەو خۆشیدەکردەوە پەلکە زێڕینەی ڕەنگین دەردەکەوت. شەوانە قازو قولنگ بە ئاسمانا دەفڕین و تا بەیانی گوێمان لە دەنگیانبوو. باش بوو پەنامان بۆ خۆمان و ئەسپەکانمان دروستکردبوو، بەڵام نەماندەتوانی بەو بارانە زۆر بە خوڕە بجەنگین، بەڵام دڵنیا بووم بە کەمارۆدان قەڵا نییە خۆی نەدا بەدەستەوە، لەگەڵ ئەوەشدا من زۆر پەلەمجوو، دەمویست لە ڕێی وڵاتی ڕۆمەوە ـ تورکیا ـ بگەڕێمەوە. لە سەرێکی کەشەوە مەترسیی ئەوەم لەدڵا

بوو کە پادشاو سوڵتانەکانی هندستان یەکبگرن، لەشکرێکی گەورە پێکەوە بنێن و بێنە سەرمان. دەبوو هەرچۆنێ بوایە زووتر قەڵای(لۆنی) بگرین. دارتاشەکانم لە پەناگەکاندا رۆژانە خەریکی دروستکردنی (مەنجەنیق)بوون. بە هەزارەها تووتی بەسەرمانا دەفرین و دەیانقیژاند کەس نەیدەزانی لەکوێوە دێن و بۆ کوێ دەچن؟! کە باران دەوەستایەوە، بەدەیان هەزار مەیموون لەم لقەوە بازیاندەدا بەسەر ئەو لق و لێمان نزیکدەبوونەوە بۆ ئەوەی خۆراکمان پێ نەهێڵن؟، ئێمەش دەماندانە بە تیرباران و دوور دەکەوتنەوە.

لەو ناوچەیەدا کە ئێمەی لێبووین بۆ ماوەی(٣٠)سی شەوو رۆژ لەسەر یەك تۆق بەخوڕ سەریدەکردو لافاو بەردەوامبوو. بۆ ئەوەی لە لافاوی گردەکەی قەڵاکەی لەسەر دروستکرابوو بێ خەمبین(شێر بەهرام مرووزی) بەربەستێکی زۆر چاکی دروستکرد، لافاوەکە بەرەو ناوەڕاستی جەنگەڵەکە دەکشاو دەریاچەیەکی دروستکرد بۆ مەلەکردن و خۆشۆردنی فیلەکان.

بۆ ئەوەی سەربازەکانم سست و تەمەڵ نەبن، رۆژانە خەریکی مەشق و شمشێربازی و زۆرانبازیبوون، سواری ئەسپەکانیش دەبوون و غاریان پێدەکرن بۆ ئەوەی ئەوانیش تەمەڵ و جەمام نەبن... لە دوای بەسەر چوونی سی شەوو رۆژ، هەور بەری ئاسمانی بەردا، شەوێ ئەستێرەکان دەدرەوشانەوە، دەنگی قازو قوڵنگ نەدەهات، ئەو هندییانەی لەگەڵمانا بوون مژدەیان دامێ کە بارانی وەرزی کۆتاییهات!.

لەو ماوەیەدا کەبێ پشوو باران دەباری، هیچ هەواڵێکی(دەهلی)م نەدەزانی، کۆتری نامەبەریش نەیدەتوانی بفڕێ و نامەم بۆ بێنێ تا بزانم سەرەنجامی سەربازە بریندارەکان و نەخۆشەکان چییە؟! شەو ورۆژ(مەلو ئیقبال و مەحموود خەلج) پاسەوانیان بە دیارەوە بوو. (کارتار)ی قەڵای(لۆنی) دەیزانی هەردووکیان لە لای من دیلن. (مەلو ئیقبال) لەیەکەم رۆژدا نامەی بۆ نارد کە خۆی بدات بەدەستەوە، بەڵام ئەو گوێی نەدایەو وتی: بەرگریدەکەم و دەجەنگێم! ...... دوای وەستانی باران هەموو فەرماندەکانم کۆکردنەوەو بەدرێژی و بە تەواوەتی نەخشەی گرتنی قەڵاکەم بۆ ڕوونکردنەوەو وتم هەر هەمان پلانی داگیر کردنی(دەهلی)رەچاودەکەین. دوو، سێ چاڵی باش لەبن دیوارەکەدا هەڵدەکەنین و بە باروت دەیتەقێنینەوە. لەهەمان کاتا بە مەنجەنیق پاسەوانەکانی سەر دیوارەکان بەردەباراندەکەین بۆ ئەوەی ئاوی گەرم و قورقوشمی تواوەو ڕۆنی

هەڵقرچێنراو نەکەن بەسەرمانا. مەنجەنیقەکان کارێکیان بە دوژمن کرد کە نەیاندەتوانی بە هیچ جۆرێ سەر دەربێنن، هەر لەو کاتەداکە دەستەی چاڵهەڵکەنەکان خەریکی کاری خۆیانبوون، بڕێك سەرباز سەرکەوتنە سەر دیواری قەڵاکەتاکو بەرگرانی قەڵاسەریان لێ بشێوێو نەتوانن لەیەك خاڵدا هێزی خۆیان کۆبکەنەوە.

چاڵهەڵکەنەکانمان حاڵیان شڕبوو، چونکە لە لایەکەوە دوژمن شتی بەسەردا دەڕژاندن، لە لایەکی تریشەوە هەندێ جار بەردی مەنجەنیقەکانمان بەر دیواری قەڵادەکەوتن و دەکەوت بەسەریانداو دەیپلیشاندنەوە، لەگەڵ ئەوەشا چارمان نەبوو، دەبوایە هەرچۆنێ بووە چاڵەکان ئامادە بکرێن و بارووتیان تیا بتەقێنرێتەوەو دوای داڕووخاندنی شوورەی قەڵا بچینە ژوورێ.

من ئەوەندە بە درێژی باسی جەنگی قەڵای(لۆنی) ناکەم و بە کورتی دەیگێڕمەوە. بۆ سێیەمین ڕۆژ توانیمان لە دوو لاوە شوورەی قەڵاکە داڕمێنین. بەبەرگی جەنگەوە ئامادەی جەنگبووم، هەرچەندە فەرماندەکانم زۆر تکایان لێکردم و هەوڵیاندا بەشداری نەکەم، قایل نەبووم و وتم: خۆم هەقی کوڕەکەم نەسێنم، ئەی کێ بیسێنێ؟! لە کەلەبەری ڕۆژهەڵاتی شوورەکەوە لەگەڵ دەستەیەك لە پاسەوانە تایبەتییەکانما چوومە ناوقەڵاوە لەگەڵ یەکەمین هەنگاودا لەهەموو لایەکەوە تیربارانکراین، بێ ئەوەی گوێی بدەینێ بەرەو پێشەوە چووین، یەکەمین دەستەی بەرگری ڕێیان پێگرتین، پیاوێك هاواریدەکرد(تەیموور)، پاشان چەند شتێکی وت، بێجگە لە ناوی خۆم لە هیچ نەگەیشتم، بەڵام دەمزانی جنێوم پێدەدات! .

دەستێکم شیرو ئەوی تر تەور، بەهەردوو دەست بە هەموو لایەکا دەستم دەوەشاندو سەربازەکانیشم قارەمانانە دەجەنگان. زوو بۆم دەرکەوت کە دوژمن زۆر بەهێزە ئەفسەرێکم بەرەو دواوە نارد بۆ لای قەرەخان بۆ ئەوەی تا ئەتوانێ هێزمان فریابخات، دوای سەعاتێ چەندان هەزار سەرباز خۆیانکرد بەناو قەڵاکەدا و ئێمەش هەنگاو بەهەنگاو بەرەو پێشتر ئەچووین تاکو زووتر بگەینە ناوەندی قەڵاکە، بۆ ئەوەی خۆم بگەیەنمە(کارتار) . پێش ئەوەی بگەینە ئەوێ، تاقمێکی تر جەنگاوەرانی دوژمن پێشیان لێگرتین، دیسان پیاوێ هاواریکرد،(تەیموور)، بە هندیش چەند قسەیەکیکرد. پیاوێکی بە هەیکەل و سمێڵدرێژو قەویبوو. منیش هاوارمکرد تەیموور منم! ئەویش دەستی بەسنگیا

داو وتی: (کارتان)!! زانیم(کوتوال)ی قەڵایەو شاڵاوم بۆ برد. بە هەموو هێزێکییەوە شمشێرێکی بۆم داوەشاندەوە لەهەمان کاتدا منیش تەورێکم بۆ داهێنایەوە بەر دەستیکەوت و شمشێرەکە لە دەستی پەڕی و دەستی ڕاستی لەکار کەوت، خێرا شمشێرێکم بۆ سەرو چاوی داهێنایەوەو خوێن فیچقەیکرد، (کارتان)دانەویەوەو کە شێر هەڵگرێت و پەلامارمبدات، دەستی تەورەکەم لەکاردا بوو، تەورێکم لەگازەرەی پشتی داو خێمکردو بە زەحمەتێکی زۆر تەورەکەم دەرهێنایەوە. قاچێکیم گرت و بەناو جەنگاوەرەکاندا ڕامکێشا، سەربازەکانم ئەو دیمەنەیان زۆر پێ سەیر بوو چونکە شتی وایان لە من نەدیبوو. دڕم بە سەربازەکانمدا، تا (کارتان)م لە گۆڕەپانی شەڕ دوورخستەوە، ئنجا داوای وەرگێڕم کرد. وتم بە (کارتان) بڵێ لە تۆڵەی کوڕەکەما سەریدەبڕم و پێستەکەی دەگرووم و پڕیدەکەم لەکا. چاوەکانی کارتار داپچڕابوون و سەیریدەکردم، نەیدەتوانی قسە بکات و لێوەکانی بجووڵێنێ. من ویستم بەر لە مەرگی بزانێ کە بە دەستی من دەکوژرێ، پاشان بەیەك شمشێر سەریم پەڕاندو دەمم نایە شا دەماری گەرووی، دوو قوم خوێنیم خواردەوەو تینوێتیی تۆڵەی(سەعد وەققاص)م شکا، پاشان کەوڵکراو پێستەکەی پڕ کرا لە کا .

دوای تەواو بوونی جەنگ تەنیا دوو سەدو شەش سەربازی دوژمن مابوون، ئەوانی تر هەموویان بەدەستی ئێمە کوژران لە کەللە سەرەکانیان هەرەمێکمان دروستکردو سەرو پێستی بە کا ئاخنراوی(کارتان) کرا بە لوتکەی هەرەمەکەدا. سەرو پێستی کوڕەکەمم لەو نزیکانەدا بە خاك سپارد و ئەندازیارەکانم ئارامگەیەکیان بۆ دروستکرد.

دانیشتووانی ئەو ناوە کۆکرانەوەو بەبێگاری قەڵاکەم پێ ڕووخاندن. تاڵانی و دەستکەوتەکانی(دەهلی)م لە ڕێی(قەندەهار) و(کابول)ەوە ناردنەوە بۆ شاری(کەش). (پاریا)نەو موسڵمانەکانیشم لە ناوچە موسڵمانەکاندا نیشتەجێم کردن و زەویوزاری باشم بۆ کڕین...،(عبدوڵڵا والیلموك)م ڕاسپارد کە ئاگای لێیان بێ و بیانپارێزێت و زانای باشیان بۆ تەرخانبکات بۆ ئەوەی فێری داب و دەستووری ئیسلامیان بکا.(ئەبدال کەلزائی) و سەربازەکانی لە جەنگەکانی هندستاندا ئازایەتی و قارەمانێتی چاکیان نواند، دەستکەوتی باشیان بەدەستهێنا، هەموویم بە خۆیان بەخشی و هیچم لێ گل نەدانەوە.

# بیست و پێنجەمین بەش

## جەنگ لە وڵاتی شامدا و داگیرکردنی شارەکانی

دوای گەڕانەوەم لە هندستان، یەکەم ڕۆژی بەهار گەیشتمە شاری(کابول) بەبێ وەستان لەوێشەوە بەڕێبووم بۆ وڵاتی خۆم. لە هەژدەیەمین ڕۆژی وەرزی بەهاردا گەیشتمەوە(کەش)، ئەو شارەی کە خۆم دروستمکرد، هەروەکو بەهەشت هاتە بەرچاوم!... هەموو لایەك سەوزی دەنواندو داروردەختەکانی هەردووبەری شەقامەکان گەورە بووبوون. دەمویست یارمەتیی هەژارانی شاربدەم، بەڵام کەسم نەدی هەژارو نەداربێ. ویستم ئەو بەهارە لەناو گوڵ و گوڵزاری شارەکەمدا بە خۆشی و حەسانەوە بەرمە سەر، لە پڕێکا کەوتمە سەرزەنشتکردنی خۆم و وتم: لە بیرت بێ کە(بەرهەمەن)ە هندییەکە ئاگاداریکردیتەوە کە حەوت ساڵت لە دنیادا ماوە! تۆ لە گەرمەی تەمەنتا لە هەموو خۆشی ورابواردنێکەوە دوور بوویت، بەم دواییەی تەمەنت دەتەوێ بە خۆشی ڕابوێری !پیاوێکی وەکو تۆ نابێ لەناو جێدا بمریت دەبێ لە گۆڕەپانی جەنگا بکوژرێیت!هەستەو بەرەو وڵاتی(ڕۆم) بکەوە ڕێ کە کەوتۆتە ڕۆژئاواو بیخەرە سەر وڵاتانی ڕۆژهەڵات، تاکو بە سوڵتانی(ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا) ناو ببرێیت. هەستە برۆ بۆ(سەمەرقەند)، دوو بەردی بنچینە دابنێ، یەکێکیان بۆ مزگەوتی خوا پەرستی، دووەمیان بۆ ئارامگەی خۆت! تۆ لە مردن باکت نییەو دەبێ بە دەستی خۆت ئارامگە بۆ خۆت دروستبکەی، مرۆڤی بێ ئارەزوو و بێ دەسەڵات لە مردن دەترسێ، تەنیا هەر خودای مەزن نەمرە.

لەگەڵ تەواو بوونی یەکەمین مانگی بەهاردا گەیشتمە سەمەرقەند. یەکەمین ئیشم دانانی بەردی بناغەی مزگەوتەکەو ئارامگەی خۆم بوو. داوام لە ئەندازیارەکان کرد کە گەورەترین و قایمترین مزگەوت دروستبکەن کە تا دوو هەزار ساڵ پتر بمێنێ. ئەندازیاری سەرپەرشتیار ئاگاداریکردم کە ئارامگەکە بە دوو ساڵ تەواو دەکرێ، مزگەوتەکەش بە چوارساڵ. منیش بوودجەی تایبەتی و تەواوم بۆ هەردوو پڕۆژەکە تەرخانکردو ڕوومکردە بیابان بۆ مەڵبەندی تایبەتی خۆم.

زەویوزاری کشتوکاڵیم بەسەر سەربازە دێرینەکانمدا دابەشکردو بە خەڵات و مووچەی باشەوە خانەنشینمکردن، لەجێی ئەوان لاوە خوێنگەرم و

بەدەستوبردنەکانم کردە سەربازی نوێ. بەر لە بەڕێبوونم لەگەڵ سوپای لاواندا(شاهروخ)ی کوڕم کردە جێنشینی خۆم و پێم وت کە لە شاری(کش) دابنیشێ، زستانانیش بچێتەوە (سەمەرقەند) بۆ ئەوەی هەردوو شارەکە ئاوەدانبن. بیرمخستەوە کە سەر زەمینێکی بەرین، لە (دەهلی)یەوە تاکو (بەغداد) قەڵەمڕەوی منەو بە هۆی بنکە زۆرەکانی کۆتری نامەبەرەوە دەتوانێ بە زووترین کات لە هەواڵی ئەم پەڕو ئەوپەڕی وڵات ئاگادار بێ. هەروەها ئاگادارمکردەوە کە هەرگیز خوو نەداتە خواردن و خواردنەوەو ڕابواردن و تەمەڵی، چونکە بەڵایەکی زۆر گەورەن. داوام لێکرد کە بەردەوام مەشقی سەربازی بکات بۆ ئەوەی بتوانێ تا سەر بەسەرکەوتوویی فەرمانڕەوایی بکات ... پاشان پێم وت: (مەلو ئیقباڵ و مەحموودخەلج) دەدەمە دەست تۆ، لەگەڵیانا چاکبە، چاك خزمەتیان بکە، تەنانەت ئەگەر حەزیان لە خواردنەوەو ژنی جوانیشبوو، بێ دڵییان مەکە چونکە لەکاری چاك و بەکەڵك دوور دەکەونەوە؛ من نیازم نییە ئەم دوو کەسە بکوژم، چونکە لەوانەیە بۆ دوارۆژ کەڵکیان لێوەرگرم. لێرەوە بۆ هندستان ماوەیەکی زۆر دوورو درێژە ناتوانن ئاژاوەو پیلان بەرپا بکەن، بەڵام دوور نییە ڕابکەن لەبەر ئەوە چاك چاودێریانبکەو ئاگاداریانبە.

لە یەکەمین ڕۆژی سێیەمین مانگی بەهاردا بە سەد هەزار سەربازەوە بەڕێبووم. هەر سەربازێکی نوێم سپاردە سەربازێکی پێشترو خاوەن ئەزموون بۆ ئەوەی چاك فێری مەشقی بکات و ئامادەی شەڕ بێ... ڕێی خوراسانم هەڵبژارد چونکە چاك شارەزای ئەو ڕێیە بووم. بە شاری(طووس)دا گوزەرمکردو ڕێگەی شاری(ڕەی)م گرتە بەر. بە هەر شارو شارۆچکەو گوندێکا دەڕۆیشتم بە گەرمی پێشوازیدەکرام و دیاریی بەنرخیان بۆدەهێنام، هەندێ لە میرەکان کوڕە لاوەکانی خۆیانیان دەخستنە ڕیزی سوپاکەمەوە بۆ ئەوەی لە گۆڕەپانی جەنگدا بەهرەداربن و دوای چەندین شەڕو نەبەرد وەك پۆڵای ئاودراویان لێ بێت و پیاوانە پشت بە خۆیان ببەستن.

کە گەیشتمە شاری(ڕەی) چوومە سەر ئارامگەی زانای ناودار(موحەممەدی کوری بابوویە قومی)و سوورەتێ قورئانم لەسەر خوێند. ئەوانەی لە دەوروبەرمدا بوون پێیان سەیر بوو، وتم: ئەی ئێوە نازانن کە هەمیشە ڕێز لە زانایانی زیندوو ومردوو دەگرم! من دوو کتێبی ئەم زانایەم خوێندووەتەوە، هەرچەندە شیعەیەو هەندێ شتی نووسیوە لای من پەسەند نین، لەگەڵ

ئەوەشدا پلەو پایەی ئەم زانایە هەر بالایە!... دوای ئەوەی سێ ڕۆژ لە شاری(ڕەی) مامەوە، لەڕێی کرماشانەوە بەرەو بەغداد بەڕێبووم.

بۆ ئەوەی لە ترسی خێڵ و عێلەکانی کرماشان بێ خەمبم و بەدەردی جاری پێشوو نەچین، لەپێشەوە دەستمگرت بە سەر دەربەندی(پاتاق)دا، دوای ئەوە بێ ترس و لەرز لەوێوە تێپەڕ بووین.

بەغداد هەر وەکو یەکەمین جار بینیبووم زۆر فراوان و دڵگیر بوو، بەڵام نەمتوانی ئەوەندە تیادا بمێنمەوە. لەوێ هەندێ لە شارەزایانم کۆکردەوە تاکو لە هەموو ڕوویەکەوە زانیارییان دەربارەی وڵاتی شام لێوەر بگرم. بەدرێژی و بە تەواوی لەڕووی زەوی و ڕووبارو دانیشتووان و شارو دێهاتەکانیەوە زانیاریم وەرگرت، گرنگترینییان ئەو زانیارییانەبوون دەربارەی زنجیرە چیاکانی(دروون) و خێڵ و عێلەکانی(دروون) ئاگادارکرام کە ئەوان زۆر جەنگاوەرن، لەکاتی جەنگا زەوی و کشتوکاڵیان بەجێدەهێڵن و بەمەڕو ماڵاتەوە ڕوو دەکەنە کێوە سەختەکانیان، بە گۆشت و شیرو خوریی مەڕەکانیان هەڵدەکەن!!.

پێم وترا ئەگەر پەنجا ساڵ دژیان بجەنگێم و گەمارۆیان بدەم دەرەقەتیان نایەم! باشترین ڕێگە کە بۆم دەسنیشانکرا ڕێگەی باکووری وڵاتی شامبوو، کە بە کێوەکانی(ئەنصار ییون)دا دەڕواو پڕە لە چەم و کانیاوی زۆرو زۆریش سەلامەتە.

لەگەڵ چەند شارەزایەکی ناوچەکانی وڵاتی شامدا بەڕێبووین. لەسەرەتای وەرزی هاویندا گەیشتینە کوێستانی(ئەنصارییون)، ئەوەندەش گەرم نەبوو کە پەرێشانبین.

ڕۆژێکیان گەیشتینە شوێنێك کۆمەڵێ ژن و پیاودەرکەوتن، پیاوەکان دەماخیانکردبوو، تەنیا هەر چاویان بەدەرەوە بوو، هەموو بالابەرزو ناوقەد باریکبوون، ژنەکانیش وەك پیاوەکان بالا بەرز بوون، بەڵام قەڵەو تر بوون و دەماخیشیان نەپۆشیبوو. شارەزاکان بۆیان باسکردم کە ئەوانە(ئیسماعیلین). شەوێ لەو ناوچەیەدا هەڵمانداو داوامکرد کە چەند پیاوێکی ئیسماعیلیم بۆ بانگبکەن. لە پێشەوە وام زانی کە عەرەبن دوای پرسیارو وەڵام، زۆرم پێ سەیر بوو کە بە فارسی دەدوان. وتیان: ڕەچەڵەکمان ئێرانییەو لە ساڵی (٦٥٦)ی کۆچییەوە، باووباپیرانمان لە ئێرانەوە هاتوونەتە شام و جێگیر بوون. وتم ئێوە چاك ئەو ساڵی کۆچکردنەتان لەبەرە!! هەموویان بەبێ دەنگ سەریانلەقاند.وتم: چی دەزانن بە بێ ترس بیڵێن، من چێژ لەهەموو زانیارییەك وەردەگرم!

یەکێکیان وتی: ئەی ئەمیر، ئەو ساڵە لە یادی هەموو(ئیسماعیلی)یەکدا چەسپەو لەیاد ناچێ چونکە لەو ساڵەدا هەموو قەڵاکانی (ئیسماعیلییەکان)لەهەموو ناوچەیەکی ئێرانداو بە تایبەتی لە(ئەلمەوت)، بەدەستی(هۆلاکۆخان)ی مەغۆل وێرانکران. ئەو ساڵە ساڵی غەزای ماتەمینیی ڕێبازی ئیسماعیلییەکانە!...

پرسیم بۆچی ڕووی خۆتانتان داپۆشیوە!؟ وتیان: دوای وێرانکردنی قەڵاکانمان(هۆلاکۆخان) فەرمانی قڕکردنمانی دەرکردو هەر کەس بەردەست بکەوتایە دەکوژرا چونکە بە خێر دەزانراو پاداشتیش وەردەگیرا. لەو سەردەمانەدا لە ئێرانا کۆمەڵێ دەروێش هەڵکەوتبوون پێیان دەوترا(دەروێشانی ڕووپۆش). باوو باپیرانیشمان، بۆ ئەوەی نەناسرێنەوە دەماخیانکردووەو بە شێوەی(دەروێشانی ڕووپۆش) خۆیان نواندووە. پاشان لە ئێرانەوە کۆچیانکردووەو هاتوونەتە وڵاتی(نێوان دوو ڕووبار)، چونکە ئەوێش کەوتۆتە ژێر دەسەڵاتی هۆلاکۆ خانەوە، لەوێشەوە باریانکردووەو لەم ناوچەیەدا گیرساونەتەوە، ئەم دەماخ و ڕووپۆشەش لە باووباپیرانمانەوە بۆمان ماوەتەوەو بۆوە بە داب و ڕەوشی ئێمەش!... وتم: هەر لە ئەمڕۆوە ئێوە بێ ترس و لەرزن، نابێ دەماخبکەن، دەست لەم داب و نەریتەتان هەڵگرن!

بۆ ئێوارەی ڕۆژی دواتر گەیشتینە قەراخ ڕووبارێکی بچووك. لەوێ چەند پیاوێکی سمێڵدرێژو قەوی و ڕم بەدەستم بینین، لێمان وورد دەبوونەوە! شارەزاکان تێیانگەیاندم ئەوانە(عەلەوی)ن. دوای نوێژی شێوان چەند پیاوێکی(عەلەوی)یان بۆ هێنام، بە عەرەبی دەدوان، منیش چاك شارەزای زمانی عەرەبیم، پرسیم: بۆچی پێتان ئەڵێن(عەلەوی)؟! وتیان: باووباپیرانمان لە بنەماڵەی(بەنی هاشم) بوون، لەبەر ئەوەی هەندێ لە خەلیفە(ئەمەوییەکان) ئازاریانداون و تەنگیان پێهەڵچنیون، پەنایان هێناوەتە ئەم کێوانەو لێرە ماونەتەوە. وتم: منیش پیاوێکی موسڵمانم و ڕێزی بەنی هاشم و بنەماڵەی پێغەمبەری ئیسلام(د.خ) لەسەر سەرم و هەرچی داواییەکتان هەیە بەسەر چاو. وتیان: ئێمە هیچ داواکارییەکمان نییە، بە هاتنت شادمانین، چونکە هیچ ئازارمان نادەیت ولەگەڵمانا بەسۆزی. وتم: مەگەر کەسێك بیەوێ دوژمنایەتیم لەگەڵدا بکات ئازاریدەدەم...

دوای ئەوە چەند ڕۆژێ بە ناوچەی عەلەوییەکاندا گوزەرمانکرد. ڕۆژێکیان هەستم بە ئازارێکی زۆر کرد لە پەنجەگەورەی پێی ڕاستمدا، وام زانی خەتای

پێڵاوەکانمە، بۆیە پێڵاوێکی فراوانترم کردە پێم. بۆ شەوێ ئازاری پەنجەم زۆری بۆهێنام، بۆ بەیانییەکەی پێش ئەوەی سوار بم . پێڵاوێکی سووکترو فەرەحترم کردە پێم، بەلام ئێشی قاچم هەر بەردەوامبوو. دەمەو ئێوارە گەیشتینە شوێنێکی بەرین و خۆش، لەوێ ئوردووگەمان هەڵدا. پاش نوێژی شەوێ داوای پزیشکی سوپام کردکە ناوی(نەبوومووسابوخاری)بوو. دوای سەیرکردنی شوێنی ئازارەکەم سەری هەڵبڕی، وتی: ئەی ئەمیر، ئێسقانی پەنجەت سەلامەتە، ئێشی جومگەکەیە وا سەختڵەتیکردووی. وتم: کەوا بوو پیر بووم!؟ پزیشکەکەم بۆ دڵدانەوەم وتی: ئەی ئەمیر، لەسەردەمی لاویشدا نەخۆشی جومگە هەر هەیە، خەمیشت نەبێ چارەسەری ئاسانە!... وتم: چییە؟! وتی: بە ئاوی(بی) چاکدەبی، چەند جارێ بیخۆرەوە ئێشەکەت نامێنێ، بەلام پاش چەند مانگێ لە پێی چەپتاو لەهەمان شوێنا هەست بە هەمان ئازار دەکەیتەوە، ئەمە پێی دەڵێن نەخۆشیی(نەقرەس)و بەیناو بەین سەر هەڵدەدا.

تاکو ئێستاش ئەم نەخۆشییە بەیناو بەین تووشمدەبێت و لە پێمدەخات، چارەسەریشم هەرئاوی(بی)یە، کە چاکدەبم وا دەزانم هەرگیز ئەم نەخۆشییەم تووش نەهاتووە.

دوای ئەوە بە ناوچەکانی عەلەوییەکاندا تێپەڕ بووین، بەرەو شاری گەورەی(حەڵەب) کەوتینە ڕێ. دەربارەی زۆریی دانیشتووانی، دەوترا ملیونێ دەبن، پیشەسازیی ئاسن، کە بە ئاسنی حەڵەبی ناودار بوو، ئاوریشمی زۆر باش و جوان و دانسقەو نایابی، ژنانی زۆر جوانی، کە ئاگادار کرام سوپاکەم نزیك شار نەخەمەوە نەبادا سەربازەکانم بۆیان شێت و دێوانە بن، ئەمەش ژنانی گەیلان ـــ ی وەبیر هێنامەوە، هەروەها دەربارەی سوڵتانی حەڵەب(طوغرول بوولاك) کە دەوترا بۆ خۆی دێوێکەو ئەوەندە بالا بەرزو بە هەیکەلە من وەکو منالێ لە زەوی بەرز دەکاتەوە، بەڵێ دەربارەی ئەمانەو شتی تر گەلێ شتم دەبیست.

ڕۆژێکیان گەیشتینە سەر بەرزاییەك، لەدوورەوە تارمایی شاری حەڵەب دیاربوو، کە نزیکتر بوومەوە شوورەی شارباش دیار بوو، سەرنجمدا هیچ هێزێکی بەرگری دیار نییە، شوورەی شاریش زۆر بەرزو قاییم نەبوو. بەڕاستی چاوەڕوان بووم سوڵتانی حەڵەب کە دەوترا بەیەك دەست وەکو منالێ من بەرز دەکاتەوە، ڕێم پێبگرێت و نەیەڵێ بەرەو پێشێ بڕۆم. کە گەیشتمە قەراخ شار، دیم هەموو دەروازەکان قاییمکراون و لەسەر شوورەی شار کۆمەڵێ پاسەوانانم

بینی. بۆم دەرکەوت کە(طوغرول بوولاك) پیاوێکی ترسنۆکەو خۆی خزاندۆتە ناو شارەوەو لە مەرگی خۆی دەترسێ و بەسەریا سەردەکەوم... وەرز پاییز بوو، هەوا خۆشبوو، گەمارۆی شارمانداو لای باکوورەوە ئوردووگەمان هەڵدا.

یەکەمین ڕۆژ کەگەیشتمە قەراخ شاری حەلەب، دوای نوێژی ئێوارە فەرماندەکانم کۆکردەوەو پێم وتن: ئەمڕۆ بە هەرچواردەوری شوورەی شاردا گەڕاوم، شوورەکە لە خشت و قوڕ دروستکراوەو گرتنی بۆ ئێوە زۆر ئاسانە، ئێوە بەسەر شورەی(دەهلی)دا سەرکەوتن و تەقانتانەوە، کە مەزنترین و قاییمترین شوورەی سەر زەمینە، دڵنیام هەر بە پەیژەی دارو پەیژەی گوریسی قولاپدار دەتوانن بە ئاسانی سەرکەون و دەروازەکانی شار بکەنەوە، باکاری باڕووتیش بۆ هەڵتەکاندنی شوورەکە لەو لاوە بوەستێ کەبە تەواوەتی ئیشەکەمان ئاسانەکات... بە پیاوەکانتان ڕابگەیەنن دوای چوونە ناو شار ئازادن، چییان دەوێ دەستی بەسەردا بگرن و بۆخۆیان. لە سبەینێوە دارتاشەکان خەریکی دروستکردنی پەیژەو شارەزایانی دیکەش سەرقاڵی دروستکردنی پەیژەی گوریس دەبن. دوای بڵاوکردنەوەی فەرمانەکانم، لەو نانەی کە سەربازەکان دەیانخوارد نانیان بۆ هێنام، ئەوە داب و ڕەوشمە، لەکاتی جەنگدا چێشتکەری تایبەتیم نییەو هەموو سەربازەکانیش لەوە ئاگادارن. دوای ئەوەی کەمێك خواردنم خوارد نووستم.نیوەشەو لە چادرەکەم هاتمە دەرێ و بەناو ئوردووگەکەدا گەڕام، دوایی چوومە سەر گردێك کە ناو شاری لێوە دیار بوو، بێجگە لە چرای منارەکان هیچ ڕووناکییەك دیار نەبوو، بێجگە لە دەنگی کوندە بەبوویەکیش هیچ دەنگێ بەر گوێ نەدەکەوت. خەڵك دەنگی کوندە بەبوو بە خراپ و نەگبەتی دەزانن، بەڵام من وای نازانم، چونکە هەندێ باڵندە بە تیشکی خۆر سەخڵەتدەبن و چاویان نابینێ، لەبەر ئەوە بە شەو دێنە دەرێو دەخوێنن .

لەهەمان کاتیشا پژمین بە پێشبینیی خراپ وەرناگرم، کە گوێم لە پژمین دەبێ هەموو مێژووی دێرینم دێتەوە یادو دەمخاتە بیری دروستکردن و بینینی داهاتوو، چونکە داهاتوو لەسەر بنچینەی ڕابووردوو بەرز دەبێتەوەو سەرهەڵدەدات. خەڵك دەزانن ئەسکەندەرو جەنگیز کێن و چییان کردووە، بۆیە ناویان بە مەزنی دەبەن و یاد دەکرێن، لە دڵی خۆمدا وتم دەبێ دوای هەزار ساڵی تر خەڵکی بە مەزنی یادت بکەنەوە!... لە گردەکە هاتمە خوارێ، هەستمکرد هێزو توانای تەواوم هەیە بۆ داگیر کردنی جیهان. بە خۆمم وت:

دەبێ تا دوا ڕۆژو دوا هەناسەت لە گۆرەپانی نەبەردو جەنگدا بیت بۆ ئەوەی ناوت هەر بمێنێ و وەکو خەڵك ناوت ون نەبێ...

لە بەرەبەیانی سێیەمین ڕۆژدا پەلاماری شوورەی شارماندا. لەهەموو لایەکەوە سەربازەکان بە پەیژەی دارو گوریس سەرکەوتنە سەر شوورەی شار، لەهەمان کاتا بۆ بەرگرییان بە تیرو کەوان و قۆچەقانی تیرباران و بەرد بارانی دوژمنمان دەکرد. دوای سەعاتێ توانیمان حەوت بنکەی دوژمن لەسەر شوورەکە داگیر بکەین و خۆمان تیایا جێگیر بین. پەیتا پەیتاش هێزی پشتیوانم دەنارده سەر شوورەکە بۆ قاییمکردنی ئەو خاڵانەی بەدەستمانەوە بوون. هەر کە زانیم سەربازەکانم بەو دیوا چوونە خوارێ، دڵنیا بووم بە ئاسانی دەتوانین بچینە ناو شارەوە.

یەکەمین جار دەروازەی ڕۆژهەڵاتی شار کرایەوەو سوارەکانمان بەرەو ناو شار کشان. دوای داگیرکردنی خانووەکانی نزیك بە دەروازەکە، بەرەو دەروازەی ڕۆژئاوا کشان و ئەویشیان کردەوە. لە دەروازەکان و شوورەی شارەوە لەشکرەکەم ڕژایە ناو شارەوە، لەو کاتەدا بە پێویستم زانی لەناو شاردابم. زۆر چاوم بۆ سوڵتانی پاڵەوان و بەهێزی شار گێڕا، سا بەڵکو بۆم بێتە مەیدانەوە، بەڵام دیار نەبوو. وتم ڕەنگە خۆی لە قەڵاچکەیەکدا حەشار دابێ، لەپڕ ئاڵایەکی سپیم لەسەر دەرگای قەڵاچکەیەکەوە دی، زانیم(طوغرول بوولاك) نیازی شەڕی نییەو دەیەوێ خۆی بدات بە دەستەوە. بانگمکرد: پاسەوانی قەڵا کێیە، بۆچی خۆی دەرناخات!؟ پیاوێکی قەبەو بەشان و شکۆ دەرکەوت، پرسیم: ئایا تۆ( طوغرول بوولاك)یت؟! بە زمانی عەرەبی وتی: بەڵێ. وتم: ئەگەر ئەتەوێ خۆت بدەی بەدەستەوە بۆچی فەرمانی وەستانی بەرگری دەرناکەیت؟ دیارە شتێك لەژێر سەرتایە!... وتی: ئەی ئەمیر، من نەمویستووە دژ بە تۆ بجەنگێم، بۆچی هێرشتکردە سەر ئەم شارە؟! وتم: ناچارتکردم، ئەگەر نیازی شەڕت نەبوو بۆچی دەروازەکانی شارت قاییمکرد و نەتهێشت بێمە ناو شارەوە؟! وتی: ناچار بووم وا بکەم! پرسیم: چەند ساڵە فەرمانڕەوای!؟ وتی: پازدە ساڵە. پرسیم: لەم ماوەی پازدە ساڵەدا ڕەوشی شەڕو ڕێککەوتن فێر نەبووی؟! تۆ ئەگەر چەند پیاو ماقووڵێکت بناردنایەو خۆیشت بهاتیتایە بە پیریمەوەو دەروازەکانتان واڵا بوونایە نەدەهاتمە شارەوەو سوپاکەشم لە دەرەوەی شار دەمایەوە. هەموو کەسێ بەم داب و نەریتە دەزانێ، بەڵام دیارە تۆ خۆتی لێ گێلدەکەی.

(طوغرول بوولاك) وتی: هەر ئێستاکە فەرمانی شەڕ وەستاندن دەردەکەم بەو مەرجەی تۆش فەرمان بدەی بە سەربازەکانت کوشتار ڕاگرن و دەست لە تالآن و بەدیلگرتن و کچ وژنبردن هەڵگرن!... وتم: تۆ دۆڕاوی، منیش براوەم، دەبێ من مەرجی کۆتاییهێنان بە جەنگ دابنێم نەك تۆ! مەرجم هەر ئەوەیە ئەگەر چەك دابنێن، خۆت و ئەوانەی چەك دادەنێن ناتانکوژم!.. زۆری پێ نەچوو لە قەلآچکەکەوە بڕێك پیاوی دەهۆڵ و زوڕناو تەپڵ بەدەست دەرکەوتن، هەندێکیان ئامرازێکیان بەدەستەوە بوو لە ڕەحەتی گەورە دەچوو، هەموویان دەستیان بە مۆسیقا لێدانێکی خەست و چڕو گوێکەڕ کەر کردو جاڕیاندەدا: شا(طووغرول بوولاك) فەرمانی داوە کە شەڕ بوەستێت و هەموو سەربازەکانی خۆیان بەدەستەوە بدەن... منیش فەرمانمدەرکرد لە هەر شوێنێ سەربازەکانی(طوغرول) خۆیان بەدەستەوە بدەن شەڕ بوەستێ.( طوغرول) میوانداریکردم بۆ ناو قەلآچکەکەی، بەلآم من وتم: ئێستا لەناو شارا ئیشم زۆرەو ناتوانم، باسەربازەکانم بێنە ژووێ، بێ خەم بە لاقەی خۆت و ماڵ و منالّ و دەستوپێوەندت ناکەن، بەلآم ڕێتان پێنادرێ بێنە دەرێ بە تایبەتی خۆت، دواتر خۆم بڕیاردەدەم. کاتی نیوەڕۆ بە تەواوەتی شاری(حەلەب) کەوتە ژێر دەستمان. چوومە مزگەوتی گەورەی شارو لەوێ نوێژی نیوەڕۆم کرد. دوای نوێژ ئیمامی مزگەوتەکە کە پیاوێکی پیرو ڕدێنسپیو نورانیبوو ناوی( فەیضە ددین عاملی)بوو، هاتە لامەوەو بەزمانی عەرەبی وتی: بینیم سەرگەرمی نوێژی، سوپاس بۆ خوا کە موسڵمانی، کەواتە موسڵمانان ببەخشە! وتم: من بەپێی شەرع هەڵسوکەوتدەکەم، دانیشتووانی ئەم شارە دژ بە من وەستاون، لەبەر ئەوە دەبێ تالآنبکرێن و پیاوان و ژنانی لاویان دیلبکرێن. ئیمام وتی: دانیشتووانی ئەم شارە نەیاندەویست دژ بە تۆ بەرگریبکەن، بڕیار هی(طوغرول بوولاك)بوو. ئەی ئەمیری گەورە، ئەگەر تۆ بۆ خۆت فەرمانبدەی دانیشتووانی شاردەتوانن سەرپێچیبکەن؟! ڕەحم بە دانیشتووانی شار بکەو بیانبەخشە. ئەگەر ماڵ و سامان و گەنجینەت دەوێن ڕێی وڵاتی کافران بگرە بەر، لەوێ دەست بگرە بەسەر زێڕو گەوهەرێکا کە دوو هەزار ساڵ دەبێ کۆیدەکەنەوە!.. پرسیم: وڵاتی کافران کامەیە؟! وتی: وڵاتی (بیزانتیۆم) کە هەموو دانیشتووانی کافرن!... لێم پرسی: ئایا تۆ (بیزانتیۆم)ت دیوە؟... پیرەمێردە بۆی باسکردم کە یەك جار چووە بۆ شاری بیزانتیۆم(ئەستەمبوڵی ئێستامارسل بریون) ئەو شارە دە ئەوەندەی حەلەب گەورەترو فراوانترە، ئەوەندە دەوڵەمەندە هەزار

قاروونی زیاتر تێدایە، دوو هەزار ساڵ دەبێ هەرچی سامانی کافرانە لەو شارەدا کۆکراوەتەوە، تەنانەت کاسەو کەوچکی حەماڵەکانیش لەزێڕو زیو دروستکراون!... پاشان ئیمامی مزگەوتی گەورەی شاری حەڵەب وتی: ئەگەر بیزانتیۆم بگریت، سەرەڕای ئەوەی خزمەتێکی گەورە پێشکەشدەکەیت بە ئیسلام و سەرانسەر ئەو وڵاتە دەکەیت بە موسڵمان، ئەوەندە زێڕو زیوو گەوهەرت پێدەبڕێن کە بەشی هەزار ساڵ پتر دەکەن و هەر تەواو نابن!... وتم: ناوی (بیزانتیۆم)م بیستووە دەڵێن کەوتۆتە کەنار دەریاوە... وتی: بەڵێ، وایە، لەهەموو لایەکی دنیاوە کەشتی ڕوودەکاتە ئەو شارە، ئەوەندە کەشتی لەو بەندەرەدان لە ژمارە نایەن! پاشان بۆی باسکردم کە ڕێگەی ئەوێ زۆر دووررو درێژەو! دەبێ بە وڵاتی ڕۆمدا بڕۆم و خۆم بگەیەنمە بیزانتیۆم، ئەگەر ئەوێ بگرم دەبمە پادشای سەرانسەری جیهان و کەس شان لەشانم نادات. هەروەها باسیکرد کە ئەو شارە سێ شوورەی قاییمی هەیە کەلەبەرد دروستکراون، کەسێ بیەوێ ئەو شارە داگیر بکات دەبێ لە ئاوەکەش بدات... وتم: ئەی زانای ئایینی، لەبەر ئەوەی ئیشم زۆرە ناتوانم لەمە زیاتر گفتوگۆت لەگەڵدا بکەم، لەبەر خاتری تۆ دەست لەتاڵان و دیل و ژن و پیاوانی شارهەڵدەگرم. دەبێ تا ئەو ڕۆژەی لێرە بار دەکەم دانیشتووان بەشێ لە خەرجی لەشکرەکەم دابینبکەن، بەشەکەی تریش لە سامانی(طوغرول بوولاك) دابینیدەکەم. پرسی: ئەی ئەمیر، سەرەنجامی طوغرول بوولاك چۆن دەبێ!؟ وتم: نایکوژم، بەلام ماڵ و سامانەکەی داگیر دەکەم. ئیمام پرسی: کۆکردنەوەی سەرانەی شار بەمن بسپێرە. وتم: باشە، پێنج سەد هەزار مسقاڵ زێڕ، یان شتی تر بەرانبەر ئەو زێڕە کۆبکەنەوە. ئیمام وتی: ئەی ئەمیر، ئەم شارە ئەمەندە سامانی نییە! وتم: ئەی پیاو چاك، ئایا دەزانی سەدەها سەربازم کوژراوە و دەبێ مووچەی بڕاوە بەکەس و کارەکانیان بدەم و ژیانیان دابینبکەم!؟ ئیمام سەری دانەواندو وتی: هەوڵدەدەم ئەو سەرانەیە کۆبکەمەوەوتێدەکۆشم دەوڵەمەندەکان هی هەژارەکانیش بدەن.

لە مزگەوت هاتمە دەرێ، بڕێك سەربازم بۆ هەڵسووڕاندنی کاروباری شار هێشتنەوەو فەرمانمدا کە لەشکر لە شار دەرچێتە قەراخ شار. ماوەی پێنج ڕۆژ لەسەر یەك سەرانە کۆکرایەوە، بەلام لە چوارسەد هەزار دینار زیاتر کۆنەکرایەوە. پاش ئەوە میوانداریی ئیمامی حەلەبم کردو پێکەوە نانمان خوارد. دوای نانخواردن باسی شاری (دیمەشق)ی بۆ کردم، وتی: ئەی ئەمیر،

بـەهاری هیـچ ولاتێـك هێنـدەی بـەهاری دیمەشـق دڵگـیر نییـە، کـە گـوڵان سەردەردێنن هـەموو هەوای دیمەشق یەکپارچە عـەترو گـوڵاوە، بۆهـەر لایـەك بڕوانـی تـا چـاو بڕکـات سـەوزایی و گـوڵ و گوڵـزارە، سـازوچریکەی بـاڵداران خۆشترین ئـاواز دەبەخشن. هـەردوو بـەری ڕووباری(بەڕەدا)، کـە بەناوەراسـتی شاردا دەڕوات پڕن لەدارو درەختی بادام، قەیسی، گێلاس و قۆخ، هەڵاڵەی ئەو درەختانـە ئەوەنده دڵگیرەمرۆڤ سەرمەسـتدەکات! پرسـیم: ئایـا دیمەشـق لـە حەڵـەب بچووکـتر نییـە؟! وتـی: بـەڵێ، بـەلام زۆر جوانـترە، ئەگـەر لەسـەر گردەکانەوە بە دیمەشقابڕوانی وەکو پارچە یاقووت و فەیرۆزە دەنوێنێ لە ناو بـاخێکی سـەوزو بـەریندا! وتم:یـا شـێخ بیسـتوومە دانیشـتووانی دیمەشـق (نەصرانی) بوون. وتی: بەڵێ، پۆلص ڕەسوولْ پێنج سەد ساڵ بەر لـە کۆچی پێغەمبەری ئێمە(د.خ) لەشاری مەککەوە بۆ شاری مەدینە هاتۆتە دیمەشق و خـەڵکی شـاری بانگهێشـتکردووە بـۆ ئـاییی مەسـیح، کەنیسـەیەکی دروستکردووە کە یەکەمین کەنیسەی شاربووە، ئەوە بوو پاشان موسڵمانەکان کردیـان بە مزگەوت. پاشـان بۆی باسـکردم کـە لـە سـاڵی حـەقدەی کۆچیـداو لەسەردەمی دووەمین خەلیفەی ئیسلامدا(عومەری کوڕی خەتتاب ـد.خ) کراوە بە مزگەوت و بۆ یەکەمین جاریش خەلیفەی ئیسلامان پێشنوێژیی تیا کردووەو ڕوو بە کەعبە نوێژیانکردووە.

وتم: دەبێ منیش بچمە ئەو مزگەوتەو بەهەمان شـێوە ڕووبکەمـە کەعبـەو سوپاسی خـوا بکـەم.(عـاملی) وتـی: ئـەی ئـەمیر، چونکـە تـۆ لەگـەڵ منـدا سـۆزو میهرەبانی زۆر دەنوێنی، چاونەترسیت داومـەتێ کـە دڵسـۆزانە زاتبکـەم، دوو ئامۆژگاریتدەکەم! پرسیم:چین؟! وتی: یەکەم، ئەگەر ئەتەوێ بچی بۆ دیمەشق لە وەرزی بەهاردا برۆ چونکە لەهەموو وەرزەکان خۆشترە. دووەم، دیاری بنێرە بـۆ سوڵتانی دیمەشـق و دۆسـتانە بچـۆرە نـاو شـارەوە. پرسـیم: سـوڵتانی دیمەشق کێیە؟! وتـی: هەمان سوڵتانی (ڕۆم)ە، ئەوەندە سامدارو بەهێزە، بـە بیستنی نـاوی خـەڵکی زیـرە دەکـەن!. وتم: کـە بـەرەو حەلـەبیش هـاتم وتیـان (طوغـرول بـوولاك) بۆ خۆی دێوێکەو بە دەستێ بەرزتدەکاتـەوەو دەتخاتـە بـن باڵی!... وا ئێستا بە چاوی خۆت دەبینی لە کۆشکەکەی خۆیدا دیلە!... وتـی: ئـەی ئـەمیر، پادشـای ڕۆم نـاوی(ئیلـدرم ــ بایـەزید)ە، ئـەو پیـاوێکی تـرەو بەڕاستی(ئیلدرم)ە ، واتە (تریشقە)، دیمەشق و هەموو ئەو وڵاتانـەی دەکەونـە سەر کەناری دەریای ڕۆم هی ئەون، ئەگەر بتەوێ بەبێ ڕەزامەندی ئەو بچیتـە

دیمەشقەوە، دەبێ لەگەڵیا بجەنگی!... وتم: لەگەڵیدا دەجەنگم! پاشان ئیمام وتی: بۆیە ئەم ئامۆژگارییەتدەکەم چونکە ئەمیرێکی مەزن و جوانمەردو خێرەومەندو دلێری، خۆت لەقەرەی(ئیلدرم بایەزید)مەدە، بێجگە لە پەشیمانی هیچت دەست ناکەوێ! وتم: ئەی تۆ پێت نەوتم کە بچم بۆ بیزانتیۆم و دەست بەسەر سامانی دووهەزار ساڵەی کافرەکانا بگرم و موسڵمانیانبکەم؟! وتی بەڵێ، ئەی ئەمیر، وام وت. وتم: خۆ دەبێ دژ بە ئیلدرم بایەزید بجەنگێم جا بتوانم بڕۆم بۆ بیزانتیۆم! وتی: خۆت لەو پیاوە لادە، زۆر بە تواناو بەهێزو جەنگاوەرە، دەتوانێ بەیەك شمشێر حوشترێ دوولەت بکات! وتم: خۆت دیوتە وابکات!؟ وتی: نا، لەخەڵکم بیستووە.. وتم: خەڵکی شت زۆر زل و زەبەلاحدەکەن! تەنانەت ئەوەندەش توانای هەبێ، من حەز دەکەم دژی بجەنگێم و چی دەبێ بابێ!! وتی: ئەی ئەمیر، ئەگەر ئەمە ئارەزووی تۆبێ ناتوانم ئامۆژگاریتبکەم!.. پاشان لەبارەی زاناکانی دیمەشقەوە پرسیارمکرد، لەوەلاما وتی: بەڵێ، ئەی ئەمیر، لەدیمەشقا دانای زۆر مەزن هەن، یەکێ لەوانە(عەرەبشا)یە، لە هەموو زانستەکانا بالا دەستەو زمانی سریانیش دەزانێ، بەرێکەوت زانای وا هەڵدەکەوێ. هەروەها دانایەکی ناودارتریش لە دیمەشقایە ناوی (نیظامە ددین)ەو نازناوی(ڕەوانبێژترینی ڕۆژهەڵاتوڕۆژئاوا)یەو لە وێنەی نییە... وتم: یا شێخ، دەمەوێ بەزووترین کات لەحەلەب دەرچم، مانەوەم زیانی بۆ سوپاکەم زۆرە،(طوغرول بوولاك) نەیتوانی من بشکێنێ، بەلام لەتاو ژنەجوانەکانی ئەم شارە هەڵدێم، من بۆخۆم هیچ ترسم نییە چونکە چوومەتە ساڵەوە بەلام سەربازەکانم لاون و دەترسم بە جوانیی ژنانی ئەم شارە لە پەلوپۆ بکەون و دەماری جەنگاوەرییان کزو سستبێ. پاشان وتم: بەر لەوەی لە شار دەرچم داواکاریت چییە با بۆتی جێبەجێبکەم...وتی: ئەی ئەمیر، مامۆستایان و قوتابییانی قوتابخانەی(عوبەید) ژمارەیان سەدو پازدە کەسەو دوو ساڵە هیچ مووچەو بەراتێکیان وەرنەگرتووەو بە یارمەتیی خێرەومەندان دەژین و گوزەرانیان زۆر دژوارە! پرسیم: ساڵانە هەر قوتابییەك چەندی بەسە؟ وتی: چل مسقاڵ زێڕی گەرەکە. هەر دەمودەست فەرمانمدا کە سێ هەزار مسقاڵ بدرێ بە(شێخ فەیضە ددین عاملی)و خۆی بیداتە مامۆستاکان و قوتابییەکان.

بۆ عەسری ئەو ڕۆژە داوای (طوغرول بوولاك)م کرد، کەهێنایان، پێم وت: من تۆ لەگەڵ خۆما دەبەم بۆ دیمەشق، کوڕەکەشت لەجێی خۆت دەکەم بە

فەرمانڕەوای حەڵەب، هیچ ترست نەبێ، دەستت لێنادەم، تەنیا هەر ئەوەیە کە ئەمەوێ لەهێرشی پشتەوە بێ خەمبم. کە شەڕی شام تەواو بوو ئازادتدەکەم و بچۆرەوە سەر کورسیی فەرمانڕەوایی دانیشەرەوە، ئەگەر کوڕەکەشت سەرپێچیکرد بۆت تەمێدەکەم!.

بۆ ڕۆژی دوایی، بەیانی زوو بەرەو دیمەشق کەوتمە ڕێ، بەڵام زۆر درەنگ گەیشتینە ناوچەی دیمەشق چونکە لەسەرێکەوە خێڵ و عێلەکانی دەوروبەر بەرەنگارمانبوونەوە،لەسەرێکی دیکەشەوە باران و بەفر وزریان ئامبازمانبوون و زۆر دوایانخستین.کەگەیشتمە کەنار ڕووباری(بەڕەدا)ئیمامی حەڵەب چۆنی بۆباسکردبووم بەزیادەوەو جوانتریش هاتەبەر چاوم! ئەگەر پێمبکرایە پێم خۆشبوو ئەو بەهارە لە کەناری ئەو ڕووبارەدا بەسەر بەرم.

کە لەشاری دیمەشق نزیکبوومەوە، یەکێك لەسەرکردەکانی پاشای ڕۆم کەناوی(قوتول هەمزە)بوو بە گالیسکەی جەنگییەوە هێرشیکردە سەرمان. سەرکردەی ناوبراو تەمەنی پەنجا ساڵ دەبوو، عەمامەیەکی گەورەی بەسەرەوە بوو، یەکەم جار بوو جەنگاوەرێ ببینم بە عەمامەی گەورەوە بجەنگێ.

ئەو ڕۆژە(قوتول هەمزە) بە پێنج سەد گالیسکەی جەنگییەوە هێرشیکردە سەرمان، گالیسکەکان شوێنی تایبەتییان هەبوو کە سەربازە سوواربووەکانی لەتیرو قۆچەقانی دەپاراستن. بە ڕاستی لەپڕ پەلاماردراین و نەمدەزانی بەرامبەر بەو گالیسکە جەنگیانە چی بکەین. گالیسکەکان بە دوو ڕیز هێرشیاندەهێناو زۆر زیانیان لێداین، لەبەرئەوە ناچار بووم فەرمانی پاشەکشێ دەرکەم و بەرەو دواوە گەڕاینەوە بۆگوندی(ئاوك) کە کەوتۆتە نزیك دیمەشق و بەدرروستکردنی گۆزە ناوبانگی دەرکردووە.لەوێ سوپاکەم ڕێکخستەوە،بەوەی باشبوو کە(قوتول هەمزە) دوامان نەکەوت.

بۆ شەوێ فەرماندەکانم کۆکردەوە بۆ دۆزینەوەی چارەیەك بۆ کوشتنی ئەسپی گالیسکەکان. یەکێ لەوان ناوی(ئەتا بوك)بووکە لەلای(شاهروخ)ی کوڕمبوو، یادیخستمەوە کە کیسە بارووت بەکاربێنن. زۆرم پێ سەیربوو کە بارووتم لەبیر چووبووەوە! بەڵام کێشەی گەورەمان ئەوە بوو کە چەرمی تەواومان نەبوو. ئەتا بوك پێشنیاریکرد کە گۆزەی گوندەکە بەکاربێنین، کەچەند گۆزەڵەیەکمان بە بارووت داگرت و فتیلەمان گرِدا ئەوەندە دەنگ و زرمەیان بەهێز بوو گوێیان کەڕ دەکرد.ئەو شەوە لە خۆشیانا نەمدەتوانی بخەوم. بۆ بەیانییەکەی بڕێکی زۆر گۆزەڵەمان کڕی و پڕمانکردن لە بارووت.

بۆ ڕۆژی دوایی، منیش بە دەستووری گالیسکە جەنگییەکانی(قوتول هەمزە) سەربازە گۆزەڵەهاوێژەکانم کرد بە دوو ڕیز، هەر سوارە خورجێکی گەورەی پڕ لە گۆزەڵەی بە ئەسپەکەیدا دابەستبوو، ڕامسپارد گۆزەڵەکان لەبەردەم ئەسپەکانی گالیسکەکاندا بتەقێننەوە. هەر ئەو ڕۆژە جارێکی دی بەرەو شاری دیمەشق کەوتمە ڕێ، دڵنیاشبووم کە پاسەوان و قەرەوڵەکانی دوژمن ئاگایان لە جمووجووڵمانە. گالیسکەکانی دوژمن لەکەناری ڕووباری(بەرەدا)وە هێرشیان بۆ هێنایین، سوارە گۆزەڵە هاوێژەکانم زۆر لەخۆبوردووانە بەرەو ڕوویان چوون هەر کەلێیان نزیکبوونەوە پلیتەکانیان گڕەدا و گۆزەڵەکانیان بەرەو ئەسپەکان هاویشت. ئەنجامی تەقینەوەی بارووت گەلێ لەوە مەزنتر بوو کەمن چاوەڕێمدەکرد، زۆربەی زۆری ئەسپەکان یەکسەر کوژران و بڕێکی زۆریاریشیان بریندار بوون، دوژمن هەر ئەوەندەی پێکرا بەسەر لێشێواوی پاشەو پاش کشایەوە بۆ ناو شار.لەگەرمەی جەنگدا سەرنجمدا یەکێ لە سەربازەکان بە قۆچەقانیی گەورە گۆزەڵە دەگرێتە دوژمن، بانگمکردو لێم پرسی: کێ پێی وتی بە قۆچەقانی گۆزەڵە بارووت بهاوی ؟! وتی: بیرۆکەی خۆمبوو، کە دیم گۆزەڵەکان بچووکن، قۆچەقانییەکی گەورەترم دروستکرد، هاویشتنی گۆزەڵەکان ئاسان و کاریگەر تربوو. بۆ داگیرکردنی دیمەشق هەمان شێوازمان بەکارهێنا. لەسەرەتادا سێ سەربازم گۆزەڵەکانیان پیادا تەقییەوەو مردن، دوای ئەوە پلیتەی درێژ ترمان بەکارهێناو دوای دوو جار هەڵسووڕاندنی قۆچەقانییەکان گۆزەڵەکانمان دەهاویشت. ساڵێ دوای داگیرکردنی دیمەشق، لە جەنگی دژ بە(ئیلدرم بایەزید)دا لەم شێوازە گەلێ کەڵکمان وەرگرت و هیچ سەربازێکیشم گۆزەڵەی قۆچەقانییەکەی پیادا نەتەقیەوە.

بەسەرکەوتنی ئەو ڕۆژەمان گەلێ شادو بەختەوەر بووم. گەمارۆمان لەسەر شاری دیمەشق بەهێزتر بوو. بۆ شەشەمین ڕۆژ بە تیرو کەوان چەند نامەیەکم هەڵدایە ناو شارو پێم ڕاگەیاندن: کە ئەگەر خۆیان بەدەستەوە نەدەن، چیم بەو شارانە کردووە کە بەرەنگارمبوونەتەوە ، واش بە دانیشتووانی دیمەشق دەکەم، لەنامەکاندا وتبووم : ئەگەر شار داگیرکرا، هەر کەسێ بچێتە مزگەوتی(عومەر)، یان ماڵی(نیظامودینی شامی ـ زمانی شیرینی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا)، یان ماڵی(عەرەبشا) پارێزراوە. بەپاسەوانەکانی سەر شوورەی شارم ڕاگەیاند کە (قوتول هەمزە) ئاگادار بکەن هەرچەندە لەیەکەمین ڕۆژی هێرشیدا

ژمارەیەکی زۆر لە سەربازەکانم تیاچوون، بەڵام ئەگەر خۆی بدات بەدەستەوە سەرو ماڵی خۆی و بنەماڵەو هەموو پیاوەکانی پارێزراون، بەڵام ئەگەر بەرەنگاریبکات و بجەنگێ لە سزای زۆر سەختی خۆیان دەگەن و کوشتو بڕی گشتییان دەکەم .

لەبەرەبەیانی حەوتەمین ڕۆژدا هێرشمانکردە سەر شار، قۆچەقانێ بەدەستەکان بەجارێ ئاگربارانی شاریان کرد، پاسەوانان و قەرەوڵانی سەر شوورەی شار تیاچوون؛ سەربازەکانم سەرکەوتنە سەر شوورەکەو کەوتنە ئاگربارانی شار. هێشتا هێندەی ڕمێك خۆر بەرز نەبووبووەوە لەناو شەقام و کۆڵانەکاندا شەڕ گەرمبوو. لەگەڵ کردنەوەی یەکەمین دەروازەی شاردا بڕێکی زۆر سەربازم خۆیان کرد بەشاردا. تانیوەڕۆی نۆیەمین ڕۆژ شەڕو کوشتار درێژەیکێشاو ساتێ پشوومان نەداو، ئەگەر سەربازێ زۆر ماندوو بووایەو یەکی بکەوتایە دەماننارده دەرەوەی شارو سەربازی تر جێیاندەگرتەوەو پەیتا پەیتا سەربازی تازە بەشداریی جەنگیان دەکرد. لە هەشتەمین شەودا شاری دیمەشق بەجارێ گڕی گرتبوو، وەکو ڕۆژی نیوەڕۆ هەمو شتێ دەبینرا. ئەو شەوە چەند جارێ چوومە ناو شارەوەو سەرپەرشتی بارودۆخەکەم دەکرد. لەهەموو لایەکەوە تەرمی هەزاران جەنگاوەرو ژن و پیاو کەوتبوون، لە هەشتەمین ڕۆژدا، دەمەو عەسر گەیشتمە نزیك مزگەوتی عومەر(د.خ) پیرێکی نوورانی بەرەو پیرم هات، پێشان بە عەرەبی پاشان بە فارسی دوا، وتی: ئەی ئەمیر، بەزەییت هەبێ! پرسیم تۆ کێیت؟!وتی: ئەی ئەمیری مەزن، من(نیظامودینی شامیم)، لە ڕووی گەورەییتەوە ماڵەکەمت کردووە بە پەناگەی خەڵکی شار، خۆم هاتووم بۆ مزگەوت و کوڕەکەشم سەرپەرشتیی ماڵەکەم دەکات. وتم: بەو هەموو خەڵکە بڵێ لەبەر ڕێزی حەزرەتی (عومەرد.خ) هەموویان پارێزراون. وتی: ئەی ئەمیر، هەمو ئەوانەی لە مزگەوت و ماڵی عەرەبشاو ماڵی مندان پارێزراوین و لەژێر سایەو سۆزی تۆدان، تۆ کە ئەمەندە مەزن وبەخشندەی، چاکتر نییەلە هەموو دانیشتووانی شار خۆش بیت و چاوپۆشییان لێ بکەیت؟!.

پاشان داب و نەریت و ڕەوشتی جەنگم بۆ باسکرد، لەگەڵ ئەوەشدا تکام لێکرد کە بۆ خۆی بە جەنگاوەرانی دوژمن ڕابگەیەنێ، هەر کەس چەك فڕێبدات و خۆی بەدەستەوە بدات پارێزراوە... ئەو دانا بلیمەتە تاکو ئێوارە چەند جارێك بانگەوازی بڵاوکردەوە، بەڵام هەموو جارێ ئەفسەرەکانی(قوتول هەمزە)

وەلأمیاندەدایەوە: چەك دانانێین، هەر کەسێکیش چەك دانێ، یان بیەوێ خۆی بەدەستەوەبدات ئاگری تێبەردەدەین!.

بۆ بەرەبەیانی نۆیەمین ڕۆژ، لە باکووری ڕۆژئاوای شارەوە تەنیا دە، تا پازدە خانوو بەپێوە مابوون، لەگەڵ باخێکی گەورەو بەریندا کە (قوتول هەمزە) خۆی تێداقاییمکردبوو. بۆ ئەوەی زوو کۆتایی بەجەنگ بێنین، لەهەشت لاوە هێرشمانکردە سەر ئەو ناوچەیە. دەمەو نیوەڕۆ سەربازەکانم چوونە ناو باخەکەوە،(قوتول هەمزە) بە شمشێرەوە هێرشیکردە سەریان، ئەوەندەی پێ نەچوو کوژراو سەربازەکانم سەرەکەیان بۆ هێنام.لەگەڵ بەرز بوونەوەی دەنگی بانگی نیوەڕۆ لە منارەی مزگەوتی عومەرەوە، جەنگی زۆر سەختی دیمەشق بەسەرکەوتنی ئێمە کۆتاییهات، شاریش بە تەواوی کاولکرابوو. پاشان چوومە مزگەوتی عومەر، بەنیظامە ددینی شامیم ڕاگەیاند کە هەموو ئەو خەڵکەی پەنایانبردۆتە مزگەوت ئازادنو با بچنە دەرێ.پاشان لەو شوێنەدا کە عومەر نوێژیکردبو نوێژمکردو سوپاسی خوای گەورەم کرد! دوای ئەوە ڕێم بە سەربازەکانم دا تالأنیبکەن!.

هەر ئەو ڕۆژە داوام لە زیندووانی شارو خەڵکی دەوروبەری شارکرد خەریکی ناشتنی کوژراوەکانبن. لەپاڵ شاراو لەو دەشتەدا گۆڕی بە کۆ هەڵکەندران و لەماوەی دوو ڕۆژدا هەموو نێژران.لەو جەنگەشدا شازدە هەزار سەربازم کوژران و برێکی زۆریش بریندار بوون. دوو ڕۆژم سەرخانکردن بۆ سەرپەرشتیکردنی وێرانکردنی شار، بەزیندووەکانم ڕاگەیاند ئەگەر ویستیان شار دروستبکەنەوە با وەك نەخشەی شاری کەش نەخشە دابڕێژن. لەبەر ئەوەی زۆر زیانیشیان پێگەیشتبوو، شتێکی واشیان بۆ نەمابووەوە، داوامکرد کە لەسەر بەردێکی مزگەوتی گەورە ئەم فەرمانەم هەڵکەندرێ: تا ماوەی دە ساڵ دانیشتووانی شاری دیمەشق لەهەموو سەرانەو باج و خەراج و موڵکانەیەك بەخشراون و دوای منیش ئەبێ ئەو فەرمانە هەر جێبەجێبکرێ.

دەمزانی هەر دەبێ لەگەڵ(ئیلدرم بایەزید) ڕووبەڕوو ببمەوە و دژ بەو بجەنگم، بۆ ئەم مەبەستەش پێویستم بە سوپاو توانای بەهێزتر هەبوو. بڕیارمدا لە(دیمەشق)دا بمێنمەوەو سوپاکەم یەك بخەمەوەو پێداویستییەکانی جێبەجێبکەم. لەسەر داب و نەریتی خۆم لە دەرەوەی شار ئوردووگەم هەڵداو بەردەوام لەگەڵ سەربازەکانمدا خەریکی مەشقی سەختبووم. بە کۆتری نامەبەردا نامەم بۆ(شاهروخ)ی کوڕم نارد، ئاگادارمکرد کە چاك سەرکەوتووین

و داوای یارمەتیشمکرد. پاشان بە تەتەریشا نامەیەکی دوورو درێژم بۆ نارد، تیایدا داوامکرد کـە هـێزێکی زۆر سەرسەخت و زۆرم لەسەربازانی(چەتین و ئۆزبەك و غوور) بۆ هەڵبڕێژێ و ڕەوانەی دیمەشقی بکات.

خەڵکی دیمەشقم هێور کردەوە، دوای ئەوەی دڵنیا بوون کە ئازارنادرێن و کەس لاقەیان ناکات، دەستیانکردەوە بە خانوو دروستکردن و ڕێکخستنەوەی شارەکەیان. ڕۆژانە(عەرەبشاو نیظامووددینی شامی) دەهاتنە لام و لـە بابەتـە جۆراوجۆرەکانی زانستا گفتوگۆماندەکرد. لە ئەنجامی وتووێـژو لێکۆڵینەوەی زۆردا کەوتمە بیری ئـەوەوە کەئەگـەر بکـرێ و لـەتواناداهـەبێ هـەموو زانـا ناودارەکانی جیهانی ئیسلام بانگهێشتبکەم بۆ دیمەشق، بۆ ئـەوەی بـەفتواو بڕیاری هەموویان سوورەتەکانی قورئان بەڕێزو زنجیرە ڕێکبخرێنـەوە. بۆ ئەم مەبەستەش نامەم نارد بۆ هەموو سوڵتان و فەرمانڕەوایانی قەڵە مڕەوی خۆم کە لەسەر خەرجی خۆیان گەورە داناوزاناکانی ناوچەکانیان بنێرن بۆ دیمەشق. بـۆ وڵاتـەکانی وەك مـەغریب و میسر کەفـەرمانڕەوام لـەوێ نـەبوو پێشـەکی خـەرجیی سـەفەری هـەموو زاناکـانم نـارد. بانگهێشـتی تایبـەتیم بـۆ(شـێخی ئەزهـەر)یش نـارد. هـەندێك لـە زاناکـان وەکـو(شـێخی ئەزهـەر) و ئیمـام و سەرپەرشـتیاری قوتابخانـەی خواجـە لـە ئەسـفەهان بانگهێشـتەکەمیان دایـە دواوەو نەهاتن، دوایی بۆم دەرکەوت کە لەوە ترساون بیانکوژم! بەڕاستی ئەو هەواڵـەم زۆر پێناخۆشبوو، چونکە ئەگـەر ئـەوان نرخـی بـەڵێن و پـەیمانیان بزانیایەو خۆیـان خـاوەنی بوونایە دەبوایە بەرانبـەر بـە پیـاوێکی وەك مـن لـە کۆبوونـەوەی گشـتیی دیـارترین دانشـمەندانی ئیسـلامدا ئـەو بۆچوونـەیان نەبوایە، لەگـەڵ ئەوەشـدا هـەندێ لەناودارترین دانشـمەندانی وڵاتـی مـەغریب_ تونس، جەزائیر، مەراکیش، لیبیاو مۆریتانیای ئەمڕۆ_ ئامادە بوون.

ناودارترین دانایان کەلە دیمەشقدا ئامادە بوون ئەمانـەبوون: عیمـادوددینی مـەغریبی، سیراجی ئەسـکەندەر، بـەهائوددینی حەڵـەبی، ئیـبن خـەلدوون، نیظامووددینی شامی و عەرەبشا.

بەر لە کۆبونەوەی زانایانی ئیسلام لە دیمەشقا، یەکەمین دەستەی هێزی پشـتگیری ویارمـەتیدەر لەسـەرەتای هـاویندا گەیشـتە دیمەشـق، هـەموو سەربازەکان لەوانە بوون کە داوامکردبوون. فەرماندەکەیان لەڕەگەزی(چەتین) بوو، ناوی(توقات) بوو، تەمەنی سی ساڵبوو. پاشان کە هاتە لام، وتی: ئەی ئەمیر، کە (شاهروخ) منی بینی بە دوو شمشێر دەجەنگم، وتی: تۆش وەکو

باوکم بە هەردوو دەستت شمشێر دەوەشێنی!... پرسیم: تۆقات، کە ئەجەنگی هەردوو دەستت لەهەمان کاتدا بەکاردێنی!؟ وتی: بەڵێ، ئەی ئەمیر تەیموور.

ئەوانەی ئەو بەهرەیان هەیە زۆر دەگمەنن. تا ئەو ڕۆژە لەکەسم نەبیستبوو توانای وەك هی من بێ، لە قسەکەی(توقات) سەرم سڕما، وتم: زریێ بپۆشە با بە هەردوو دەست مەشق و ڕاهێنانی شیربازی بکەین. بۆ خۆیشم زرێم پۆشی، لەبەر ئەوەی بەردەوام لەگەڵ ئەفسەرو سەربازەکانمدا خەریکی ڕاهێنانبووم بۆ ئەوەی چالاکیمان درێژەداربێ، ئەو مەشقەش لەبەر چاوی سەربازەکانم کارێکی نەشاز نەبوو. دوای هێنان و بردنێکی زۆر بۆم دەرکەوت کە(توقات) توانای منی نییە، چەند جارێ شمشێری من بەر زرێکەی کەوت، لەوەش دەچوو کەمێ زامدار بووبێ، بەڵام بە هیچ جۆرێ شمشێری ئەو بەر من نەکەوت، دوای تەواو بوونی ڕاهێنانەکە دانی بەوەدا نا کە ناگاتە من.

کۆبونەوەی زانایانی ئیسلام لە دیمەشقا لە دەیەمین ڕۆژی مانگی میزاندا دەستی پێکرد، منیش ئامادە بووم تاکو لە نزیکەوە بزانم زانیارییی ئەو زانایانەبە ئەندازەی ناوبانگیانە ، یان نا!...

لە عیمادوددینی مەغریبی م پرسی: لە قورئاندا کام سیفەتی خوا لە پێش ئەوانی ترەوە باسکراوە؟ وتی: (قدیر) واتە زۆر توانا. پرسیم: دوای ئەو؟! وتی: (علیم) واتە زۆر دانا . وتم : ئافەرین فیردەوسیش کە شانامەی نووسیوە لە هەنراوەکانیا سیفەتی زۆر توانایی خوای پێش سیفەتی زۆر دانایی خستووە.

داوام لە (ئیبن خەلدوون) کرد کە پێناسەی خودا بکات! وتی: هەندێ لە پێغەمبەرانی بەنی ئیسرائیل وایان دەزانی خودا وەکو مرۆڤە، پاش ئەوەی ئایینی مەسیح هات، خوایان بە سیانە ناسی، بە واتای(باوك ـ کوڕ ـ ڕەوانی پیرۆز). یەکەمین ئایین کە خوای بە تاك و تەنیا ناسی و وتی خوا وەکو مرۆڤ نییەو سیفەتەکانی تایبەتن بە خۆی، دینی ئیسلامبوو. بۆ پێناسەی خودا، تەنها دەتوانم بڵێم خودی خوا (توانایی و داناییە)،واتە زانست و توانای لەرادەبەدەرن و لەوە پتر ناتوانم دەربارەی خوا هیچی تربڵێم. ئافەرینم لێکردو سوپاسمکرد. پاشان لە (بەهائوددینی حەڵەبی)م پرسی: لە قورئاندا چەند ئایەت هەن کە شایانی هاتنە خوارەوە بن، وە بۆ چ مەبەستێ هاتوونەتە خواری؟!..لە وەڵاما وتی: ئەی ئەمیر، تۆ بڵێ لە قورئاندا چەند ئایەت هەن کە شایانی هاتنە خوارەوە نین؟! چونکە هیچ ئایەتێك بە بێ مەبەست و بێ هۆ

نەهاتۆتە خوارێ!.. وتم: سڵاوت لێبێ، ئەی (بەهائوددینی حەڵەبی)!.. پاشان ڕوومکردە(سیراجی ئەسکەندەری)و پرسیم: بۆچی قیبلەی موسڵمانان گۆڕرا؟! وتی: لەسەرەتای ئیسلامدا هەندێ داب و نەریتی ئایینەکانی پێشتر(جوولەکەو نەصرانی) مانەوە، وەکو حەرامنەکردنی شەراب، پاشان وردە وردە حەرامکرا. یەکێ لەو دەستوورانەی کە لە سەرەتای ئیسلامدا هەبوو قیبلە(قودس) بوو. پاشان خودا ویستی لەخوا پەرستیدا موسڵمانان لە پەیڕەوانی دینەکانی تر جیابن ، بۆیە خودای مەزن فەرمانیدا کە موسڵمانان ڕووبە(کەعبە)نوێژ بکەن، دیارە کە خودا لەهەمووشوێنێ هەیە، لەبەر ئەوەش (کەعبە)یکرد بە قیبلەی موسڵمانان تاکو هەموویان لەگەڵ یەکتریدا یەکبن و ڕۆژی پێنج جار، ڕووبکەنە خاڵێکی تاك و جیاوازو نوێژ بۆ خودا بکەن.ئافەرینم لەویش کردو وتم: بەڕاستی دڵی تۆ لەناو ڕووناکیی زانستا دەدرەوشێتەوە.

پاشان لە(عەرەبشا)م پرسی: ماوەی هاتنە خوارەوەی ئایەتێك و ئایەتێکی تر چەند ڕۆژە؟! وتی: ئەی ئەمیر، نزیکەی ڕۆژو نیوێك دەبێ، چونکە پێغەمبەری ئێمە(د.خ) هەشت هەزارو سێ سەدونەوەدو پێنج ڕۆژ پێغەمبەرایەتیکردووە، واتە لە ماوەی بیست و سێ ساڵدا سەدو چواردە سوورەتی قورئان هاتوونەتە خوارێ، بەم حیسابە تێکڕا لە ماوەی ڕۆژو نیوێکدا یەك ئایەت هاتۆتەخوارێ، لەگەڵ ئەوەشدا جاری وا هەبووە لەیەك کاتدا چەندین ئایەت یان سوورەتێکی تەواو هاتوونەتە خوارێ، بۆیە مەرج نییە ئەو حیسابەی وتم: بە تەواوی ڕێکوپێك دەرچێ.

ئافەرینم لە(عەرەبشا)ش کردو وتم: نیوەی ناوەکەت عەرەبی و نیوەکەی تریشی فارسییە. پاشان ڕوومکردە(نیظاموددینی شامی)و لێم پرسی: پێم بڵێ بزانم بۆچی خودا فەرمانیدا کە موسڵمانان لە نوێژدا کڕنووشبەرن؟! وتی: خوا مرۆڤی لە خاك دروستکرد، بۆیە خوا فەرمانیدا لە کاتی نوێژ کرندا مرۆڤ کڕنووشبەرێ بۆ ئەوەی بێتەوە یادی کە لە خاك دروستکراوە؛ هەموو مرۆڤ چوونیەکن و هەمووشیان هەر دەبنەوە بە خاك.

وتم: ئافەرین! ئەی(نیظاموددینی شامی). پاشان لە (موحەممەدی کوڕی موسلمی لاذقي)م پرسی: کە دەستنوێژ دەگیرێ، دەبێ چەند جار دەست و پێ بشۆرڕێن؟! وتی: ئەی ئەمیر، لە زستاندا هەوا ساردەو دەست و پێی نوێژکەر پاکە، لەبەر ئەوە یەك جار بەسە، بەڵام هاوینان گەرمەو دەست و پێی نوێژکەر پیسە، لەوانەیە پێنج جار شۆرین بەس نەبێ! بۆ ئەوەی سەری لێ تێکبدەم وتم

ئەی پیاو، تۆ گاڵتە تێکەڵ بە دەستووری دینی ئیسلام دەکەی!؟ وتی: نەخێر ئەی ئەمیر، ئەوەی من دەیڵێم ڕاستە. خودا لە ئایەتی سەدو یەکەمینی سوورەتی(مائدە)دا دەفەرموێ: ئەی موسڵمانان، نابێ لە وردەکاری و بەندەکان و دەستووری دیندا ئەوەندە ڕۆچن و ورد ببنەوە!، وەکو ڕەخنەکانی میللەتی بەنی ئیسرائیل لە بارەی سەربڕینی مانگاوە، کێشەتان بۆ دروستبێ.دەستنوێژ بۆ پاکوخاوێنییە ، ئەگەر نوێژکەر خۆی شتبێ پێویست ناکان دەستنوێژ هەڵگرێ. ئەگەر ئاو زۆر بێ پێویستە نوێژ کەر چاك دەمو چاوو دەست و پێی بشوات، ئەگەر دەست و دەموچاوو پێی نوێژکەر پاکبن یەك جار شۆرین بەسە. خودا دەفەرموێ نابێ موسڵمانان لە وردەکاریدا جیاوازی بکەوێتە نێوانیان .
سوپاسی ئەویشمکردو وتم: سوپاس بۆ خوا کە ئەم زانایانەی لەم کۆبوونەوەیەدان، هەموو دانشمەندن و زانیارییان بە ئەندازەی ناوبانگیانە، لەبەر ئەوە هۆی کۆکردنەوەتان بۆ ئەم کۆڕە ئاشکرا دەکەم. ئێوە هەمووتان زانان و ئاگادارن کەلە سەردەمی پێغەمبەرداو (د.خ) دوای کۆچکردنیشی قورئانی پیرۆز کۆنەکرایەوەو نەنووسرایەوە. ئەوەبوو لە جەنگەکانی سەردەمی خەلیفە ئەبو بەکرو عومەردا خوا لێیان ڕازیبێ ، گەلێ لە یارانی پێغەمبەر کە قورئانیان لەبەر بوو شەهید کران. کە عوسمانی کوڕی عەفان، خوا لێی ڕازیبێ بووبە خەلیفەی ئیسلام لەوە ترسا ئەوانەی قورئانیان لەبەرە شەهید بکرێن، یان بە مەرگی ئاسایی بمرن و وەچەکانی دوای ئەوان لە ئایەتەکانی قورئان بێ ئاگا بن. ئەوە بوو لیژنەی تایبەتی دروستکردو کۆکردنەوەی قورئانی خستە ئەستۆی حۆی. لیژنەکەش زنجیرەی ئایەتەکانی قورئانی بەپێی زنجیرەی ئەو کەسانە تۆمارکرد کە ئایەتەکانیان لێوەردەگیرا، بەم جۆرە پەیرەویی ئەوە نەکرا کە بەپێی زنجیرەی ڕۆژانی هاتنە خوارەوەیان تۆمار بکرێن کە بریتین لە هەشت هەزارو سێ سەدو نەوەدو پێنج ڕۆژ. لە ئەنجامدا ئایەتەکانی قورئان کران بە دوو بەشەوە، بەشێکیان لەڕووی ناوەڕۆك و واتاوە پەیوەندییان پێکەوە هەیە، بەشەکەی تریان پەیوەندییان پێکەوە نییە. زانایانی ئیسلام لەم بارەیەوە ئاگادار بوون و ئاگادارن و دەزانن وا باشتربوو ئایەتەکان بە جۆرێ تۆماربکرا نایە کە ناوەڕۆك و واتاکانیان پەیوەندییان پێکەوە هەبوایە، بەڵام لە ترسی ئەوەی نەك لە دینی ئیسلامدا لە خۆوە داهێنان و دەستکاریی نوێ بێنە کایەوە، تا ئەمڕۆ زاتی ئەوەیان نەکردووە کە خۆیان لە قەرەی ئەم کارە بدەن و

ئایەتەکانی قورئان بەپێی ڕیزو زنجیرەی ساڵەکانی پێغەمبەرایەتیی موحەممەد(د.خ) تۆمار بکەن و جارێکی دیکەش قورئان بنووسنەوە...

ئێستاش بە ئامادە بوونی ئێوەی بەڕێز، کە گەورەترین و ناودارترین زانایانی ئیسلامن، ئەم بابەت و باسە دەخەمە ڕوو، پێشنیار دەکەم بەوردی لێی بکۆڵنەوەو ڕاوێژکارییەکی زۆر بکەن، تاکو لە ئەنجامدا بزانین ئایا دەکرێت ئەم کارە بکرێ، یان نا؟! وەئەگەر(بیدعەت)ە، وازی لێدێنین.

دوای ئەوە زاناکان داوایانکرد کە بواریانبدەم تا بە تەواوی لێکۆڵینەوەو ڕاوێژی خۆیان بکەن. پاشان لەهەمان مزگەوتا جارێکی دیکەش کۆبوونەوەو منیش لەگەڵیانا دانیشتم تاکو ئاگاداری سەرەنجامی دوا بڕیاریانبم. یەکەمین کەس کە زاری کردەوە(بەهائوددینی حەڵەبی)بوو، وتی: ئەی ئەمیر، دوای وتوێژو ڕاوێژی قووڵ گەیشتینە ئەنجامی ئەوەی کە دەبێ تاکو کۆتایی ڕۆژگار قورئان هەر وەکو خۆی بێ، تەنها یەك کەس بۆی هەیە دەستکاری زنجیرەی ئایەتەکانی قورئان بکات، ئەویش پێغەمبەری خوایە(د.خ) کەلە ڕۆژی بەریێ(قیامەت)دا دەردەکەوێتەوە، ئەوسا دەتوانێ ئەو زنجیرەیە بەپێی ڕۆژانی پێغەمبەرایەتیی خۆی ڕیز بکات... وتم: بەهائوددینی حەڵەبی، ئەم بۆچوونە پێویستی بەڕوونکردنەوەی پتر هەیە!... وتی: ڕۆژی هاتنە خوارەوەی ئایەتەکان ئاشکراو ڕوون نییە، کەس نازانێ هەر ئایەتێ لەچ ڕۆژێکدا هاتۆتەخوارەوەو کامیان پێش کامیان کەوتوون، تەنها هەر ئەوەندە دەزانین کام سوورەت لە مەککەو کامیان لە مەدینەدا هاتۆتەخوارێ، لەبەر ئەوە ناتوانین مەبەستی تۆ بەدیبێنین و ئایەتەکان و سوورەتەکانی قورئانی پیرۆز بەڕیزو زنجیرەی یەك لەدوای یەك دابنێین، لەهەموو جیهانیشا دانشمەندێك نییە بتوانێ بڵێ کام ئایەت لە فلان ڕۆژو ساڵدا هاتۆتە خوارەوە.

دوای ئەو (ئیبن خەلدوون) مۆڵەتی قسەکردنی وەرگرت و وتی: ئەی ئەمیر، تەنها هەر پێغەمبەری مەزن(د.خ) دەتوانێ ئەو هەنگاوە بنێت و هەندێ ئایەت لابەرێت و بیانخاتە لاوە، ئەگەر لەڕۆژی بەرێدا بە چاکی زانی ڕەنگە ئەو سا ئەو کارە بکا!... وتم: ئەی ئیبن خەلدوون، مەبەستی تۆ لە لابردنی هەندێ ئایەتی قورئان چییە؟! بۆچی دەتوانرێ وتەی خوا لە ناو قورئانا لابرێت؟! وتی: ئەی ئەمیر، ئایەت هەیە لەسەرەتای ئیسلامدا هاتۆتە خوارێ، ئایەتیش هەیە دواتر هاتووەتە خوارێ، بەپێی سوودی موسڵمانان فەرمانی ئایەتەکانی پێشتر،یان توندتر، یان ئاسانترو سووکترکراوە. یەکێ لەوانە سزادانی ژن و پیاوی

زیناکارە، لەسەرەتادا ئایەتی خوا هاتەخوارێ کە سزایان بەردبارانکردنە. بەهەمان دەستوور جوولەکەکانیش بەردبارانیاندەکردن.
پاش چەندان ساڵ لە سوورەتی نووردا ئایەت هاتە خوارێ کە سزای ژن و پیاوی زیناکار فەلاقە بێ بە قامچی. ئەگەر کەسێکیش تاوانی زیناکردن بداتە پاڵ کەسێك و نەتوانێ بیسەلمێنێ، دەبێ هەشتا قامچیی لێ بدرێت.
گومانی تێدا نییە کە دووەم ئایەت دوای ئایەتی بەردبارانکردن هاتۆتەخوارێ و فەرمانی سزادانیش فەلاقەیە بە قامچی .
بەڵام ئێمە ناتوانین ئایەتی بەردبارنکردنەکە لە قورئانا لابەرین و بیخەینە لاوەو بەشێك لەوتەی پیرۆزی خوا لە بەشێکی تر دابڕین. تەنیا کەسێ بۆی هەبێ و بتوانێ بیکا هەر پێغەمبەری خوایە(د.خ)، ئەویش لەڕۆژی بەرێدا وەکو بەندەکانی خوا زیندوو دەکرێتەوەو ئەوسا لەم بارەیەوە چی بە چاك زانی وا دەکات.
دوای ئەو(عیمادوددینی مەغریبی) وتی: لە ماوەی خەلافەتی خەلیفە(عوسمانی کوڕی عەففان)دا کە دوانزە ساڵبوو، قورئان کۆکرایەوەو نووسرایە، ئەم ئیشەش پێنج ساڵ، بەوتەیەکی تریش حەوت ساڵی پێ چوو. بێ گومان لیژنەکە ئاگاداری ئەوە بووەکە لە قورئاندا ئایەت هەن دواتر هاتوونەتە خوارێ و حوکمی ئایەتەکانی پێشتریان توندتر، یان ئاسانتر کردووە... دوای ئەوەی پشتگیریی لە بۆچوونەکانی ئیبن خەلدوون کرد، وتی: ناکرێ بوترێ کە خەلیفە عوسمان و لیژنەی تۆمارکردنی قورئانی پیرۆز بەوەیان نەزانیوەکە دەبێ و باشتریش وایە ئایەتەکان و سوورەتەکانی قورئان بەزنجیرەو بەڕیزو بەپێی ڕۆژی هاتنە خوارەوەیان بنووسرێنەوە، بەڵام لەبەر ئەوەی زنجیرەو ڕۆژەکانیان نەزانیوە نەیانتوانیوەئەو مەبەستە بەدیبێنن، جا ئەگەر دوای چواردە ساڵ لە کۆچی دوایی پێغەمبەر(د.خ) نەتوانرابێ ئەم کارە بکرێت، ئێمە لەم ڕۆژگارەدا چۆن دەتوانین هیچ هەنگاوێ بنێین ؟!
پاشان(موحەممەد کوڕی موسلمی لاذقي) وتی: ئەی ئەمیر، تۆ لە زانستی قورئاندا لەئێمە شارەزاتری و هەموو قورئانت لەبەرە، تەنانەت دەتوانی لە کۆتاییەوە بۆ سەرەتا لەبەر هەموو قورئان بخوێنی!! کەواتە نابێ بۆ زانایەکی وەکو تۆ بێ بیرکردنەوەو بێ پێشەکی باسی هیچ بابەتێ بکرێ، هەر بۆیە ئێمەت ڕاسپاردووە سەبارەت بە باسی ڕیزکردنی سورەتەکان و ئایەتەکانی قورئان ڕاوێژبکەین‌و لە ئەنجام ئاگادارتبکەینەوە... لە سەرەتای ئیسلامدا

لێکدانەوەی قورئان نەبوو، هەر کەس لەشتێ نەگەیشتایە، یان کێشەیەکی هەبوایە پرسیاری لە پێغەمبەر(د.خ) دەکرد، دوای کۆچی دوایی ئەو، زانیاری و تێگەیشتنی قورئانی پیرۆزهاتنە کایەوە، ئەوەش لەبەر دوو هۆ بوو: یەکەمیان پێغەمبەر(د.خ) نەما، تا موسڵمانان یەکەو ڕاست پرسیاری لێبکەن، دووەمیشیان ئەوە بوو دینی ئیسلام لە سنووری عەرەبستانەوە بەرەو وڵاتانی تری وەکو شام و عیراق و میسر و ئێران پەرەی سەندو بڵاوبووەوە، جا لەبەر ئەوەی ئەو وڵاتانە لە زمانی قورئان نەدەگەیشتن، کە زمانی عەرەبییە، موسڵمانان ناچار بوون ناوەڕۆکی قورئان بۆ خەڵکانی ئەو وڵاتانە وەرگێڕن و بۆیان لێکبدەنەوە. لەهەمان کاتیشا زانایانی ئەو وڵاتانە گەڵێ بایەخیان بەم لایەنەداوە، ئەوە بوو هەندێك لە زانایانی ئێران پەرەیان دابە زانیاریی تێگەیشتنی قورئان. ئەمڕۆکە حەوت سەدەی تەواو بەسەر سەرەتای ئەو زانیارییانەدا تێدەپەڕن و هەرچی لێکدانەوەی قورئانیشە بەپێی ڕیزو زنجیرەی خۆی کراوە، ئەگەر دەستکاری ئەم زنجیرەیە بکرێ هەموو لێکدانەوەکانی ئەم حەوت سەدەیە بەرەو لاوازی و شێواوی دەبرێن... لە ئەنجامدا بۆمان دەردەکەوێ کە ناکرێ دەستکاری ئەو ڕیزو زنجیرەیە بکرێ.

لە کۆتاییدا منیش وتم: کەواتە منیش لەگەڵ بۆچوون و بڕیارەکانی ئێوەدام، لەم ڕووەشەوە ڕاسپاردەم بۆ کوڕەکانم ئەوە دەبێ کە لە دوای من هەرگیز بیر لەم پڕۆژەیە نەکە نەوە.

کۆبوونەوەو ڕاوێژکاریی زانایان لە دیمەشق تەواو بوو، هەموو بەشدارانم خەڵاتکرد و بەدڵخۆشییەوە بەرەو وڵاتی خۆیان گەڕانەوە. لەهەمان کاتا دووەمین دەستەی لەشکری پشتگیری کە کوڕەکەم لە(کەش)ەوە ناردبووی بە فەرماندەیی(نووح بەدەخشانی) گەیشتە دیمەشق. ئەم فەرماندەیە لەهەموو ئەفسەرو فەرماندەکانم باڵا بەرزترو چوارشانەتر بوو. دوای گەیشتنی هەموو ئەو هێزە بەتوانایە، دەبوایە لە دیمەشقەوە بەرەو وڵاتی ڕۆم(تورکیەی ئێستا)بەڕێبم. بەڵام وەرزی زستانی سەخت هاتە پێشەوە، لەبەر سەختی و تووشیی ڕێگە، وام بەباش زانی تا وەرزی بەهار لە دیمەشقا بمێنمەوەو لە ئوردووگەکەی خۆمدا زۆربەی کاتم بەسەر بەرم. جاربەجار دەچووم بۆ مزگەوتی عومەرو لەگەڵ زاناکاندا کاتێکی بەکەڵکم بەسەر دەبرد، بە تایبەتی لەگەڵ(ئیبن خەلدوون)دا، کەلەسەر داواکاریی من لە دیمەشقا مایەوە. زۆربەی زۆری کاتم لەگەڵ سەربازەکانمدا بەمەشقکردنی سەختەوە ڕادەبورد، چونکە خواردنو

خـەوتن و ڕابـواردن و حەسـانەوە دوژمـنی پیـاوی جـەنگاوەرن و تەمــەڵ و خاویدەکەنەوە.!

دوای تەواو بوونی وەرزی زستان، ئەفسەران و سەربازەکانم زۆر بەتاسەوە بوون بەرەو وڵاتـی ڕۆم بـەڕێبین و بکەوینـە ناوجەرگـەی جەنگـەوە.پێـم وتـن: چەندین جەنگی سەختمان لە پێشەوەیە، ڕەنگە گەلێکمان لێبکوژرێت، بەڵام ئومێـدەوارم سەرکەوین، ئەوسا هـەمووزێڕو گەوهـەری سـوڵتانی ڕۆم(ئیلـدرم بایەزید) بۆ خۆتانە! دوای ئـەوەی ڕێـی(بیزانتیوم)دەگرینەبەر، خەزێنەیەك کە دووهەزار ساڵە لەسەر یەك کەڵەکە دەکرێت، دەبێتە هی ئێوەو دەستی بەسەردا بگرن...

## بیست و شەشەمین بەش

## بەرەو ڕۆم و جەنگ دژ بە( ئیلدرم بایەزید )

زۆربەی ئەو ڕێیانەی دەهاتە پێشمان شاخاوی و کوێرە ڕێبوون و سانو سوپاو سوپای لەشکرێکی فراوان نەیاندەتوانی لێیبدەن، لەبەر ئەوە ناچار بووم کە ڕێی شاری(قوونیە) بگرمەبەر.

دەمزانی گۆڕی(مەولەوی)، دانەری کتێبی(مەثنەوی)لەو شارەدایە. من ئەو پیاوەم خۆش ناوێ چونکە بە یەك چاو سەیری هەموو دینەکانی کردووە، بەڵام بە باوەڕی من دینی ئیسلام لە هەموو دینەکانی تر لە پێشترە. ئەفسەرەکانم وتیان: با گۆڕی مەولەوی هەڵدەینەوە، ئێسکوپروسکی دەربێنین! وتم: شەڕ کردنی(تەیموور گورگین)دژ بە مردوو نییە!! من بە تێکدانی گۆڕی مەولەوی خۆم ڕەزا گران ناکەم.

لە نزیك گڵکۆی(مەولەوی)یەوە خانەقایەك هەبوو، بڕێك دەروێش و سۆفی تێدا بوو، بە خوێندنەوەی هۆنراوەکانی(مەثنەوی) و گوێگرتن لێیان سەرقاڵ بوون و حاڵیاندەکرد. وام بۆ باسکرا کە حاڵیان لێدێ سەرخۆشدەبن. پرسیم: ئایا شەراب ئەخۆنەوە؟! وتیان نەخێر، هەرگیز شەراب ناخۆنەوەو ڕێز لە دەستوورو یاساکانی ئیسلام دەگرن..

پاشان داوامکرد کە سەرهەڵقەی سۆفییەکان بێتە لام.... کە هات سەیرمکردزۆر بە ساڵاچووەو ریشێکی سپی بەرداوەتەوە. لێم پرسی: ئایا تۆش حاڵدەکەی؟! وتی: بەڵێ، حاڵی ئێمەی سۆفی بە مەبەستی گەیشتنە بە چێژو نەشئەی ڕۆحانی، هیچ چێژێکی لەشی تێدا نییە!... لێم پرسی: ئایا ئێوەی سۆفی، ئیسلامن یا نا؟! وتی: بەڵێ موسڵمانین و پەیڕەویی دەستوورو یاساکانی دینی ئیسلام دەکەین. پرسیم: باشە، بۆچی لە خۆتانەوە ئەم شتانەتان داهێناوە؟

وتی: ئێمە هیچ شتێکمان دانەهێناوە. لەسەرەتادا کەلە عەرەبستاندا دینی ئیسلام هاتە کایەوە، لەبەر ئەوەی عەرەبەکان بیابانشین و کۆچەر بوون دەستوورەکانی دینیش ئاسان و سادە بوون تا بۆ هەمووان ئاسان بن و باش تێیانبگەن. لەهەمان کاتیشا ئیمانداران ڕۆچوو لەخوا پەرستیدا لە

دەستوورەکان و فەرمانەکانی خوا زیاتر خواپەرستیاندەکردو ئێستاش دەیکەن.

(عەلی کوڕی ئەبوطالب -خ.ر) شەوانە نوقمی دەریای خواپەرستی بوو، لەرادەبەدەر خەریکی نوێژو نزا و پاڕانەوە بوو لە خوای مەزن، دەگێڕنەوە کە زۆرجار لەهۆش خۆی دەچوو... ئێمەی سۆفییانیش ئەو کەسانەین کە پەیمانمانداوە پتر لە دەستوورو فەرمانەکانی خوای گەورە خواپەرستیبکەین و تێبکۆشین، کە لەبەندە ڕاست و دروستەکانی ئەو بین.

لە شاری(قوونیە)دا کەم مامەوە، لەوێوە بەرەو باکوور کەوتمەڕێ تا گەیشتمە ڕووباری(قزڵ ئیرماق). لەبەر ئەوەی وەرزی لافاو بوو،ڕووبارەکە ئێجگار سەریکردبوو، نەمتوانی لێیبدەم، بە چاکترم زانی بە درێژایی لێواری چەپی ڕووبارەکە درێژە بەڕێ بدەم. تا ئەو ناوچەیە هیچ شوێنەوارو نیشانەیەکی لەشکری(ئیلدرم بایەزید)مان نەدی.

(نووح بەدەخشانی) فەرمانەدەی دوو دەستەی پێشڕەوی مندبوو، بەردەوام لە هەموو هەواڵێ ئاگاداریدەکردم. (توقات)یش فەرماندەی دوارەی سوپا بوو. بەوەی کە هیچ شوێنەوارێکی هێزی دوژمن دیارنەبوو، ڕای بۆچووم کە پادشای ڕۆم دەیەوێ بمخاتە بۆسەیەکەوە. هەر چاوێکمان کردبوو بە هەزار چاو، زۆر لەسەر خۆو بەوردی ڕێمان دەبڕی، تا گەیشتینە جێیەك، دەشتێکی پان و بەرین دەرکەوت، وتیان ئەوە دەشتی (ئەنگوریە)یا _(ئەنقەرە). کە گەیشتینە ئەو دەشتە کاتی خۆرئاوابوونبوو. (نووح بەدەخشانی) هەواڵیدامێ ئۆردووگەیەکی زۆر گەورە دەبینێ، وا پێدەچێ لەشکرێکی زۆری تێدابێ. لە گوێ چەمێکان، کە بەرەو ڕووباری(قزڵئیرماق) دەڕۆی، هەڵماندا‌و داوامکرد کە سەربازەکان زوو بخەون و بحەوێنەوە بۆ ئەوەی بۆ ڕۆژی دوایی ئامادەی جەنگبن.لەبەر ئەوەی دوژمن زۆر نزیکبوو، بە هەموو جۆرێك و بەشێوەیەکی باش ئاگاداری خۆمانبووین.

لەبەر ئەوەی لە بارەی سوپای(ئیلدرم بایەزید)ەوە هیچ زانیارییەکم نەبوو، (توقات) و هەندێ سەربازی زۆر وریاو چالاکم نارد تاکو چەند سەرباز، یان چەند ئەفسەرێکی دوژمن بەدیلبگرن و بیانهێنن بۆم بۆ ئەوەی سەبارەت بە سوپای پادشای ڕۆم هەندێ هەواڵ بەدەستبێنم. بۆ نیوەشەو توقات بە دەستی بەتاڵ گەڕایەوەو پێنج سەربازیشی کوژرا بوو. وتی: دوژمن ئاگادارەو

نەمانتوانی هیچ بکەین!... بۆم دەرکەوت ڕۆژی دوایی جەنگێکی سەختمان لەبەردایە.

ئەو شەوە لە چادرەکەم هاتمە دەرێ و هەر گوێم هەڵدەخست سا بەڵکو دەنگێ بێتە گوێم، بەڵام لە هیچ لایەکەوە هیچ دەنگێ نەدەبیستراو هەموو لایەك شەوە زەنگی نووتەکبوو، ئەستێرەکان ئەوەندەی تر دەدرەوشانەوە. ڕوومکردە ئاسمان و لەدڵی خۆمدا وتم: ئەستێرەکان، ڕەنگە سبەی شەو تەرمی من لە گۆڕەپانی جەنگا ببینن، بەڵام ئێوە دەزانن من لە مەرگ ناترسم و دەزانم دەبێ هەموو کەسێ بمرێ، بەڵام نابێ مرۆڤ بە ترسەوە لەم دنیایە دەرچێ.!

لەگەڵ بەرەبەیاندا لەسەر چەمەکە دەستنوێژم هەڵگرت و نوێژمکرد. پاشان داوامکرد سەربازەکان لە خەو هەڵسێنندرێن. زوو هەموویان هەستان، لەهەمان کاتا گوێم لە دەنگی مۆسیقا بوو. زوو بۆم دەرکەوت کە مۆسیقای سوپای پادشای ڕۆمە؛ تەمەزە بەیانییانی ڕۆژانی جەنگ ئەو مۆسیقایە لێدەدەن. بەزووترین کات ئۆردووگەمان پێچایەوەو دەستە بەدەستەو تاقم بە تاقم لەدەشتی بەر بڵاوی ئەنگوورییەدا جێی خۆمان گرت. کیتەڵە هاوێژان کە شەوی پێشتر ئامادەمکردبوون لە شوێنی دیاریکراودا دامەزران.

من لە بێ ئەزموونی پادشای ڕۆم سەرم سڕما کە ئەو دەشتە پان و بەرینەی بۆ شەڕ هەڵبژاردبوو. سوپاکەی من هەموو سوار بوون، بیابان و دەشتی بەرینیش چاکترین گۆڕەپانی شەڕن بۆ سوار.

کە جەنگ دەستی پێکرد، بۆم دەرکەوت ئیلدرم بایەزیدلەمن بە ئەزموونترە. بۆیە دەشتایی هەڵبژاردبوو تاکو بە ئاسانی و زۆر کاریگەرانە گالیسکەجەنگییەکانی بخاتە گەڕ. لە شێوەی کەوانەیەکی زۆر گەورەدا گالیسکەکان کەوتنە گەڕ، زۆری پێنەچوو هەردوو سەری کەوانەکە لەیەکتری نزیکدەبوونەوە،دیار بوو دەیانویست بمانخەنە ناو بازنەیەکەوەو گەمارۆمانبدەن. سەرنجمدا گالیسکەکان هەر وەکو گالیسکەکانی جەنگی (دیمەشق)بوون. هەرچۆن دروێنەی گەنم دەکرێت، گالیسکەکانی دوژمن دروێنەی ئەفسەرو سەربازەکانی منیاندەکرد. هەر گالیسکەیەك برێك سەربازی تێدا بوون، بە کەوانی سپرنگی تیربارانی سەربازەکانمیان دەکرد، تیرەکان کەمێك لە پەنجە درێژتربوون، لەبەر ئەوەی زۆربەهێزەوە دەهاوێژران، بەرهەرکەسێ بکەوتنایە بە تەواوی دەچەقیە لەشی. دواتر نموونەی ئەو

تیروکەوانەم بردەوە بۆ(کەش و سەمەرقەند) لەوێ وەستاکان ژمارەیەکی لە رادەبەدەریان دروستکردن. دواتر بەناوی منەوە بە(تەیموورپالیك) ناوزەند کرا.

لەهەموو لایەکەوە گالیسکەکان لێمان نزیکبوونەوە، سەربازانی ناو گالیسکەکان تیربارانیاندەکردین. بۆم دەرکەوت ئەگەر زوو فریای خۆمان نەکەوین بە تەواوی گەمارۆ دەدرێین و ناشزانین سەرەنجام چی دەبێ. (توقات) و کیتەلە هاوێژەکانم بەرەو رۆژهەلات نارد و وتم: هەرچۆنێکتان کردووە نەهێلن گالیسکەکانی دوژمن گەمارۆمانبدەن. (نووح بەدەخشانی)م راسپارد هەرچی شتێ بەری گالیسکەکانی پێدەگیرێ بیخاتە گەر، وە ئەگەر زنجیر هەیە، بە سنگو مێخی تەویلەی ئەسپەکاندا قایم دایانکوتن بۆ خستنی ئەسپەکانی گالیسکەکانی دوژمن. منیش لەگەڵ هەندێ ئەفسەردا خۆمان تەرخانکرد بۆ پاراستنی قۆلی باکوورو باشوور. (توقات) زۆر بە چاکی ئەرکی خۆی بەجێهێنا. سوارە کارامەکان کیتەلەکانیان ئاگر دەدان و بە قۆچەقانی دەیانگرتە گالیسکەکان ، بەر هەر گالیسکەیەك بکەوتنایە یان ئەسپ و سەربازەکان دەکوژران، یان بە جۆرێ زامدار دەبوون لەکار دەکەوتن. بەداخەوە هەندێ کیتەلە بە هەندێ سەربازما تەقینەوەو کوژران.باشبوو توانیمان نەهێلین دوژمن لە قۆلی رۆژهەلاتەوە گەمارۆمانبدات و پەیوەندیشمان لەگەڵ ئۆردووگەکەماندا نەپچڕا، داوامکرد کە کیتەلەی زۆر بە بارووت داگرنەوەو بیانهێنین بۆ مەیدانی شەرو بەکاریانبێنن. لەهەمان کاتیشا بەردەوام زنجیری باریك و تەنافیان دەهێنان و لە گۆرەپانی جەنگا بە سنگی قاییم دایاندەکوتا بۆ رێگرتن لە گالیسکەکانی دوژمن.

هێشتا چواریەکی رۆژ تێنەپەریبوو، برێك سەربازم راسپارد کە خۆیان بگەیەننە گوندەکانی رۆژهەلات و باشوور بۆ وەدەستهێنانی داروتەختەو گوریس و تەناف و زنجیرو بەزۆرەملێ بەدانیشتووانی ناوچەکەی بگوێزینەوە بۆ گۆرەپانی جەنگ. برێکی تریشم راسپارد بەرووی دوژمندا بەربەستێکی باش لە کۆلەکەو دارو گوریس و تەختەو زنجیر دروستبکەن تاکو لە هێرشی لە ناکاوی شەو کوتی دوژمن پارێزراوبین.

لەو رۆژەدا ئەسپی هەر گالیسکەیەك کە لە گوریس و تەناف و زنجیرە داکوتراوەکان دەگیرا، سوارەکانمان هێرشیاندەکردە سەر ئەسپەکانو دەیانکوشتن، سەربازانی ناو گالیسکەکانیش ناچاردەبوون یان لە گالیسکەکانا دەرپەرنە دەرەوەو بجەنگێن و بکوژرێن، یان هەروا لەناو گالیسکەکاندا

بمێننــەوەو بکوژرێــن. هــەر ئــەو ڕۆژە بۆمــان دەرکــەوت کــە ئەگــەر بتوانــین گالیسکەکانی دوژمن لەکاربخەین، بە ئاسانی بەسەر دوژمندا زاڵدەبین.

هەر لەو ڕۆژەدا بۆ یەکەم جار ڕووبەڕووی سەربازی (نەصرانی) بووینەوە، ئەوەش بەوەدا دەرکەوت کە برێك لە سەربازانی دوژمن هاواریاندەکرد(ئیشۆ)، هــەندێکی تریشــیان هاواریــاندەکرد(یوحــان). دەمــەو عەســر گەڕامــەوە بــۆ ئاوئوردووگەکــەم کــە کــەوتبووە دواوەی بــەرەی جــەنگ، لــەوێ لــە چــەند گوندنشــینێکم پرســی: واتــای (ئیشــۆ)و (یوحــان) چییــە؟! وتیــان بــە زمــانی نەصرانییەکان(ئیشۆ) واتا حەزرەتی (عیسا)، (یوحان)یش واتا (یەحیا). هەر لەو ڕۆژەدا کــە یەکــەمین ڕۆژی جــەنگمانبوو، ســوارانی کەمــەند هاوێژانمــان توانیان بە هاویشتنی کەمەند گەلێك گالیسکە سست و خاوبکەنەوە، لەو کاتە شا تیر هاوێژان و شمشێر وەشێنان ئەسپەکانیان دەکوشت و گالیسکەکانیش لەکار دەکەوت.لە هــەمان کــاتدا دەبــوو هــەر چۆنــێ بوایــە دوو ڕۆژ بەســەختی بەرگریمان بکردایە تاکو بارووتی تەواوو پێویست دروستبکەین و لەبەر هەتاو هەڵبخرێت و وشکبێتەوە. بۆ کۆکردنــەوەی خــۆراك و ئــالیکیش ڕامسپارد لــە ناوچەکانی دەوروبەردا تا دەتوانن کۆیان بکەنەوەو خەڵکەکەش بە بێگار بگرن بۆ گواستنەوەی هەموو پێداویستییەك.

لەگەڵ خۆرئاوا بووندا شەڕ وەستاو سەربازەکانم بریندارەکانیان دەهێنایەوە بۆ ئوردووگەکــەمان تــاکو چــارە ســەری زامــەکانیان بکرێــت، بــەڵام نــەمانتوانی تــەرمی کوژاوەکــان دەرکــەین و بیــاننێژین. هێشــتادوو ســەعات لەشــەو تێنەپەڕیبوو گوێم لــە نــووزە نــووزی کــەمتیار بــوو، زانیــم بــەر بوونەتــە لاشــەی کوژراوەکانی گۆڕەپانی جەنگ.!

شەوێ چاوەڕێبووم لەهەر کات و ساتێکا هێرشبکرێتە سەرمان، کەچی لە پڕێکا ئاگاداریانکردم کە نوێنەری(ئیلدرم بایەزید) نزیکی ئۆردووگە بووەتەوەو دەیەوێ لەگەڵما بدوێ!... وتم: چاوی ببەستن و بیهێنن بــۆ لام. کــە هێنایانــە پێشــەوەو چاویــانکردەوە بــە زمــانی تورکــی لێــم پرســی: تــۆ کێیــت و بۆچــی هاتووی؟! وا خۆی ناساند کە ناوی(قودرەت تات)ەو یەکێکە لەسەر لەشکرانی پادشــای ڕۆم. هــەر دەمودەســت نامەیــەکی پادشــای ڕۆمــی دایــە دەســتم، کــە هــەڵمپچڕی، ســەیرمکرد بــە فارســی نووســراوە. نووســیبووی : تــەیموور بــەگ، کیتەڵە ئاگرینەکانت کە زۆر پشتیان پێدەبەستیت،، بە چاوی خۆت دیت ئەمڕۆ هیچیان نەکرد. تۆ لە ترسا لە گۆڕەپانی جەنگا هەڵهاتیتو ڕاتکردەوە بۆ ناو

ئۆردووگەکەت. چاکتر وایە بۆ سبەینێ لە کام ڕێوە هاتووی هەر لەو ڕێیەوە بگەڕێیتەوە، چونکە سبەینێ گالیسکەی زۆرتر دەخەمە گەڕو لەشکرەکەت لەناو دەبەم!

بە نووسەری تایبەتی خۆمم وت بەم جۆرە وەڵامی(ئیلدرم بایەزید) بنووسێتەوە:

من لە گۆڕەپانی جەنگدا هەڵنەهاتووم، بەڵکو گەڕامە دواوە بۆ ئەوەی فەرمانی پاشەکشەی لەشکرەکەم دەرکەم چونکە سوودی سوپاکەم لەوەدا بوو. سەرداری جەنگاوەر دەبێ هەمیشە قازانجی سوپای خۆی لەبەر چاو بێ. تۆ من بە ترسنۆك دەزانی و وا دەزانی لەبەر ترس لە مەیدانی شەڕ هەڵاتووم! بۆ ئەوەی بە لاوێکی وەك تۆ بسەلمێنم کە ناترسم، سبەینێ لەبەر چاوی هەموو ئەفسەران و سەربازانی هەردوو سوپا ئامادەم بێمە مەیدانی تۆوە، کە وەکو ئەڵێن بە شمشێرێك حوشترێ دەکەی بەدوو لەتەوە، هەر کامێکمان سەرکەوتین سەری ئەوی تر لەلەشی جیا بکاتەوە! من ئەمشەو جێنشینێك بۆ خۆم دەسنیشاندەکەم، تۆش وا بکە... جا ئەگەر ئامادەی دووبەدوو بەرەنگاری یەکتر بینەوە، پێش نیوەشەو ئاگادارمبکە.

دوای ئەوەی نامەکەم سەر مۆر کردو دامە دەست ئەفسەرە ڕۆمەمییەکە، بە دەمی ناوەڕۆکی نامەکەم بۆ ڕوونکردەوە، تاکو ئەگەر پادشاکەیان نەیوێرا ڕووبەڕوومبێتەوە، ناوەڕۆکی نامەکەم بۆ ئەفسەرەکانی تر باسبکات.

ئەو شەوە هیچ وەڵامێك دیار نەبوو، دیار بوو نەیوێرا بوو شەڕی نەفەر بە نەفەر بکات، لەجیاتی ئەوە چەند جارێ گالیسکەکانی لێمان نزیکدەبوونەوە، بەڵام سڵیاندەکردەوەو دەگەڕانەوە. بۆ ڕۆژی دوایی داوامکرد کە زۆر بە پەلە بڕێکی زۆر باڕووت دروستبکرێت.

دوای ئەوەی باڕووتەکە لە نزیك لێواری چەمەکەوە لەبەر خۆرهەڵخرا، دەمەو نیوەڕۆ لە ئاسۆدا پەڵە هەورێك دەرکەوت، لە ترسی باران هەرچی لبادێکمان هەبوو درا بە سەر ئەو باڕووتەدا. دەمەو عەسر ناڵەی هەورە تریشقە هەموو لایەکی گرتەوەو تاوی باران ئەوەندە بە خوڕ بوو دەتگوت تۆفانی (نووح) هەستاوە. لەوە ترسام ئاستی ڕووبارەکە بەرز بێتەوەو دەرمانپەرێنێ و ناچارببین کە بە تەورو شمشێر دڕ بە دوژمن بدەین و ژمارەیەکی زۆر کوژراومان لە گۆڕەپانی جەنگا بەجێبمێنێت!... بەڵام باشبوو، باران و لافاو دوژمنیشیان شەکەتکردبوو، لەبەر ئەوە نەیتوانی پەلامارمانبدات. ئەو شەوە بەیناوبەین

.باری‌و خۆشـیدەکردەوە، بـەڵام وەکـو یەکـەم جـار نـەبوو. هـەموومان لـە ..مادەبووندا بووین بـۆ کۆچکـردن. لەبەرەبـەیاندا بـاران وەسـتایەوەو ئاسـتی ..ووبارەکە کەمێك نزمبووەوە.

ڕۆژی دوایی خۆرەتاوێکی گەرم هەموو ناوچەکەی داپۆشی، وتم: باروتەکە لەبەر هەتاو هەڵخەن با وشکبێتەوە... ئەو ڕۆژە ئاگادارکرام کە ئەفسەرەکەی شەویَ هاتۆتەوەو نامەیەکی پێیە.وتم: چاوی ببەستن و بیهێنن. پادشای ڕۆم لە نامەکەیدا نووسیبووی: لەبەر نەخۆشی و ئازاری جومگە نـاتوانیَ ڕووبـەڕووم بجـەنگیَ. هـەروەها نووسـیبووی: ئـەمڕۆ پێنـج سـەد گالیسـکەی تـر دەگەنـە بەرەوەو لە تواناتا نییە دژ بە گالیسکەکانم بجەنگی، ئەم وڵاتە دەبێتە گۆڕی خۆت و سوپاکەت. ئەگەر لە ئۆردووگەکەشدا بمێنیتـەوە، هـەمووتان لەبرسـانا دەمرن. بەڵام ئەگەر ئەتەویَ واز لە سەرەڕۆیی و گیربوونی خۆت بێنی، ئامادەم ڕێتبدەم بە سەلامەتی بگەڕێیتەوە بۆ وڵاتی خۆت!..

لە(قودرەت تات)م پرسـی: ژمارەی لەشکری پادشـای تـۆ چەندە؟ وتـی: لـە پێنـج سەد هـەزار کـەس زیـاترە، ئەگـەر بشیـەویَ دەتوانـیَ هـەموو پیـاوانی ئـەم وڵاتە بێنێتە ناو سوپاکەیەوە. وتم: چۆن؟ وتی: لە کاتی پێویستیدا پادشا بۆی هەیە لەشازدە ساڵان و بەرەو ژوورتر بخاتە ژێر چەکەوە. پرسـیم: جا ئـەوەندە سوپای هەبیَ بۆچی تا ئێستا(بیزانتیۆم)ی داگیرنـەکردووە؟! وتـی: ئـەی ئـەمیر، ئەو شارە لەوبـەر ئاوەوەیـەو گرتـنی زەحمەتـەو کەشـتیی زۆری گەرەکـە. وتم: پادشـایەك ئـەوەندە دەسـەڵاتی هـەبیَ دەشـتوانیَ ژمارەیـەکی زۆر کەشـتی .روستبکات. وتـی: ئـەی ئـەمیر، دەتوانـیَ کەشـتیی زۆر دروسـتبکات، بـەڵام .توانیَ بیزانتیۆم داگیر بکات چونکە بەهەموو لایەکی دەریای دەوروپشتی ئەو .ارەدا چـەندان زنجـیرە زنجـیر بەسـت تـەنراون و ڕیَ لەکەشـتییەکان دەگـرن. .انەت(موعاویەی کوڕی ئـەبو سوفیان)یـش دوای دوو ساڵ گـەمارۆدانی ئـەو .ارە نەیتوانی بیگریَ و ناچاربوو بگەڕێتەوە دواوە.

وتم: ڕاسـتە، بـەڵام ئـەو لەبـەر ئـەو ئـاگرەی لەسـەر ئـاو بـەرپا دەکـراو .ەشتییەکانی دەسووتاند نەیتوانی سەرکەویَ، ئەوسا زنجیر بـەندی نـاو دەریـا .ەبووە. وتی: ئەی ئەمیر، زانیـاریی تـۆ پترەو من لـەو ئـاگرە ئاگـادارنیم. ئێسـتا ئەو ئاگرە نـەماوە. هـەر کـە هەست بەمەترسییەك بکرێت دەوروبـەری شـار بـە زنجـیر دەتـەندرت و ڕیَ لـە پاپۆڕەکـان دەگـرن. لەبـەر ئەمەیەکـە تـاکو ئـەمڕۆ پادشای ئێمە نەیتوانیوە بیزانتیۆم بگرێت.

بەم شێوەیە وەڵامی نامەکەم دایەوە: پیاو نابێ هەڕەشە بکات، دەبێ دەمی بگرێت و دەستبکاتەوە. لە گالیسکەکانی تۆ هیچ باکێکم نییە. لەبەر بەرژەوەندیی سوپاکەمە لێرە ماومەتەوە، هەر کاتێ بمەوێ بە ئارەزووی خۆم دەکەومە ڕێ. منیش ئازاری جومگەم هەیەو گەلێ جاریش زۆرم بۆدێنێ، بەڵام لەبەر ئەوەی بەردەوام نییە ڕێ لە شەڕکردن ناگرێ. من دەزانم تۆ ترسنۆکی و ناوێری ڕووبەڕووی من بجەنگی، چونکە پیاوانی بەجەرگ و چاونەترس هەمیشە لە پیاوانی ترسنۆك دەبەنەوەو بەسەریانا زاڵدەبن...

دوای نامەکەم دایە(قودرەت تات)، چاوی بەستراو لە ئۆردووگەکە بەڕێکرا.

سێ ڕۆژ لەسەریەك لە ئۆردووگەکەماندا ماینەوە . لە چوارەمین ڕۆژدا خۆمان ئامادە کردبوو بۆ گۆڕەپانی جەنگی سەخت و دژوار. بەرگی جەنگم پۆشی، سواری ئەسپەکەمبووم کەلە توخمی(کوکلان) بوو، ئەو ڕەگەزەش باشترین ئەسپی جیهانە. بە ئەفسەرەکانم ڕاگەیاند کە بە سەربازەکانیان بڵێن هەرچۆنێبووە دەبێ ئەمڕۆ کۆتایی بەشەڕ بێنین و سەرکەوین، جارێکی تر فەرمانی کشانەوە دەرناکەم. شمشێرێکی درێژم هەڵبژارد، شمشێربە دەستی ڕاست و تەوریش بە دەستی چەپەوە، لە یەکەمین ڕیزی سو پاکەمداو لەدوای کیتەڵە هاوێژەکانەوە بەرەو پیری مەرگ جێی خۆم گرت.

لەیەکەمین هەنگاودا بەرەو ڕووی گالیسکەکانی دوژمن بڕینەوە، کیتەڵە هاوێژەکان گوڕج لێیان هاتنە دەست و ئاگربارانیانکردن، گەلێ لە سەربازەکانی دوژمن کوژران و بڕێك لە گالیسکەکان وەرگەڕان و ئێمە هەر بەرەو پێشتر دەچووین. هەمیشە ئەسپێکی یەدەك بەدوامەوە بوو، بۆئەوەی ئەگەر ئەسپەکەم کوژرا زوو بەکاریبێنم. تیربارانی دوژمن وەکو شەستەباران بەسەرماندا دەباری و گەلێ جار زرنگەیان لە بەرگە ئاسنەکەم هەڵدەستان، بەڵام بەردەوام بەرەو پێشتر دەچووین تا گەیشتینە شوێنێك تەنیا هەر سەربازی پیادە بوون. ئاوزەنگیمان لێداو گەیشتینە سەر پیادەکان. ڕەشوێی ئەسپەکەم بە ددان گرت و بە هەموو لایەکا شمشێرو تەورم دەوەشاندن. سەربازێکی ڕۆمی بەشیر ورگی ئەسپەکەمی ڕاداو ئەسپە بە نرخەکەم لەدەستچوو، هەر خێرا تەورێکم کێشا بە بکوژی ئەسپەکەماو یەکەلامکردەوە. سەربازەکانم دڕیان بە گالیسکە سامناکەکانی دوژمنداو خۆیان گەیاندە پیادەکان. زۆربەی سوارەکانم بە شمشێر دەجەنگان،هەندێکیشیان تەوریان بەکاردەهێنا.

لە کاتێکا کە زۆر سەرگەرمی جەنگبووم تیرێك چەقیە ڕوومەتم، شیرەکەم خستە بنباڵی چەپمەوەو تیرەکەم دەرهێنایەوە، لەو کاتەدا کزەیەك لە پووزمەوە هەستا، لغاوی ئەسپەکەم توند کردەوەو هەستایەوە سەر هەردوو پاشووی، هەر لەو کاتەدا ڕمێك بەرەو ڕووم بووەو خێرا بە شیرەکەم دوو کەرتمکردو تەورێکم داهێنایەوە بۆ جەنگاوەرە ڕم بەدەستەکەو ناوشانیم شەقوپەقکرد. هیچ بوارم نەبوو برینەکانم بپێچم، درێژەم بەشەڕدا. دوای چەند خولەکێك ئەوەندەم زانی هەردوو پاشووی ئەسپەکەم چەمانەوە، لەگەڵ ئاوڕ دانەوەمدا، زرمەیەك لە تەپڵی سەرم هەستا، گورزێکی زۆر بەهێز بەر سەرم کەوت، بەری چاوم ڕەشبوو، بەربوومەوە. کە هاتمەوە هۆش خۆم لە چادرەکەمابووم، پۆشاکی جەنگم لەبەردا نەبوو. زانیم فریامکەوتوون و لە گۆڕەپانی شەڕدا ڕزگاریانکردووم.

بەر لەوەی مشووری زامەکانم بخۆم و داوای چارەسەر بکەم، دەربارەی گۆڕەپانی جەنگ پرسیارمکرد. زانیم کە گالیسکەکانی دوژمن لەکارکەوتوون و ژمارەیەکی ئێجگار زۆر لە سەربازانی دوژمن کوژراون ئەوانی تریش هەڵاتوون (ئیلدرم بایەزید)یش هەڵاتووە.

پرسیم: بۆچی هێشتتان پادشای ڕۆم رابکات؟ وتیان(نووحبەدەخشانی) برێك لە ئەفسەرەکانی خۆی دواخستوون و داوای لێکردوون تا دەستگیری نەکەن وازی لێ نەهێنین. ... بەڕاستی بەو مژدەیە ئەوەندە شادو بەختیار بووم ئاگام لە برینەکانم نەما. پزیشکەکەم وتی: هەرچەندە گورزێکی زۆر بەهێز بەرسەرت کەوتووەو گێژیکردووی، بەڵام ئەگەر پشوو بدەیت و بحەسێیتەوە وردە وردە چاکدەبی. دوایی پرسیم چۆن ڕزگار کراوم؟! بۆم باسکرا کە گورج(توقات) بە یاریدەی سەربازەکانی منیان ڕزگار کردووە.

کەشەڕ کۆتاییهات ئاگادار کرام ژمارەی دیلەکانی دوژمن شەست هەزار سەربازە. وتم دەبێ ئەرك و بژێویی هەر هەموویان لەسەر پادشای ڕۆمبێ، با دەست بەسەر سەرچاوەی داهاتی ئەوا بگیرێ تا خۆیشی دەگیرێ. لەهەمان کاتدا دەمویست بەزووترین کات بگەمە شاری(قەیساریە) کە پایتەختی پادشای ڕۆمبوو. دوای ناشتنی کوژراوەکان و چارەسەرکردنی بریندارەکان کەوتینە ڕێ.

نەمدەتوانی لەسەر ئەسپ خۆم بگرم، لەبەر ئەوە لەسەر قەرەوێڵەیەکی تایبەت ڕاکشام و هەڵیانگرتم. لەڕێدا پرسیارم لە دانیشتووانی ناوچەکە کرد،

بۆم دەرکەوت شاری(قەیساریە) دوو شوورەی هەن، یەکەمیان لە قوڕو بەرد و دووەمیان لەبەرد دروستکراوە. پێشبینیمدەکرد بەرەنگاری بەرگرییەکی زۆر ببینەوە، بەڵام کە لە شار نزیکبووینەوە کۆمەڵێك لە پیاوە هەڵبژاردەکانی شار بە پیرمانەوە هاتن و پێشوازییەکی باشیان لێکردین و بەخێرهاتنیانکردین و کلیلی شاریان دایە دەستم. کە دەربارەی (ئیلدرم)و خەزێنەکەی پرسیارمکرد وتیان پادشایان نەدیوەو خەزێنەکەشی گواستۆتەوە بۆ شاری(ئەنطاکیە). داوام لێکردن کە خۆراکی دیلەکان دابینبکەن، وتیان باشە بەسەر چاو.

چوومە ناو شارو لە کۆشکی پادشای ڕۆمدا دابەزیم. پادشای ناوبراو خێزانەکەی بردبوو بۆ شاری(ئەنطاکیە). دانیشتووانی شار ئەنجوومەنێکیان پێکهێنا، بڕیاریاندا دیلەکان سەرانە بدەن و بەربدرێن، ئەرك و خەرجی سوپاکەشم لەسەر گەورە دەفتەرداری پادشای ڕۆمبێ. داوام لەو دەفتەردارەکرد کە تا سبەینێ بە تەواوی حسابی هەموو داهاتی ساڵانەی پادشام بۆ ئامادە بکات. دەرکەوت کە نیو کروور بایەزیدی_ پارەی ئەو سەردەمەی ڕۆم_لە خەزێنەدایە، (کروور واتە پێنج سەد هەزار)، دەبوایە دوو کروورو نیوی تریش وەرگیرێ. بە گەورە دەفتەردارم وت: لە ئێستاوە من سوڵتانی ڕۆمم و دەبێ هەموو حسابێك بگاتە دەست من و خەزێنەی وڵاتی ڕۆم لەژێر چاودێریی خۆما بێ. هەر ئەو ڕۆژە فەرمانمدا لەهەموو شارە نزیکەکاندا جاربدرێ کە من پیاوێکی موسڵمانم، لەبەر ئەوە هەموو دانیشتووانی ڕۆمیش موسڵمانن. لاقەی کەس ناکەم و ئازاری کەس نادەم. دەبێ دەروازەکانی هەموو شارەکان لەڕووی خۆم و فەرماندەکانمدا والا بن. هەر شارێ بەرگریمبکات خاپووریدەکەم، پیاوەکان دەکوژرێن و کچ و ژنەکانیش بەدیلدەگیرێن و دەست بەسەر سامان و داراییشا دەگیرێ.

بۆ ڕۆژی دوایی تەتەرێکی زۆر گورج و خێرا هەواڵی گرتنی(ئیلدرمبایەزید)ی بۆ هێنام. هێنابوویانە ناو ئۆردووگەی دەرەوەی شاری قەیساریە، نامەیەکی ئەویان بۆ هێنام، نووسیبووی(چنین است رسم سرای درشت– گهی پشت برزین، گهی زین به پشت) واتە داب ودەستووری گەورەیی وایە، جارێ پشت لەسەر زینە، جارێ زین لەسەر پشتە. ئەی ئەمیری گەورە، چەرخی ڕۆژگار بووە هۆی تێکشاندنی من و سەرکەوتنی تۆ. ئەوەتا سەرو ماڵی من لەژێر دەستتایە، بەڵام من چاوەڕێم بەجۆرێ هەڵسوکەوتم لەگەڵابکەیت لەگەڵ ناوبانگی مەزنی تۆدا بگونجێ.

وتم: کە بەوردی چاودێریبکەن و ... لێبگرن، دوای سێ ڕۆژ بیهێننەوە لام. کاتێ هێنایان سەیرمکردپیاوێکی فەنەوە. وتم: ببوورە کە ناتوانم لەبەرت هەستم، چونکە نەخۆشم و هێشتا برینەکانی مەیدانی جەنگم چاك نەبوونەتەوە. دوای ئەوەی مۆڵەتم پێدا کە دانیشێ، وتم: نامەکەتم خوێندەوەو چاك تێگەیشتم، لەنامەکەتا دیارە کەلە لوتکەی خۆباییبوونەوە هاتوویتە خوارێ و تێگەیشتوویت کە پەنجەپێکانت دژی تەیمووری لەنگ هەڵەیەکی گەورە بوو.

(ئیلدرمبایەزید) وتی: ئەی ئەمیری گەورە، ئەگەر پادشایەك بهاتایەتە سەرت بۆ داگیرکردنی وڵاتەکەت و لابردنت لەسەر تەختی دەستەڵات و دارایی، چیتدەکرد؟! ئایا دژی نەدەوەستایت و نەدەجەنگایت؟ ئەگەر من هێرشمبکردایەتە سەر تۆ هەقی خۆتبوو توڕەبیت، بەڵام ئەوەتا تۆ هێرشتکردۆتە سەر وڵاتی من، من بەرگریمکردو بەخت هاوکارم نەبوو، من شکام و تۆ سەرکەوتی. وتم: قسەکانت پەسەند دەکەم، ڕاستە تۆ ناچار بووی دژبە من بجەنگی. من نامەوێ تۆ بکوژم، بەڵام داوای دوو شتت لێدەکەم، یەکەمیان دەبێ هەرچی خەزێنەو پارەو زێڕوگەوهەرت هەیە بمدەیتێ. وتی: بەڵێ، فەرمانت بەجێیە. وتم: دووەمین داواکاریم ئەوەیە کە دەبێ بۆ داگیرکردنی بیزانتیۆم یارمەتیمبدەی !... وتی: بە هەموو جۆرێ ئامادەم، بەڵام کەشتیم نییە. داگیرکردنی ئەو شارە پێویستی بە هەزارەها کەشتییە بۆ گواستنەوەی سوپابە ئەسپ و هەموو کەلوپەلێکەوە. ئەو کەشتییانەش دەبێ دروستبکرێن.

وتم: باشە بیزانتیۆم بەندەرێکی زۆر گەورەیەو دیارە کەشتی هاتو چۆ دەکات بۆ ئەوێ. وتی: بەڵێ وایە. وتم ئەو کەشتییانە لە کوێوە دێن؟ وتی: لە لاتی میسرو فەرەنگەوە(فەرەنسە) دێن و ئێمە دەستمان نایانگاتێ. پرسیم ئایا لە نێوان ئەم وڵاتەو بیزانتیۆمدا کەشتی هاتوچۆ دەکات؟! وتی: بەڵێ، ئەو کەشتییانە بچووکن و وەکو بەلەمن، توانای گواستنەوەی سوپایان نییە.

پرسیم: ئایا دەتوانن کەشتی دروستبکەن؟! وتی: بەڵێ، بەڵام ناتوانین وەکو کەشتییەکانی فەرەنگ دروستی بکەین چونکە وەستای باشمان نییەو داری باشمان نییە بۆ دروستکردنی کەشتیی گەورە . پرسیم: چ جۆرە دارێ پێویستە؟ وتی: داری بەڕوو، کە لە وڵاتی ئێمەدا نییە، وە داری سنەوبەر بۆ ستوونی کەشتی و ڕاگرتنی چارۆکەی کەشتییەکە. ئینجا بۆی باسکردم ئەگەر

ستوون و پەیکەری کەشتی لە سپیدار دروستبکرێت بەرگەی سێ حەفتە ناگرن، ئەو بەبایەکی توند دەشکێ و ئەویش لەناو ئاوا دەتلیسێتەوە. بەلام داری سنەوبەر، کە لە ولاتی فەرەنگا زۆرە، باش بەرگەی ڕەشەباو زریان دەگرێ و ناشکێتەوە.

وتم: من پێویستم بەو کەشتییانە نییە کە پەنجا ساڵ دەمێننەوەو هەر بەکەڵکدێن. من کەشتییەکم دەوێ لەم ولاتەوە من بگەیەنێتە بیزانتیۆم. کەشتیی سپیدار ئامانج و مەبەستی من جێبەجێدەکات، چونکە ئەو کەشتیانە زیاتر لەیەك، دوو ڕۆژێ لەدەریادا نامێننەوە.(ئیلدرم) وتی: گوێڕایەڵی فەرمانتم و چی بفەرمووی جێبەجێیدەکەم.

لەو کاتەدا هەواڵیان پێدام کە(کاتۆلیکۆس)ی سوڵتانیە، کە لە شامەوە ناردبووم بۆ لای پادشای فەرەنگ، گەڕاوەتەوە. قەشە مەسیحییەکان لە سەرەتادا لە (نەخچەوان)دا دەژیان. دوای ئەوەی سوڵتان موحەممەد خودا بەندە، کە کوڕی (جەنگیزخان)بوو لە ئازبایجان(سوڵتانیە)ی کرد بە پایتەختی خۆی، ئەوانی لە نەخچەوانەوە گواستنەوە بۆ سوڵتانیە.

کەلە شامبووم قەشەی سوڵتانیە هاتە شام و پێشنیاریکرد کە پەیوەندیی بازرگانیم لەگەڵ ولاتی فەرەنگا هەبێ، چونکە سوودی زۆرە. پاشان باسی کالای فەرەنگی بۆ کردم کە چەند باش و بەکەڵکە. پێشنیارەکەیم وەرگرت، داوام لە نووسەرێکی باش و شارەزای زمانی فەرەنگی کرد نامەیەکی باش بنووسێ بۆ پادشای فەرەنگ کە ناوی(شارلی شەشەم)بوو. تیایدا پێشنیارمکردبوو هەندێ بازرگان بنێرێ بۆ ولاتی من، منیش هەندێ بازرگان بنێرم بۆ ئەوێ تاکو پەیوەندیی بازرگانیمان سەقامگیر بێت و بەرەبەرە بەرەو پێشتر بچێت. لەگەڵ نامەکەدا کۆمەڵێ دیاریی باشم ئامادەکرد و دامنەوە دەست قەشەی سوڵتانیەو بردنی بۆ پادشای فەرەنگ. کە گەڕابووەوە، وەلامی نامەکەم و دیاریی پادشای فەرەنگی لەگەڵ خۆیدا هێنابوو بۆم.

کە قەشەی سوڵتانیە گەیشتە ولاتی ڕۆم نیازم هەبوو کەشتی دروستبکەم و پەلاماری ئەستەنبوڵ بدەم. قەشەی ناوبراو وتی: باشترین کەشتیی جیهان لە فەرەنسادا دروستدەکرێت ئەگەر مس بدەیت بە پادشای فەرەنگ چەند کەشتیت بوێ دەتداتێ، چونکە هەموو کانزاییەکیان هەیە، تەنیا هەر مسیان نییە، کە لای ئێمە بێ نرخەو لای ئەوان نرخێکی ئێجگار زۆری هەیە!...

پرسیم: پادشای فەرەنگ چەند کەشتیم دەداتێ؟ وتی: دەتوانێ هەرچی

کەشتیی فەرەنساهەیە بتداتیٚ، دەتوانیٚ هەزار کەشتیت بداتیٚ. وتم: هەزار کەشتی بۆ من کەمن، دەمەویٚ بەجاریٚ هەموو سوپاکەم بپەڕێنمەوە. وتی: کەشتییەکانیان زۆر گەورەن، هەندێکیان جێی پێنج سەد کەسیان تیا دەبێتەوە، ئەگەر پادشای فەرەنگ پێنج سەد کەشتیت بداتیٚ ئیشی تۆ زۆر ئاساندەبیٚ.

لە قەشەم پرسی: پادشای فەرەنگ چ جۆرە مسێکی دەویٚ؟ وتی: هەر جۆرە مسێکی بدەیتیٚ وەریدەگریٚ. فەرەنگەکان مس دەتوێننەوەو هەموو جۆرە شتێکی لیٚ دروستدەکەن. لە بەندەرەکانی ڕۆم و شامەوە مس بەرەو فەرەنگ دەگوێزنەوە.

دەستوورمدەرکرد لەهەموو ناوچەکانی ئێراندا، بە تایبەتی ناوچە شاخاوییەکان کە مسی زۆریان تێدایە، هەرکەسیٚ قاڵبە مس، یان مسی دروستکراو، یان مسە شکاوی هەیەو دەیەویٚ بیفرۆشیٚ، بە نرخێکی باش لێی بکڕن و بیگوێزنەوە بۆ وڵاتی ڕۆم و شام. جارێکی دیکەش قەشەی سوڵتانیەم بە دیاریی پاش و نامەیەکەوە ناردەوە بۆ وڵاتی فەرەنگ. لە نامەکەمدا بۆ پادشای ئەو وڵاتەم نووسی: مسێکی لەڕادەبەدەر لە وڵاتی مندا هەیەو هەرگیز تەواو نابیٚ.گەلی فەرەنگ چەندە مسیان بویٚ دەتوانین بیاندەینیٚ، لەبەرانبەریدا بە پلەی یەکەم پێویستیمان بە پێنج سەد کەشتیی چاك و باش هەیە کەلە بەندەرەکانی ڕۆمدا وەریانبگرین. ئەگەر کەشتییەوانە فەرەنگەکانیش بیانەویٚ خزمەتمانبکەن کارێکی زۆر باشەو مووچەی چاکیان بۆ دەبڕمەوە.

دوای ئەوەی قەشەی سوڵتانیە ڕۆی، بەرەو شاری بیزانتیۆم کەوتمە ڕیٚ بۆ ئەوەی لەدوورەوە ئەو شارە ببینم. ئاگادار کرابووم کە لەنێوان ڕۆم و بیزانتیۆمدا دەربەندێك هەیە، پانییەکەی شەش سەد تاحەوت سەد گەز دەبیٚ و قوڵاییەکەشی زۆر لەوە زیاترە. لە ڕۆژگاری کۆندا ئەو دەربەندە بۆ پەڕاندنەوەی ڕەوە گا بەکارهێنراوە. لەدڵی خۆمدا وتم: کە گا بتوانیٚ لەم دەربەندە بدات و بپەڕێتەوە، کەواتە سوپاکەی من ئاسانتر دەپەڕێتەوە.

لەو گەشتەما(ئیلدرم بایەزید) لەگەڵما بوو. دانیشتووانی ڕۆم دەیانزانی ئەگەر هەر سەرپێچییەك بکەن سەرەڕای ڕەشە کوژییان ئیلدرم بایەزیدیش دەکوژریٚ. بە کورتی دەریامان لێوەدەرکەوت و لە دوورەوە شاری بیزانتیۆم دیاربوو، کەوتبووە لای قوڵی ڕۆژئاواوە. سەرکەوتمە سەر گردێك بۆ ئەوەی چاك شار ببینم، ئەوەندە پان و بەرینبوو ئەم سەرو ئەوسەری دیار نەبوون.

لەناوەڕاستی شاردا دوورگەیەکی گەورەو درێژ دیار بوو، وتیان ناوی(شاخی زێڕە).

هەزاران بەلەم هاتوچۆیاندەکرد. شەوقی گومەزە زێڕەکانی کڵێسەکان چاویاندەبرد. وتیان داهاتی ئەو کڵێسانە ئەوەندە زۆرە، بە خەروار کەلوپەل و چراو جامی زێڕو گەوهەرو جەواهێر کەوتووە. وتیان: ئەگەر بیزانتیۆم بگری، هەر لە کڵێسەکاندا سەد خەروار زێڕت دەستدەکەوێ لەهەموو کۆشکێکدا خەزێنەیەکی تایبەت هەیەو زۆربەی زۆری بنەماڵە دێرینەکانیش خەزێنەی تایبەتی خۆیان هەیە. شارەزاکانیش ئاگاداریانکردم کە لەو شارەدا دوو چین هەن، یەکەمیان چینی دەسەڵاتداران، کە هیچ ناکەن، کاری سەرەکییان تەنها خواردن و خواردنەوەو ڕابواردن و خەوتنە. دوومیان چینی نۆکەرو ژێر دەستانەو تا مردن دەبێ لە خزمەتی یەکەمین چیندا بن.

بۆم دەرکەوت کە چینی دەسەڵاتدار دابەستەن و وەکو مرۆڤی داریـن و پیاوی گۆڕەپانی جەنگ نین، هەزار سەربازی من دەتوانن هەموویان بەدیلبگرن. دووەمین چینیش لەخوایان دەوێ خۆیان بدەن بەدەستەوەو ڕزگاریانبێ. لەبەر ئەوە گرتنی ئەو شارە ئاسانە،تەنها تەگەرەی سەرەکی هەر دەریایە. ئیلدرم بایەزید لە خوارەوەی گردەکەبوو، داوامکرد بیهێننەوە سەرەوە. دوای ئەوەی باسی ئەو زانیارییانەم کرد کە لە بارەی شارەوە ئاگادار کرابووم، لێم پرسی: چۆن هەتا ئەمڕۆ ئەم شارەت داگیر نەکردووە؟! لەوەڵامدا بۆی باسکردم کە چینی دەسەڵاتدار چەند سوپایەکی بەکرێگیراویان ڕاگرتووە، هەموو سەربازەکان بیانین، هەرکەسێ پارەی زیاتریان بداتێ بۆ ئەو دەجەنگن و هەموشیان مەسیحین!. پادشای بیزانتیۆم سێ سوپای کرێگرتەکەی خەڵکی وڵاتی (نیز، لومباردی و سویسی) هەیە.

لەو کاتەدا لەگەڵ(ئیلدرم بایەزید)دا دەدوام، سەیرمکرد لەناو کەشتییەکانی(توقات)دا دووکەڵێك بەرز بووەوە. ئیلدرم وتی: ئەی ئەمیر، وابزانم ئاگر لە کەشتییەکانت بەردراوە، وا پێدەچێ پادشای بیزانتیۆم بە هاتنتی زانیوە، وتم: ئەی ناکرێ ئەو ئاگرە خۆی کەوتبێتەوە؟ وتی: نەخێر، ئاگرەکە هەر لەسەر ئاوەکەوە گەیشتۆتە کەشتییەکان و گریان تێبەربووە... سەیر بکە وا کەشتییەکان دەگەڕێنەوە!...

لە ڕاستیدا خۆم ئەو کەشتییانەم ناردن بۆ وەرگرتنی زانیاری. دوانیان نەیاندەتوانی وەکو ئەوانی تر بگەڕێنەوە، دووکەڵیان لێهەڵدەستا. لەو کاتەدا،

چونکە نیوەڕۆ بوو، لە گردەکە هاتمە خوارەوەو لە مزگەوتەکەی خۆمدا نوێژمکرد. پاش ئەوەی لە مزگەوت هاتمە دەرێ، (توقات)م بینی زۆر شڵەژابوو. پرسیم: چی قەوماوە؟! وتی: ئەی ئەمیر، ئێمە زۆر ئارام و لەسەرخۆ بەبەردەم کەشتییە لەنگەرگرەکان و کۆشکەکانی شاردا دەڕۆیشتین تا گەیشتینە دەم دورگەی چیای زێڕ. لەپڕێکا کەشتییەك بەرەو رووەمان هات و پێش ئەوەی بگاتە بەرەوە شتێکی فڕێدایە سەر ئاوەکەو گەڕایەوە. دوو کەشتی لەپێشەوە دەڕۆیشتن، گڕیان لێهەستا، کەشتیوانەکان هەرچەندە هەوڵیاندا نەیانتوانی ئاگرەکە بکوژێننەوە. من تاکو ئەمڕۆ ئاگرم نەدیوە بە ئاو نەکوژێتەوە. بۆ ئەوەی کەشتییەکانی ترمان نەسووتێن ناچار بووم کە بگەڕێمەوە. پرسیم: دوو کەشتییەکە چییان لێهات؟ وتی: هەردووکیان سووتان و کەشتیوانەکانیشیان تیاچوون.

داوام لە(ئیلدرم بایەزید) کرد چەند پیاوێکی ناسراو شارەزای ئەو ناوچەیەم بۆ بانگبکات. کەهاتن، لێم پرسین: ئەو ئاگرە چییە ئەو دووکەشتییەی سووتاندو لەسەر ئاو بەرپا دەکرێت و بە ئاو ناکوژێنرێتەوە؟! ئیلدرم وتی: ئەی ئەمیر، ئەم ئاگرە تۆمارو کەتەلۆکی تایبەتی خۆی هەیەو هەزارو دووسەد ساڵ لەمەوبەر نووسراوەو پشتاو پشت پادشاکان بەیەکتری دەسپێرن و دوو خاڵ رەچاو دەکەن کە بەپێی بۆچوونیان فەرمانڕەوایی پادشای بیزانتیۆم بەوانەوە وا بەستەیە، یەکەمیان: پاراستنی کەتەلۆکی ئەم ئاگرە، دووەمیان: ئەو زنجیرانەی رێ لە کەشتی دوژمن دەگرن.

وتم: کەواتە هەر ئەم ئاگرە نهێنییە بووە، نەیهێشتووە(موعاویە) شاری بیزانتیۆم داگیر بکات! وتی: من نازانم موعاویە چیکردووە، بەلام ئەوەندە دەزانم کە بەر لە هەزارو دووسەد ساڵ تا ئێستا ئەم ئاگرەو زنجیرانەی ناو دەریا شاری بیزانتیۆمیان پاراستووە. وتم: چۆن بە درێژایی ئەم هەمووماوەیە بە نهێنیی ئەم ئاگرە نەزانراوە؟! یەکێك لە شارەزاکان وتی: هەر بە منداڵی پادشای دواڕۆژ فێری هێماو نهێنییەکانی ئەو ئاگرە دەکرێ، کە بەزمان و خەتێکی نهێنی نووسراونەتەوە. کە پادشا دەچێتە سەر تەخت، ئەو ساهەر خۆی دەزانێ کەتەلۆکە نهێنییەکە بخوێنێتەوەو شتەکان ئامادە بکات پاشان دەیداتە بەردەستەکانی، ئەوانیش ئاگرەکە هەڵدەکەن.

دەمەو ئێوارە جارێکی تر سەرکەوتمەوە سەر گردەکەو سەیری شارم کردەوە، بەڵام لەبەر ئەوەی خۆر لار بووبووەوەو لە چاومانی دەدا، بە باشی

شار دیارنەبوو... لەو کاتەدا بە وردی بیرم لەو ئاگرە دەکردەوە، هاتەوە یادم کەلە ناوچەی(باد کووبە -باکۆ) ئاگرێك لە زەوی بەرز دەبێتەوە ناتوانرێ بە ئاو بکوژێنرێتەوە، ئەوەندەش تینی زۆرە، کەس ناتوانێ نزیکیبکەوێ. لەم لاولەو لای گڕە گەورەکەشەوە گڕی بچووك بچووك هەن، ئەوانیش بە ئاو ناکوژێنرێنەوە، بەلام ئەگەر برێك خاك و خۆڵ بکرێتە سەریان دەکوژێنەوەو تا چەند ڕۆژێ هەڵناگیرسێنەوە. وای بۆچووم کە ڕەنگە ئاگری بیزانتیۆمەکان لە چەشنی ئاگری(باد کووبە) بێ و دەبێ بە خاك و خۆڵ بکوژێنرێتەوە.

بۆ شەوێ هەرچەندم کردو کۆشام نەمتوانی بخەوم و هەر بیرم لەوە دەکردەوە کە چۆن بتوانین لە کەشتییەکانماندا شتێك دروستبکەین بتوانێ گڵ بکا بەسەر ئاوەکەداو ئاگری پادشای بیزانتیۆم بکوژێنێتەوە!... ناردم بە دوای(توقات)داو هات، پێم وت: بۆ سبەینێ پێنج کەشتی ئامادە بکە و تا ئەتوانی گڵیان تێبکەو بڕۆرەوە بۆ هەمان شوێن ڕەنگە هەمان کەشتی بەرەو ڕووت بێت و هەمان ئاگر بەکار بێنێت، لە جیاتی هەڵاتن بەرەو ئاگرەکە بڕۆن و داوا لە سەربازەکان بکە لە ماوەیەکی کەمدا ( خۆڵ )خاکێکی زۆر بکەن بەسەر ئاگرەکەدا تاکو بکوژێتەوە!...(توقات) وتی: ئەی ئەمیر، ئەم کارە دەکەم.

بۆ بەرە بەیانی ڕۆژی دوایی سەرکەوتمەوە سەر گردەکە. پێنج کەشتییەکەی (توقات) بەڕێبوون. کاتێ لە شاخی زێڕ نزیکبوونەوە، کەشتییەکەی ڕۆژی پێشوو دەرکەوتەوە، شتێکی بەرەو کەشتییەکان هاویشت و کەوتە ئاوەکەوەو ئاگر بەربووەوە. کەشتییەکانی (توقات) بەرەو ئاگرەکە ڕۆیشتن و خاکیان بەسەر ئاگرەکەدا هەڵپرژان و لەبەر بەستی ئاگرەکەش تێپەڕ بوون. لەو کاتەدا لە یەکێك لە کەشتییەکاندا دووکەڵ هەستاو دوای ماوەیەکی کەم نەما. بۆم دەرکەوت کە ئاگری کەشتییەکەشیان بە خاك کوژاندۆتەوە.

عەسری ئەو ڕۆژە (ئیلدرم بایەزید) لە هەواڵی تاقیکردنەوەکەم ئاگادار بووبوو. هەواڵی بۆم ناردم، وتبووی: توانیت ڕێگەی چارەسەرکردنی یەکەمین نهێنی بدۆزیتەوە، ماوەتەوە سەر دووەمیان، ئەگەر چارەسەری ئەویش بدۆزیتەوە، شاری بیزانتیۆم بە هەموو گەنجینەو زێڕو جەواهیرو سامانیەوە دەبێتە هی تۆ.

سەعاتێ دواتر بە کۆتری نامەبەرا نامەیەکم بۆ هات، هەواڵم زانی کە (توگول)، میری(مەگنیسیە) کە دەکەوێتە ولاتی ڕۆمەوە، دەیەوێ بە سوپایەکی پێکهێنراو لە عێلەکانی (صاروخان، ساری قەمیش، کوردەکان و تاتارەکانی

ڕۆم) هێرشبکاتە سەرم. پاش ئەم هەواڵە گومانم لە(ئیلدرم بایەزید) پەیدا کرد. وام دەزانی ئەو جوولێنەری ئەو ڕاپەڕینەیەو هەواڵی بۆ میرەکانی تر ناردووە کە پشتگیری و هاوکاری میری مەگنیسیە بکەن. ناردم بە دوایداو هێنایان. وتم: تۆ هاندەری ئەم ڕاپەڕینەی! .. پێش ئەوەی بچم بۆ سەرکوتکردنەوەی ئەو ،ا خیبوانە تۆ دەکوژم! سوێندی خواردو وتی: ئاگام لە هیچ نییەو(توگول) بۆ ئەوەی نەکردووە کە من ئازاد بکرێم بەڵکو، ئەم بارودۆخەی بەهەل زانیوەو وای بۆ چووە کە لەبارە بۆ ئەوەی ببێتە پادشای ڕۆم، چونکە هەمیشە کەڵکەڵەی فەرمانڕەوایی وڵاتی ڕۆم لەسەریدا بووە، وا ئەمڕۆ ئەم هەلەی قۆزتۆتەوەو دەیەوێ فەرمانڕەوای بگرێتە دەست خۆی. وتم: ئەگەر ئەتەوێ بە زیندوویی بمێنی، هەر ئێستاکە نامەیەکی بۆ بنووسە، داوای لێبکە کە بڵاوە بە لەشکرەکەی بکات و بێ بۆ لام، ئەوسا سەرو ماڵ و فەرمانڕەوایی پارێزراوە، ئەگینا سزای سەختدەدرێن. لەبەر چاوی خۆم نامەکەی نووسی و مۆریکردو نامەکەم نارد بۆ(توگول). بەڵام توگول گوێی بە نامەکە نەداو هێرشیکردە سەر وڵاتەکانی ناوەندی ڕۆم. بەم جۆرە مەترسییەکی زۆرم بۆبەرپا کرا.

ئەگەر توگول ئەو ناوچانەو شامی داگیر بکردنایە دەبووە پادشای ڕۆم و ڕێگەی گەڕانەوەمی دەگرت. لەبەر ئەوە ناچاربووم خۆم ئامادە بکەم بۆ کوژاندنەوەی ئاگری ئەو ئاژاوەیە و دواتر بیر لە داگیر کردنی بیزانتیۆم بکەمەوە.

بە سوپاکەمەوە کەناری دەریام بەجێهێشت و بەو ڕێیەدا کە هاتبووم گەڕامەوەو هەوڵمدا بەپەلە بگەمە(توگول). یەکەم شەوی دوای ڕێبڕینێکی زۆر لە شوێنێکا هەڵماندا، دوای گەڕان بەناو ئۆردووگەکەمدا، چوومە ناو چادرەکەم و خەوتم. ئەو شەوە خەوێکی زۆر ناخۆشم دی، تا ئێستا خەوی وام نەدیوە.

لە خەوما مامۆستای سەردەمی منداڵیمم دی کە ناوی(عبدوڵڵای کوڕی قوطب)بوو، هاتە لام، سەیرمکرد زۆر خەمبارە. وتم: بۆچی خەمباری؟ ئایا ژیانی منداڵەکانت باش نییەو مووچەیان نەدراوەتی؟ وتی: ئەی ئەمیر، لەو بارەیەوە ئاسوودەم، بەڵام هۆی خەمباریم ئەوەیە کە تۆ دەمریت !... وتم: هەر کەسێ لە دایکبێ دەبێ بمرێ. من لە سەمەرقەند گۆڕم بۆ خۆم ئامادەکردووە، پیاوی وەك من لە مردن ناترسێ! ... وتی ئەی ئەمیر، تۆ سێ ساڵی تر دەمریت!! ئەم قسەیە قسەی بەرهەمەنەکەی هندستانی وەبیر خستمەوەکەلە بارەی پاشماوەی تەمەنی منەوە قسەیکرد... ویستم قسەکانی ئەو بەرهەمەنە

بۆ مامۆستام بگێرمەوە، بەلام ئەو ڕۆیشت و لەبەر چاو ونبوو. هەر لەو خەوەما وام زانی ڕۆژو مانگ و وەرزو ساڵەکان تێپەڕین و سێ ساڵی ڕەبەقم تەواو کرد. یەکێ لە فەرماندەکانم ئاماژەی بۆ هێلێکی دووروودرێژو بێ کوتاکردو وتی: ئەوە شووورە مەزنەکەی چینە.

وتم: چەندان شووورەی وام داگیر کردووە و ڕووخاندوومن. کە ویستم هەستەمەوەو نوێژ بکەم و سواربم هەستمکردکە لە پەلوپۆکەوتووم. زانیم خوریەی کتوپڕ لێیداوم و دەوروبەرەکەم وایانزانی کە مردووم، وتیان با لاشەی ئەمیر بگەیەنینەوە سەمەرقەند. لە لبادێکیان پێچام تا بمبەنەوە بۆ سەمەرقەند. لەو کاتەدا لە خەو ڕاچڵەکیم، کە چاومکردەوە سەیرمکرد ڕۆژ بۆتەوە!...

بەو خەوە زۆر سەخڵەت و خەمبار بووم، بەلام نەترسام، دەمزانی دەبێ هەموو کەسێ بمرێ خەیالانی خاوم لە خۆم دوورخستنەوەو هەستام نوێژمکرد. دووبارە ڕێمان گرتە بەر.(ئیلدرم بایەزید)یش کە دیلی منبوو، لەگەڵمابوو، ترسی ئەوەم هەبوو گەر بمێنێتەوە سەربازەکانی ئازادیبکەن و کێشەی سەختم بۆ بەرپا بکات.

کاتێ دەگەیشتمە هەر شوێنێ دەیانگوت::(توگول) هەمووانی تالانکردووە، خۆزگە سەری لەلەشی جیا دەکرایەوەو بەچاوی خۆمان دەمانبینی . بەلام توگول لە هیچ شوێنێ نەدەوەستا. بۆم دەرکەوت دەیەوێ ڕاکێشمانبکات بۆ ئازربایجان .هەواڵم پێگەیشت کە لەگەڵ سولتانی ئەو ولاتەدا یەکیانگرتووە، ئەگەر بچوومایەتە ناو ئەو ولاتەوە هەموو عەشایرە یەکگرتووەکانیان لێهاندەدام و سوپاکەم لەناو دەچوو. بە چاکم زانی ڕێ لە توگول بگرم و نەهێڵم بگاتە ئازربجان. بۆ ئەو مەبەستەش سێ هەزار سوار چاکی هەڵبژاردەم بە فەرماندەیی(توقات) بەرێکردن. توقات پیاوێکی خۆڕاگرو بە ئارامبوو، دەیزانی چۆن دڵی سەربازەکان ڕاگرێ و دڵسۆزو خۆبەختکەربن. داوام لە توقات کرد پێشی بگرێت و ئێمەش لە دواوە بیگەینێ و لەهەردوو لاوە بیگرینە بەرو مێشکی بپژێنین. هەر سەربازێکی(توقات) ئەسپێکی یەدەکشی پێبوو. کەوانەیەکی گەورەیان گرتەبەر تاکو بتوانن پێشگری لە توگول بکەن. ڕێگەی داوێنی باکووری کێوەکانی ڕۆمیان گرتەبەر کەلەو ناوچەیەدا پێیاندەلێن کێوەکانی(طوور). منیش یەکەو ڕاست دوای(توگول) کەوتم. کە گەیشتمە ناوچەی (سجك) گوێم لە شین و شەپۆڕی ژنانبوو. بۆم باسکرا کە پیاوانی ئەو ناوچەیە دژ بە توگول وەستاون و نەیانویستووە تالانیانبکات، ئەویش فەرمانی

کوشتنی هەموویانی داوەو هەموویان بەدەستی جەنگاوەرانی ئەو کوژراون.
بڕێك لە ژنانی ئەویێ بە شین و زاری و قوڕپێوانەوە هاتنە دەریێ و بەزمانی تورکی وتیان: ئەی ئەمیر، توگول هەموو پیاوەکانمانی کوشت و بە تەواوی تالانیکردین، تەنانەت بۆ بژێویی منالەکانمان یەك مەڕمان نەماوە، لەبەر برسێتی، ئەم پاییزو زستانە هەموومان دەمرین. وتم: ئەگەر دەستم بگاتە توگول هەرچیتانی بردووە لێی دەسێنمەوەو دەتاندەمەوە.
ڕۆژێکیان لە(توقات)ەوە هەواڵم بۆ هات کە لە دەربەندی(پەتك)دا خۆی قاییمکردکردووە، پێی وایە(توگول) دەیەویێ لەوێوە بچێت بۆ (دیاربەکر).
کە ئەو هەواڵەم وەرگرت خێراتر بەرێبووین بۆ ئەوەی زووتر بگەینە(توگول).
کە گەیشتمە دەربەندی پەتك ڕووبارێکمان دی کە سەرچاوەکەی (فوڕات)بوو، کە دوای ئەوەی ڕووباری تری دێتە سەر، ڕووباری فوڕات پێکدەهێنن.
(توگول) زۆر بەپەلەو خێرا دەڕۆیشت. پاسەوانی و دیدەوانی بۆ دواوەی سوپاکە دانەنا بوو، وە نەیدەزانی من شوێنیکەوتووم. کە(توقات) زانیبووی توگول لە دەربەندەکەوە دەڕوات، ژیرانە پاشەکشەیکردبوو بۆ لای ڕۆژهەلاتی دەربەندەکەو چاك خۆی قاییمکردبوو. شەویێ لەسەر بەرزاییەکانەوە چاومان لە ئاگری سوپاکەی (توگول)بوو: ئەگەر لە دەربەندەکەدا نەبووینایە هێرشمانکردە سەریان.
من خۆم گرت تا بە تەواوی لەشکری توگول لە دەربەندەکەبچێتە دەرەوە. ڕیێ بۆ چوونە دەرەوەی سوپاکەم کرایەوە. توگول بەهێزی(توقات)ی زانیبوو، هەر کە بەرەو پێشیێ هێرشیکرد، (توقات) لە پێشەوەو منیش لە دواوە هێرشی زۆر سەخت و دژوارمان کردە سەری. بە ماوەی دوو سەعات کەمتر لەشکری توگولمان گەمارۆدا. هەرچەندە هەوڵیاندا، نەیانتوانی دڕ بە گەمارۆکە بدەن.
سەربازانی صارووخەکان بەکوتەك شەڕیاندەکردو بە شێوەیەکی هونەری بەکاریاندەهێناو دەبوو فێری ئەو هونەرەش ببین.
سەربازانی (ساری قەمیش، کورد، تەتەری ڕۆم) بە قیمەکێشی گەورە دەجەنگان ! ئەویش چەکێکی کاریگەر بوو، بەر هەر کەسیێ بکەوتایە، یان دەیکوشت، یان لەپێیدەخست. سەربازە کوردەکانیش لەو جەنگەدا بە گورزو شمشێر دەجەنگان، ئەگەر لە گورز وەشاندن ماندوو بوونایە، شمشێریان لە

کێلان دەردەهێناو دەجەنگان. سەربازانی تەتاریش بە تیرو کەوان دەجەنگان و شمشێریشیان بەکاردەهێنا، بەڵام تیرو کەوانەکانیان کاریگەر تر بوون.

ئەگەر ئەو سەربازانە هی من بوونایە، سوپایەکی وام پێکدەهێنا هیچ هێزێ دەرەقەتی نەهاتایە. بەڵام لەبەر ئەوەی توگول لە هونەری جەنگدا شارەزا نەبوو ئەو سەربازە چاکانەی خستنە تەڵەو داوی گەمارۆوە. بە هۆی ئەفسەرەکانەوە چەندین جار داوام لەو سەربازانە کرد خۆیان بەدەستەوە بدەن بۆ ئەوەی نەکوژرێن. تەنها تاتارەکان خۆیان بەدەستەوە دا، بەڵام سەربازەکانی تر هەر دەجەنگان. تا نزیکەی خۆرئاوا بوون جەنگ درێژەیکێشاو هیچ سەربازێکی دوژمن دەرنەچوو، هەموویان کوژران، (توگول)یش بەزامداری گیرا.

ئەو ڕۆژە چوار هەزار سەربازم تیاچوون، بەڵام مەترسییەکی زۆر گەورەمان لەناوبرد. ئەگەر( توگول) بگەیشتایەتە ئازربایجان، لەگەڵ سوڵتانی ئەوێدا هێزێکی وایان پێکدەهێنا، لەوانە بوو نەمانتوانیایە بەسەریانا زاڵبین.

پاش نوێژی ئێوارە ناردم بە دوای(ئیلدرم بایەزید)ا پێم وت: بۆچی لەو پیاوە سەرسەخت و دلێرانە سوپایەکی بەهێزو خۆڕاگری وات پێکنەهێنا کەکەس نەتوانێ بەسەرتا زاڵبێ؟! وتی: مرۆڤ کاتێ نرخی شتێ دەزانێ کە لە دەستی دەرچێت. ئەوەتا ئێستا تێگەیشتم کە دەمتوانی کەڵکی زۆر لەو پیاوە دلێرانە وەرگرم، بەڵام وەرم نەگرت! دوای ئەوەی(ئیلدرم) ناردەوە جێی خۆی، داوای(توگول)م کرد بۆم بێنن. لەبەر ئەوەی برینداربوو، نەیدەتوانی بڕوات و لەسەر تەختەبەرە هێنایان. لێم پرسی: بۆچی دژی من هەستایت و سەرکێشیتکرد و پەنجەت لەگەڵما پێکا؟! وتی: من نەمویستووە سەرکێشیبکەم و دژ بە تۆ بجەنگم. ئەگەر نیازی جەنگم ببوایە بەرەو بیزانتیۆم دەهاتم. من ویستم بچم بۆ ئازربایجان بۆ سەردانی پادشای ئەوێ کە خزممە، بەڵام تۆ ڕێگەت لەمن گرت و سەربازەکانمت کوشت. وتم: کەسێ بڕوات بۆ سەردانی خزمی لەشکرێ لەگەڵ خۆیدا نابات!... تۆ بۆ ئەوە دەچوویت کە پێکەوە سوپایەکی بەهێز دروستبکەن. پاشان پرسیم: ئایا بە فەرمانی(ئیلدرم بایەزید) ئەم کارەتکرد؟! بە شێوەی نەفرەت و دەموچاوی گرژەوە وتی: ئیلدرم بایەزید تەنها خاوەنی ناوێکی زلەو هیچی تر! کەسێ پیاو بێ بە گوێی یەکێکی وەکو

ئیلدرم بایەزید ناکات!... (ئیلدرم واتە بروسکە). بە سیماو دەنگ و گوزارەی (توگول)دا بۆم دەرکەوت کە ڕاستدەکات. وتم: ئەی پیاو، هەرچەندە تۆ دوژمنی منیت و ئەمڕۆ ژمارەیەکی زۆر سەربازم بەهۆی تۆوە کوژراوە، بەڵام لەبەر ئەوەی پیاوێکی قارەمانیت ناتکوژم، ئەگەر لەگەڵما دۆستبی دەتکەمەوە بە فەرمانڕەوای(مەگنیسیە). بەڵام لەبەر ئەوەی زامەکانی زۆرو کاریگەر بوون، دوای سێ ڕۆژ مرد.

پێنج ڕۆژ لەناوچەی دەربەندی(پەتك)دا مامەوەو تەرمەکانمان بە خاك سپارد و زامدارەکانمان چارەسەر کرد. لەو ماوەیەدا هەواڵم بۆ هات کە پادشای ئازربایجان تا (ڕەی) داگیر کردووە، ئەگەر فریا- نەکەوم هەموو ناوچە چیاکان و عێراق داگیر دەکات و بەرەو فارس و گورگانیش دەکشێت. ئەو پیاوە دووریی منی بە دەرفەت زانیبوو، واتێگەیشتبوو کە ناتوانم بگەڕێمەوەو دژی بوەستم.

من دەمویست بیزانتیۆم بگرم، بەڵام ئەوە بوو ناچار بووم کە ڕێی ڕۆژهەڵات بگرمە بەرو ڕووەو ئازربایجان بڕۆم. لە پێشەوە گەیشتمە(دیاربەکر) لەوێشەوە ڕێی شاری(خووی)م گرتە بەر، ئەوەش باشترین ڕێبوو بۆ شاری(تەورێز). لەبەر ئەوەی لە وەرزی زستان دەترسام، زۆرتر پەلەمکرد تاکو بەر لەو وەرزە بگەمە ئازربایجان و ڕێمان لێنەگرێ.

پێش ئەوەی لە دەربەندی(پەتك) دەرچم، هەرچی تاڵانییەك کە(توگول) کردبووی دامەوە بە خاوەنەکانی. لەڕێدا پێیان وتم:(ئیلدرم بایەزید) زۆر نەخۆشە، ئەگەردرێژە بە ڕۆیشتن بدات دەمرێ. قایلبووم کەلە (دیار بەکر)دا بمێنێتەوە بە مەرجێ لەژێر چاودێریدا بێ. دوای ئەو قایلبوونەم، نامەیەکی ئەوم پێگەیشت نووسیبووی: من نەخۆشم و دەزانم بەم زووانە دەمرم، چونکە هەر لە زووەوە تا ئەمڕۆ هەر پادشایەك کە بە دیلگیراوە بەدیلی مردووە، ئەگەر بە نەخۆشیش نەمرم بە دیلی دەمرم. بەڵام تکام ئەمەیە کە نەهێڵی فەرمانڕەوایی لە بنەماڵەی ئالی عوسماندا نەمێنێ. لەسەرە مەرگما تەنها داواکاریم ئەمەیە کە کوڕەکەم بخەیتە جێی خۆم و لە باتی ئەویش پەیمانئەدەم لەگەڵتا ئەمەکداربێت و هەرگیز دژایەتیت نەکات. لە کۆتاییدا نووسیبووی: ئەگەر مردیشم ڕێبدە تەرمەکەم ببرێتەوە بۆ گۆڕستانی باوو باپیرانم و لەوێ

بنێژرێم. وەڵامم بۆ نووسیەوە: کوڕەکەت دەکەم بە پادشای ڕۆم و دەبێ باج و سەرانەم بداتێ.

پێش ئەوەی بگەمە ئازربایجان هەواڵی مەرگی(ئیلدرم بایەزید)م پێگەیشت. تەرمەکەیان بردبووەوە بۆ گۆڕستانی تایبەتی باوباپیرانی .

# بیست و حەوتەمین بەش

## لە ئازربایجاندا چیم کردو چیم بینی؟!

کە گەیشتمە ناوچەی(خووی) یەکەمین کزە بای پایز هەڵیکردلەچوونە ناو شاری (خووی) بە بێ هیچ بەرگرییەك دانیشتووان دەروازەکانیان خستنە سەر پشت. کە سەرنجی خەڵکی ئەو شارەمدا بۆم دەرکەت بە ناڕەوا وتراوە ئەوێ تورکستانی ئێرانە چونکە جوانیی(خووی) لەکوێ و جوانیی چاوو بڕۆی تورکستان لە کوێ!!. بەڕاستی من لە(خووی)دا هیچ کەسم نەدی ناشیرینبێ، وەك بڵێی یەزدان خاك و ئاوو خەڵکی ئەوێی بە جوانی خوڵقاندووە.

لە شارەزایانی ئەوێم پرسی ئێوە لە چ ڕەگەزو توخمێکن و بۆ ئەمەندە جوانن؟! وتیان: ئێمە لە ڕەگەزی خەڵکی(خەتا)ین و هەر لە ڕۆژگاری کۆنەوە باووباپیرانمان لەوێوە هاتوونەتە ئێرە. یەکێ لە هۆکارە سەرەکییەکانی جوانیی ئێمە ئەوەیە کەلە ناو خزمانا ژن و ژنخوازیمان نییە، لەبەر ئەوە جوانیمان پارێزراوەو بە هیچ جۆرێ منالی ناشیرینو خوارو خێچ و ناتەواومان نییە.

ئەو ماوە کەمەی کە لەوێ مامەوە بۆم دەرکەوت بۆ میوانداریی لە ڕادەبەدەرن و پلەیەکی زۆر بالأیان هەیە، لە ئێراندا بێجگە لەناوچەی گەیلان هیچ ناوچەیەکی ترم نەدیوە هێندەی خەڵکی(خووی) جوانبن. لە گەیلاندا ژنەکان زۆر جوانن، بەڵام تێکڕا پیاوەکان بەو ئەندازەیە جوان نین، کەچی لە(خووی)دا بەبێ جیاوازی ژن و پیاوهەموویان جوان و دڵڕفێنن.

ئەو وەرزە وەرزی تری و هەرمێبوو. بەناوبانگترین هەرمێ هەرمێی،(پێغەمبەری)بوو، کە لە گەورەیی و شیرینی و ئاوداریدا لەم سەرزەمینەدا وێنەی نییە!. مرۆڤی برسی بە تاقە هەرمێیەك تێر تێر دەبێ. جۆرە ترێیەکیشیان هەیە بە بینینی سەرم سڕما، هەر دەنکێکی هێندەی هێلکەیەك دەبێ!! و ڕەنگیشی سوورێکی ئاڵە. لەبەر گەورەیی دەنکەکانی، خەڵك بەناچاری ئاوەکەی دەگرن و دەیخۆنەوە. کووپەیەك ئاوی ئەو ترێیەیان بۆ گرتم و بەفریان تێکرد، کە خواردمەوە بۆم دەرکەوت خۆشترین و بەچێژترین شەربەتە.

لەبەر ئەوەی زستانی ئازربایجان زوو دێت، لە سەرێکی کەشەوە لە ترسی ژنە جوانەکانی ئەوێ، هەر وەك لەوەو پێش لە گەیلان زوو بەڕێبووم، لە ڕۆژێ زیاتر لە شاری(خووی) دانەمامەوە.

لە(خووی) کەوتمەڕێ و ڕێگەی (مەرەندم) گرتە بەر. کەلەو شارە نزیکبوومەوە، پێشەنگانی سوپاکەم ئاگاداریانکردم کە لە دەشتی لای

باشـــوورەوە خـــەڵکێکی زۆر دەبیـــنرێن، لەوانەیـــە ســـوپایەکبێت. دواتـــر ئاگاداریانکردوەوە کە ئەو خەڵکە ژن و منداڵن، هەر یەکەیان قەرتاڵەیەکیان بە کۆڵەوەیـەو لـەوە دەچـێ خـەریکی کۆکردنـەوەی بەرهـەمبن. جـارێکی تـر ئاگادارکرام کە لەو ناوچەیەدا هیچ کشتوکاڵێك نییە؛ ئەو خەڵکە هـەموویان خەریکی کۆکردنەوەی کرمن!. کە نزیکتر بووینە وەزانیم بە درێژایی هاوین لەو دەشـــتانەدا ئیـــش و کـــاری ژنـــان و منـــاڵانی(مـــەرەند) کۆکردنـــەوەی کرمی(قرمزی)یە، کەنرخو بایەخێکی زۆری هەیە بۆ ڕەنگکردنی فەرش و کاڵای ئازربایجان بە ڕەنگی سوور.

هـــەر ئـــەو ڕۆژە چوومـــە نـــاو شـــاری (مـــەرەند). لـــە(ســـلێمان) کوڕی(ئیلدرمبایەزید)ەوە، کە بەڕەزامەندیی خۆم لە جێی باوکی کرابوو بە سوڵتانی ڕۆم، نامەیەکم پێگەیشت، تیایدا نووسیبووی بۆ ئەوەی ئەمەکداریی خۆی بۆ بسەلمێنێ ئەوا بیست هەزار سەربازی خۆی بۆ یارمەتی دانم ڕەوانەی ئازربایجان دەکات وهەموو خەرجیو ئەرکێکیشیان دەکێشێ. پاش ماوەیەکی کورت هەموو سەربازەکان گەیشتنە جێ و دژ بە سوڵتانی ئازربایجان کە تاکو (ڕەی) م داگیر کرد، کەڵکی باشم لێوەرگرتن.

سوڵتانی ئازربایجان ناوی(سوڵتان ئەحمەد) و لە هۆزی(ئیلکانیان)بوو لە کـاتی ئاسـاییدا لـە(تـەورێز)دا دەژیـا. ئـەو ڕۆژەی گەیشتمە شـاری(مـەرەند) دانیشتووانی شار دەیانویست منداڵەکانیان بکەنە قوربانیی بەر پێم، دەیانگوت منداڵەکانمان لەبەر پێتا سەر دەبڕین چونکە تۆ هاتوویت بۆ ڕزگار کردنمان لە زۆرو ستەمی(سوڵتان ئەحمەد)! وتم: من نامەوێ هیچ کەس کوڕی خۆی بۆ من بکا بە قوربانی. دوای جێگیر بوونم لەشاردا، پیاو ماقووڵان هاتنە لام و باسی زوڵم و زۆری(سوڵتان ئەحمەد)یان بۆ کردم، وتیـان: هـەر ساڵێ وشك و بـێ بارانبێ، نەخۆشی بناڵێتە بەرو بـووم و ئاژەڵمـان و خەڵکەکـە نـەتوانێ بـاج و خـەراج بـدات، کچـان و کوڕەجوانـەکان دەبـەن و لـە بـازاڕدا دەیانفرۆشـن، هەرکەسێکیش کچ و کوڕی جوانی نەبێ چاوێکی هەڵدەکۆڵن، ئەگەر بۆ ساڵی دواییش نەتوانێ پووشانەو ئاژەڵانە بدات چاوەکەی تریشی هەڵدەکۆڵن!! ...

ئـەو سـواڵکەرانەی کـە لـە ئازربایجـاندا دەبیـنران هـەموویان بـەو دەردە برابـوون!... لـەو قسـانە زۆر سـەرم سـڕما، چونکـە هـەرگیز خـۆم ئـەو کـارەم نەکردووەو نەشمبیسـتبوو کـەس وایکردبـێ، وتراویشـە لاتولـووت لـە پـەنای خوادایە. پاشان پتر باسی زۆرو ستەم و سامناکیی سوڵتانی ناوبراوم بۆ کرا!

تەنانەت حەز لەهەر ژنێ بکا بەزۆری زۆرداری لە مێردەکەی جیایدەکاتەوەو دەیباتە ماڵی خۆی، دوای چەند ڕۆژێ بەرەڵایدەکات و ئیتر ئەو ژنە ناتوانێ بگەڕێتەوە لای پیاوەکەی و تووشی بەد ڕەوشتیش دەبێ. پرسیم: ئێوە چۆن لە سایەی زۆرو ستەمی پیاوێکی وادا ژیاون؟! وتیان: هەموومانی سەرکوتکردووە، هەرکەسێ سەرپێچی لەگەڵا بکات بەرەچەڵەکیدا دەچێتە خوارێ و دەستدرێژی ناشیرین و دزێویش دەکاتە سەر نامووسی ژنان و کچانی هەموو خێڵ و هۆزەکەی!! دوایی پاڕانەوەیەکی زۆر وتیان: ئەی ئەمیری مەزن، لە زۆرو ستەمی ئەم سوڵتانە ڕزگارمانبکە، تا دوا هەناسەی ژیانمان سەرمان لەڕێتایە.

لەو کاتەدا ئاگادار کرام کە(سوڵتان ئەحمەد) لەشاری (ڕەی)ەوە گەڕاوەتەوە (تەورێز) منیش بەرەو تەورێز بەڕێبووم. بیستبووم کە تەورێز شارێکی زۆر دێرینەو کەس نازانێ کەی دروستکراوە. لەبەر ئەوەی لەزستانی سەختی ئەو وڵاتە زۆر ترسم هەبوو، زۆر پەلەمکرد تاکو زووتر بگەمە بەرەوەو (سوڵتان ئەحمەد)یش نەتوانێ ئەوەندە خۆی قاییمبکات.سوڵتان داوای کۆمەك و لەشکرکێشیی لەسەرەك تیرەکانی ئازربایجان کردبوو، بەڵام لەبەر ئەوەی پیاوێکی ستەمکار بوو، خەڵکەکەش ڕقیان لێیبوو، بێجگە لە دوو سەرۆك خێڵ کەس بە دەنگیەوە نەهاتبوو، هێرشەکەی ئەوانیشمان زۆر بە ئاسانی تێکشکاند.

کە گەیشتمە بەرەوە، دەروازەکانی شار قایم داخرا بوون و شار ئامادەی بەرگریبوو، دەمودەست گەمارۆی شارمدا. بڕێك خەڵکی دەوروبەر هاتنە لام و وتیان: هەر جۆرە یارمەتییەکت بوێ ئێمە ئامادەین، بۆ ئەوەی زووتر شار بگریت و زۆرو ستەمی سوڵتان ئەحمەد بنەبڕ بکەیت، بەڵام تکامان هەیە دوای داگیرکردنی شار لەکوشتن و بڕین و تاڵانی دانیشتووان چاوپۆشی بفەرمووی. خەڵکی شار هیچ دەسەڵاتێکیان نییەو بێ تاوانن، ئەگەر بیانتوانیایە دەروازەکانی شاریان دەخستنە سەر پشت.

ڕۆژێك دوای گەمارۆدانی شار، پیاوێك هاتە سەر شوورەی شارو بەزمانی تورکی بانگیکرد:( ئەمیر تەیموور) کێیە؟ با خۆی پیشانی من بدات. پرسیاریان لێکرد: تۆ کێیت؟! وتی: من سوڵتان ئەحمەد ئیلکانیم، دەمەوێ لەگەڵ ئەمیر تەیمووردا بدوێم... لە چادرەکەم چوومە دەرێ و بەرەو شوورەی شار ڕۆیشتم، هاواریکرد ئەی تەیمووری لەنگ بە شەلینی پێی چەپتا تۆم ناسی !! هەر بە

تەنانەت حەز لەهەر ژنێ بکا بەزۆری زۆرداری لە مێردەکەی جیایدەکاتەوەو دەیباتە ماڵی خۆی، دوای چەند ڕۆژێ بەرەڵایدەکات و ئیتر ئەو ژنە ناتوانێ بگەڕێتەوە لای پیاوەکەی و تووشی بەد ڕەوشتیش دەبێ. پرسیم: ئێوە چۆن لە سایەی زۆرو ستەمی پیاوێکی وادا ژیاون؟! وتیان: هەموومانی سەرکوتکردووە، هەرکەسێ سەرپێچی لەگەڵا بکات بەرەچەڵەکیدا دەچێتە خوارێ و دەستدرێژیی ناشیرین و دزێویش دەکاتە سەر نامووسی ژنان و کچانی هەموو خێڵ و هۆزەکەی!! دوایی پاڕانەوەیەکی زۆر وتیان: ئەی ئەمیری مەزن، لە زۆرو ستەمی ئەم سوڵتانە ڕزگارمانبکە، تا دوا هەناسەی ژیانمان سەرمان لەڕێتایە.

لەو کاتەدا ئاگادار کرام کە(سوڵتان ئەحمەد) لەشاری (ڕەی)ەوە گەڕاوەتەوە (تەورێز) منیش بەرەو تەورێز بەڕێبووم. بیستبووم کە تەورێز شارێکی زۆر دێرینەو کەس نازانێ کەی دروستکراوە. لەبەر ئەوەی لەزستانی سەختی ئەو وڵاتە زۆر ترسم هەبوو، زۆر پەلەمکرد تاکو زووتر بگەمە بەرەوەو (سوڵتان ئەحمەد)یش نەتوانێ ئەوەندە خۆی قاییمبکات.سوڵتان داوای کۆمەك و لەشکرکێشیی لەسەرەك تیرەکانی ئازربایجان کردبوو، بەڵام لەبەر ئەوەی پیاوێکی ستەمکار بوو، خەڵکەکەش ڕقیان لێیبوو، بێجگە لە دوو سەرۆك خێڵ کەس بە دەنگیەوە نەهاتبوو، هێرشەکەی ئەوانیشمان زۆر بە ئاسانی تێکشکاند.

کە گەیشتمە بەرەوە، دەروازەکانی شار قایم داخرا بوون و شار ئامادەی بەرگریبوو، دەمودەست گەمارۆی شارمدا. بڕێك خەڵکی دەوروبەر هاتنە لام و وتیان: هەر جۆرە یارمەتییەکت بوێ ئێمە ئامادەین، بۆ ئەوەی زووتر شار بگریت و زۆرو ستەمی سوڵتان ئەحمەد بنەبڕ بکەیت، بەڵام تکامان هەیە دوای داگیرکردنی شار لەکوشتن و بڕین و تاڵانی دانیشتووان چاوپۆشی بفەرمووی. خەڵکی شار هیچ دەسەڵاتێکیان نییەو بێ تاوانن، ئەگەر بیانتوانیایە دەروازەکانی شاریان دەخستنە سەر پشت.

ڕۆژێك دوای گەمارۆدانی شار، پیاوێك هاتە سەر شوورەی شارو بەزمانی تورکی بانگیکرد:( ئەمیر تەیموور) کێیە؟ با خۆی پیشانی من بدات. پرسیاریان لێکرد: تۆ کێیت؟! وتی: من سوڵتان ئەحمەد ئیلکانیم، دەمەوێ لەگەڵ ئەمیر تەیمووردا بدوێم... لە چادرەکەم چوومە دەرێ و بەرەو شوورەی شار ڕۆیشتم، هاواریکرد ئەی تەیمووری لەنگ بە شەلینی پێی چەپتا تۆم ناسی !! هەر بە

تورکی پرسیم: ئایا تۆ سوڵتان ئەحمەدی؟! وتی: بەڵێ... وتم: دەزانی زۆر بەد ڕەوشتی؟! مرۆڤی بێ مێشک زۆر بێ ئەدەبە! پرسی: بە چیدا دەزانی بێ ئەدەبم؟! وتم: چونکە قسەی ناپەجێ دەکەیت و جنێو دەدەی! وتی: من جنێوم نەداوە، تەنها وتم شەل. وتم: بۆم دەرکەوت کە بەپێی لێکدانەوەی من زۆرتر بێ ئاوەزو بێ ئەدەبی، چونکە هێشتا نازانی کە باسکردن و بەچاودانەوەی کەمئەندامیی مرۆڤ جنێودانی گەورەیەو تەنها پیاوی گەمژەو بەدڕەوشت ئەو کارە دەکات!!... وتی: دەزانی بۆ بانگمکردووی؟! وتم: بڵێ... وتی: دەمەوێ چاک بمناسی و بزانیت باوباپیرانی من هەموویان لە سوڵتانەکانی ئیلکانین و جیهانگیرو چەندە مەزنن!.. وتم: باوباپیرانی تۆ بەهیچ جۆرێ ناگەنە باپیرە گەورەی من کە (چەنگیزخان)ە، لەگەڵ ئەوەشدا باپیرم لە گۆڕدا نایەتە دەرێ و یارمەتیم نادا، من دەبێ خۆم پیشانیبدەم تاچ رادەیەک پێشیاو لێهاتووم..
وتی: دەمەوێ ئامۆژگارییەکتبکەم! وتم: ئامادەم!.. وتی: چەنگیز نەهات و کوڕەکەی ناردووە، چونکە دەیزانی ئەگەر بهاتایە ئەم وڵاتە دەبووە گۆڕستانی. تۆ کە ئەوەی ئەوی، لە باپیرت ئەزموون وەرگرە، هەر ئەمڕۆ ئوردووگەی خۆت بپێچەرەوەو بڕۆ، بۆئەوەی بتوانی بە ئاسایی ژیان بەسەر بەری!.. وتم: من لە مەرگ ناترسم، ئەگەر وا بوایە نەدەهاتمە ئێرە!.. وتی: من هەرگیز لە مردن ناترسم! وتم: وانییە، ئەی ئەوە نییە پەناتبردووەتە بەر شوورەی تەورێز!..
وتی: ئەمە لەبەر ترس نییە بەڵکو بۆ پاراستنی ژیانی سەربازەکانم و دانیشتووانی شارە... وتم هیچ قسەیەکی ترت پێ ماوە؟! وتی: ئەگەر ئەڕۆی قاچەکەی دیکەشت شەلدەکەم!

لە پێنجەمین ڕۆژی گەمارۆدانی شاردا، بیست هەزار سەربازەکانی (سلێمان کوڕی ئیلدرم بایەزید) گەیشتنە جێ. فەرماندەکەیان کە ناوی (ئەصعەت ئاڵتوون) بوو سڵاوی سوڵتانی پێگەیاندم. وتی: کە شەش ڕۆژ بەڕێوە بوون بۆ ئەوەی زووتر بگەنە بەرەوە.

بۆ داگیرکردنی شاری تەورێز پەنام نەبردە بەر تونێل و بارووت، چونکە بە شێوەیەکی ئاسایی و ئاسانە توانیم لە سوڵتان (ئەحمەد ئیلکانی) بیسەنمەوە. جەنگی تەورێز تەنیا هەر دە ڕۆژ درێژەیکێشا. هێرشبردنمان لە ڕاپەڕینی گەڕەکی شامەوە دژبە سوڵتان ئەحمەد دەستی پێکرد. نەژادی دانیشتووانی ئەو گەڕەکە دەچووەوە سەر جەنگیزخانی باپیرم، کە مەغۆڵبوون. کاتێ بەهەواڵی ڕاپەڕینەکەیانمزانی بەپەیژە و بەسەر شوورەی شاردا چەند هەزار

سەربازێکم نارد بۆ یارمەتیی ڕاپەڕیوەکان. ڕاپەڕینەکە دوو ڕۆژ درێژەیکێشا، ئێمەش لەهەموو لایەکەوە هێرشماندەبردە سەر سەربازانی دوژمن. ئەو بیست هەزار سەربازەی بۆ یارمەتی گەیشتبوونە بەرەوە نەبەردێکی زۆر باشیان نواند، لە ئەنجامدا دەروازەکانی شار کرانەوە. (سوڵتان ئەحمەد) خێرا هەڵهات، بەڵام زوو دەستگیر کرا. پێش ئەوەی بیهێننە لام، جەماوەرو خەڵکی شار هەلا هەلایانکرد بوو.

لە ڕۆژانی کۆتایی جەنگدا(شێخ مەسعوودی شەبستەری) لە شەبستەرەوە هاتە لام و وەکو خەڵکانی تر پاڕایەوە کە دانیشتووانی شار لەهەموو سزایەکی جەنگ بپارێزم، بە تایبەتی بەشێك لە دانیشتووان دژی سوڵتانی زۆردار ڕاپەڕیون، جەنگیش زوو کۆتاییهات... منیش تەنها دەستم بەسەر دارایی سوڵتان ئەحمەددا گرت. بە کوشتنی ئەو پیاوە ستەمکارو زۆردارە زنجیرەی بنەماڵەی ئیلکانییان(ئیلخانییان) دوایی پێهێنرا.

(غازان خان) کە نەوەی(جەنگیزخان) بوو، بەردی بنچینەی گەڕەکی(شام)ی لە تەورێزدا دانابوو، لە ساڵی(٧٠٣) حەوت سەدو سێیکۆچیدا مردبوو، هەر لەو گەڕەکەشدا نێژرابوو. چوومە سەر گۆڕەکەی و فاتحەم بۆ خوێند. پاشان چووم بۆ سەردانی ئەو قوتابخانەو خانەقایەی کە(غازان خان) دروستیکردبوون. دەروێشەکانی خانەقا بە حاڵکردن پێشوازییان لێکردم. لەوێ زانیم کە لە کاتی ڕاپەڕینەکەیاندا دوازدە کەسیان لێکوژرا بوون. پاشان سەرم لە مزگەوتی (عەلی شای گەیلانی)دا، ناوبراو وەزیری(غازان خان) بوو بوو، ئەو مزگەوتەی بە پارەی گیرفانی خۆی دروستکربوو، چەند جۆگە ئاوێکی پاك و جوانی بۆ مزگەوتەکەی ڕاکێشا بوون، گومبەزو دیوارو تەختی مزگەوتەکە، هەموویان بە مەڕمەڕی نایاب داپۆشرابوون. ڕووبارێ ئاوی سازگارو خاوێن بە ناوەڕاستی مزگەوتا دەڕۆیشت و لەم بەرو لەو بەرەوە خەڵك دەستنوێژیان دەگرت.

دوای سێ ڕۆژ بازاڕەکان کرانەوە، منیش بەناویانا گەڕام. هەموو کەلوپەل و کالایەکی جوان و نایاب بەر چاودەکەوتن. دوو بازاڕی تایبەتیم دی، یەکێکیان بازاڕی گەوهەر فرۆشانوئەوی دیکەیان بازاڕی عەنبەر فرۆشان . لەبەر هەر دووکانێکی گەوهەر فرۆشا پیاوێکی ڕێکوپێك و قۆز و پۆشتە وەستابوو، هەر فەرمووی لەخەڵك دەکرد. زۆربەی کڕیاران ئافرەتانبوون، بۆیە پیاوی جوانیان بە پۆشاك و سەرو کلاوی ڕەنگاو ڕەنگەوە هەڵدەبژارد بۆ فەرمووی کڕیاران. کە

چوومە بازاڕی عەنبەر فرۆشان بە بۆنی خۆش و بێ هاوتا مەستبووم. سەرەڕای عەنبەر هەموو گولاوێکی نایاب دەفرۆشرا. عەتری گوڵە سوورەی(موحەممەدی)و عەتری گوڵە زەردەی(موحەممەدی)ی تەورێز لە جیهاندا هاوتایان نییە. من وەك پێغەمبەر(د.خ) حەزم لە عەترە و چێژی لێوەردەگرم، چونکە مرۆڤ لە تەمەڵی و سستی دوور دەخاتەوە...

شارەزایانی عەتر بۆیان باسکردم کەلە وەرزی گوڵدا لەخەرواریك گوڵی سوور، یان زەردی موحەممەدی تەنها یەك مسقاڵ عەتر بەدەستدێنن، نرخی ئەو عەترەش سێ مسقاڵ ئاڵتوونە. ئەو ڕۆژە بڕێك عەتری باشم کڕی.

لە تەورێزدا دوو ڕووبار هەیە، ڕووباری (میهران) وڕووباری (سارد)،هەردووکیان لەکێوی (سەهەند)ەوە هەڵدەقوڵێن کە دەکەوێتە باشووری تەورێزەوە. ئاوەکە یان ئەوەندە ساردە هاوینان بەفریناوێت.دوای ئەوەی هەردووکیان دەچنەوە سەرڕووباری (سەراو)، دەڕژێنە ناو دەریاچەی جیجەست (ورمێ).

ڕۆژێکیان بۆسەیری قوماش وکووتاڵ چووم بۆ بازاڕی تەورێز.بەڕاستیقوماشی(دیبا،ئەتڵەس،ئاوریشم وخوری) یتەورێز زۆرنایاب وباشن،تەنانەت لە فەرەنسەداکڕیاری باشیان هەیەو بازاڕیان گەرمە.

بەرلەوەی بچمە ئازربایجان، بەتاسەوە بووم سەر لە شارۆچکەی (شەبستەر)بدەم وبچمە سەر گڵکۆی (شێخ مەحموودیشەبستەری)، فاتحەی بۆبخوێنم ولەخوابپاڕێمەوە کە بیبەخشێ.ئەو پیاوە مافی زۆری بەسەر منە وە هەیە، من بە خوێندنەوەی کتێبی(گوڵشەنی ڕاز) فێری زۆرشتی بەکەڵك بووم وتاهەتایە کەڵکیئەوکتێبە بەنەمری دەمێنێتەوە. ئەو کتێبە نزیکەی هەزار دێڕ هۆنراوەی لەخۆ گرتوون ، لەگەڵ ئەوەشدا زۆر بەکەڵك و کاریگەرە. ( جەلالە دینی ڕۆمی )ی لەکتێبی (مەثنەوی )دا بیست وحەوت هەزار دێڕ هۆنراوەی تۆمار کردوون ، هەرکەس بیخوێنێتەوە لەوانەیە کافرببێ!!، چونکە بەیەك چاوسەیری هەموو ئایینەکان دەکات . ئەم بۆچوونە بە تەواوەتی پێچەوانەی دەقی ڕوون و ئاشکرای قورئانە،کەپترلەدووسەد ئایەتا خوا دەفەرموێت دینی ئیسلام لەدینەکانی تر بالا ترو لەپێشترە.

کە شێخ ( مەسعوودشەبستەری)م لەسەردانەکەم ئاگادارکرد، زۆرپێی خۆشبوو ،وتی : ئەی ئەمیر، بڕوام وایە کەگیانی باپیرم بەسەردانی تۆ زۆر شاد دەبێتو دێتە دەرەوە. کەگەیشتمە(شەبستەر) پێشوازییەکی زۆرگەرمم لێکرا.

(شێخ مەسعوود) میوانداریی‌کردم ، منداڵەکانی هاتنە لام و بەخێرهاتنیانکردم. دوای نانخواردن چووم بۆ سەر گڵکۆی(شێخ مەحموودی شەبستەر). فەرمانمداکە گڵکۆیەکی وای بۆ هەڵبەسترێ شایانی پلە وپایەی باڵای بێ. لە(شێخ مەسعوود)م پرسی: ژمارەی هەموو دانیشتووانی ئەم شارۆچکەیە چەندە؟ وتی: شەش هەزارکەس دەبن. وتم: بەپێی دەستووری ئیسلام دەبێ پیت وفەڕی ئەم پیاوە پیرۆزە هەموو دانیشتووانی ئەم شارۆچکەیە بگرێتەوە. شێخ مەسعوود پرسی: مەبەستی ئەمیر چییە؟ وتم: من هەزار لیرە دەدەم بەتۆ، هەر ژن وپیاوێ کە تەمەنی هەژدەو لەهەژدە هەورازترە پێنج دینار زێڕی بدەرێ.

دوای گەڕانەوەم لە شەبستەر خۆم ئامادە کرد لەرێی(ئەردەبیل)ەوەبگەڕێمەوە. کەلەوشارە نزیکبوومەوە، شێخی خانەقای شارو هەمووشێخەکانی (ئەردەبیل)بەرەو پیرم هاتنو پێشوازییەکی زۆرباشیان لێکردم. دەمزانی هەرهەموویان شیعەن،ئەگەر سەری گوێڕایەڵیو نەوازشیان دانەنەوانداپە هەموویانم دەکوشت، بەلاّم لەبەر ئەوەی ڕێزی زۆریان لێگرتم، ئازاری هیچیانم نەدا لەهەمان کاتدا نەمدەویست میوانی هیچیان بم تاکو نەڵێن مافمان لەسەریەتیو میوانداریمانکردووە و نانمانداوەتێ.

بۆ عەسری ئەورۆژە داوای شێخی گەورەی خانەقاو دووکەسی ناوداری ترم کرد بۆ ئەوەی گفتوگۆیان لەتەکدا بکەمولەبۆچوونەکانیان بگەم. لەشێخی گەورەم پرسی: دینی تۆ چییە؟ وتی: موسڵمانم. پرسیم: بنچینەو دەستووری ئایینی ئیسلام چین؟! وتی: خوا بەیەك زانین - دادوەری - پەیامبەری - پێشەوایی - گەڕانەوە بۆ بارەگای خوای گەورە. وتم: بەپێی بۆچوونی من سیانن: خوابەیەك زانین - پەیامبەری - گەڕانەوە بۆ بارەگای خوای گەورە. تۆ چۆن کردنت بە پێنج؟! وتی: ئەگەر دوو بنچینە بخرێنە سەر سێ بنچینەی‌تر، دەبنە هۆی بەهێزکردنیان. ئەگەر ئەم دوو بنچینەیە ئەوانی‌تریان لاواز بکردایە تۆ مافی ڕەخنەگرتنت هەبوو، بەلاّم لەبەر ئەوەی سێ بنچینەکەی تر بەهێز دەکەن نابێ ڕخنەبگری!

وتم: ئەمەی تۆ دەیڵێیت کارێکی داهێنان و دروستکراوەو نابێ کاری وا لە ئیسلامدا بکرێ!. وتی: ئەی ئەمیر، کاری هەڵبەستراو و داهێنراو پێچەوانەی ئایەتی قورئانە ، ئایا لە قورئاندا نووسراوە بنچینەکانی دین سیانن ؟ وتم : لەقورئاندا بەم شێوەیە بنچینەکانی دین نەنووسراوە ، بەلاّم لەکۆی ئایەتەکانی

قورئاندا دەگەینە ئەو ئەنجامەی کە بنچینەی دینن ئەوسیانەن کە باسمکردن ، موسڵمانیش دەبێ باوەڕی بە هەرسێکیان هەبێ. شێخی گەورەی خانەقا، کەبەڕابەر ناودەبرا، وتی : لە قورئاندا گەلێ ئایەت هەن باسی دادوەریی خوای گەورە دەکەن، ئایا ئەمیر بوارمدەدات ئەو ئایەتانە بخوێنم ؟ وتم: ئەی پیاو، من هەموو قورئانم لەبەرە لە قورئاندا ئایەتی زۆریش هەن باسی زانستی لە ڕادەبەدەریخوا و بەزەیی و سۆزو قین و بیمی زۆری دەکەن، ئایا دەبێ وای بۆ بچین کە بنچینەکانی دینی ئیسلام ئەمانەن: خوابەیەك زاین – زانست – میهرەبان –قین و بیم – پەیامبەری – گەڕانەوە بۆ دیوانی خوا...!

ڕابەری خانەقا وتی : بەبیرو باوەڕی ئێمە ئەو پێنج بنچینانە ئەنجامی بۆ چوون و وەرگرتنی پێشەوای گەورەو سەروەرمان ، میری موسڵمانان، حەزرەتی (علی) یە (خ. ر)، ئەگەر تۆ ئەم بنچینانەت لا پەسەندنین، ئێمە لەگەڵ تۆدا هیچ قسەیەکمان نیە(لکم دینکم ولی دین)، واتە دینی خۆتان بۆ خۆتان و دینی خۆیشم بۆ خۆم.

وتم: باشە، وازلەم باسە دێنین و دەچینە سەرباسێکی تر پێم بڵێ تۆ چۆن ڕابەریی خەڵك دەکەیت و چ ئەنجامێکت لێوەردەگرن ؟..

وتی ئەی ئەمیر ، ئارەزووی شەیتانیی ئادەمیزاد داکەوتنی بۆ نییە و هەرگیز تێر نابێ. من ڕابەریی خەڵك دەکەم کەزاڵبن بەسەر خۆیان و ئارەزووەشەیتانییەکانیاندا ، ئەمەش لە کەمکردنەوەی خواردنەوەدەستپێدەکات کە مرۆف کەم بخوات کەمتر دەخەوێ و کەمتریش پێویستی بە بۆ گەنەو گەندەڵیی دنیاهەیە و لە گوناهەوە دووردەبێت!.

وتم : ئافەرین ئەی پیاوی دانا من بۆ خۆم ئەمەم تاقیکردۆتەوە، هەرکاتێ بمەوێ کەمتر بخەوم و زۆرتر کاربکەم ، کەمتردەخۆم. پاشان پرسیم: ناوت چییە؟ وتی: ناوم (صەدروددینە). پرسیم: بژێوی‌و مووچەتان چۆنە؟ وتی:هەندێك خێرەومەندی باش بەشێك لە دارایی خۆیان تەرخاندەکەن بۆ خانەقاکەمان و ئێمەش ژیانی پێ دەگوزەرێنین، چونکە ئەوەندە گوێ نادەینە پێداویستییەکانی ژیان وبەتەمای هیچ نیین. پرسیم: دەروێشەکان لەخانەقاداچیدەکەن ؟ وتی :خەریکی خوا پەرستی‌و یادکردنی خوان،هەمیشە بەخۆیانا دەچنەوە تاکو بەدیهێنەری خۆیان چاکتربناسن.

هەرچەندە(صەدروددین)وشێخەکانی تری خانەقای(ئەردەبیل) شیعە بوون،لەپاکی وبێگەردیی ئەوان چێژم وەرگرت. هەرلەوێ بڕیارمدا چوار گوند

لەگوندەکانی(سوڵتان ئەحمەدئیلکانی)، کەبوونە هی‌من،تەرخانبکەم بۆخانەقای ئەردەبیل. دەمزانی دەرامەتی‌ئەوگوندانە زۆرەوگوزەرانــی خــەڵکانی خانەقاکـە باشتردەبێ.

دوای ئەوەی(صـەدروددین)وهاوڕێکانی‌ڕۆیشتن، بەناوئەو باخـەدا گەڕام کە تیایدا دانیشتبووین، هەرچەندە سەرنجمدا تاقەدارێکی بەردارم تیانەدی. کـە هـۆی ئـەوەم پرسـی، وتیـان: لـەم باخـەدا داری بـەردار پێناگـات و نایەتەبـەر، تەنانـەت دارێکـی میـوە لـەم شـارەدا نییـە. لـەماوەی مانـەوەمدا لــەو شــارەدا دووشتی ترم بینی کە سەرنجڕاکێشبوون، یـەکێکیان بەردێبوو کە لـەدەرەوەی شاربوو، پێیان دەوت بەردی باران وتیان ئەگەر لەپاییزدا ئەم بەردە بەرینە نـاو شـارەوە و تـا وەرزی بـەهار لــەوێ بمێنێتــەوە، بـارانی بـاش دەبـارێ!. هــەر کـاتێکیش لــە شـار بیهێنینــەوە دەرەوە بـاران دەوەسـتێتەوە. دانیشــتووان نەیانتوانی هۆی ئەوەم بۆ ڕوونبکەنـەوە... دیاردەکـەی تریـش هێرشـی جرجـی گەورە بوو بۆ سەر ئوردووگەی( نەصرەت ئاڵتوون )، کە هەریـەکێکیان هێنـدەی بەچکەپشـیلەیەك دەبـوو. ئـەو ڕەوە مشـکانە لـە نیوەشـەوا دابوویـان بەسـەر ئوردووگەکـــەداو زۆر ســـــەخڵەتیانکردبوون و هـــــەرچی خۆراکێکیــــان هەبووخواردبوویان. پێم سەیربوو هێرشیان نـەکردبووە سەر ئوردگەکـەی مـن، کەزۆر بەرینتر بوو. دوایـی بۆمـان دەرکـەوت هـۆی سەرەکی ئـەوەبووە سـەربازە ڕۆمییـەکان دۆینەیــەکی زۆریــان پێبــووە و گیایـــەکی کێویلــەی بۆنخۆشـــی تیکەڵبووە کە بووەتە هـۆی ڕاکێشانی مشکەکان بۆ خواردنـی دۆینەکە. ئــەو شـەوە تابـەیانی ئـەو سـەربازانە خـەریکی ڕاوە جـرج بـوون، کـە ڕۆژ بــووە وە مشکەکان هەڵاتن.( نەصرەت ئاڵتوون )یش ناچار بوو لە ئەردەبیل خۆراکی تر بۆ سەربازە کانی بکڕێ. ئاگاداربووم کە زستانی ڕۆم و ئازربایجان زۆر سەختە و یەکی هەموو لەشکرکێشییەك دەخات. وام بەباشتر زانی بەزووترین کات خۆم بگەیەنمەوە سەمەرقەندو لەوێ زستان بەسەربەرم و لەوەرزی بەهاردا بکەومەوە سەر کەڵکەڵـەی داگیرکردنی‌بیزانتیۆم، چونکە تائەوکاتـە ئەوکەشـتییانەی لـە پادشای فەرەنسە داوامکردبوون دەگەیشتنە بەرەوەو گـەلێك لـەو کەشتییانەش تـەواو دەکـران کەلەبـەندەرەکانی ڕۆمـدا دروسـتدەکران. بـەو جـۆرە دەمتوانـی بەژمارەیەکی زۆری کەشتیەوە هێرشبکەمە سەر بیزانتیۆم.

پـاش ئـەوەی هەریەکـە لەسـەربازەکانی(نـەصرەت ئاڵتوون) سـێ دینـار زێـرم دانێ و سێسەد دیناریشم دابەخۆی، هەموویانم بەرێکردنەوە بۆ وڵاتـی خۆیـان

و خۆيشم رێی ( قەزوين و رەی )م گرتەبەر. لەبەر ئەوەی كەش و هەواكەی خۆشبوو، دووڕۆژ لەشاری (رەی)دا مامەوە. پاشان بەرەو خوراسان كەوتمە رێ.

كەبەلای(سەبزەوار)دا تێپەڕبووم، منارەی كەللەسەرەكانم بينی، زانيم تائەوڕۆژەی ئێسكی كەللەسەری كوژراوەكان دياربێ، لەسەبزەواردا كەس ناتوانێ سەرپێچيم لەگەڵبكات.

كاتێ گەيشتمە شاری ( طووس) سەيرمكرد وێرانەيە ، شەوی پێشوو بوومەلەرزەيەكی زۆر بەهێز لێيدابوو، ژمارەيەكی ئێجگار زۆر بوو بوون بەژێر دارو بەردوپەردووی خانووە تەپيوەكانەوە. خەڵكەكە خەريكی دەرهێنانەوەی تەرمەكان و بريندارەكان بوون. ليژنەيەكم لە ئەفسەرێكی خۆم ودووپياوی باوەڕپێكراوی ئەو شارە پێكهێنا بۆ چاككردنەوەی خانووەكان لەسەر حسابی خۆم. هەرلەوكاتەداجارێكی تر بۆم دەركەوت كە چەندە ژيانی ناوچادرو رەشماڵی دەشت وبيابان سەلامەتترو بێوەيترە.

شاری(كش)بەتەواوەتی دروستكرابوو، هەمووشتێ بەدڵی منبوو. نامەی بانگهێشتن و ميوانداريم بۆ چل ودوو پادشای قەڵەمڕەوی دەسەڵاتداريی خۆم ناردكە دووساڵی تر لەوەرزی بەهاردا لە شاری(كەش)دا بەيەكبگەن و سەيری شارە جوانەكەم بكەن. هەموويان وەڵاميان بۆ نووسيمەوە كە لە كات و شوێنی دياريكراودا ئامادە دەبن. لەهەمان كاتا نامەيەكی تايبەتيشم بۆ پادشای چين نووسی.

هەرچەندە لەشاری(كش)دا كۆشێكی زۆر دروستكرا بوو، دەستوورمدا كە بەڕێز چل و دوو كۆشكی تايبەتی دروستبكرێت بۆ پادشاكان و ئەو شوێنە ناوبنرێ(شاری پادشايان).

پادشای چين بەزمانی خۆی وەڵامی نامەكەمی نووسيبوو، كە ئەمە ناوەڕۆكەكەيەتی: {تەيموور بەگ، خۆت لەوە گەورەتر دەناسێنی كە هەيت!. چاك بزانە من پادشای وڵاتی چينم، كە سەرێكی لە(جابولقا)يەو سەرەكەی تريشی وا لە(جابولسا). ژمارەی دانيشتووانی وڵاتەكەم هێندەی ژمارەی وردە لمی بيابان و ماسييەكانی دەرياكان دەبێت. كە لەشكرم دەكەوێتە رێ بوومەلەرزە بەرپا دەبێ، ئەگەر كێوەكان پێيان هەبوايە لەترسانا هەڵدەهاتن!!..

تۆ بە دانانی چەند بەردو خشتێك لەسەریەکتر لە خۆت باییبوویت و وا دەزانی بینای زۆر گەورەت دروستکردووە! ئەگەر بێیت بۆ چین و شووره گەورەکەی چین ببینی، کە باووباپیرانم دروستیانکردووەو هەزاران فرسەنگ درێژە، ئەوەندە سەرت سڕ دەمێنێ کە لە تاوا پەنجەی خۆت دەگەزی!

ئەی تەیموور بەگ، موختارەکانی وڵاتە جیاوازەکانی من لەتۆ بە تواناترو سەنگینترن! ئەگەر ڕۆژێ لەڕۆژان لە سامان و دارایی و توانادا گەیشتیتە پایەی موختارێکی من ئەوسا مۆڵەتدەدەم کە میوانداریمبکەیت!! پێش ئەوەی بەو پلەیە بگەیت چاکتر وایە خۆت بە یەکێ لە نۆکەرەکانم بزانیت و بیر لەوە نەکەیتەوە لەوە پتر پێ ڕاکێشی!!...

دوو ساڵ پێش کاتی هاتنی پادشاکانی جیهان بۆ(کەش) ئەم نامەیەم وەرگرت. بڕیارمدابەرەو چین بکەومە ڕێ وبە پادشای ئەو وڵاتە بسەلمێنم کەمن لەو باڵاترو لە پێشترم...

**ڕووداوە داهاتووەکان، لەمەودوا تۆمار دەکەم.**

**کۆتایی یادەوەرییەکانی(تەیمووری لەنگ) بە خ مەی خۆی.**

# بیرەوەرییەکانی قەشەی سوڵتانیە
# لە بارەی تەیمووری لەنگەوە

لێرەدا بیرەوەرییەکانی(تەیمووری لەنگ) تەواو بوون. ئەوە بوو کە گەڕایەوە بۆ وڵاتی خۆی لەشکرکێشیەکی زۆر فراوانی کرد بۆ سەر پادشای چین.... بەڵام هەر وەکو خۆی لەوەو پێش خەوی بینیبوو، لەڕێدا تووشی ئیفلیجییەکی زۆر بەهێز بووەو لە پەلوپۆی خستووەو لەجێدا کەوتووە. دوای حەوت ڕۆژ مردووەو تەرمەکەی براوەتەوە بۆ(سەمەرقەند) و لەو گۆڕەدا کە بۆ خۆی ئامادەیکردبوو نێژراوە..

تەیمووری لەنگ لە بیرەوەرییەکانی خۆیدا باسی ئەوەی نووسی، کە(قەشەی سولطانیە)ی وەکو نوێنەری خۆی نارد بۆ لای پادشای فەرەنگ بۆ کڕینی کەشتی. قەشەی ناوبراو سەبارەت بە تەیمووری لەنگ بیرەوەرییەکانی خۆی نووسیونەتەوە، تاکو ئێستاش لە(کتێبخانەی میللیی پاریس)دا پارێزراون. ئێمەش بەرانبەر بەو پەیمانەی کەداومانە کورتەیەکی ئەو یادەوەرییانە دەخەینە بەرچاوی خوێنەران.

ئەوەشمان لەیاد نەچێت، وا دەردەکەوێت کە تەیمووری لەنگ پێش ئەوەی قەشەی ناوبراوی لەشامدا دیبێ، لەوەو پێش لە(سولطانیە) دیویەتی و ناسیویەتی و ئاشنایەتیی باشی لەگەڵیا هەبووە.

❖ ناوی تەیموور بەگە، تەیموور واتە(ئاسن)، بەگ یش واتە(میر). دوژمنەکانی بە تەیمووری لەنگ ناویدەبەن، واتە تەیموورە شەل، چونکە قاچێکی شەلە. لە ئێراندا پێیدەڵێن میری تابان، واتە فەرماندە.

❖ ئەم پیاوە چەندان کوڕی هەبووە، ئێستا(*) تەنها دووانیان ماوە، یەکێکیان(میرانشا)یەو تەمەنی چل ساڵە، ئەوی دیکەیان ناوی(شاڕوخ)ەو تەمەنی بیست و دوو ساڵە. کوڕەکانی تری، یان لە جەنگدا کوژراون، یان بە نەخۆشی مردوون.

(میرانشا) چوار ژن و چوار کوڕی هەیە کوڕەکان گەورەن و هەر یەکەیان خاوەنی دووسەدتا سێ سەد هەزار سەربازە، هەر یەکە بۆ خۆی پادشایەکە، بەڵام هەموویان لە باوە گەورەیان(تەیمووری لەنگ) دەترسن، دەزانن ئەگەر لە فەرمانی دەرچن سزا دەدرێن.

❖ تەیموور بەگ هەرچەندە ئەمڕۆ پیاوێکی بە تەمەنە، لەگەڵ ئەوەشا زۆر بە توانایە. هەرگیز لە ڕۆیشتن و شەڕکردندا ماندوو بوونی بۆ نییە. شەوو ڕۆژ وا لە بیاباندا لەوێ ژیان بەسەر دەبات. دەڵێن لە سەردەمی لاویدا زۆر قۆزو جوانبووە، ئەمڕۆ هەر کەس بیبینێ دەزانێ وا بووە.!

❖ ئەوەندە پارەو سامانی هەیە کە دەتوانێ ڕووی زەوی بە لیرە داپۆشێ. ڕۆژانە هەزار مسقاڵ زێڕ تەرخانە بۆ چێشتخانەو شەربەتخانە؛ تایبەتی خۆی!

❖ ئەوەندە وڵاتەکەی فراوانە، ئەگەر ڕێبوارێك لە ڕۆژهەڵاتیەوە بەڕێبێ، لەوانەیە دوای یەك ساڵی ڕەبەق ئینجا بگاتە ڕۆژئاوای قەڵەمڕەوی ئەو. لە سەرانسەری ئەو وڵاتە بەرینەدا ئاسایش بەر قەرارەو ڕێبواران و کاروانەکان پارێزراون.

لەهەر ناوچەیەکی قەڵەمڕەویدا کاروانێك ڕووتبکرێتەوە، بە فەرمانی تەیمووری لەنگ فەرمانڕەوای ناوچەکە دەکوژرێت، چونکە بڕوای وایە تا میری وڵات دەستی لەگەڵ جەردەکاندا نەبێ ئەوان ناتوانن سەرەڕێ بگرن و خەڵك ڕووتبکەنەوە.!!

(*) سەردەمی نوسینەوەی بیرەوەرییەکانی لەشەی سوڵتانیە دەگەیەنێ.

وەرگێڕی کوردی

❖ لەو ڕۆژەوە ئەم پیاوە بووەتە خاوەن دەسەڵات، تاکو ئەمڕۆ لەهەموو شەڕەکانیدا سەرکەوتوو بووەو هیچ پادشایەك و هیچ قەڵایەکی جەنگی نەیانتوانیوە بەرانبەر بەو بەرگریبکەن.

❖ ئەم پیاوە دڵڕەقترین مرۆڤی ئەم سەر زەمینەیە!. ئەگەر بە بەرچاویەوە سەد هەزار منداڵ و ژن و پیاو سەر بیڕێن هیچ گوێ ناداتێ و کاری تێ ناکات. زۆر جار تا دوا منداڵی شیرە خۆرە، دانیشتووانی شارێکی قڕ کردووە، بێ ئەوەی هیچ بەزەییەکی بە هیچ کەسێکدا بێتەوە. بەڕووکەش موسڵمانێکی تەواوەو بە وردی پەیڕەویی دەستووری یاسای ئیسلام دەکات، ڕۆژانە پێنج جار نوێژی خۆی دەکات و لە مانگی ڕەمەزانیشدا بەڕۆژوو دەبێت. هەر گیز نەمدیوە مەی بخواتەوە، بەلام بیستوومە جار بەجار سەروساختی لەگەڵیاهەیە!. هەرکاتێ بیەوێ دەتوانێ یەك ملیون جەنگاوەر بۆ جەنگ ئامادە بکات. ژمارەی ئەسپەکانی کە لە مێرگ و پاوەنەکانی خۆیدا دەلەوەڕێن دوو ملیون دەبێ. ئەوەندە حوشتری هەیە کە لە ژماردن نایەن. کە هندستان کەوتە ژێر دەستی و کردی بە بەشێك لە قەڵەمڕەوی خۆی، تا ئێستا بەردەوام پەنجا، تا سەد زنجیرە فیلی هەیە، زۆرتر بۆ پێشوازی و جوانی کەڵکیان لێوەردەگرێ.

❖ تەیموور بەگ زمانی عەرەبی، فارسی و تورکی دەزانێ. لەزانستی قورئان و (فیقە)ی ئیسلامدا ئەوەندە شارەزاو بە توانایە کە هیچ زانایەکی موسڵمان لەگەڵیا دەرنابات.

❖ ژمارەی کۆشکەکانی لەدوو سەد تێپەڕ دەکات. لە(سەمەرقەند)دا هەژدە کۆشك، لە(کش)دا بیست کۆشك، لە(بەغدا)دا پازدە، لە(ئەسفەهان)دا دوازدە، لە(شیراز)دا حەوت کۆشکی هەیە. ئەو ڕۆژەی کە شاری بەغدادی داگیر کرد، درەختێکی زێڕی دەستکەوت، هەموو گەڵاکانی جەواهیری ساغبوون، هیچ کەس نەیتوانی دەستنیشانی نرخی ئەو درەختە بکات!.

❖ لە جەنگا وەکو سەربازەکانی بەرگی شەڕ دەپۆشێت ودەچێتە مەیدانی نەبەردەوەو لە مردن ناترسێ. چەندین جار زۆر بە سەختی بریندار کراوەو کەوتۆتە گیانەلا، دوای چاکبوونەوەی جارێکی کە بەبێ ترس لە شەڕەکاندا بەشداریدەکات. لە گۆڕەپانی جەنگا هیچ پلەو پایەیەك بەلای ئەوەوە هیچ بایەخێکیان نییە، فەرمانی لەسەردان و لەتوپەتکردنی گەورەترین پادشاو میر

دەدات و لەگەڵ بچووکترین نۆکەرا جیایان ناکاتەوە. تەنها ڕێز لە زانایان و شاعیران و پیشەکاران دەگرێ،ئەمەش لەبەر ئەوەیەکە خۆی دانایە.

❖ لەو ڕۆژەوە کە(تەیموور بەگ)م بینیوە، بەردەوام لە بیاباندا ژیان بەسەر دەبات، وا بزانم لەبەر ئەوەیە کە ئەوەندە لەشکری هەیە ناتوانێ لە هیچ شارێکدا جێیانبکاتەوە. ئەم پیاوە لەسەر زەوی نان دەخوات، لەسەر زەوی دەخەوێت. خواردنیشی جارجار برنجەو جارجارێش ماستی ماینە. خواردنەوەیشی شیری ماین، یان شەربەتی هەنگوینە. لە جەژنەکاندا جوانووی بۆ دەکەن بە کەباب، ئەم خواردنە لە خواردنە خۆش و نایابەکانی(خوارەزم)ە.!!

بۆ کاتی نانخواردن، لە چادرەکەیدا، کەپێنج کۆڵەکەی تێدایە، سفرە ڕادەخرێت. تەیموور لەناوەڕاستا دادەنیشێ، کوڕەکانی و وەچەکانی و فەرماندەکانیش چەند گەزێك دوور لەوەوە دادەنیشن. هەروەها ئەو کاسەو قاپانەی لەسەر سفرەکە دادەنرێن لە زێڕی ساخ دروستکراون. لە کاتی نانخواردندا هیچ کەس نادوێت، مەگەر کەسێك کە تەیموور خۆی بیدوێنێ!!.

❖ ئەگەر تەیموور میوانی گاوری هەبێت مۆڵەتیدەدات لەگەڵ خواردندا مەی بخواتەوە، بەڵام خۆی ناخواتەوە، هەروەها نابێ کوڕەکانی و نەوەکانی و فەرماندەکانی بخۆنەوە.

❖ هیچ سوپایەکی ئەم سەرزەمینە وەکو سوپای تەیموور بەگ ڕێکوپێك و ڕێکخراو نییە. ئەفسەرەکانی پلە بەپلە کاری خۆیان بەڕێوە دەبەن. فەرماندەی دە سەرباز(ئوونباشی)یە، فەرماندەی سەد سەرباز(یووزباشی)یە، فەرماندەی هەزار سەرباز(مینباشی)یە، و فەرماندەی دە هەزار سەرباز(تومانباشی)یە. ئەگەر مینباشییەك فەرمانبدات بە هەزار سەربازەکەی بەردەستی، خۆیان بخەنە ناو ئاگرەوە، بەبێ یەك و دوو فەرمانەکەی جێبەجێدەکەن!. هەر سەربازێ سەرپێچیبکات بە زیندوویی کەوڵدەکرێ. زۆرجار سەربازی سەرپێچیکەر بە خەنجەر شادەماری خۆی دەبڕێت و خۆی دەکوژێت. بۆ ئەوەی دوچاری سزای کەوڵکردن نەبێ.

❖ کاتێ تەیموور بەگ فەرمانی ڕەشەکوژی و کوشتاری گشتیی و تالانکردنی شارێك دەردەکات، ئاڵای ڕەشی هەڵدەکرێت. هەر شارێك ئاڵای

ڕەشی تەیموور بەگ تیایا هەڵکریٚ تەختدەکریٚت. کە ڕۆیشت بۆ وڵاتی ڕۆم گەمارۆی شاریٚکیدا، کەوتبووە نیٚوان ئەرمەنستان و ئەنگووریە. دوای داگیر کردنی ئەو شارە، هەموو دانیشتووەکانی بە زیندوویی خستنە ناو چاڵەکانی ناو شارەوەو زیندە بەچاڵیکردن.

❖ هەر شاریٚ بە بیٚ شەڕ خۆی بەدەستەوە بدات سەروسامان و گیان و نامووسی خەڵکەکە پاریٚزراون. ئەگەر لەو جۆرە شارانەدا، سەربازیٚکی تەیموور بەگ دەستدریٚژی بکاتە سەر ئافرەتیٚك، یان ماڵی کەسیٚك داگیر بکات، بە فەرمانی تەیموور بەگ، سەربازەکەو فەرماندەکەشی دەکوژریٚن. لەبەر ئەوەیە کە هەر شاریٚ گەمارۆ بدات بەبیٚ شەڕ خۆیان بەدەستەوە دەدەن، سا مەگەر تەنها ئەو شارانەی کە پادشاو میرەکانیان نەیانەویٚ گویٚڕایەڵی تەیموور بن.

❖ یەکیٚك لەو شتانەی کە بۆتە هۆی ئەوەی تەیمووری لەنگ ببیٚت بە تواناترین پیاوی جیهان سوود وەرگرتنە لە باروت. بە تەواوی ئاگاداری نهیٚنیی دروستکردنی بارووتە. لەهەموو شەڕەکانیدا بڕیٚك کەرەستەی خاوی بارووت لەگەڵ خۆیدا دەبات بۆ هەڵتەکاندنی شوورەی قەڵاو شارەکان.

❖ لەو باوەڕەدام کەلەمەو بەرو لەمەودواش لە دڵڕەقی و بیٚ بەزەییدا هیچ کەسیٚ ناگاتە تەیمووری لەنگ. لە کاتی گەمارۆدانی(دیمەشق)دا پەیامی نارد بۆ دانیشتووانی شار کە خۆیان بەدەستەوە بدەن ئەگینا دەکوژریٚن.لە ترسی(قوتول هەمزە) دانیشتووانی شار نەیانویٚرا هیچ بڵیٚن و هیچ بکەن. هەرچەندە قوتول هەمزە گالیسکەی جەنگیی گەورەو زۆری هەبوون، بەڵام دەرەقەتی تەیموور نەهات. تەیموور شوورەی شاری ڕووخاندو چووە ناو شارەوە. بەرانبەر بە مزگەوتی عومەر، زانایەکی گەورەی موسڵمانان کە ناوی(نیظامووددین شامی) بوو، بە کزی و پاڕانەوەوە تکای لە تەیموور کرد لە کوشتاری شار دەسبەردار بیٚ. تەیموور بە دەنگیٚکی بەرز وتی: ئەگەر زانا نەبوویتایە دەمگوت بە زیندوویی کەوڵتبکەن !... بیٚجگە لە زانایان و شاعیران و پیشەسازان هیچ کەسیٚکی نەهیٚشتەوە. دوو هەزار باری حوشتر زیٚڕو زیووجەواهیٚرو فەرشی بەنرخ‌و شتی نایابی لە دیمەشقەوە ناردنەوە بۆ سەمەرقەند. دوای ئەمەش ئەم پیاوە خویٚنخۆرو دڵڕەقە لە دیمەشقدا کۆنگرەیەکی گەورەی لەزانایانی ئیسلام پیٚکهیٚنا بۆ وتوویٚژ کردن لەبارەی قورئانەوە.

❖ تەنها یەك کەس توانیویەتی تەیموور بەگ بخەڵەتێنێ و سزا نەدرێ، ئەویش پادشای (تەتارستان)بوو کە ناوی(ئەدیگ بی)یە. ئەوە بوو تەیمووری لەنگ ناردیە خوازبێنیی کچی(ئەدیگ بی) بۆ کوڕەکەی. ئەویش وتبووی من ئامادەم کچم بدەم بە کوڕی تەیموور بەگ، بەڵام لەبەر ئەوەی دەستم کورتە، ناتوانم جیهازییەکی شیاو بە شان و شکۆی پادشایەکی وەکو تەیموور بەگ، لەگەڵ کچەکەمدا بنێرم، خۆ ئەگەر بە جیهازییەکی کەموکووڕەوە بینێرم لەڕێزو پایەی من کەمدەبێتەوە.

تەیموور بەگ وتی: من بۆ خۆم جیهازیی کچەکەت دەنێرم، تاکو لەگەڵیا بینێریتەوەو هەموو کەسێ وا بزانێ کە خۆت ئەو جیهازییەت بۆ کچەکەت ئامادە کردووە، بەم شێوەیە ڕێزو پلەو پایەت پارێزراوە.

(تەیموور بەگ) فەرمانیدا بیست و پێنج حوشتر بە باری زێڕو زیوو جەواهێر و کووتاڵ و شاڵی کشمیرەوە ئامادە بکرێ، هەشت ئەفسەری گەورەی لەتەکیانا نارد، ڕایسپاردن کە ئەو هەموو شتە بە نرخانە ببەن بۆ(ئەدیگ بی)و لەو سەرەوە کچەکەی بهێنن بۆ کوڕەکەی.

ئەفسەرەکان بە حوشترو بارەوە بەرەو شاری(سوقراط)_ پایتەختی وڵاتی تەتارستان _ بەڕێبوون. کە کاروانی گەنج و زێڕ گەیشتبووە بەرەوە،(ئەدیگ بی) ئەفسەرەکانی زیندانی کردوو دەستی بەسەر هەموو دیارییەکاندا گرت، کچەکەشی نەنارد!(تەیموور بەگ) ئەو هەموو زێڕو زیوو کاڵا بەنرخانەی لە کیسچوون و نەشیتوانی ئەفسەرەکانی ڕزگار بکات... چەند جارێ لێم بیستووە دەیگوت: هیچ کەسێ وەك (ئەدیگ بی) نەیخەڵەتاندووم!!

❖ هیچ پادشایەك وەکو تەیمور بەگ کۆشکی گەورەو فراوانی نییە... لە کۆشکە بەرینەکانیدا شازادەو میرزادە دەستبەسەرەکان هەریەکەیان لە کۆشکی تایبەتی خۆیدا، بە جلوبەرگی وڵاتی خۆیانەوە ژیان بەسەر دەبەن و ئەوپەڕی ڕێزیشیان لێدەگیرێ. تەیموور بەگ ئەوانی بۆیە بە بارمتە لای خۆی دەهێشتنەوە، تائەگەر باوکەکانیان، کە باج و سەرانە دەدەنە ئەو، هەر سەرپێچییەکبکەن، ئەمان دەکوژێت. ئەو بارمتانە لە شازادەو میر زادەکانی هندستان، ئێران، شام، ڕۆم و قبچاق تێکەڵن. هی وایان هەبووە چووەتە ڕیزی جەنگاوەرانی تەیموور بەگەوەو لەشەڕدا کوژراوە.

❖ جگە لە تالانیی شارە گەورەکانی وەك ئەسفەهان، بەغداد، دیمەشق و شارەکانی تر، لەهەموو ئەو ولاتانەوە کە دەکەونە سنووری قەڵەمڕەوی فەرمانڕەواییەوە، (دە یەکی) داهاتی بۆ دێتەوە، لەو بڕە مووچەی ئەفسەران و سەربازانی خۆی دابیندەکات. ئەگەر(تەیموور بەگ) بزانێ سەربازێکی شتێکی بەقەرز هێناوە، سزای سەختی دەدات، خۆ ئەگەر هەر سەربازێکی بەزۆر شتێك لە خەڵك بسێنێ، بێ یەك و دوو دەیکوژێت.

❖ تەیموور بەگ پیاوێکی ئیماندارە. لەهەموو کات و شوێنێکا پێنج فەرزە نوێژی خۆی دەکات. هەرچەندە لەو شتانەی کە لە ئایینی ئیسلامدا قەدەغە کراون خۆی دەپارێزێت، لەگەڵ ئەوەشا سەبارەت بە ژنانی سپی و جوان و مەیخواردنەوە ئەوەندە گیر نییە، بەڵام لە کردەوەی قەومی(لووط) زۆر تووڕەیە و ئەنجامدەرانی دەکوژێت.

❖ تەیموور بەگ دەفری شووشەی پێ خۆشەو لەدەفری شووشەدا ئاو دەخواتەوە. زۆر خۆر نییە، زۆرتر حەز لەو خواردنانە دەکات کە زەعفەرانیان تێبکرێت، بە تایبەتی برنج.

❖ لە یەکێ لە شەڕەکانیدا قاچی چەپی بە سەختی بریندار کراوەو دەماری پچڕاوە، هیچ پزیشکێکی ئەم سەر زەمینە نەیتوانیوە چارەسەریبکات، لەبەر ئەوە شەلبووەو بە شەلی ماوەتەوە. هەرچەندە ئێستا بە ساڵدا چووە، لەگەڵ ئەوەشدا شەلییەکەی هیچ لە چالاکی و گورجوگۆڵیی کەم نەکردۆتەوە، هەر ئەوەیە کەمێ سەری سپیبووە.

❖ ڕەنگە هیچ کەسێ هێندەی تەیمووری لەنگ بیری تیژ نەبێ. ئەم بیر تیژییە هۆیەکی سەرەکییە لە سەرکەوتنی بەردەوامی ئەم پیاوەدا. ئەگەر لە بەیانییەوە تاکو ئێوارە سەد فەرمان و داواکاری جیا جیا بەسەر سەد میرو ئەفسەری خۆیدا بدات هەموویانی لەیادن، دەزانێ هەر فەرمانێکی بەکێ داوەو دەبێ لەچ کاتێکا جێبەجێبکرێ. هەر کەسێ بچووکترین کەمتەرخەمیبکات دەکوژرێ. لەبەر ئەوە هیچ کەس ناوێرێ لە جێبەجێکردنی ئەرکی سەر شانیدا بچووکترین سەرپێچی و کەمتەرخەمیبکات. ئەگەر لەسەرەتاوە کەسێ داوای کات و مۆڵەتی زیاتر بکات، تەیموور بەگ ئەوە ڕەچاو دەکات و قایلدەبێ... کە لەشەڕ گەڕایەوەو چوو بۆ سەردانی شاری(کەش)، سەیریکرد کۆشکەکانی

تەواونەکراون. ئەندازیارەکانی داوای تەنها ماوەی دوو مانگی تریان کرد، بەلام تەیموور بەگ پێشنیارەکەی وەرنەگرت و فەرمانی کوشتنی هەردووکیانی دەرکردو دوو ئەندازیاری تری ڕاسپارد کە کۆشکەکان تەواو بکەن.

❖ لەهەموو جەنگەکانیدا وەکو سەربازەکانی هەڵسوکەوتدەکات و وەکو ئەوان دەژی و لەهەموو شتێکا بەشدارییاندەکات. ئەوانیش لەم ڕاستییە ئاگادارن. هەر ئەفسەرو سەربازێکی نەبەردی بنوێنێ پاداشت وەردەگرێ. هەر کەسێکیش تەمەڵی و سستی بنوێنێ سزا دەدرێ. لەکاتی جەنگدا لەناو سوپای تەیمووری لەنگدا تەمەڵی و ترسنۆکی بەدی ناکرێن، هەموو جەنگاوەرەکانی زرنگ و ئازاو نەبەردن، بە لای ئەوانەوە سستی ئەوپەڕی بێ نرخی و سووکایەتییە...

لە جەنگە گەورەو پڕ مەترسییەکاندا، دوای ئەوەی تەیمووری لەنگ جێنشینێك دەسنیشاندەکات بۆ فەرماندەیی سوپاکە، بۆ خۆی لەڕیزی پێشەوەی شەڕدا، نەبەردانە دەجەنگێ. زۆرجار بە خەستی زامدار کراوەو سەربازەکانی لەمەیدانی شەڕ دووریانخستۆتەوە تا ئەسپەکان نەشێلن، دوای چاکبوونەوە دووبارە لە جەنگا بەشداریدەکات. بە قارەمانیەتیی خۆی لە گۆڕەپانی جەنگ و نەبەردیدا خوێنی هەموو سەربازەکانی دێنێتە جۆش و ئامادەیاندەکات بۆ هەموو خۆبەختکردنێك.. بەو قارەمانیەتیی ەی توانی لەگەڵ پێنج سەد خۆبەختکەردا شارێکی وەك(دەهلی)، پایتەختی هندستان بگرێ.

جارێکیان بەڕێکەوت بەشداریی(تەیموور) لەشەڕداو گەڕانەوەیم لە مەیدانی جەنگدا بینی. بە ڕاستی دەڵێم ئەم پیاوە لە قارەمانەکانی ڕۆژگارە. ئەو ڕۆژە، کە لە مەیدانی شەڕدا گەڕایەوە بینیم سەراپای ئەرخەوانییە، شمشێرەکەی ئەوەندە خوێنی وشکەوە بووی پێوەبوو نەدەچووەوە ناو کێلانەکەی!. کە بەرگی جەنگی داکەند چەند برینێکی پێوە بوون. برینەکانی بۆ تیمارکرا و بەرگەکەیان بردە قەراخ ئاوێك تاکو بشۆردرێ.

❖ بەر لەوەی بمنێرێ بۆ فەڕەنسە ڕیشی دەتاشی، بەلام کە گەڕامەوە بینیم ڕیشی هێشتۆتەوەو تاڵ تاڵ سپیی تێکەوتبوو.

ئەگەر بەرگی شەڕی لەبەرا نەبێ کلاوێکی سپی دەکاتە سەری کە چەند دانەیەك یاقووت و ئەڵماسی پێوەیە. کلاوی زستانەی لبادە، هاوینەشی لە ئاوریشم دروستکراوە.

(تەیموور بەگ) حەز لە جلوبەرگی ڕەنگاو ڕەنگی زەردو سووروو سپی دەکات. هاوینان بەرگی ئاوریشمی سپی، یان زەرد دەپۆشێت، لەبەهارو پاییزدا بەرگی ئەرخەوانیی ئەستوور لەبەر ئەکات. لەوەرزی زستاندا بەسەر جلەکانیدا کورتەکی دروستکراو لە پێستی سمۆرەو دەڵەك لەبەر دەکات. زستانانیش وەك هاوین مەڵبەندی لە بیاباندایە. زۆر حەز لە بۆنی خۆش دەکات، بەنرخترین و نایابترین عەتری بۆنخۆشی هەیە. هەر کەسێ نزیکی چادرەکەی بێتەوە خێرا هەست بە بۆنی عەتر دەکات.

❖ هەندێ لە میرە بێگانەکان کە دەگەیشتنە بەردەم تەیموور بەگ و کڕنووشیان بۆ دەبرد، زۆر تووڕە دەبوو، دەیگوت: دەبێ تەنها بۆ خوا کڕنووشببرێ!، بێجگە لە خوا هیچ کەسێك شیاوی ئەوە نییە کڕنووشی بۆ ببرێت.. دوای ئەوە هەر کەسێ بیەوێ بچێتە لای، لە دەرەوە ئاگادار دەکرێت کە کڕنووش نەبات، بەڵکو تەنها بە چۆکا بێت. نوێنەرە بیانییەکان کە دەچنە لای تەیموور بەهەمان دەستوور ڕێزی لێدەگرن، تەیمووریش بواری دانیشتنیان دەداتێ.

❖ لەکاتی شەڕا چادرەکەی تەیموور لەگەڵ چادری ئەفسەرەکانیدا هیچ جیاوازییەکی نییە، بەڵام ئەگەر لە شوێنێکا بۆ پشوودان چادری بۆهەڵبدەن، چادری وا بە نرخی بۆ دادەکوتن خەرجی وڵاتێکە. بەسەر چادرەکەیدا ئاڵای ئەرخەوانیی ڕازێنراوە بەزێڕو زیو دادەکوترێن، کە باڵیاندەدات و دەشەکێتەوە دیمەنێکی زۆر جوانیان هەیە. لەناو چادرەکەیدا، بەپێی وەرزەکانی ساڵ فەرشی زۆر گرانی ئەرخەوانی، زێڕین، یان شاڵی کشمیری، ڕادەخرێن و دیمەنێکی زۆر دانسقەو نایابیان هەیە.

❖ ئەو ڕۆژەی کە نوێنەری(هەنری سێیەم)، پادشای وڵاتی کاستیل، کە دەکەوێتە ئەسپانیا، هاتە سەمەرقەند بۆ دیداری تەیموور، من لەوێبووم. ناوبراو ناوی(گۆنزالیز کلاویخۆ) بوو. دووەمین نوێنەری(هەنری سێیەم) بوو بێتە لای تەیموور. یەکەمین نوێنەر کاتێك نێردرا کە (تەیموور بەگ) لە وڵاتی ڕۆم دژی(ئیلدرم بایەزید) دەجەنگا. ئەو نوێنەرە ئامادەی جەنگی (ئەنگووریە) بوو، بە چاوی خۆی ئازایەتیی تەیموور بەگ و سەربازەکانی بینی. لە ڕۆژی گەڕانەوەیدا تەیموور بەگ باری بیست ئێستر دیاریی بە نرخ و نایاب و دوو کەنیزەکی گاوری زۆر جوانی ناردن بۆ پادشای کاستیل. پادشای ناوبراو ئەوەندە وابەستەی گەورەیی و بەخشندەیی تەیموور بوو، نوێنەرێکی تریشی

نارده لای تەیموور کە(گۆنزالیز کلاویخۆ)بوو. من لە سالی (١٤٠٣) ی زاینیدا، پێش مردنی تەیموور بەگ، نوێنەری ناوبراوم بینی.

❖ لە ڕۆژی دووشەممەدا، ڕێکەوتی هەشتی مانگی ئەیلولی سالی هەزارو چوار سەدو سێی زاینی، بڕیار بوو نوێنەری ناوبراو، لە شاری سەمەرقەندا بە دیداری تەیمووری لەنگ شاد بێ. (گۆنزالیز کلاویخۆ) جوانترین و بە نرخترین بەرگی پۆشیبوو. دیارییەکانی پادشای(کاستیل)ی دایە دەست یاوەرەکانی، هەموو سواری ئەسپبوون. ئەوان لە پێشەوەو خۆی بە دوایانەوە بەڕێبوون تا گەیشتنە نزیك کۆشکی تەیموور. هەندێ لە پاسەوانانی تایبەتی تەیموور بەگ لەوێدا ئامادە بوون و پێشوازییان لە نوێنەرو یاوەرەکانی کرد.دوای ئەوەی دابەزین دیارییەکانیان لێوەرگیرا. پاسەوانەکان دیارییەکانیان لەسەر دەست هەلگرت و پێشکەوتن تا گەیشتنە دەروازەی کۆشکی تەیموور. لەوێ شەش فیلی زین زێڕو ئەرخەوانی، بە کەژاوەی لەداری قۆفەلی هندستان دروستکراوە ئامادە کرابوون. دیارییەکان خرانە ناو کەژاوەکان و فیلەکان کەوتنە ڕێ تا گەیشتنەبەر سێیەمین دەروازەی کۆشکی تەیموور. سێ کەس لە وەچەی تەیموور بۆ پێشوازی ئامادە بوون. یەکێ لە پیاوەکانی کۆشك باسکی(گۆنزالیز کلاویخۆ)ی گرت و بەرەو ئەو تەلارەی تەیمووری لێبوو کەوتنە ڕێ.

هەندێ دەستوپێوەند دیارییەکانیان هەلگرت، سێ کەس لەوەچەی تەیموریش لەدوایانەوە دەڕۆیشتن، لە دوای ئەوانیشەوە نوێنەری پادشای کاستیل، تا گەیشتنە ئەو هۆلە گەورەیەی کە تەیموور دانیشتبوو. نوێنەری کاستیل هات بە چۆکاو هەردوو دەستی خستنە سەر سنگی و سەری خەفاند، پاش ماوەیەك ڕاستبووەوە. بەم جۆرە تاکو گەیشتە لای تەیموور حەوت جار ئەوەی دووبارە کردەوە.

تەیموور دەیزانی(گۆنزالیز کلاویخۆ) زمانی عەرەبی تێدەگات، بە عەرەبی پرسی: کوڕی خۆشەویستمان پادشای کاستیل، کە دەزانم گەورەترین پادشای فەرەنگە، چۆنەو هەوالی چییە؟.

(کلاویخۆ)وتی: زۆر باشەو لە یەزدان دەپاڕێتەوە کە میری گەورەمان سەلامەت و تەمەندرێژ بێ.

پاشان نامەی ڕەنگاو ڕەنگ و ڕازاوەی پادشای کاستیلی دایە دەست تەیموور. تەیموور پرسی: ئەم نامەیە بە چ زمانێ نووسراوە؟ وتی: بە زمانی

ئەسپانی نووسراوە. ئەمیر تەیمور وتی: ئێمە کەسمان زمانی ئەسپانی نازانین، پاش نانخواردن خۆت دەیخوێنیتەوە.

لەو کاتەدا نۆکەرەکان دیارییەکانیان لەبەردەم(تەیموور بەگ)دا دەنا.. دوای ئەوەی سەیرێکیکردن، ئەو پیاوە گەورەیە بە ئامارەیەك داوایکرد کە لایبرێن. پاشان بە نوێنەری کاستیلی وت: بێ دیاریش بهاتیتایە گوێم نەئەدایە، ئەوەندەم بەسە کە مژدەی سەلامەتیی پادشای(کاستیل)ت بۆ هێناوم، بە راستی زۆر شاد بووم.

تا ئەو ساتە نوێنەری کاستیل و هاورێ و یاوەرەکانی هەربە پێوە بوون. ئینجا تەیموور بەگ داوای لە نوێنەرەکەو یەکێ لە هاورێ پلەدارەکانی کرد لە لای راستییەوە دانیشن، ئەوانی ترجەوت گەز لەو لاترەوە دانیشتن. ئەمیر تەیموور چوارمشقی لەسەر دۆشەکێکی نایاب دانیشتبوو، کڵاوێکی لبادی کردبووە سەری کە بە جەواهێرو گەوهەری رەنگاورەنگ رازێنرابووەوە.

پاش ماوەیەك خواردنیان هێنا. ئەگەر بمەوێ باسی جۆرەکانی و برەکانی بکەم بە چەندان پەرە تەواونابێ. برێکیان بریتیبوون لە بریانیی مەڕ، بریانی جوانووی ئەسپ کە لەژێر ئاگرو بۆتەی بیاباندا پیشابوو. کەبابی جوانووی ئەسپ یەکێکە لە خواردنە خۆش و نایابەکانی دانیشتووانی بیابانی ولاتی تەیموور بەگ. جوانووەکە سەر دەبڕن، کەوڵیدەکەن، پاشان ورگی هەڵدەدڕن، ناوسك و ورگ و ریخۆڵەی دەردێنن و پاك پاك دەیشۆن. پاشان جگەرو دڵ و گورچیلەکانی دەخەنەوە بۆشایی هەناوی، برێك رۆن و گیای بۆنخۆشیشی تێدەکەن و دەیدروونەوە، دەیخەنەوە ناو پێستەکەی و ئەویش دەدروونەوە، دەیخەنە ناو چاڵێکەوەو کەمێ دایدەپۆشن و ئاگری لەسەر ئەکەنەوە. من لەو خواردنەم خواردووە، زۆر خۆش و بەتامە.

❖ بریانیی جوانووەکەیان خستبووە سەر سینییەکی زۆر گەورەو چەند نۆکەرێك هەڵیانگرتبوو،، هێنایان و دایاننا، پاشان پارچە پارچەیانکرد، رانەکانیان لەبەردەم تەیموور بەگ و هەموو میوانەکاندا دانان. برێکیش لە جەرگ و دڵەکەیان بۆ دانان. ئەو رۆژە نزیکەی دوو سەد مەڕو جوانوویان کردبوونە بریانی. ئەو هەموو خواردنە بەشی زیاتر لە ساڵێکی ئەو هەموو خەڵکەی دەکرد.

هەموویان لە دەفری زێریندا ئەیانخواردو ئەیانخواردەوە. تەیمووری لەنگ و پیاوەکانی لەناو خواردنەوەکاندا تەنها هەر دۆی مایینیان دەخواردەوە.

دوای نانخواردن (گۆنزالیزکلاویخۆ) نامەی پادشای کاستیلی بۆ میر تەیموور خوێندەوە، ئەویش زۆری پێخۆشبوو.

❖ بۆ ماوەی حەوت ڕۆژ لەسەر یەك نوێنەری کاستیل و هاوڕێ و یاوەرەکانی، هەر ڕۆژەی لە کۆشکێکی تەیمووری لەنگدا میوانبوون. هەر میوانداریيەك لەگەڵ هی ڕۆژی پێشتردا جیابوو. لەیەکەمین ڕۆژدا بەو فیلە ڕازێنراوانەوە پێشوازیکران کە باسکران. دووەمین ڕۆژ بە ئەسپی زین و ڕەشۆی جەواهێردارەوە، لە سێیەمین ڕۆژیشا بە ئێسترو بۆ ڕۆژی چوارەمیش بە حوشتری ڕازێنراوە پێشوازییان لێکرا...

❖ دوای تەواو بوونی حەفتەی میوانداریی تایبەتی، کلاویخۆ لەوەرزی زستاندا لەو ولاتەدا مایەوە. لە وەرزی بەهاردا تەیمووری لەنگ بە دیاریی زۆرباش و نایاب و وەڵامی نامەی پادشای (کاستیل)ەوە ئەوی بەرەو ولاتی خۆی بەڕێکرد.

❖ من دڵنیام بەم نزیکانە پادشایەکی تر هەڵناکەوێتەوە ئەوەندەی تەیموور بەهێزو بە تواناو بەخشندەو لێهاتوو بێت.

***

# ناوەرۆک

## وەرگێڕ لە چەند دێڕێکدا

- ناوی (محەممەد سەعید عەلی)یە ناسراوە بە (حەمەی حەمە سەعید).
- ساڵی (١٩٦٢) لە شارۆچکەی (تەوێڵە)ی ناوچەی هەورامان لەدایکبووە.
- لە خوێندندا، پۆلی سێیەمی ناوەندی تەواو کردووە.
- ئێستاش جێگـــری لێپرســـراوی مەڵبـــەندی (٩)ی ڕێکخســـتنی شـــارەزووری ی.ن.کە.

سەرنج

❖ (زەبیحوڵڵای مەنصووری) وەرگێڕی ئەم کتێبە لە زمانی فەرەنسیەوە بۆ فارسی، هەندێ ڕوونکردنەوەی لەسەر "وشە، جێگا، ناو.....هتد" نووسیوە. ئێمە بە پێویستمان نەزانی هەموو ئەو ڕوونکردنەوانە وەرگێڕینە سەر زمانی کوردی.

❖ لە وەرگێڕانی ئەم کتێبەدا بۆ کوردی، هەر چی درێژە پێدانی تەیموری لەنگ بووە لەسەر شێوەی ئارایشی جەنگی، ڕێ ڕۆیشتن جێگە – شوێن، گفتوگۆکانی. کورت کراوەتەوە، وە بۆچوون و ڕادەربڕینی خۆی سەبارەت بەهەندێ مەزهەب بەتایبەتی ( شیعە مەزهەب ) ەکان، وەرنەگێڕدراوە.

حەمەی حەمە سەعید

# لێکدانەوەی چەند ووشەیەك

**کەش - کیش :**

لە کۆندا کیش دەکەوتە هەرێمی خوارەزم پێی دەوترا کاس یان کیش ڕووباری جەیحون وێرانی کردبوو بەهۆی لافاوی‌یەوە ، پاش داگیر کردنی ئەو وولاتە لە لایەن تەیموری لەنگەوە بڕیاری چاك کردنەوەی داو کردیە پایتەختی خۆی و وە لەجوانترین و ڕازاوە ترین شاری ئەو سەردەمە بوو.

**خوارەزم :**

هەرێمی خوارەزم لە سەرەتای سەدەکانی ناوەڕاستدا دوو شارۆچکە بووە یەکەمیان کەوتبووە خۆرئاوای ڕووباری جەیحون پێی وتراوە ( جۆرج جانید) یان ( ئەرگەنج) لە بەری ناوچە فارس نشینەکەیەوە ، بەشەکەی تری خوارەزم کەوتبووە ڕۆژهەلآتی ڕووباری جەیحونەوە واتە بەشە تورك نشینەکەی ، وە پێی ووتراوە ( کاث یان کیش) لە کۆتایی قەڕنی چواردەی میلادی دا تەیموری لەنگ داگیری کردووە ، بەگشتی هەرێمی خوارەزم ئەم شوێنانەی گرتبووەوە (کیش) جۆرجانید ئەو شارانەی کە کەوتبونە ئەم بەر و ئەوبەری ڕووباری جەیحونەوە ( خیوە هەزار ئەسپ).

**ماوراء النهر :**

لە کۆندا ڕووباری جەیحون سنووری نێوان فارسەکان و تورکەکانی لە یەك جیادەکردەوە یان سنووری نێوان ئێران و تورانی دیاری دەکرد ، بەشە تورك نشینەکەی کەوتبووە باکوری ڕووباری جەیحون ، عەرەبەکان پێیان دەوت (ماوراء النهر ) کە لەو کاتەدا چەند هەرێمێکی گرتبووەوە کە پێك هاتبون لە کەنارەکانی باکوری ڕوباری جەیحون ناوچەکانی بەدخشانی و وەفا هەرێمی قەتلٚ و وەحش هەرێمی سەغد واتە نجارا ، سەمەرقەند ، ترمد ، دەریاچەی خوارەزم.

## جەیحون و سەیمون:

لەسەدەکانی ناوەڕاستدا بەڕووباری ئۆکس OXUS یان وتووە جەیحون وە بە ڕووباری جکزر تس یان Jaxartes وتووە سەیحون ئەم دوو ڕووبارە کەوتونەتە ولاتی ( ماوراء النهر) لەکۆندا خەلك باوەڕیان وابووە ئەم دوو ڕووبارە ڕووباری بەهەشتن وەك دجلە و فرات عەرەبەکان ئەم ناوانەیان لە جولەکە وەرگرتووە گوایا لە کتێبی پیرۆزی ( سەفەری تەکوین) دا ناویان هاتووە بە ناوی ( گەیحون و پیسون) ڕووباری جەیحون سەرچاوەکەی لە دەریای ( تبت) ەوە هەڵ دەقوڵێ.

## عێراقی عەجەم :

لە کۆندا بەو ولاتە فراوانە وتراوە کە ناوچکەیەکی شاخاوی یان و بەرینی دەرگتەوە ڕۆژئاوای دەشتی عێراق و جزیرە بووە ڕۆژهەلاتیشی بیابانە سوێرەکانی فارس بووە ، یۆنانیەکان پیێان دەووت میدیا Media مێژوو نووسە عەرەبەکان پێیان دەووت ولاتی شاخاوی ، پاشان لە سەردەمی سەلجوقیەکاندا ناوی عێراقی عەجەمی لێنراوە بۆ ئەوەی جیا بکرێتەوە لە عێراقی عەرەب کە پێك دەهات لە ولاتی نێوان دوو ڕووبار عێراقی عەجەم پێك دەهات لەم هەرێمانە قەرە حسین واتە کرماشان - بێستون و کەنگاوەر - دینەوەر حەلوان - ڕێگەی گەورەی خۆراسان - کرند - کوردس تانی سەردەمی سەلجوقیەکان- بەهار - چەمچەماڵ - شارەزوور - ئالانی و والیشتر - هەمەدان، نهاوە و کەرەج .

## غەور :

لە سەردەمی سەدەکانی ناوەڕاست غەور پێك دەهات لە هەرێمێك کە خەزنە و بامیانی تێدابووە ، ڕووباری هێرمەندی پێدا تێپەڕیوە ، ئەم هەرێمە ئێستا بەشێکە لە وولاتی ئەفغانستان.

## الصیمرە :

سێمرە شارێك بووە کەوتبووە ڕۆژئاوای لوڕی بچوکەوە مێژوونوسەکان ڕۆژگاری کۆن وەك موقەدەسی ئیبن هوقەل یەعقوبی و قەزوینی هەمویان ئاماژەیان بۆ کردووە ئەم شارە نزیك بووە لە شارێك سیروان ، یاقوت : سێمرە شارێکی گەورە و ئاوەدان بووە خورما و زەیتون و گوێز و بەفری تێدا بووە

پاشماوەی ئەم شارە ئێستە لە ئوستانی لوڕستانی ئیدان دایە ، وە ڕوبارێکیش بە ناو لوڕستاندا گوزەر دەکات پیٚ‌ی دەڵێن سیمرە.

**باب الابواب :**

ئیبن حومەل کوڕی هوقەل : دەڵێت ناوی شارێك بووە لە سەر بەحری قەزوین عەرەبەکان ئەم ناوەیان لیٚ ناوە.

**هرات :**

لە سەدەکانی ناوەڕاستدا و لە سەردەمی دەسەلاتی عەرەبەکاندا هەرێمی خۆراسان کراوە بە چوار بەش . (١) نیشاپور (٢) هرات (٣) مرو (٤) بەلغ ، هەرات شارێك بووە لە نزیك شاری بابەگدا خاوەنی کتێبی فارسی نامە دەڵێت هەرات لە سەردەمی میلادی دا شاریٚ‌ی گەورە بووە خاوەن بەرهەمی زەیتون و سێو بووە هەرات ئێشتە ناوی پارێزگایەکە لە ئەفغانستان دا .

**طالش :**

ناوچەیەکە دەکەوێتە باکوری وولاتی ئێران ، سەر بە پارێزگای _(گیلانە ) لە ناوچەکەدا شارێك بە ناوی طالش هەیە ، دانیشتوانی طالش کوردی کۆچ پیٚ کراون ، زمانیشیان لە لەهجەی هەورامییەوە نزیکە.

**فرسەنگ :**

یەك فرسەنگ نزیکەی شەش کیلۆمەترە .

**سەمەرقەند :**

شارێکە ئێستە هەر بە سەمەر قەند ناو دەبرێت لە وولاتی ئۆزبەکستانی ڕووسیەدا .

**دەربەندی پاتاق :**

دەکەوێە پارێزگای کرماشان لە ولاتی ئێراندا ئەم دەربەندە نزیکەی ٢٣ کیلۆمەترە ، کورت ترین ڕێگای نێوان عێراق و ولاتی خۆراسانی سەردەمی کۆن بووە ، سەرەتای دەربەندەکە لەکەلی داود لە نزیك سەرپێلی زەها و دەست پیٚ دەکات و لەنزیك شاری کرند کەشارێکی سەربە ئۆستانی کرماشان و دانیشتوانی (کاکەیی)ن کۆتایی دێت ئەم بەرو ئەوبەری دەربەندەکە دوو زنجیرە کێوی سەخت و بەرز و زۆربەیان بەدارستانی دار بەڕوو داپۆشراوە.

**اسماعیلیە :**

ئیسماعیلیە بەشێکی لە( شیعە ) کە ئیسماعیل کوڕی ئیمام جەعفەری صادق بە ئیمامی حەوتەم دەزانن ، دژی ئەو باوەڕەن کە شیعەی دوانزەیی (الاثناعشري) هەیانە گوایا لە بەر ئەوەی ئیسماعیل پێش باوکی کۆچی دوایی کردوە بۆیە ئیمامەت لەباوکیەوە دراوەتە دەست (موسى کاظم) شیعەی اسماعیلی دەڵێن ئیمامەت دوای حەسەن و حوسەین هەر لە باوکەوە بۆ کوڕ گوێزراوەتەوە وە هەرگیز لە براوە بۆ برا نەگوێزراوەتەوە هەر لە بەرئەوەشە ئیسماعیلی بە ئیمامەتی موسى کاظم قایل نەبوون .

**عەلەوی :**

عەلەوی بە شێوەیەکی گشتی بەو شیعانە دەوترێت کە تەنها ڕەوایی بە خەلافەتی حەزرەتی عەلی کوڕی ئەبی طالب ئەدەن خەلافەتی هەرسێ خەلیفەکەی تر بە ( باطل ) دەزانن باوەڕیان وایە پێغەمبەری مەزن لە ژیانی خۆیدا ئاماژەی بەو مەسئەلە کردووە کە عەلی بەخەلیفەی مسوڵمانان دابەزێنرێت بەو پێیەی کە فەرمویەتی ( من كنت مولاه فعليا مولاه) ئەمانەش چەند دەستەیەکن هەندێکیان ئەوەندە زیادە ڕۆییان کردووە دەربارەی حەزرەتی عەلی وە بە خوای دەزانن.

**ئەلفاری :**

پاش وەفاتی نێرراوی خودا لە سەر خەلافەت کێشە دروست بوو ، ئەلفاریەکان کۆبونەوەیەکیان کرد لەو کۆبونەوەدا بڕیاریان دا لە ئەنصاریەکان خەلیفەی جێگەداری پێغەمبەری مەزن هەڵبژێردرێت ئەوە بوو (سەعید بن عبادە)یان دیاری کرد ، تا ماوەیەك بیعەتیان بە خەلیفە ئەبوبەکر نەکرد ، ئەنصاریەکان واتە خەڵکی شاری مەدینە ئەوانەی پشتی پێغەمبەریان گرت ، ئەنصاریەکان پێیان وابوو ١٣ سیزدە ساڵ بوو پێغەمبەری مەزن ، دەعوەتی خەڵکی مەکەی کردبوو بۆ بوون بە ئیسلام کەچی ئەوان ڕوویان لێ وەردەگێڕا و ئازاریان ئەدا ، ئەنصاریەکانی مەدینە بە پیر داواکەیەوە چوون و جێگەی پێغەمبەر و هەوەڵەکانیان کردەوە بوون بە سەربازو فەتحی شاری مەکەیان کرد و نیوە دورگەی عەرەبیان داگیر کرد .

**ئەنگوریە** :بە ئەنقەرەی پایتەختی ئێستای تورکیا ووتراوە ئەنگوریە .

**گوڵشەنی ڕاز** :

ناوی کتێبی هۆنراوەکانی شێخ مەحمودی شبس تەریە مانای ووشەکەش نازناوێکە بۆ بەهەشت.

**عاق مەربوج** :

لە باکوری سەمەر قەند دا هۆزێك هەبوون بە ناوی ( قەرەخەتائی ) ناوی تیرەیەکی ئەو هۆزە یان تیرەیەکی ئەو هۆزە پێیان دەوترا عاق مربوج .

**السقف سلطانیة** :

واتە قەشەی سلطانیە پێشتر لە نەخجەوان دا ژیاوە پێشەوای رۆمانی ئەرمەنیەکان بوو ، دواتر تەیموری لەنگ گواستیەوە بۆ ( مغرب الامین) واتە لەسەر زەوی ڕۆژئاوا مەئموریە تەکەیشی بردنی نامەی تەیموری لەنگ بوو بۆ پادشای وڵاتی فەرەنگستان. • فەرنسە)

**طوس**:

ناوی شارێك بوو لەووڵاتی خۆراسان دا کە فیردۆسی هۆنەری کتێبی شانامە لەوێدا لەدایك بووە.

**قوچان** :

لە پارێزگای مەشهەد دا واتە ئوستانی خۆراسان شارێك هەیە بە ناوی قوچان دانیشتوانی قوچان کوردن لە کوردستانەوە کۆچ پێ کراون زۆر لە کۆندا لە بەر هەلو مەرجی سیاسی سەردەمی خۆی.

**کەویر** :

هەر بیابانێك ووشك و بێ ئاوبێ هیچ جۆرە دار و گژو گیایەکی لێ نەڕوێ پێی دەووترێت کەویر.

**قائین**:

شارێکە لە ئوستانی فارسدا ناوەندی ئوستانی فارس ئێستا شاری شیرازە کە زادگای شاعیری پایە بڵندی شعری فارسی ( محمد شمس الدین ) ە بەنازناوی (حافظ) ی شیرازی.

**ئەسپهبودان :**

ناوی شارێك بوو لە ئوستانی گەیلان دا لەو سەردەمەدا ئەسپهبودان ناوەندی ئەو ولایەتە بوو ئێستا ناوەندی ئوستانی گەیلان لەباکوری ولاتی شیرازدا شاری ڕەشتە.

**حسین اباد:**

واتە حسین ئاوا ، لە ناوچەی لوڕستانی شیرازدا کە خەڵکەکەی لوڕن وە بە زمانی لوڕی قسە دەکەن لەو سەردەمەدا تەیموری لەنگ هێرشی کردە سەر لوڕستان ، میرەکانی لوڕستان کە ئەوکات ئەتابەگ ئەفرسیاب حوکمڕانی دەکرد لە شاری حسین ئاواد دادەنیشت وەئەم شارە لەناوچەی پشتکۆی لوڕستاندا لە جێگەیەکی زۆر سەخت دا بوو.

**ئاتەشکەدە ، ئاتەشگاە:**

زەردەشتیەکان لە سەردەمی خۆیاندا واتە ئەو کاتەی ئاگر بەلایانەوە پیرۆز بوو، جێگەیەك کە ئەو ئاگرەیان تێدا کردبوەوە قەد نەدەکوژایەوە بەو جۆرەی تەیموری لەنگ باسی دەکات بە ئاگردانەکەیان دەووت ئاتەشگاە.

**کوتوال :**

کوتوال ووشەیەکی هیندیە واتە سەرپەرشتیاری قەلاّ یان لێپرسراوی پاسەوانانی قەلاّی جەنگی.

**قزلّ ئیرماق:**

ناوی ئەو ڕووبارەی کە شاری سیواس کەوتبووە لێواری وە بە کەنار شارەکەدا ڕووبارەکە ڕەوان بوو لە ئاسیای بچووك پیّی دەوترا قزلّ ئیرماق.

**بێزانتیوم:**

لەو سەردەمەدا کە تەیموری لەنگ هێرشی کرد بۆ ئاسیای بچوك وە پادشای ڕۆمی بە ناوی ( ئیلدرم بایەزید ) شکاند و دیلی کرد وە لە گەلّ خۆیدا بردی بۆ گرتنی شاری بێزانتیۆم بەو جۆرە کە خۆی باسی کردووە شاری بیزانتیوم ئەستنبوڵی ئێستا بووە.

## خوێنەری بەڕێز:

لەچاپی یەکەم و دووەمی بیرەوەرییەکانی تەیموردا، لەسەر ئەم بەرگە، پێدا هەڵدانی بۆکوردەکانی کۆچ کردو لەکوردستانەوە بۆ (قوچاق) لەزمانی تەیمورەوە بلاو کردەوە. وا بۆ چاپی چوارەم چەند پەرەگرافێکی ترمان لەناوەرۆکی کتێبەکە وەرگرت کە دووبارە لەوێشدا باسی ئازایەتی و چاو نەترسی هۆزە کوردەکان دەکات، کە دوای گەڕانەوەی لە بەغدا، لە دەربەندی باتاق بەهێزێکی کەمەوە ڕێگەیان بەلەشکرە گەورەو گرانەکەی تەیموور گرتووە.

تەیمووری لەنگ دەڵێت:

"کەبەرەو کرماشان دەڕۆیشتم گەیشتینە ناو دەربەندێك بەناوبانگ بە(پاتاق) دەستەی پێشڕەوانم ئاگاداریان کردم کە ژمارەیەك سوارەو پیادە لە دەوروبەری ئەو دەربەندەن لەوانەیە دوژمن بن، دوای لێکۆڵینەوە ئاگاداریان کردمەوە ئەوانە هەندێك هۆزو خێڵو تیرەی ناوچەی کرماشانن، دەڵێن ئەمیر تەیموور بەچەندەها بار زێڕەوە لە بەغدا گەڕاوەتەوە، ئەگەر ئەیەوێت سەری سەلامەت بێ هەمووی دانێ ئینجا لێرەوە بڕواتت!

.....بەڕاستی من نەمدەویست سەربازەکانم بە دەستی عەشایەرانی کرماشان بەکوشت بدەم!

..... لەوشەڕەدا سەدو شانزە کوژراوو هەندێك بریندارمان هەبوون

..... لە نەبەردو جەنگی دەربەندی پاتاق دا ئەزمونی بەکەڵکم وەرگرت، لەشەڕەکانی ڕۆم و کابولستان و ئەفغانستان و هیندستان و وڵاتی شامدا،ئەگەر بمویستایە لە گەلیەکەوە بڕۆم، ئەمسەرو ئەوسەری گەلیەکەم داگیر دەکرد، ئینجا لەشکر پیایدا دەڕۆیشت".



لەبلاوکراوەکانی خانەی چاپ و پەخشی ڕێنما

نرخ (6000) دینار